# ژنان و کاروباری ژنان
# له
# ئیسلامدا

ئه‌حمه‌د کاکه مه‌حموود

چاپی یه‌که‌م

١٤٣٠ کۆچیی
٢٠٠٩ زاییینی



**ناسنامەی کتێب:**

**ناو: ژنان و کاروباری ژنان لە ئیسلامدا.**

**نووسەر: ئەحمەد کاکە مەحموود.**

**تایپ: عبدالرحمن نجم الدین طە - موحەمەد ئەحمەد کاکە مەحموود.**

**خوێندنەوەو پیاچوونەوەی: عرفان ئەحمەد کاکە مەحموود.**

**هەڵەچنی: صهیب ئەحمەد کاکە مەحموود.**

**ساڵی چاپ: ١٤٣٠ کۆچیی- ٢٠٠٩ زایینی. چاپی یەکەم.**

**چاپخانە: دارالفکر- بەیروت- لوبنان.**

**تیراژ: ٥٠٠٠ دانە.**

# پێشەكى چاپى یەكەم

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله، وعلى آله وصحبه ومن والاه.

سوپاس و ستاییشى بێ پایان بۆ خواى بالاَّ دەست و بەتوانا، درودو سلاَّوى خواى میهرەبانیش بۆ سەر گیانى پاكى پەیامبەرى ئازیزو یارو یاوەرانى و شوێنكەوتوانى. خوێنەرانى هێژا: وا بۆ جارێكى تر بە یارمەتى خواى پەروەردگار دەستنووسێكى ترى مامۆستاى موجاهیدو موفەسسیرى قورئان جەنابى مامۆستا مەلا ئەحمەد كاكە مەحموود دەخەینەوە بەردیدى ئێوەى خۆشەویست و رۆشنبیران و لاوان و گەنجانى ئەمرۆمان، بەتایبەت ئافرەتان، لە دێر زەمانەوە مامۆستا لە خولیاى نووسینى كتێبێك بوو سەبارەت بە ( ژنان و كاروبارى ژنان لە ئیسلامدا)، بەتایبەت بۆ ئەم وەزعەى ئەمرۆى موسڵمانان و بەتایبەتى تریش كێشەى ئافرەتان و خوشكان، كە لە دونیاى ئەمرۆى عەولەمەدا زۆرێك بەناوى جیاجیاوە خۆیان كردووە بە پارێزەرو دەمراستى ئافرەتان و بەسەدان و هەزاران رێكخراوى جۆراوجۆر بۆ كێشەو كاروبارى ژنان دروستكراوەو فرمێسكى تیمساحاوییان بۆ دەرێژن!، وە هەر یەكەیان دەهۆڵى شوێنێك لێدەدات و جاڕنامەى مافى ئافرەتان دەخوێنێتەوەو بلاَّو دەكاتەوە، جا لەم كات و ساتە ناسكەدا مامۆستا هەستا بە نووسینى ئەم كتێبەو وەك خۆى لە پێشەكییەكەیدا هێماى پێكردووە تەواوى سەرجەم كێشەكانى ئافرەتانى لە سۆنگەى قورئان و فەرموودەو پاشان بیروو بۆچوون و ڕاو پێشنیارى زانایانى ئیسلامیی و غەیرە ئیسلامیی باسكردووەو هیچ كێشەیەك نەماوە مامۆستا لەم كتێبەیدا سەبارەت بە ئافرەتان باسى نەكردبێت و وەلاَّمى تەواوى ئەو كەسانەیشى داوەتەوە كە بەناوى ئازادیی و ڕادەربڕینەوەو لەسایەى عەلمانییەتدا هێرشى ناڕەوا لەو دەرگایەوە— ئافرەتان— دەكەنە سەر ئیسلام و مێژووى ئیسلامیی. وە هەروەها مامۆستا بەرەحمەت بێت وەك كارێكى نموونەیى لەم كتێبەدا هەستاوە بە بلاَّوكردنەوە زیاتر لە ٣٠٠ فەتواى تایبەتیی

بـه ئافرەتـان، كـه ئەمــەش شـتێكی نوێیـه بـۆ ئافرەتـان و سـەرجەم وەڵامـی پرسـیارە هەسـتیارەكانی ئافرەتـانی داوەتـەوە، هـەر چـەندە ئـەم كتێبـه مـاوەی زیـاتر لـه ٣ سـاڵه نووسراوە، بەڵام بەهۆی نەبوونی كولفەی چاپكردنییەوە وەك – كتێبـەكانی تـری– تـا ئـەمڕۆ دوا كەوت و ئێستاش پشت بەخوا چاپی یەكەمی ئەم كتێبە دەخەینە بەر دەستی خوێنـەران، بەهیوای سوودو كەڵك لێوەرگرتنی بەتایبەت خوشكان و ئافرەتان. وە دڵنیاشـتان دەكەینـەوە كـه بـه یارمـەتی خـوای گـەورە سـەرجەم نووسـراوو بەرهەمـەكانی مامۆسـتا مـەلا ئەحمـەد بڵاودەكەینـەوەو رێگـاو فیكـرو بیرمەنـدیی مامۆسـتا تـا رۆژی دوایـی هـەر گەشـاوەو رۆشـن دەبێت، انشاوالله. داوای دۆعای خێرتا لێدەكەین.

وصلى الله وسلم على نبينا و قائدنا محمد و على آله وصحبه.

**عیرفان ئەحمەد كاكە مەحموود**

**١٣ ی شەعبانی ١٤٣٠ كۆچیی**

**٤ / ٨ / ٢٠٠٩ ی زایینی**

**www.ahmadkaka.com**

erfankaka@yahoo.com



## پێشەکیی:

إن الحمد لله نحمده ونستعينه، ونستغفره و نتوب إليه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيآت أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادی له، وأشهد أن لاأله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.

﴿ياأيهاالذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولا تموتن إلا وأنتم مسلمون﴾ آل عمران:١٠٢.

﴿ياأيهاالناس اتقوا ربكم الذى خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثيرا و نساء واتقوا الله الذى تساءلون به والأرحام إن الله كان عليكم رقيبا﴾ نساء:١.

﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله وقولوا قولا سديدا يصلح لكم أعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما﴾ الأحزاب: ٧٠-٧١.

**أما بعد:**

فإن أصدق الحديث كتاب الله تعالى، و خير الهدى هدى محمد ﷺ، و شر الأمور محدثاتها، و كل محدثة بدعة، و كل بدعة ضلالة، و كل ضلالة فى النار.

## پاشان:

بێگومان مەزنترین کێشە، لە نێو کێشە کۆمەڵایەتیەکاندا -بە کۆن و نوێوە- کاروباری ژنانە، بۆیە دەبینی زۆرێکی زۆرینەی کۆمەڵناس و فەیلەسووف و، یاساناس و، تەنانەت سیاسیی و سیاسەتمەداریش، خۆیان بە ئافرەتەوە سەرقاڵکردووە، دەتوانم بڵێم: بەوکارەیان هەم ئافرەتیان چەواشە کردووە، هەم کۆمەڵگە، واتە: زێدەڕۆییەکی زۆر کراوە لە بارەیانەوە، خۆ خودای گەورەش زێدەڕۆیی لەهیچ شتێکدا قبوڵ ناکاو، ڕێیش نادا زێدە ڕۆیی تێدا بکرێ، وە بۆهەر کەسێکیش بەڕێژەی خۆی - بێ ستەم و ناهەقیی- ماف و ئەرکی بۆ دیارییکردووە، مەگین بۆ دوایی بۆ خۆیان ماف یەکتر پێشێل بکەن و هەقی یەکدی بخۆن. ئەم ئادەمیزادە، لە جێبەجێکردنی ئەرکی سەرشانیی و، وەرگرتنی

مافى خۆيدا گشت يەكسانە.

جا لەبەرئـەوە كە باسـى ژنـان، بۆتـە باسـێكى گشتگيرو، فـرە لـق، وە بەهـەق و ناهـەق فرمێسكى بـۆ دەڕێـژرێ وكراوەتـە كێشە لـەجيهانى ئيسلامدا، ديـارە ئەمـەيش –بەپلـەى يەكـەم– لــە خۆرئــاواى فاســيد و گەندەڵــەوە ســەرى هەڵــداو خــۆى خزانــدە ولاَتــە ئيسلامييەكانەوە، بگرە خۆى كوتايە هەموو ماڵە موسڵمانێك و، ئاگرى بەردايـە نێـو مـاڵى هــەموو ئوســرەو خێزانێكــى بــچووك و گــەورەوە، (بەنــدە)ش لــە مێــژە دەمــەوێت بــە تێروتەسەل لەو باسە بنووسم و، بەپێى تواناى خۆم و بە پێى دەسكەوتنى سەرچاوەى ئيـسلامى و، نائيـسلامى، هـەق و ناهـەق لێكجـودا بكەمـەوە، روونـى بكەمـەوە ئـاخۆ ئافرەت لـە ئيسلامدا مافى زەوتكراوە، يـان لاى ئەوانـە لـە ميدياكانـەوە دەيكەنـە هـەراو بـۆ ژنان دەگرين...؟

لـەم نووسينەشـدا تـا بـۆم بكرێـت لـە (قورئـان) و لـە (فـەرمووده) دەگـەڕێم، ئەوسـا بۆچوونى زاناكانى ئيسلام – بەكۆن و نوێوە – دێنين و هەڵدەسەنگێنين، ئينجا كتێب و ناميلكــەى ئــەم لاو ئــەولا، ديــارە كــە ئــەم باســە زۆر گرنگــەو، زۆريــش دەوڵەمەنــدەو، ئـافرەتيش هەقيـەتى لـە هـەموو بـوارێكى ژيانـدا بەشـى هـەبێ و، لێكۆڵينـەوەى لەسـەر بكرێت: لە دروست بوونى، ئينجا شيوەو ڕەنگ و ڕوخساريى، قەدو بەژن و بالاَو نەرم و ناســكيى جەســتەى، هێنــدێ لــە تايبەتمەنــدى خــۆى، لــە رووى فەســيۆلۆژياو (تەناسـول)ييـەوە، ئەركـەكانى سەرشـانى، بەشـداربوونى لـە گشت بڕيـار و فەرمانـەكانى خـودادا (ئـەمر) و (نـەهى)، خواپەرسـتيى: (نوێـژ، ڕۆژو، حـەج، زەكـات، جيهـاد، ئيمـان و باوەڕو ئەركان و پايەكانى) لەماڵەوە بوونيى و، هاتنە دەرەوەى لەماڵ، خستنە ژێـر ئيش و كارى ڕۆژانە و، بژێوى دان بەسەريا، چوونە ناو دام و دەزگادەوڵەتيەكانـەوە، بـوونى بـە سەرۆك دەوڵەت، وەزير، قازيى و حاكم و دادوەرو خۆكانديـدكردن و، مـافى هەڵبـژاردن...، جـل و بـەرگ و كـالاَى شـياوو تايبـەت بـۆى، مافـە گـشتييەكانى: خاوەنـدارێتى، مـافى هەڵبـژاردنى مێـردو هاوسـەر، جيابوونـەوەو تـەلاَق – هەركـە تووشـى زيـان و سـتەم بـوو لەلايەن مێردەكەيەوە – فێربوونى زانست و زانياريى (ئەوەى لەگەڵ فيترەت و سروشـتيدا دەسـت بـدات)، خێـرو خێراتكـردن و بەخـشين – بـەئارەزووى خـۆى – لـە مـاڵ ودارايـى

خۆیدا، کێی ویست دەتوانیٚ خۆشی بویٚ و زیارەت و سەردانی بکا، دەتوانیٚ – وەکو پیاو – بە $\frac{1}{3}$ ی سامانەکەی وەسیەت بکا، هەقیەتی بە ئارەزووی خۆی جل وبەرگ و کالاّی (حەریر و ئاوریشم و زیٚڕ) بەکاربهێنێت، هەقیەتی بەهەر هۆو وەسیلەیەکی خۆجوانکردن، ئارایش بکا بۆ هاوسەرو شووەکەی، دەتوانیٚ کولٚم و لێوو روخساری سوور بکا، مافەکانی بەسەر مێردەکەیەوە، یان ماڤ مێردەکەی بەسەر ئەوەوە، مارەیی و میرات، شایەتیی و گەواهیی، ئەمانەو هەرشتێکی تر پەیوەندی بەوەوە هەبێت –پشت بەخوا– بەدەوڵەمەندانە دەینووسین و لیٚی دەکۆڵینەوە، ئومێدەوارم (خانمەکان) سوودو کەڵکی لێوەرگرن و، بیکەنە ڕۆشناییەك بۆ دۆزینەوەی هەق و ڕاستییەکان.

ئەحمەد کاکە مەحموود

مانگی ٥ / ١٤٢٧ کۆچیی

هەڵەبجەی شەهیدان

## قورئـان گرنگیی بە ژنان و کاروبـاری ژنان دەدات

دیارە کە ئافرەت لـە سـەرەتا بەراییـەکانی هـاتنی ئیـسلامیی پیرۆزیشدا، لای مـەردم مـاف پێــشێلکراوو بەشــخوراو بــوو، بۆیــە دەبــینی لــەتوێی ئایــەت و ســوورەتەکانی قورئــان و فەرمووودەکاندا، بایەخێکی ئێجگار زۆر بە ئافرەتـان دراوە، وە مـاف و ئەرکـەکانی پـتر روون و شـیتەڵکراونەتەوە، تەنانـەت – وەکـو گرنگیـدانێك پێـی– وشـەی (إمـرأة = ژن) (٢٤) جـار لـە قورئاندا هاتووەو، لەپاڵ هەریەکەیانـدا مـاف و بڕیارێـکی بـۆ چەسپانـدووە، کـەچـی وشـەی (مـرء = پیاو) (٩) جار هـاتووە، وەیـان وشـەی (رجل = پیـاو) (٥٦) جار هاتووە، کەچی بێژەی (نساء = ژنـان) (٥٧) جـار هـاتووە (المعجـم المفهـرس / بـەڕێز مامۆسـتا فـؤاد عبـدالباقی)، بـێ شك ئـەمـە پـەردە لادانـە لەسـەر مافـەکانی ژنـان، هـەتا جـارێکی تـر بـە هـیچ شـێوەیەك سـتەم و ناهەقیی بەرامبەر نەکرێت و، بە پلـەی دووەمـی مـرۆڤ سـەیر نـەکرێت و، دەرەنجـام لەمەشـەوە پیاوان زاڵ نەبن بەسەریاندا و، چۆن بیانەوێ هەڵیان بسووڕێنن و لەژێر باریان بنێن !

## نێرومێی مرۆڤ دروستکراوی خودای گەورەو دلۆڤـانن

خودای گەورە، هەروەکو پیاوو نێرینەی بەدیهێناوەو دەفەرموێ: ﴿یاأیُها الناس اتقوا رَبَکم الذی خَلَقکُم من نفس واحدة...﴾ ١/٤. هەر ئاواش ژن و مێینەی خولقاندووەو، دەفەرموێ: ﴿وخَلَقَ منها زَوجها..﴾ ١/٤. ئەوساش تەواوی ئادەمیزادی لەو (نێرومێیە) پەرەپێسەندو لەزەویدا بلاًوی کردنەوە: ﴿وَبثَ منهما رجالا کثیرا ونساء...﴾ ١/٤، یان دەفەرموێ: ﴿یا أیُها الناسُ إنا خَلَقناکُم من ذَکَر وأُنثی...﴾ (حوجورات) کەوابوو لە گرنگترین خاڵدا، لەسەرەتای سەرهەڵدانی ژیندا، ژن و پیاو هەردوو پێکەوە – لەیەك سەرچاوەوە – بەیەك دەستی خودایی، لە دەرگای ژینیانداوەو، هاتوونەتە نێو ژینەوە، خودای گەورەو میهرەبان، بۆخۆی مرۆڤی یەکەمی باوە (ئادەم) خولقاند، هەروەکو دایە (حەوا)شی بەدەستی خۆی خولقاند، واتە: هیچ جیایی و جیاوازییەکی لە نێوانیاندا لەم مەسەلەیەدا دانەناوە، ئەمی لە زێڕ دروست نەکردووەو، ئەویش لە قوڕ، بەڵکو بۆ هەردوو دەفەرموێ: ﴿خلقکم من نفس واحدة...﴾، ﴿وخلق منها زوجها...﴾ بکەرو (فاعیل)ی هەردوو هەریەکەو خۆیەتی – جل جلالە– بۆیە جێگەی شانازییە بۆ ئافرەت – ئەگەر ژیرانە ورد بێتەوە کە ئەویش هیچی لە پیاو کەم نییە و، هەردوو تەواوکەری یەکترن و، کەسیان پلەی یەکەمی نەدراوەتێ و، ئەویشیان پلەی دووەم، دەشتوانم بڵێم بۆیە دایە (حەوا)ی لەو ماددە دروستکرد کە بابە (ئادەم) ی لێدروستکرد، بۆ ئەوەبوو تا باشتر لە یەکتر تێبگەن و، باشتر پێکەوە بژین و، هیچیان دەعیە بەسەر ئەوی تریاندا نەکات.

## ژن و پیاو وەك یەك خاوەن بەهاو خاوەن مافن

خودای کارزان و کارجوان، لەبارەی مرۆڤەوە –بەبێ جیاوازی– دەفەرموێ: ﴿ولقد كرمنا بني آدم وحملناهم في البر والبحر..﴾ الإسراء/٧٠، یان دەفەرموێ: ﴿ياأيُهَا الناسُ إنا خَلَقناكُم من ذكر وأنثى وجَعلناكم شعوباً وقَبائلَ لتعارفوا إنَ أكرمكم عِندَالله أتقاكُم..﴾ حُجرات/ ١٣ (أهل الحل والعقد / د. عبدالله بن إبراهيم الطريقي)، ئەمە پلەو پایەی ژن و پیاوە لە ئیسلامدا، نابینرێ کەسێکیان فەزڵی زیاتری لەوی تریان هەبێت، مەگەر بەکارو کرداری چاك و، ئاکاری جوامێرانە، هەر کەسێك چاك و باش بێت – ژن یان پیاو – جێگەی بەهەشتەو خواش خۆشی دەوێ: ﴿إن الأبرار لفي نعيم﴾،﴿فمن يعمل مثقالَ ذرة خيراً يره﴾ کێش بەدکارو بەدڕەوشت بێت، جێگاو ئەنوای جەحەننەم ودۆزەخەو، خوداش نایەوێ: ﴿وإنَ الفجارَ لفي جحيم﴾، ﴿ومَن يعمل مثقالَ ذرة شَرّاً يره﴾. ئەوەتە ئافرەتێك بە بێ رەحمی خۆی پشیلەیەك لەماڵەوە بەند دەکات، نە خواردنی دەداتێ، وە نە ئازادیشی دەکا، بچێت شتێ پەیدا بکات بۆ خۆی، دەرەنجامی ئەو ژنە بەهۆی ئەو بەدکارییەوە جەحەننەم و دۆزەخە. پیاوێکیش سەگێك لە تینوویەتی ڕزگار دەکا، لە بەر ئەوە خودای گەورە دەیبەخشێ و عەفووی دەکا. کەوابوو ژن و پیاو – بێ فەرق و سوون– ڕێزدارن و، بەیەك چاوەوە تەماشای کارو کردەوەیان دەکرێت، چاککاربوو، چاککارە، بەدکرداریشبوو، بەدکردارە. دە ئاخۆ جێگەی خۆی نییە (خانمەکان) دوای هەق و ڕاستییەکان بکەون و، ئەوەند بە قسەی ئەم و ئەو فریو نەخۆن و، بە فرمێسکی (تیمساح)انەیان دڵگەرم وخۆشحاڵ نەبن ؟

## پێکهاتەی جەستەی ژن و پیاو لێکجودایە

بەڵێ لەگەڵ ئەوەدا کە ژن و پیاو هەردوو ئینسانن و مرۆڤن و، وە هەردوو وەکو یەك خاوەن بەهاو بەحورمەتن، لەهەندێ شتدا پێکهاتەی جەستەیان لێکجودا دەبێتەوەو هەرکامێکیان تایبەتمەندی خۆی هەیە، بۆ نموونە: ژن دەکەوێتە (حەیز)و بێ نوێژییەوە، کەچی پیاو حەیزو بێ نوێژی نییە، ژن دووگیان دەبێ، پیاو دووگیان نابێت، ئەوجا لەگەڵ ئەو بەهاو حورمەتەیان و جیاوازی جەستەییان، ژن کارێکی زۆر گرنگتری پێدەکرێت، کە پیاو ئەوەی لێنایەت، ژن دەتوانێ بێ پەیوەندی نێرومێیی، دووگیان ببێ، بەڵام پیاو –هەرگیز– بێ مێینە وەبەر نایەت، ئەمەیە کە قورئانیش ئاماژەی پێدەکاو دەفەرموێ: ﴿وليس الذكر كالأنثى...﴾ (الإسلام/سعيد حوى). بۆیە خاتوونە (مەریەم)یش، بێ پەیوەندی نێرومێ بە فەرمانی خودا (عیسا) پێغەمبەری لێبوو. تەفسیری (مەنار) دەڵێت: بەلای زاناکانەوە

سەلمێنراوە کە لەهەندێ ئاژەڵدا، هەندێ مێینە هەیە بێ (تەلقیح) و متوربە لەگەڵ نێرەکەیدا، زاوزێ دەکا: (إنه من قيل ما هوَ ثابت إلى اليوم عند العُلماء من التوالد البكرى، وهوَ أن إناث بعض الحيَوانات الدنيا تلد عدة بطون بدون تلقيح من الذكور) تفسير المَنار. ب٧ لاپەڕە ٣٣١ ج٨. (عبدالوهاب نجار) دەڵێت: ٢٩/مایۆی ساڵی ١٩٣٩ز، ڕۆژنامەی (ئەهرام)ی میسری بلأوی کردەوە کە: لە ١٤ی مایۆ، لە نەخۆشخانەی لەدایکبوون، لە شاری (لیما)ی پایتەختی کۆماری (پیرۆ)ی ئەمریکای باشوور، کیژێکی تەمەن (٥) ساڵ، منداڵێکی بەنەشتەرگەری دیت و، تەندروستیشی زۆر باشە! (قصص الأنبياء/ عبدالوهاب النجار) مەبەست لە هێنانی ئەم بۆچوونە جۆراوجۆرانە، نرخاندنی دۆزی ئافرەتانە لەم بوونەوەرەدا ئەوەیە کە: هێندێ شتی سەرسوڕهێنەر لە ژناندا دەبێ، لە پیاواندا دەست نادات، کەوابوو خوای گەورە زۆر ڕاست دەفەرموێ: ﴿وليس الذكر كالأنثى..﴾ جا لەبەر ئەوە کە ئەوگشت نهێنییە لەژناندا هەیە، خوا بە (مەریەم) دەفەرموێ: ﴿إنَ الله اصطفاكِ وطَهَّركِ واصطفاكِ على نساءِ العالمين﴾ ٤٢/٣.

## باوە ( ئادەم ) و دایە ( حەوا )، هەردوو پێکەوە لەدرەختەکەی بەهەشتیان خوارد

ئافرەت لەهەموو خێرو شەڕێکدا، شان بەشانی پیاو بووە، هەردوولا قابیلی ئەنجامدانی کاری چاك و خراپن، خوای میهرەبان هەردوو وەکویەك سەیر دەکا، (ئەمر)و(نەهی)یەکانی بۆ هەردوولایانە، هەردوو پێکەوە دەنێردرێنە (بەهەشت)ەوە، لە بەهەشتدا لە هەردووش ڕێدەگیردرێ بۆ خواردن لە درەختەکە، شەیتان هەردوولا لەخشتە دەبا و دەیانخەڵەتێنێ و، لە بەهەشت دەریان دەپەڕێنێت، هەردوو پێکەوە دادەبەزێنێ بۆسەر زەوی، هەردوو پێکەوە دەپاڕێنەوە لەخوا و پەشیمانی دەردەبڕن و خواش لێیان گیرا دەکات: ﴿وقُلنا يا آدم اسكن أنتَ وزوجكَ الجنة وكلا منها رغدا حيثُ شئتما ولا تقربا هذهِ الشَجَرة فتكونا من الظالمين فَأزلهما الشيطان عنها فأخرجهما ممّا كانا فيه وَ قلنا اهبطوا بعضكم لبعض عدوّ ولكم فى الأرض مستقر ومتاع الى حين. فتلقى آدم من رّبه كلمات فتابَ عليه إنهُ هوَ التواب الرحيم﴾ ٢/٣٥-٣٧. لەسوورەتی (ئەعراف)یشدا لەئایەتی(١١)دا هەمان باس هاتووە، بەلأم بەشێوەو شێوازێکی تر، دیسان هەرلەوێ دەفەرموێ: ﴿قالا ربنا ظلمنا أنفسنا وإن لم تغفرلنا وترحمنا لنكونن من الخاسرين﴾ ئایەتی: ٢٣.

لەسوورەتی (طە)شدا، لەئایەتی (١١٥) وە تا(١٢٣) سەبارەت بەو بەسەرهات و داستانەیە هاتووە، ئەمانە هەموو ئەوە دەگەیەنن کە ژن و پیاو، وەکو یەك بەرپرسن، وەکو یەك قابیلی (خیطاب)و ئاخاوتنن، وەکو یەك (تەکلیف)و ئەرك لە ئەستۆیان دەنرێت، مەگەر شتێك تەنیا

لەپیاودا، یان لە ژناندا تەکلیف هەڵبگرێت، واتە: هێندێ شت هەیە لە پیاواندا دەست دەدات، لە ژناندا نابێت، یان بە پێچەوانەوە. لەگشت ﴿یاأیُها الناس..﴾ و ﴿یاأیُهَا الذین آمنوا..﴾ و ﴿یابنی آدم...﴾ەکانی قورئاندا، ژن و پیاو هاوبەشن، وە هەموو ئەو وشەو رستانەی (بیکە)و (مەیکە)ی قورئان رووی لە هەردووکیانە.

## ژن و پیاو لە ئایدیۆلۆژیادا دەبێ یەك بن

هەر لەسەر بەرژەوەندی (ژن و پیاوە) کاتێ لەئایدۆلۆژیاو بیروباوەڕیان دەدوێ، ئەگەر بیانەوێ ببنە هاوسەروپێکەوە ژن و مێردی بکەن، ئەگەر بیروباوەڕو فیکرەیان لێکجودا بێت، ئەو ژیانە سەقامگیرنابێ و دەوامی نابێت، هەر بۆیە ڕێگە نادات پیاوی موسڵمان ژنی (موشریك) و بێ دین و بێ دیانەت مارە بکات، یان ژنی موسڵمان لەپیاوی (موشریك) و بێ دین وبێ دیانەت مارە بکرێت، بەڵام بۆ خاوەن نامەکان (عیسایی و موسایی) جیاوازییەکی هەیە، بۆیە لەسوورەتی: ٢٢١/٢دا هاتووە: ﴿ولا تنکحوا المُشرکات حتی یُؤمنَّ ولأمة مؤمنة خیر من مشرکة ولو أعجَبَتکم ولا تنکحوا المشرکینَ حتی یؤمنوا ولَعبد مؤمن خیر من مشرك ولو أعجَبَکم أولئكَ یدعونَ الی النار والله یدعو إلی الجَنة والمَغفرة بإذنه ویُبیّن آیاته للناس لعلهم یَتذکرون﴾ واتە: ئەو ژن و پیاوە دەبێ – تەنانەت– لە فیکرەشدا یەك بن، ئەگینە ژیانیان قابیلی تێکچوونە و، قابیلە نەتوانن، دوو مرۆڤی خاوەن فیکرەی لێکجودا، ژیانێکی ئاسوودە بەرنە سەرو، ماناو مەبەستی ژن و مێردی بێتە دی کە خوا ئەفەرموێ: ﴿هوَ الذی خلقکم من نفس واحدة وجَعَلَ منها زوجها لیسکن إلیها...﴾ أعراف/١٨٩. یان دەفەرموێ: ﴿وَمن آیاته أن خلق لکم من أنفسکم أزواجاً لتسکنوا إلیها و جَعَلَ بینکُم مودة وَ رَحمة إن فی ذلك لآیات لقوم یَتفکرون﴾ روم/ ٢١.

## لە بەر ئاسوودەیی ژنانە، هاوکووفیی ڕەچاوکراوە

لەم سۆنگەوە بوو زاناکان –هێندێکیان– پاش باس و لێکۆڵینەوە لە ژیانی ژن و پیاو (مێردوهاوسەر) دەروازەیەکیان لە کتێبەکانیاندا کردەوە بەناوی (باب الکفاءة)ەوە، واتە: ئەو پیاوەی دەیەوێ ببێتە هاوسەری هەر ژنێك، دەبێ لە کۆمەڵێ کاری پەسەندوجوامێریدا هاو کووف و هاوشانی ئەو ژنە بێت، وە خاوەن شان و شەوکەوت بێت، ئافرەتەکە هەست بە کەم و کورتیی باری کۆمەڵایەتی هاوسەرەکەی نەکات، لەناو کۆمەڵگەدا باری کۆمەڵایەتی پێی کەم نەبێتەوە، تا لەپاشەڕۆژو ئاییندەشدا مانا و مەبەستی ژن و مێردی، یان بڵێین ژیانیان باشتر بچەسپێ و، پڕ لەخۆشیی و دلۆڤانی بێت، ئەم خاڵەش، واتە: ڕەچاوکردنی

مرۆڤێکی شیاوو خاوەن سومعە بۆ ئافرەتەکە پتر لەبەرژەوەندی ژناندایە، ئەگەرچی بە گشتیی لە خزمەتی خێزانەکەدایە.

بێ شك ژیان لەگەڵ هاوسەرێکی ئاوادا، پتر مایەی ئاسوودەیی و، مانەوەو درێژەدانە بەژیانی کامەرانیی و، بە دەگمەن بیر لە تەلاّق و جیابوونەوە دەکرێت، پێچەوانەی ئەمەش کە: پیاوەکە لە هێندێ لە(فەزائیل)دا لە ژنەکە کەمتر بێت، دەگونجێت ئەو ژنە کەمتر گوێڕایەڵ بێت، کەمتر ڕووخۆش و دلۆڤان بێت لەگەڵ مێردەکەیدا، هەمیشە هەست بە کەمیی و بچووکیی و ناتەواوی مێردەکەی دەکات، ئەوساش خێزان لەو حاڵەتەدا تێکدەچێ و، منداڵ وێڵ و سەرگەردان دەبێ و، واوەیلاش بۆ ئاییندەی هەردوو لایانە (الإسلام عقیدة و شریعة/ شیخ محمود شلتوت) (ئیشەڵلاّ لە جێگەی خۆیدا، پڕتر باسی (کەفائە) و هاوشانیی کچ و کوڕ دەکەین).

## ژنان و حەیزو بێنوێژیی

لەبەشی (١٥)ی (تەورات)دا هاتووە کە: (یەهوود)ەکان، لەحاڵەتی (حەیز) و بێ نوێژی ژناندا بە ڕیسواو کەم نرخیان دادەنێن، بەشێوەیەك کە: هەرکەسێك دەستی بەردەستی ئافرەتی حەیزدار کەوتبا بەپیس دادەنرا، هەرکەسێ دەستی بەر شوێن و جل وبەرگی کەوتبا، دەبوو بیشۆرێ و حەمام بکات، هەر ڕایەخ و نوێنێك ئەوی لەسەر دانیشتبا پیس دەبوو... هتد. جاهیلیەت و سەردەمی نەفامیش لەگەڵ ژنی حەیزداردا، دانەدەنیشتن، نان و ئاویان لەگەڵ نەدەخوارد! لەگەڵ ئەوەیشدا گەلێ جار سنوور شکێنی دەکراو لە حاڵەتی بێ نوێژییەکەیدا، لەگەڵیا جووت دەبوون و کاری ژن و مێردییان لەگەڵ دەکرد! بەوهۆیەوە –بێ شك ئافرەتەکە– توشی ئازارو بێزاری دەروونیی وجەستەیی دەبوو، چونکە وەکو یاسای پزیشکی دەڵێ: لە حاڵەتی ئاوادا ئەندامی (تەناسول)ی ژنان ئامادەیی بۆ دروستبوون نییەو، لەوانەیشە هەردوولا تووشی هێندی نەخۆشی و حاڵەتی نائاسایی بن، جا بۆ ڕاستکردنەوەی ئەوحاڵەت و بارە هەڵەیە، خوای بەبەزەیی و لەکارزان فەرمووی: ﴿وَیسئلونكَ عن المحیض قل هوَ أذی فاعتزلوا النساء فی المَحیض ولا تقربوهُنَ حتی یطهرن، فإذا تطهرن فأتوهن من حیث أمرکم الله، إنَ الله یحب التوابینَ ویُحبُ المتطهرین، نساؤکم حرثٌ لکم فأتوا حرثکم أنی شئتم و قدموا لأنفسکم واتقوا الله واعلموا أنکم ملاقوه وبشر المؤمنین﴾ ٢/٢٢٢–٢٢٣. واتە: لەبارەی عوزرو حەیزی ژنانەوە پرسیارت لێدەکەن ئەی پێغەمبەر! تۆش بڵێ: ئەوە ئازارو بێزارێکە تووشی ژنان دەبێ، وە لەو چەند ڕۆژانەدا کە خوێنیان هەیە، ئێوە

سەرجێیان لەگەڵ مەكەن، جاهەركە پاكیش بوونەوە، دەبێ لە جێی ڕێ پێدراوەوە —لەلایەن خواوە — كاریان لەگەڵ بكەن، خوا ئەوكەسانەی خۆش دەوێ لە گوناح پەشیمان دەبنەوە و، حەزیان لە پاك و خاوێنیە. ژنان جێگەی سەوز كردن و وەبەرهێنانن، دەسا ئێوەش لە جێی سەوز كردن و وەبەرهێنانەوە — بەهەر جۆرێ حەزی لێدەكەن — سەرجێیان لەگەڵ بكەن. ئیسلامی پیرۆز ئافرەتی بە (ئینسان) داناوە و، هەر بە ئینسانیش تەماشای دەكا و، دەبێ بە ئینسانانەش مامەڵەی لەگەڵ بكرێت، لە هەموو ڕوویەكەوە، وە بەدەر لە مەسەلەی تێركردنی ئارەزوو، جێبەجێ كردنی كاری سێكسی، بەدیهێنانی زاڕۆو نەوەی دواڕۆژیشە، وە مایەی بەرهێنانی سەدان و هەزاران و ملیۆنان پیاوی تەنگانەو دواڕۆژیشە، فەیلەسووف و حەكیم و دانا و زانا و، پشكێنەری ئاسمان و فەزاو، زەویی و، ژێر زەویی و، دەریاو ژێر دەریاكانە، جگە لەخاڵێكی هەرە گرنگتر كەئاوەدانكردنەوەی ئەم زەوییەیە... جائەگەر ئەو كاری ژن و مێردیە لە جێی سەوزكردن و ڕواندنەوە نەبێ، بێگومان زارۆو نەوە سەوز نابێ و، دنیاو بوونەوەر بە وێرانی دەمێننەوەو كەسێك نابێ ئەو ئەركە مەزن و گەورەیە جێبەجێ بكات.

بەڵێ بۆ حورمەت و ڕێزی خانمەكانە كە: بە هیچ شێوەیەك لە جێی خۆیەوە نەبێت، بە پیاو ڕێ نەدراوە كاری سێكسیی لە گەڵیا ئەنجام بدات، چونكە ئەگەر لە جێگەی پەسەندی خۆیەوە نەبێت، ئافرەتەكە تووشی ئێش و ئازار و سووكایەتی دەروونی دەبێ و، بە ئەندازەی ئەوەش كە پیاو لەزەت و خۆشی دەست دەكەوێ، ئەو لەزەت نابات و خۆشی نابینێ، سەرەڕای ئەوانەش، كاری وا بە كاری ((الشذوذ الجنسية)) دادەنرێ وتۆڵەی خوایی ویاسایی خۆی هەیە.

## بێحورمەتی كەناڵە سێكسیە بازرگانیەكان بەرامبەر بە ژنان

لـەم بارەیـەوە چـەند كـەناڵێكی ئێجگـار قێـزەون و ناشـیرین و سـووكایەتیكەر بەشـان وشـكۆمەندیی ئافرەتـان لـە كەناڵـە ئاسمانییەكانـدا دانـراوە، كـە بەراسـتی ئەگـەر بـۆ بـاس و بەیان نەبێت، هەر گێرانەوەیشی ناڕەوایە و، بێ ڕێزیە بە كەرامـەتی ئافرەتـان، لـەو كەناڵانـەدا لەبەرامبەر لەش فرۆشیەوە هەرچی شێوەی دزێـوو ناشـیرینی سێكسیە، لەگەڵ ئـەو ژنـە بـێ خانـە و، بێكـەس و بـێ دەرامەتانـەدا دەیكـەن، كـە بـێ شـك خانمـەكان تـەنها سـووكایەتیی و لەشفرۆشییەكەیان پێدەبڕێت! ئاخۆ كاری وا، مایەی حورمەت و ڕێز بێت بۆ ژنان؟ كە تـەنها ژنێـك چـوار لاوی هــەتیوی كـوڵاَن و بــێ ئــەخلاقیان تێبــەرداوەو هەریەكــەیان بــە جــۆرێ خەریكیـەتی و ئـارەزووی گـڵاوی خـۆی پـێ تێـر دەكـا: یـەكێ لـە ڕێگـەی پێشەوە، یـەكێ لـە

جێگەی فڕێدانی پاشەڕۆکەوە (کاری لەواتە)، دووکەسیش بە نۆرە هەریەکەیان ئامێری خۆی دەخاتــە دەم و قــوڕگی ئەوژنــە لەشفرۆشــەوە، دەبــێ بیمــژێت، هێنــدێ جــاریش دەبــێ (مەنیە)کەیان – کەدەگەنە حاڵەتی خۆشیی و تووڕی دەدەن- بخوات..!! دەئاخۆ کاری وا، چ ڕێزو حورمەتێکی تێدایە بۆ ژنان؟! خانمەکان چۆن ڕێ بە هەتیو و مەتیو دەدەن کە بەوشێوە بێ حورمەتییان لەگەڵ بکرێ؟ ئینجا کۆمپانیا سێکسبازەکانیش لە کەناڵەکانەوە بازرگانی پێوەبکــەن؟!. ســەد تــوف لەپێــشکەوتن و ئــازادی و بــێ پــەردەیی ئــاوا، ســەد تــوف لــەو کۆمپانیانەش بازاڕی خۆیان بە جەستەو لەشی ناسکی ژنان گەرم دەکەن، تۆ بڵێیت ڕۆژێ نەیەت کە ژنان بیر لەو سووکایەتیی و بێ حورمەتییە بکەنەوەو بگەڕێنەوە بۆ ئینسانییەت و ڕوشدی خۆیان وهەزار نەحلەت و نەفرینیش بنێرن بۆ دیموکراسی خوازانی سەدەی بیست ویەك؟ سەدەی شکاندنی ڕێزو حورمەتی ژنان؟.

## چەند خوویەکی نالەباری جاهیلیەت بەرامبەر بە ژنان وچارەسەریان لە ئیسلامدا

یەکەم- گەلێ پیاو -بۆ ئازارو بێزاری ژنانی هاوسەریان- سوێندیان دەخوارد کە: ژن و مێردیی و تێکەڵی هاوسەرەکانیان نەکەن، بێگومان ئەو کارە -بە خەیاڵی خۆیان- بۆ تۆڵە و ئازاردانی دڵ ودەروونی ژنەکانیان بووا!، دیارە ئەوانیش بەوە تووشی سووکایەتیی و بێ بەهایی دەروونی ناو کۆمەڵگە دەبوون، ئەگەرچی مێردەکەش بەناچاری گەیشتبێتە ئەو حاڵەتەو، وەکو چارەسەرێك بۆلاساری ژنەکەی دانابێت، جا بۆئەوەی ئەو حاڵەتە نائاساییە زۆر نەخایەنێ و، کاروباری خێزانەکە ئاسایی ببێتەوە، دەبێ پیاوەکە یان سوێندەکەی بشکێنێ و، دەست بکەنەوە بەکارو باری ئاسایی ژن و مێردی خۆیان – وەکو جاران-، یان دەبێ لێك جیاببنەوە، جا بۆئەوە کە ئەو هەڵەیە ڕاست بکرێتەوەو، ئەو زوڵم و ناهەقیە لە ژنان نەکرێت، قورئانی پیرۆز هات و فەرمووی: ﴿للذين يؤلون من نسائهم تربص أربعة أشهر فإن فاءُوا فإن الله غفور رحيم * وإن عزموا الطلاق فإن الله سميع عليم﴾ ٢/٢٢٦-٢٢٧. واتە: ئەوانە سوێند دەخۆن کە لەگەڵ هاوسەرەکانیان نەنوون و سەرجێیی نەکەن، چوار مانگ چاوەنۆڕدەبن، (واتە: نابێ پتر لەچوار مانگ کار بە سوێندەکەی بکات) جا ئەگەر لەو ماوەیەدا گەڕایەوە لایان و هەراو کێشەیان نەما، ئەوا خوا گوناح بەخش و میهرەبانە. خۆ ئەر بڕیاری تەڵاقیان داو، نەگەڕانەوە بۆ کاری ئاسایی خۆیان، ئەوسا خوا دەبیسێ و بەئاگایشە.

بەڵێ... ڕاگرتنی هەست و نەستی دەروونیی ژنان – لە هەموو ڕوویەکەوە – تەنانەتی حاڵەتی پێکەوە نووستن و سەر جێییش، کارێکی گرنگ و پێویستە لەدینی ئیسلامدا، دەبێ

وەلأمی داخوازییە دەروونیی و نەفسییەکانی ژنان بدرێتەوە، دەبیٚ ئەو پیاوە لەکاری سەرجێییشدا ناهەقیی لەگەڵ نەکات، تا ئەویش بیر لەشتی تر نەکاتەوە بۆ تێرکردنی ئارەزووە جەستەییەکانی خۆی. قورئانی پیرۆز چوار مانگ مۆڵەت دیاری دەکات بۆ پیاوان، ئەگەر نێوانیان نائاسایی بوو، ئەگەرچی سروشتی ئادەمزاد لێك جیاوازە، لەوانەیە ژنی وا هەبیٚ، نەتوانیٚ ئەوەندەش چاوەڕوانی بکات، بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا قورئانی پیرۆز، سنووری بۆ دیاری کردووە و چوار مانگی بۆ داناوە. (عومەری کوڕی خەتتاب/رەزای خوای لەسەر بێت): شەوێك دەردەچیٚ بۆ چاودێری عەدالەت و ناعەدالەتی ناو کۆمەڵگەکەی (مەدینە)، تا بەچاوی خۆی باری ئاسایی و نائاسایی ناوچەکە ببینیٚ و، کاریان بۆ ئاسان بکات، جا لەو گەڕانەیدا بوو گوێی لە ژنێکەوە بوو دەیگوت:

تَطاوَل هذا الليلُ واسودّ جانبُهْ * وأرَّقـني أن لا خـليل ألاعبُـهْ
فَـواللهِ، لَـوْلا اللهُ أنـي أُراقِـبُـهْ * لَحُرّكَ من هذا السرير جوانِبُهْ

واتە: شەو هەر درێژەی کێشاو نەبڕایەوەو تاریکە، منیش لەبەر ئەوە کە خۆشەویستێك نییە یاری لەگەڵ بکەم، خەو لەچاوم تۆراوە، سوێندبیٚ بەخوا، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت، خوا چاودێرمە، ئەم تەخت و رایەخەم دەگۆڕیی و، بەتەنها نەدەخەوتم، ئینجا عومەری پێشەوا (حەفصە) خانی کچی خۆی بانگ کردو گوتی: بەپێی تەبیعەت وسروشت، ژنان چەندە دەتوانن لە مێردەکانیان دووربن، یان پێکەوە نەنوون؟ ئەویش گوتی: (٤-٦) مانگ، ئەوسا عومەر گوتی: ئیتر نابیٚ هیچ سەربازێك، پتر لەوە لەبەرەی جەنگدا بمێنێتەوە. (دەبیٚ حاڵی ئەو ئافرەتانە چۆن بێت، کە مێردەکانیان بەناوی هەندەرانەوە چەندین ساڵ و مانگ بەجێیان دەهێڵن و، بیٚ سەرپەرست وچاودێر وێڵیان دەکەن...؟) لەوانەشە ئەو لەویٚ کاری سێکسیی خۆی ئەنجام بداو، بەیناو بەینیش شین و گریان لە میدیاکانەوە بۆ ژنان بکاو گلەییش لە ئیسلام بکاو بڵیٚ: دینی ئیسلام ستەمی لە ژنان کردووە!.

ڕای تەفسیرزانەکان وەکو (ئیبن جەریرو، ئیبن کەسیر) وایە کە: ئەو کابرا سوێند خۆرە تەنهاچوارمانگ مۆڵەت دەدریٚ، پاشان ئەگەر باروو دۆخەکەی ئاسایی کردەوە، ئەوە باشە ئەگینە دەبیٚ تەڵاقی بدا، خۆئەگەر وتی: تەلأقی نادەم، (دادوەر) بەزۆر پێی تەلاق دەدا.

بۆ دوایی (ئیبن کەسیر) دەڵێت: (وهوَ مروى عن عمر، وعثمان، وعلى، وأبى الدرداء، وعائشة أم المؤمـنين، وابن عمر، وابن عباس، وَبهِ يقول سعيد بن المسيب، وعمر بن عبدالعزيز، ومُجاهد، وطاووس، ومحمد بن كعب، وقاسم وهوَ مذهب مالك، والشافعي، وأحمد بن حنبل، وأصحابهم -رحمهم الله- وهوَ إختيار ابن جرير أيضاً. وهوَ قول الليث بن سعيد، وإسحاق بن

راهویه، وأبی عبید ثور، وداود، وکل هؤلاء قالوا: إن لم یفیء ألزم بالطلاق، فإن لم یطلق، طلَقَ علیه الحاکم، والطلقة تکون رجعیة، له رجعتها فی العدة). ئیبن کەسیر، فی ظلال القرآن.

باشە! ئەگەر ئەمە گرنگیی و بایەخدان بە ژنان نەبیٚ؟ دەبیٚ چی بەبایەخ دابنریٚ؟ ئەی ئەمە ماف نیە، کە ئەگەر وەکو پیٚویست پیاوەکە نەیتوانی ئارەزووی سیٚکسیی ژنەکەی تیٚر بکات، دادگا لیٚی دەسیٚنیٚتەوەو، پیٚی تەلاٚق دەدات؟ ئەگەر خۆی داوای جیابوونەوەی کرد. (بەپشتیوانی خوا ئەم باسی تەلاٚق و لیٚکجوداکردنەوەی ژن و پیاوە لە جیٚگەی خۆیدا، پتر ڕوون دەکەینەوە، ئیتر تا ئەویٚ خواتان لەگەلٚ.

<u>دووەم</u> – لەبەر گرنگیدان بە کاروباری ژنان و، بۆ ئەوە کە ژنان زۆر دوانەکەون بۆ شووکردنەوە، – پاش ئەوە ژن و پیاو پیٚکەوە نەژیان و تەلاٚق کەوتە نیٚوانیان و جیابوونەوە – قورئان یاسای ماوەی چاوەڕوانیی و عیددەی بۆ بڕیارداون، ئەوسا دەتوانن بچن میٚردی تر بکەن، ئەوەش بۆ ئەوەیە دەرکەویٚ ئاخۆ ئەوماوە کە لەگەلٚ میٚردا بووە، دووگیان بووە یانا؟ تاڕەگەزو ڕشتەی ئادەمزاد تیٚکنەچیٚ و، مندالٚو (نەسل)ی میٚردە کۆنەکەی، بەمندالٚی شووە تازەکەی تیٚکەلٚ نەبیٚت، کە خۆشەویستی خیٚزان و بنەمالٚە لەوەوە سەرچاوە دەگریٚو، هەموو کەس بەوە بنەچەو ڕەچەلٚەکی خۆی دەناسیٚتەوە، لەولایشەوە لەو سەردەمەدا ژنان گیریان کردبوو بەدەست خزم و کەس و کاری میٚردەکەیانەوە، بە هەموو جۆریٚك ڕیٚیان لیٚدەگرتن بۆ میٚردکردنەوەیەکی نویٚ، ئەوجا ئەم ئایەتە هات و دای بەگوییاندا کە پاش چاوەڕوانی سیٚ (قورء – حەیز، یان پاکی) هیچ کەسیٚك بۆی نیە ریٚ لە ژنان بگریٚت، میٚرد بکەنەوە، بۆیە دەفەرمویٚ: ﴿والمُطلقات یتربصن بأنفُسهنَ ثلاثة قروء ولا یحل لهُنَ أن یکتمن ما خَلَق الله فی أرحامهن إن کُن یؤمن بالله والیوم الآخر وبعولتهن أحقُ بردهن فی ذلك إن أرادوا إصلاحا، ولهن مثل الذی علیهن بالمعروف، وللرجال علیهن درجة، والله عزیز حکیم﴾ ٢٢٨/٢. واتە: ژنانی تەلاٚق دراوی سەرجیٚیی لەگەلٚ کراو، هەتا سیٚ جار لە حەیزو بیٚ نویٚژی پاك دەبنەوە، دەبیٚ چاوەنۆڕبن – جا پاش ئەوە، ئەر ویستیان شوبکەنەوە دەتوانن، ئەر بڕوایان بەخواو، بە ڕۆژی سەلاٚوبەریٚ هەیە دەبیٚ ئاوا بکەن، ئەوساش هەرچی لە سکیاندایە، بۆیان ڕەوانیە بیشارنەوە –لەبەر هەر بەرژەوەندیەکی خۆیان – واتە: ئەر لە حەیز دابوون، یان دووگیانبوون، دەبیٚ ڕاستیەکەی بلٚیٚن، جائەگەر لەو ماوەی عیددەدا پیاوەکە بەنیازی ئیسلاٚح و، بەنیەتی پاکەوە ویستی ئەو ژنە بگیٚڕیٚتەوە ژیٚر ڕکیٚفی خۆی بۆ پیٚکەوە ژیان، دیارە ئەوپیاوە شیاوترو ماف لەبەرترە بۆ ئەو کارەو، ژنەکەش هەقیەتی – ئەر ڕیٚگری نەبوو – بچیٚتەوە لایی و دریٚژە بەژیانی ئاسایی خۆیان بدەن، هەتا بچیٚ میٚردیٚکی تازە بدۆزیٚتەوە، بیٚ ئەوەی بیناسیٚ خۆی تەسلیمی بکات.

هەرچۆن پیاوان مافیان بەسەر ژنانەوە هەیە، هەر ئاواش ژنان مافیان بەسەر پیاوانەوە هەیە. (ئیمامی ئیبن كەسیر) دەڵێ: (أی لهُنَ علی الرجال من الحق، مثل ماللرجال علیهن) دەبێ هەریەك لەوان ماڤ ئەویتریان بە جوامێرانە بداو، ناهەقیی و ستەمی لێ نەكات. (جابر.خ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە بەشێ لە وتارەكەی ڕۆژی حەجی ماڵئاواییەكەیدا فەرمووی: ((فاتقوا الله فی النساء، فإنكم أخذتموهن بأمانة الله، واستحللتم فروجهن بكلمة الله، وَلَكم علیهنَ أن لا یوطئنَ فرشكم أحداً تكرهونه، فإن فعلن ذلكَ فاضربوهنَ ضرباً غَیر مبرج، ولهنَ رزقهن وكسوتهن بالمعروف)) مسلم / كتاب الحج. واته: سەبارەت بەكاروباری ژنان و هەق ومافیان، دەبێ لەخوابترسن، چونكە ئەمانەت و سپاردەی خوان لای ئێوە، بە بڕیاری خوا حەلاڵ بوون بۆتان، هەقە هەردوولا دڵی یەكتر ڕاگرن، شتێ نەكەن ببێتە ڕەنجە دڵی ئەوی ترتان، بەتایبەتی ئێوە – ئەی ژنان! – دەبێ ڕێ بە كەسێك نەدەن بێتە ماڵەكانتان، یان قسە لەگەڵ كەسێ بكەن مێردەكەتان حەزی پێنەكات، تەنانەتی، ئەرچی خزم وكەس و كاریشتان بن، چونكە (مەسكەن) و خانەو لانەی هەموو كەسێك حورمەت و ڕێزی خۆی هەیە، دەبێ خاوەنەكەی ڕازی بێ، ئەوسا كەسێك دەتوانێ تێی بچێت، ئەر ژنان سەرپێچیان – لەوكارەدا – كردو، پیاوی نەیارو ناحەزیان هێنایە ماڵی پیاوەكانیان، پیاوان بۆیان هەیە – بۆ ڕاستكردنەوەی ئەو هەڵەیە – سووكە لێدانێكیان بكەن، واته: ئەو لێدانە بە شێوەیەك بێت هێمای ناڕەزایی و بێزاری ئەو كارەی پێوەی دیار بێت، پێغەمبەر ﷺ ئەر لەگەڵ ژنەكانیدا گەیشتبێتە ئەو حاڵەت وقۆناغە، بە (سیواك) سووكە لێدانێكی كردوون! ئەوسا دەبێ پیاوانیش بەپێی یاساو عورف پەسەندی سەردەم، ژنەكانیان بژێنن، خانووبەرەو، خواردن و خۆراك و جل و بەرگ و كاڵای شیاویان بۆ بكەن. (ئیبن عەباس) دەڵێت: لەبەرئەوە كە خوا دەفەرمووێ: ﴿وَلَهنَ مثل الذي علیهن بالمعروف﴾ هەقە پیاوانیش وەكو ژنان، خۆ جوان بكەن و، قژی سەریان پاك و پوختە ڕابگرن و، شانەی بكەن و، ڕۆنی بكەن و، سەرچاك بكەن و بەرسمێڵ بكەن و، بن باخەڵ و هەر جێگایەكی تریان پاك و خاوێن ڕابگرن و، ئەگەر پێویستی كرد بیتاشن و لای بەن، چونكە وەكو پیاوەكە حەزی لە جوانیی و، پاك و تەمیزی ژنەكەیە، ژنەكەش هەروا حەزی لە جوانیی و پاك و تەمیزی پیاوەكەیەتی، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە پیاوی پیس و پۆخڵ و قژتێكچوو تووڕە دەبوو، فەرمانی دەدا بیبەن پاك و تەمیزی بكەن (تفسیر الطبری). وە لە مەسەلەی ئارەزوو و كاری (سێكس)یشدا دەبێ هەردوولا هەوڵ بدەن خۆ بۆیەكتر بڕازێننەوەو خۆئامادە بكەن بە هەرشێوەیەك ئارەزویان دەوروژێنێ، تەنانەت ئەگەر پێویستی بە (حەب و دەرمان) هەبوو، دەبێ پەیدای بكەن و بەكاری بێنن، تا ئارەزووی یەكتر تێر دەكەن.

**<u>سێیەم</u> – پاش ئەوە کە ماف ژن و پیاوی– وەکو یەك – چەسپاندو ڕایگەیاند کە پیاوان هەر مافێکیان بەسەر ژنانەوە هەبێت، بێگومان مافێکی ژنانیش بەسەر ئەوانەوە هەیە، ئەو مافانەش بەپێی ڕۆژگار دەگۆڕدرێن، زیادوکەم دەکەن، هەروەك بەپێی ناوچەو وڵات دەگۆڕدرێن، جا لەدیاریکردنی ئەو مافانەدا –بۆیەکتر– (عورف) و باوونەریتی هەر وڵاتەو ناوچە بۆ خۆی بڕیاردەدا، بەمەرجێ حەڵاڵ حەرام نەکاو، حەرام حەڵاڵ نەکات، بەڵام هەندێ لە (فوقەها)کانی ئیسلام، ئەوەندە پێ لەسەر ماف ژنان دادەگرن – لە عورفیش دەچنەدەر – دەڵێن: ژنان بەدەر لەسەرجێیی، کارێکی تریان بۆ پیاوان، وەکو ئیش و کاری ناوماڵ – بەهەموو جۆرەکانیەوە – لەسەر نیە، بەڵکو پیاو سەرەڕای ئیش و کارەکانی دەرەوەی ناوماڵ و نان و نەفەقە پەیداکردنیش، دەبێ خەمی ئیشەکانی ناو ماڵیش بخوات! دیارە ئەم تەقسیم بەندییە جۆرە ناعەدالەتیەکی پێوە دیارە، ناهەقیی و جۆرە ستەمێکی لێ بەدیدەکرێت، بەرامبەر بە دانانی ئەرك بۆ پیاو، لەولایشەوە ژن دەکەنە پارچە گۆشتێکی ئیفلیج و بێ ڕۆح، دەبێ لەم جێ بۆ ئەو جێ بگوێزرێتەوەو، نان و ئاو بکرێت بە قوڕگیاو، تەنانەت منداڵەکانیش بەخێونەکات، کەچی پیاو دەبێ نان و ئاوو خانووبەرەو ئیشەکانی ناوماڵیش بکات!. بەڵام بڕێ لە زاناکان وەکو (ئەبوبەکری ئیبن ئەبوو شەیبە، جورجانی) دەڵێن: ژنانیش ئیش و کاری ناوماڵیان لەسەرە، هەروەکو ئیش و کاری دەرەوەی ماڵ لەسەر پیاوانە، بەڵگەشیان بڕیارەکەی پێغەمبەرە ﷺ لە نێوان (عەلی و فاطمە)دا بڕیاریدا کە: فاتمەی کچی ئیشەکانی ناوماڵ لە ئەستۆ بگرێ و، (عەلی)یش ئیشەکانی دەرەوەی ماڵ.**

**تەفسیری (مەنار) دەڵێ: ئەم بڕیارە پیرۆزترین و جوانترین بڕیارە بۆ ژن و پیاو، (فیطرەت) و سروشتی هەردوولاش ئەوە هەڵدەگرێت، دابەشکردنی ئیش وکارەکانی ژیان لە نێوان ژن و پیاودا بەوشێوەیە، هاوکاری و هاریکاری یەکتریش لەکاتی پێویستدا، پڕە لە مانای خۆشەویستیی و، ڕاگرتنی سۆزو دلۆڤانی و پێکەوە ژیان، جا پاش ئەوە کە قورئانی پیرۆز، ماف بۆ ژن و پیاو –وەکو یەك– دانا، دەفەرمووێ: پیاوان – زیاد لەوە هەیانە – پلەیەکیشیان بەسەر ژناندا هەیە، ئەم پلەیەش کە قورئان دەیفەرموێ: ﴿وللرجال علیهن درجة﴾ دیارە بۆ تەفسیری ئەو دەرەجەیە نە فەرموودەیەك هەیە و، نەهاوەڵانیش تەفسیریان کردۆتەوە، بۆیە –پاش ئەوان– ڕاڤەکەرانی قورئان، هەریەکە بۆ خۆیی و بە بۆچوونی خۆی تەفسیری کردووە، ئەگەرچی زۆرینەشیان دەڵێن: مەبەست بەو دەرەجەیە– کە پیاوان بە سەر ژناندا هەیانە– قەووامە و سەرپەرشتی کردنی کاروباری ژنانە، لەگەڵ (ویلایە)ی گشتیی و هێندێ کاروباری تر، جا من لێرەدا نامەوێ درێژە بەو مەسەلەیە بدەم، چونکە إن شاء الله لەجێی خۆیدا لێیدەکۆڵینەوە..**

چوارەم– لەسەردەمی كۆندا – بەر لەئیسلام و، لە سەرەتای ئیسلامیشدا– ژنان بەدەست پیاوەكانیانەوە بەگیر هاتبوون و، وەك ئامێرێكی یاریی هەمیشە یارییان پێدەكردن، پیاوی وا هەبوو – سەدجار ژنەكەی تەلاق دەداو، دەیهێنایەوە لای خۆی – بەرلەوە عیددەی تەواوبێت– هەتا جارێ پیاوێكی (ئەنصاریی) بە خێزانەكەی خۆی وت: سوێند بە خوا، نەلای خۆم ڕات دەگرم، نەتەلاقیشت دەدەم، ژنەكە گوتی چۆن؟ گوتی: تەلاقت دەدەم، جا كە عیددەت نزیك بوویەوە، دەتهێنمەوە، هەرئاوا، ژنەكەش چووەلای پێغەمبەر ﷺ سكالای كرد، ئەوسا – بۆ بەرگری لە ماڧ ئەوژنانە و، بۆ ڕاگرتنی حورمەت و ڕێزیان، ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: ﴿الطلاق مرتان فإمساك بمعروف أو تسريح بإحسان...﴾ /٢٢٩، واتە: تەلاقی ژن دوو كەڕەتە (هەردووجار پیاو دەتوانێ تەلاق بداو، بەرلە تەواوبوونی عیددە بیگێڕێتەوە لای خۆی). ئەوسا یان بە پیاوانەو جوامێرانە ڕاگیردرێ و، مامەڵەی هاوسەرێتی لەگەڵ دەكرێت، یان بەخۆشی و بێ هەراو كێشە، یەكجاری تەلاقی بدا، با بۆ خۆی ئازاد بێت، چی دەكات بیكات.

دیاریكردنی سنووری ئاوا بۆ تەلاق، بۆئەوەیە گاڵتەو لاقرتی بەچارەنووسی ژنان نەكرێت، لەولایشەوە ئەو دووجارە مۆڵەتێكە بۆ ژن و پیاوەكە، بەڵكو بەخۆدا بچنەوەو هەڵەكانیان چارەسەر بكەن و، سەر لەنوێ تێهەڵبچنەوەو، دیوارێكی پۆڵایین بۆ ژیانی تازەیان پێك بهێنن، خۆ ئەگەر بەم دووجارەش تەمێخوارنەبوون و، هەمدیسان بۆ جاری سێیەم تەلاقیدا، ئیتر ناتوانێ بیگێڕێتەوە بۆ ژێر نیكاح و مارەیی خۆی و بیكاتەوە بەهاوسەری خۆی، مەگەر ئەو ژنە مێردێكی تازە بكا، ئینجا مێردە تازەكەی بەئارەزووی خۆی یان تەلاقی بدات، یان بۆ خۆی بمرێ، ئەوسا لە حاڵەتی ئاوادا، بۆ جارێكی تر – ئەر شووی پێبكاتەوە – مارە دەكرێتەوەو، مارەیی تری بۆ دادەنرێت. واتە: ئەم دوو تەلاقە – یەك لەدوای یەك – ئەر نەبووە مایەی ژیر بوونی ژن وپیاوەكە، بەڵكو هەر درێژەیان بەناكۆكیی و، كێشەكانیان دا، دیارە كە ئیتر نێوانیان بۆگەنی كردووەو، بۆ ژیانی ژن ومێردی ناشێت و، چارەسەریان هەرتەلاقی سێیەمە، لەگەڵ ئەوەیشدا دینی ئیسلام زۆر توڕەو دژە لە تەلاقدان و ڕووخاندنی دیواری خێزان و هاوسەرێتی، بەلام وەكو دەڵێن (آخرُ الدواء الكيُّ) چارناچارە.

جا لەحاڵەتی ئاوادا – واتە: پیاوەكە، خۆی هۆی ئاژاوەو تێكدانی ژیانی ژنەكە بێت – نابێ ئەو مارەیی و نەفەقەو سەرف و خەرجە بۆ ژنەكەی كردووە – لەماوەی پێكەوە ژیانیاندا – لێی بسێنێتەوە، یان بچێت پارەو پولێكی زۆری پێوە ببەستێ و (تەعلیق)ی بكات، چونكە ژنەكە تاوانێكی نییە، لەولایشەوە مێردەكە بە ناهەق ئازاری دەداو، تەلاقی

دەدات، خۆئەگەر ڕێیش بدرێ هەرمارەیی و شتێکی بۆ کردبێت لێی وەرگرێتەوە، بێگومان کاری وا ناڕەواو ناپەسەندە، ئەمەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ولايحلُّ لكم أن تأخذوا مما آتيتموهن شيئاً إلا أن يخافا ألا يُقيما حدود الله..﴾ واتە: هەر شتێکتان پێدابن، ڕەوانیە لێیان وەرگرنەوە، مەگەر ژن و پیاوەکە ترسیان هەبێ لەوە کە نەتوانن سنووری فەرمانەکانی خوا بپارێزن و، ئەم هەراو ناکۆکیەش لە ژنەکەوە سەرچاوەی گرتبێت، وای لێهاتبێ کە نەتوانێ یاساو قانوونی خۆشەویستی ژن و مێردیی ڕابگرێت، ئەگەر لەگەڵ ئەو پیاوەیدا بێت، ڕۆژانە هەرا و شەڕیانەو، سنوورەکانی خوا کەدایناون لە نێوان ژن ومێرددا – دەبەزێنێت و گوناهبار دەبێ، ئەوسا – ئەگەر وابوو – دەتوانێ داوای تەڵاق بکاو، لەبەرامبەر تێکدانی قەڵای ژیانی مێردەکەیەوە، (تەعوین)ی بداو قەرەبووی بۆ بکاتەوە، واتە: دەتوانێ هەرچی مارەیی و سەرف و خەرجێکی بۆ کرابێ –لەلایەن مێردەوە– لەبەرامبەر تەڵاقەکەوە بیگێڕێتەوە بۆ پیاوەکەیی و، خۆی لەو ململانێیە ڕزگار بکات، هەتا پتر – بەهۆی مانەوەیەوە لای مێردەکەی – تووشی تاوان و گوناح نەبێت لای خودا، مێردەکەشی هەرچی پێوەببەسێت –لەوحاڵەتەدا– بۆی حەڵاڵە، چونکە تاوان تاوانی ژنەکەیەو، بەڕەزامەندی خۆیشی دەیداتێ، ئەمەیە کە قورئان فەرمووی: ﴿فإن خفتم ألا يقيما حدودالله...﴾ ئەر ترستان هەبوو ئەی موسڵمانان! ئەی کاربەدەستان! کەهەردوو –لەم کاتەدا کەتاوان، تاوانی ژنەکەیە –سنوری خوا ناپارێزن و، گوێ بە یاساو حیکمەتی ژن و مێردی نادەن، کورد واتەنی: ئەو دەڵێ سیرو، ئەم دەڵێ پیاز! ﴿فلا جناح عليهما فيما افتدت به...﴾ هیچ گوناحێکیان ناگات، ژنەکە (تەعوین) و قەرەبووی تەڵاقەکە بدات بە پیاوەکە، پیاوەکەش گوناحی ناگات وەری بگرێت ﴿تلك حدودالله فلا تعتدوها ومن يتعد حدود الله فأولئك هم الظالمون﴾ واتە: ئەمانە سنوورو فەرمانی خوان، دەسا ئێوەش – ئەی ژن وپیاو! – سنوورەکانی خوا مەبەزێنن، دڵنیابن ئەو کەسانە لە سنوورەکانی خوا دەردەچن، ستەمکارو ناهەقیکارن و خواش تۆڵەیان دەدات.

پێشەوا (مالیك) خوا لێی ڕازی بێت لە کتێبی (الموطأ) دا دەڵێت: (حەبیبەی کچی سەهل)، خێزانی (سابتی کوڕی قەیس) لەگەڵ (سابت)دا هەمیشە هەرایان بوو، بەیانییەکی زوو پێغەمبەر ﷺ لەماڵ دەرچوو، دیتی وا (حەبیبە) لە دەرگاکەیاندایە، فەرمووی ئەمە کێیە؟ گوتی: (حەبیبەی کچی سەهل)، فەرمووی: ئیشت چییە؟ گوتی: من هەرگیز لەگەڵ (سابت)دا ناتوانم بژیم! کە (سابت) هات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمە حەبیبەیە، قسەو باسێکی زۆری بەیانکرد لەبارەی تۆوە، دەشڵێت هەرچی بۆ کردوم و پێیداوم لام ماوە، پێغەمبەر ﷺ

فەرمووی: دەسا لێی وەرگرەوە و تەلاقی بدە. (سابت)یش هەرچی دابوویە، لێی وەرگرتەوەو، تەلاقی داو چوویەوە ماڵی بابی. بوخاری لە (ئیبن عەباس)ەوە دەڵێت: ژنەکەی (سابتی کوڕی قەیس) هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ! من هیچ ڕەخنەیەکم لە ئایین و ڕەوشتی (سابت) نییە، بەڵام دەترسم لەدین پاشگەز ببمەوە (ئەوەندە ئازارم بدات). پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((أتردين عليه حديقته؟)) ئەو باخە کردوویەتیە مارەییت، دەیدەیتەوە؟ گوتی: بەڵێ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((اقبل الحديقة وطلقها تطليقة)) دەسا باخەکەی لێوەرگرەوەو، یەك تەلاقی بدە. فتح الباری، کتاب الطلاق ٣٩٥/٩.
لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (ئەبوو جەریر) لە (عیکرەمە)ی پرسی: ئەرێ (خولع) (واتە: ژنەکە، لەپیاوەکە خۆی ئازاد بکات) لەئیسلامدا بنەڕەتێکی هەیە؟ گوتی: (ئیبن عباس) دەڵێ: یەکەم خولع لە ئیسلامدا، لە خوشکەکەی (ئیبن ئۆبەی)دا بوو، ئەوەبوو هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەر! ﷺ جارێکی تر سەرناخەمە سەر سەرینی ئەو، لەبەرئەوە کاتێ کە گۆشەی خێمەکەمم هەڵدایەوە، دیتم لەناو قەڵەباڵخیدایەو، لە هەموویان ڕەشترو، کورتەبالاترو، ڕوخسار ناشیرینتر بوو (لەبەرئەوە حەزم لێی نیەو ناتوانم لەگەڵی بژیم) مێردەکەشی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من کاتی خۆی باشترین ماڵی خۆمم پێداوە، (واتە: باخێکم هەبوو کردوومەتە مارەیی) ئێستا بمداتەوە تەلاقی دەدەم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی بە ژنەکە: چ دەڵێیت؟ ژنەکەش وتی: بەڵێ دەیدەمەوە، حەزیش دەکات، زیاتریشی دەدەمێ، ئەوساش پێغەمبەر ﷺ لێکی کردنەوە.

ئەم ڕیوایەتانە حاڵەتێکیان نیشاندا کە ژنەکە ناتوانێ لەگەڵ پیاوەکەدا بژیی و، ئەو هۆیەش ئەوەند هەیە ببێتە هۆی جیابوونەوەیان، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەم شێوە ڕێگەی جیابوونەوەی بۆ دانان کە: پیاوەکە تەلاقی بداو، ئەویش (ژنەکە) بۆی قەرەبوو بکاتەوە، بەهەرشتێك هەیەتی و، پیاوەکە ڕازی دەبێت، چونکە ژنیش – وەکو پیاو – کە حەزی لە مێردەکەی نەبوو، ژیانی تاڵ و تفت بوو لەگەڵیا، دەبێ ڕێگای ئازادبوونی لێ نەگیردرێ و، هاوکاری بکرێ بۆ ڕزگار بوون، بۆیە پێغەمبەر ﷺ کاتێ ژنەکە دەڵێ: (إني رفعت جانب الخباء فرأيته قد أقبلَ في عدَةٍ، فإذا هو أشدهم سوادا، وأقصرُهم قامة، وأقبحهم وَجهاً). ئەویش ڕێنمایان دەکاو، لەئەنجامدا جیای کردنەوە.

## دوو ئاگاداریی:

١– ئەگەر ژنەکە هیچ شتێکی نەبوو لەمێردەکەی خۆی پێ ڕزگار بکات، یان هەیبوو بەڵام مێردەکەی لێی وەرنەدەگرت و ڕازی نەدەبوو تەلاقی بدا... ئەوە دینی پیرۆزی ئیسلام

ڕێنمایی ئەو ژنە دەکات بۆلای (دادوەر)و، ئەمیش بەپێی شەرع ویاسای ئیسلامیی، مادەم ئەم ژنە، زیانمەندە لای ئەو پیاوە، تەلاقی پێدەدات، هەروەکو پێغەمبەر ﷺ ئەو ژنەی ڕێنمایی کردو بەکابرای مێردەی تەلاقدا.

٢- ئەو ژنەی هیچ بڕووبیانوویەکی شەرعیی نیە بۆ جیابوونەوەو (تەعوین)دان بە مێردەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا هەر پێ لەسەر جیابوونەوە دادەگرێت، ئەوە پێغەمبەرمان ﷺ لەبەرامبەر ئەو ژنەوە دەفەرمووێ: ((أيُما امرأة سألتْ زوْجها طلاقهامن غير بأسٍ، فحرامٌ عليها رائحةُ الجَنَّةِ)) تەبەریی. پێشەوا (ئەحمەد)یش ئەم فەرموودەیە هێناوە: ((أَيَّما امرأةٍ سألت زوجها الطلاق فى غيرما بأس، فحرام عليها رائحة الجنة)). (ئیبن جەریر)یش ئەم فەرمودەیە دەهێنی: ((إن المختلعات المنتزعات هن المنافقات)). (ئیبن ماجه) ریوایەت دەکات: ((لاتسأل امرأة زوجها الطلاق فى غير كُنهه فتجدَ ريحَ الجنةِ، و إن ريحَها لَيوجد من مسيرة أربعين عاما)). فەرموودەکان - سەرجەم - ئەوە دەگەیەنن کە: هەر ژنێك بێ هۆکاری شەرعیی داوای خولع و تەلاق بکات لە مێردەکەی، بێ شك ناچێتە بەهەشتەوە و تەنانەتی بۆنیشی -کە ئەندازەی چڵ ساڵ ڕێگە دەچێت- نابیسێت، وە لەبەرئەوەیشە کە بە مونافق ودووڕازی ناوی بردن، تەفسیری ئیبن کەسیر.

پێنجەم- ئەگەر پاش ئەو دوو تەلاقە - بۆجاری سێیەم - تەلاقی سێیەمیدا، واتە: بەو دوجارە جیابونەوە و لێکبڕانە، پیاوەکە نەگەڕایەوە بۆ ڕوشدی خۆیی و، هێمان ڕێزی لەژنەکە نەگرت و، کردیەوە هەراو کێشەو تەلاقی سێهەمیشی پیا کێشا، لەوەوە دیار دەکەوێ کە ئیتر چاکسازی لە نێوان ئەو ژن و پیاوەدا بێ کەڵکە، جا لە بەرئەوە بە یەکجاری لێکیان جیا دەکاتەوەو ڕێگە بە (موراجعه)و گەڕانەویان بۆ لای یەکدی نادرێ، مەگەر ژنەکە بچێ مێردێکی تر بکا و پاشان ئەو مێردە بەویست و ئیرادەی خۆی تەلاقی بدات، جا ئەگەر پاش تەلاقدان ڕازی بویەوە بەو کابرا لار ولاسارو تەلاقخۆرەیە، ئەوا بەعەقدێکی نوێ و بەمارەیەکی تر، بۆی مارەدەکرێتەوەو دەست دەکەنەوە بە ژیانی خۆیان، بەلام کام ژیان؟ ئەو ژیانەی کەپڕە لەبێ بەهایی و ریسوابوونی ناو کومەڵگە، چونکە ژنەکەی لە دەست داو مێردی کردەوەو چویە باوەشی پیاوێکی تر، دەشکرێت ئەو پیاوە نەیارو ناحەزیشی بوبێت!.

بێ لەوەش، بێگومانە کە ئەم ژنە، ژنەکەی جاران نییە، کە بەهەموو شتێکی ئەو پیاوە ڕازی بێت و ماڵی تری نەدیبێت، ئەمەیە کە ئەفەرموێ ﴿فإن طلقها فلا تحل له من بعد حتى تنكح زوجا غيره، فإن طلقها فلا جناح عليهما أن يتراجعا إن ظنا أن يقيما حدودالله وتلك حدود الله يبينها لقوم يعلمون﴾. ٢/٢٣٠. ئەم زەجرو تەوبیخە - بەو شێوەیە- لەم پیاوو ژنە

لاساره، لەبەرئەوەیە کە کۆمەڵ و کۆمەڵگەی پێ ژێر بکاو، ڕێز لە یاساو مافی ژن و مێردی نێوانیان بگرن و، گاڵتە بە تەلاق و بەرنامەی تەلاق نەکەن، وە نان و ئاویان نەبێتە تەلاق وئەوەندەش بەکەم و بێ بەها سەیری ژنان نەکەن. بەڵێ بۆ حەلاڵ بوونەوەی ئەم ژنە سێ تەلاقدراوە بۆ مێردەکەی، چارەسەر هەرئەوەیە کە قورئان فەرمووی: دەبێ بێ فێڵ و فەرەج شوو بکات بەکابرایەکی تر، ئەوسا ئەگەر ئەو کابرایەش بەویست و ئیرادەی خۆی تەلاقیدا، پاشان ئەو ژنە رازی بوو شوو بکاتەوە بەو، ئەوا بۆی مارە دەکرێتەوە، ئەمەیە زاناکان بە شەرعیی دەزانن و پێی دەڵێن (تەحلیل). خۆئەگەر بەحیلەو فێڵ لە پیاوێکیان مارە کرد، ئەویش پاش مەرج لەگەڵ کردنی تەلاقی دایەوەو بۆ ئەم مارە کرایەوە، ئەوە لەحاڵەتی ئاوادا بە توندی بەر ئەو هەرەشانە دەکەوێ کە پێغەمبەر ﷺ دەیانکات و دەفەرموێت: ((لَعَنَ الله الواشمة و المستوشمة، والواصلة و المستوصلة، والمحلل والمحلل له، وآكل الربا و موكله)) پێشەوا ئەحمەد، ترمزی، نەسایی. یان فەرمووی: (ألا أخبركم بالتيس المستعار ؟ قالوا: بلى يارسول الله! قال: هوالمحلل والمحلل له)). ئیبن ماجە، كتاب النكاح. واتە: نەفرەت و نەعلەت لەوکەسانە بێت کەژنێ بەنیازی حەلاڵ کردنەوەی بۆ مێردی پێشووی، مارە بکاو پاشان تەلاقی بدات. وە نەعلەت لەو پیاوەش کە بە خەیاڵی خۆیان ژنەکەی بۆ حەلاڵ دەکەنەوە (واتە: مێردی یەکەم) چونکە ئەوە لادانە لە ئامانجی سەرەکیی و یەکەمی نیکاح و مارەکردن. مەبەست وئامانجی (نیکاح) لە ئیسلامدا ژیانێکی هەتا هەتایی و، بێ فێڵ و فەرەجە، بەڵام دیارە کە مەبەست لەم جۆرە نیکاحانە، تەنها حەلاڵکردنەوەیەتی بۆ مێردی یەکەم، نەك سکوونەت و ژیان پێکەوە بەسەربردن، لەولایشەوە ئەو فێڵ وفەرەجە (بە نهێنی مارە بکرێ لە پیاوێکی ناشیرین وبێکەس بۆ ماوەی چەند ساتێك، پاشان پێی تەلاق بدرێتەوەو، لە ناو کۆمەڵگەشدا کاری وا ئەوەند سووك بێت پێی بگوترێ (جاش) بێگومان ئەو ئیهانەو سووکایەتییە بە شان و شەوکەتی ژنەکە، چونکە تادەمرێ دەڵێن ژنە جاشکراوەکە. (تەفسیری مەنار) دەڵێت: ئەو جۆرە نیکاحانە دانامەزرێن و ژنەکەش حەلاڵ نابێتەوە بۆ مێردەکەی.(بۆدوایی زیاتر لە سەری ڕۆییشتوین).

<u>شەشەم</u>– ئافرەت هەر لە منداڵیەوە تا گەورە بوون و، دەست پێکردنی قۆناغەکانی ژیانی، لای کەس و کاریی و، پاشان لای مێردی، هەر لە ئازارو بێزاردابوو: تا منداڵ بوو زیندە بە چاڵ دەکرا، یان زۆر بەکەم بەهاو سووك دادەنراو ڕادەگیراو، نەشیان دەهێشت ئەگەر ویستبای بە ئارەزووی خۆی شوو بکات، کورتتر بڵێن، باوونەریتی (جاهیلیەت) ونەفامیی (تەحەککومی) دەکرد بەسەریا، ئینجا ئیسلام هات پلەی بەرزکردەوەو گەیاندیە

پلەی پیاوان، پیاوی تێگەیاند کە ئافرەتیش بێ زیادو کەم لەو پەیدابووە: ﴿وخلق منها زوجها..﴾ تێیگەیاند کە نابێ ئازاری بدات، نابێ ئەو خوو ڕەوشتە جاهیلیەتە شوێنەواریان بمێنێ، هەیان بوو کەژنی تەلاق دەداو نزیکبوو عیدەی بەرەو تەواوبون بچێت، خێرا بەر لەوەی عیدەکەی تەواوببێت دەیهێنایەوەلای خۆی، بەلام مامەڵەی ژن و مێردیان لەگەڵ نەدەکرد، بەڵکو تەنها مەبەستیان ئازاردانی بوو، ئیتر خۆ ئەم کارەیان نەجارێك و نەدوو جاربوو، بەڵکو چەند جار سەری هەڵدایەوە، ئەو ژنە داماوەش هەر لە عەزیەتی رۆحیی و جەستەییدا بوو، کەسێك نەبوو ئاوڕێکی بە لا بداتەوە و کێشەکەی چارەسەر بکات و، پیاوەکەی تەمێ بکات، تا خوای گەورەو دلۆڤان ئەم ئایەتەی نارده خوارەوەو فەرمووی: ﴿و إذا طلقتم النساء فبلغن أجلهن فأمسكوهن بمعروف أوسرحوهن بمعروف ولا تمسكوهن ضرارا لتعتدوا ومن يفعل ذلك فقد ظلم نفسه ولا تتخذوا آيات الله هزوا...﴾ ٢/٢٣١. واتە: هەرکە ژنانتان تەلاق داو بەماوەی چاوەڕوانییان لە(عیددە) نزیکبوونەوە، ئێوە بەشێوەیەکی باش و خواپەسەند رایان بگرن و (بیان هێننەوە لای خۆتان) یا هەم دیسان بە جوامێرانە و پەسەندی خوا، ئازادیان بکەن و تەلاقیان بدەن، وەنابێ بە نیازی ئازارو لێدان رایانگرن و لە حەق لادەن، وەکو ئەو پیاوە(ئەنصار)ە کە بە ژنەکەی خۆی گوت:سوێند بەخوا نەوەك ژنی خۆم رات دەگرم، وە نە تەلاقیشت دەدەم! هەرئاوا بەیناوبەین تەلاقت دەدەم، هەرکە عیددەکەت نزیك بوویەوە، دیسان دەتهێنمەوەو، هیچ روویەکی خۆشیشت نادەمێ و مامەڵەی ژن و مێردیت لە گەڵدا ناکەم.!

لەسوورەتی ٦٦/٦٥ شدا جەخت لەو دووبارە نەبوونەوەی ئەو حاڵەتە دەکاتەوە کە دەفەرموێ: ﴿ولا تضاروهن لتضيقوا عليهن...﴾ ئینجا هەرکەسێك رەفتاری وایکرد، دیارە ناهەقیی لە خۆیکردووەو، دوزەخی بۆ خۆی کڵداوە، ئەمانە باسکران بڕیاری خوان و نابێ بە گاڵتەیان بزانین،مامەڵە لە گەڵ ژنان بەو جۆرە کارێکی گەندەڵ و فەسادەو، پێچەوانەی حوکم و فەرمانی خوایە، خوا رازی نییە بەو جۆرە رەفتاریان لەگەڵدا بکەین، کەوابوو پێچەوانەکەی گەمە کردنە بە فەرمانەکانی خوا، بێگومان خواش شتی وا قبوڵ ناکات، بۆیە پێویستە ئەوژنە دادو بێدادی خۆی بەرێتە لای دادوەر، ئەویش ئەو پیاوە لارو لاسارە بانگ دەکاو دەیترسێنێ بە زیندانیی، بە هەرەشەی دارایی، یان پێی تلاق دەدات. لە بەرئەمەبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە (ئەشعەریەکان) توڕەبوو، چونکە ئەوانیش جۆرە هەڵسوکەوت و رەفتارێکی ئاوایان لەگەڵ ژناندا هەبوو، ئەویش فەرمووی: ((ليس هذا طلاق المسلمين، طلقوا المرأة في قبل عدتها)). بەدەر لەوەش، جۆرە رەفتارێکی تریان وەك ئەمە هەبوو، دەچوون

**رۆژ تائێواره بەگاڵتەوه تەڵاقیان دەخوارد، یان کچیان به مێرد دەدا، یان کۆیلەیان ئازاد دەکرد، کەچی بۆدوایی دەیان وت گاڵتەمان کردووه ! جا بۆ گێڕانەوەیان بۆ هەق و راستییەکان، پێغەمبەری خودا فەرمووی: ((ثلاث جدهن جد، وهزلهن جد: النكاح، والطلاق، والرجعة)). ئەبوو داود، ئیبن ماجه، ترمیزی. یان فەرمووی ((ثلاث من قالهن لاعبا أو غیر لاعب، فهن جائزات علیه: الطلاق، والعتاق، والنكاح)).**

**بەڵێ لەبەر گرنگی مافی ژنان بوو، خوا فەرمووی: ((.. ولا تتخذوا آیات الله هزوا..)) دیسان پاش بەیانکردنی بڕیارەکه فەرمووی: ﴿یعظکم به..﴾ خوا ئامۆژگارییتان دەکاو، سوزو دلۆڤانی و خۆشەویستیی، و ئولفەتی نێوان ژن و مێردتان وەبیر دێنێتەوه: ﴿ومن آیاتة أن خلق لکم من أنفسکم أزواجا لتسکنوا إلیها و جعل بینکم مودة ورحمة إن فی ذلك لآیات لقوم یتفکرون﴾ ٢١/٣٠.**

**یان که دەفەرمووێ: ﴿هوالذی خلقکم من نفس واحدة وجعل منها زوجها لیسکن إلیها..﴾ ١٨٩/٧.هەر جەختە له سەر ڕەچاوکردنی مافی ژنان. گرێدانی ژیانی دوو کەس(ژن ومێرد) بۆ تەمەنێك پێکەوه، بێ شك ژیانی وا کومەڵێ یاساورێسای دەوێت بۆی دابنرێت. بۆ ئەوه بزانن چۆن رەفتار له گەڵ یەك دەکەن، چۆن بۆ یەکتر دڵسۆزبن، چۆن حورمەت و رێزی یەکتر بگرن، چۆن خانەو لانەکەیان پڕکەن له میهرەبانیی و دڵۆڤانیی، چۆن ئامادەی بکەن بو هاتنه دنیای ئەو نەوەو کۆرپەلەیە چاوەڕوانی دەکەن، هەر دوو بەدڵپاکیی و بێ فێڵ و فەرەج پێکەوه بژین، تا لەنێوان ئەو حاڵەتە پڕ له خۆشەویستیەی نێوانیاندا ئەمیش پەروەردە ببێ، گوێ و چاوی له کەش و هەوایەکی سازگاردا بکرێتەوه. خۆئەگەر کەش و هەوای ناو خێزانەکە، سنوورەکانی خوای تێدا نە پارێزرا، ئەوسا سۆزو دلۆڤانیان نامێنێ، ئەوسا ململانێ و بەربەرکانێ دەست پێ دەکات، پیاو سوور دەبێتەوه.لەژن، ژن دەنگ بەرز دەکاتەوه بەسەر پیاودا، قسەی ناشیرین بۆ یەك هەڵ دەبەستن، یەکتر سووك دەکەن، کۆرپەلەکەیان بێ ناز دەبێ و، لەرقی یەکتردا هیچیان لێی ناپرسنەوه، کۆڵان و گەڕەك له دەس قیژو قاوی ئەوان وەڕەس دەبن و دادوەرو دادگا هەراسان دەکەن، تەنها چارەیەکیان تەلاق و جیابوونەوه دەبێ، ئەوسا کۆرپەلەکەشیان سەر گەردان دەبێ: دایك دەیەوێ بیباتە لای خۆی، باوك ناهێڵێ، هۆزی خاڵوان قبووڵ ناکەن و رازییان نییە، ئیتر مەگەر تەنها خوا بزانێ چارەنووسی منداڵی دوور له سۆزی دایك و باوك چۆن بێت ؟ ئەویش وەکو ئەو باوك و دایکە دڵ ڕەق و کەللە رەقە دەردەچێت، یان خوا به موعجیزه دەیگۆڕێ ؟.(تەفسیری تەبەری، ئیبن کەسیر). هەرلە بەرئەمەیە که (فوقەها)کان دەیان (فەصل) و (دەروازە)یان لەنیکاحدا داناوه، وه کو ((باب اختیار**

الزوجة، الخطبة، شروط الصيغة، العقد، الشهود، الشروط الشهود، الكفاءة فی الزواج) هەتا بەدەیان مەرج و خاڵی تر،چونکە ئیسلام دەیەوێ ئەو (زەواج)ە لە سەر دیوارێکی پۆڵایین دارێژرێ، نەك لەسەر دیواری بە فرو دوو سبەی بتوێتەوەو هەرەس بێنێ، دەبێ بنج و بناغەی ئەستورو مەحکەم بێت، هیچ هەراو کێشەیەکی تێدا نەبێت، هەتا بەرگەی ئەو تەمەنە درێژەی چەندین ساڵەیە بگرێت، بۆیە کتێبەکان پڕن لە باسی مافی ژن و مێرد بەرامبەر بەیەکتر. هیوادارم کچ و کوڕ و لاوەکانمان بە هەڵەو پەڵە ئەو بناغەیە پڕ نەکەنەوە، زۆر بە ژیرانە بچنە پێشەوە و دایرێژن، چونکە ئەم ژیانە ژیانێکە لەگەڵ تەمەندایە، دەبێ بە نیازی پێکەوە بوون بێت بە خۆشی، نابێت وەکو ئەوە تەماشا بکرێت کچ و کوڕێك لەسەر شەقامێك بە یەك دەگەن بۆ چەند ساتێك، پاشان بلاّوەی لێ دەکەن وهەر کەس بەلای کاری خۆیادەچێ، بەنیازم إن شاءالله لە کاتی باسی (نیکاح)گرێداندا، ئەم یاساو رێسایە چڕو پڕتر بکەینەوە.

حەوتەم- لەسەردەمی جاهیلیەت و لەسەرەتای بەشێك لە سەر هەڵدانی ئیسلامیشدا ئافرەت کۆت و زەنجیر کراوی دەستی باب و براو خزم و کەس و کاری بوو، بەئارەزووی ئەوان نەبووبا هیچ ئافرەتێك بۆی نەبوو مێرد بکات، گەلێگ جار لە نەیارو ناحەزێکی ژنەکە بەزۆر مارە دەکرا، یان ئەو پیاوانەی ژنیان تەلاّق دەدا، هەرکە کاتی شووکردنی دەهات، رێیان لێ دەگرت و نەیان دەهێشت بە هیچ کەسێك شووبکات! پێیان ناخۆش بوو پاش ئەو ماوەیە ژنی ئەو بووە، ئێستە فلاّنێك بێت بیکاتە ژنی خۆی، جابۆ چاکسازی ئەو حاڵەتە و ئامۆژگاری کەس و کاری ژنەکە، خوای میهرەبان و کارزان فەرمووی: (وإذا طلقتم النساء فبلغن أجلهن فلا تعضلوهن أن ينكحن أزواجهن إذا تراضوا بينهم بالمعروف....)۲/۲۳۳. واتە: کە ژنانتان تەلاّق داو، عیددەیان بەسەر چوو، ئێوە ئەی موسڵمانان!) مەبنە رێگرو بەر هەڵستیان، کە بەشێوەو شێوازێکی شەرعیی و بە پێی باوو نەریتی پەسەندی کۆمەڵگەی ئەوێ، پێك بێنەوە و شوو بکەنەوە بە مێردی پێشوویان. (ترمزی) دەڵێت: لەسەردەمی پێغەمبەردا (مەعقەلی کوڕی یەسار) خوشکەکەی خۆی لە پیاوێکی موسڵمان مارەکرد، پاشان مەعقەل تەلاّقی داو عیدەی بەسەر چوو، جا بۆ دوایی هەردوو حەزیان لە یەککردەوە، ویستیان ژن و مێردیی بکەنەوە، بەلاّم مەعقەل- برای ژنەکە - بەو کارە رازی نەدەبوو، وەلە کابرای زاوایش- لە بەر ئەوە کە کاتی خوی لێی مارەکردبوو وائێستاش تەلاّقیداوە- زۆر تووڕە بوو! ئەوسا ئەو ئایەتە هات: ﴿وإذا طلقتم النساء فبلغن أجلهن فلا تعضلوهن..﴾ مەعقەلیش تەسلیم بوو وکارەکەی ئەنجامدا.(فتح الباری: تەفسیری سوورەتی بەقەرە). (تەفسیری مەنار) دەڵێت: وشەی (بينهم) لە ئایەتی ﴿إذا تراضوا بينهم بالمعروف..﴾ ئەوە دەگەیەنێت کە هیچ لەنگ ونەنگێکی تێدا

نییه، ئەگەر ژنەکە لەگەڵ هەر پیاوێکی خاوەن سومعەو رێزداردا رێك بکەوێت و شووی پێ بکات، جا لەکاتی ئاوادا، ئەگەر (ولی) و سەر پەرستکاری ژنەکە، رێ لە ژنەکە بگرێت شوو بە مێردی ئاوا و پەسەندی ناو کۆمەڵگای سەردەم بکات، گوناهی دەگات. بۆیە زاناکان، دەڵێن: ئەوژنەی لەگەڵ پیاوێکی سووك وکەمنرخی ناو کۆمەڵگەدا،پێك هاتبێ و بییەوێ شووی پێ بکات، ژنەکەش بۆ خۆی رێزدارو سەنگینی ناو کومەڵگەبوو، کەچی ئەو ژنە ویستی شوو بەو پیاوە (خەسیس) وکەم بەهای ناو کۆ مەڵگەیە بکات، ئەوە لە کاتی ئاوادا خزم و کەس و کار دەتوانێ رێی لێ بگرێ، تا ژنەکەش کەم بەهاو کەمنرخ نەبێ لە کۆمەڵگەکەدا.

بەڵێ.. هەڵبژاردنی کەسێکی هاوشان و، ناوو شۆرەت چاك، هەر لە کۆنەوە لەناو موسڵمانان و گەلانی تریشدا هەبووە، بەتایبەتی لە ناو پاشاو پیاوماقووڵ و خەڵکانی هەڵکەوتووی ناو هۆزو خێڵەکاندا، هەقە یاساو رێسای وا پشت گوێ نەخرێت، تا لە پاشە رۆژو ئاییندەدا، ئەو عەقدو نیکاحە باشتر سەقامگیر ببێ و رەنگ بداتەوەو، بتوانن زۆرتر پێکەوە بژین و، بەکەم سەیری یەکتر نەکەن و کەم تەرخەمی رونەکاتە خێزانەکەیان، وابزانم تا ئێستاش پاشاو پیاو ماقووڵانی دەرەوەی ئیسلام رەچاوی ئەمە دەکەن، بەڵام سەد مەخابن زۆرێك لە عەرەبەکان ئەو باوو نەریتەیان گۆڕیوە، دەبینی کوڕە پاشایەکە چووە لە گەڵ ئافرەتێکی گۆرانی بێژ، یان ئافرەتێکی سەماکەرو ئەکتەردا بۆ خۆی رێککەوتووە، دیارە بەوە نەریت و زنجیرەی پاشایەتیی و بنەماڵەکەیانی رو خاندووە.

(محمد عبده) دەڵێت: (والمدار فی مسألة الكفاءة على العرف القومی والوطنی، لا على تقاليد بيوت شرفاء النسب والجاه وكبريائهم، فما يعده الجمهور إهانة للمرأة، تكون مضغة فی الأفواه وعارا على بيتها فهو الذی يبيح لأوليائها المنع منه، إذا لم يكن العضل سببا المفسدة شرمنه، فالمسألة من أحكام المصالح التی تختلف بحسب الزمان والمكان، لا تعبدية، ولا يجوز إكراه المرأة على الزواج بمن تكره مطاقا. (تفسیر المنار). واتە: لە هەڵبژاردنی هاوسەردا، عورف و باوی نەتەوایەتیی و نیشتمانیی دۆزی خۆی دەبێت، نەك باوو نەریتی دەوڵەمەندو پاشاوپیاوماقووڵان، هەرشتێك جەماوەر بەسووکایەتیی وبێ بەهای زانی بۆ ژن، ئەوا دەبێتە مایەی سووکایەتیی و عەیب و نەنگ بۆیی و، کەس و کاری ژن دەتوانن بەر هەڵەستی بووەستن، مەگەر لە بەرهەڵستکردندا، خراپتری لێ بووەشێتەوە، کەوابوو ئەم مەسەلەیە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ژنانە، بەشێك نییە لە (تعبد)ی‌و خوا پەرستیی، چونکە بە هیچ شێوەیەك نابێ ژنان بەزۆر بەشوو بدرێن.

(دکتـۆر موسـتەفا سـباعی) دەڵێـت: زۆرێکـی زۆرینـەی کۆمەڵگـە –بەتایبـەتی گونـد

نشینەکان- تائێستاش باوو نەریتی خۆیان بەسەر ژناندا زاڵکردووە، بۆیە باوك و دایك و خزم و کەسووکار، کێ هەڵدەبژێرن بۆ بەشوودانی کچەکەیان، هەر ئەوە پەسەند دەبێت، ئیتر هیچ دەرفەت و مەجالێکیان بۆ کچەکە نەهێشتۆتەوە!، بۆ ئەم کارەشیان هیچ بەڵگە نامەیەکی شەرعییان نییە، بەڵکو ئیجتیهاد و ڕاو بۆچوونی هەندێ لە زاناکانی سەردەمە، بۆیە ئیمام (ئەبو حەنیفە) و هاوبیرەکانی ئەوە ڕەتدەکەنەوەو دەڵێن (ليس للأب ولا لغيره من الأولياء إجبار البنت البالغة على الزواج، ويجب على الأب أوالأولياء إستئمار ها في امر الزواج، فان وافقت عليه صح العقد وإلافلا).(المرأة بين الفقه والقانون). واتە: نەباوك و نە هیچ کەسێکی تر بۆیان نییە، ڕێ لە مێردکردنی کچان بگرن و بەزۆر بە شوویان بدەن، بەڵکو دەبێ پرس و رایان پێ بکەن لە کاروباری بە مێردانیان،جا ئەگەرکچە ڕەزامەندی لەسەر هەبوو، ئەوا نیکاحەکە دادەمەزرێت، ئەگینە،دانامەزرێت.

* کاروباری ژنان، لق و پۆپی زۆرەو پێویستە باسی گشتیان بکرێت، بۆ نموونە: ئەو منداڵ و زارۆڵانە دەکەوێتە نێوان ژن وپیاو، دەبێ پشتگوێ نەخرێن ولە هەموو سەرماو گەرمایەك بپارێزرێن وبە شێوەی شەرعیی و پەسەندی خوایی بە خێو بکرێن، بەتایبەتی لەوسات و کاتەدا نێوان ژن وپیاو بەرەو تێکچوون دەچێ، چونکە لەوانەیە بەهۆی ململانێ و چەلەحانێی ئەوانەوە، منداڵەکەش لەبیر بکرێ و، مافی ڕەوای خۆی پێشێل بکرێ، بەتایبەتی ئەگەر ژنەکە لە کابرا جیابوویەوەو تەڵاق درا، بۆیە قورئانی پیرۆز لەسەر دایك فەرزی دەکات کە: هەر بووی دەبێ گۆشی بکاو تا دوو ساڵان شیری بداتێ، لەولایشەوە لەسەر باوك پێویست دەکات کە بەپێی دابوو نەریتی ناوچەکە جل و بەرگ و خۆراك و خواردن مسوگەر بکات بۆ دایکەکە، لە بەرامبەر شیرپێدانیی و بەخێوکردنیدا، دیارە ئەو بە خێو کردن و، نان و تفاق و جل و بەرگەیە، بەپێی بوون و نەبوون دەگۆڕدرێ، هەژار بە پێی هەژاری خۆیی و، دەوڵەمەندیش بەپێی، تواناو دارایی خۆی، بۆیە لەسوورەتی تەلاق دا دەفەرمووێ: ((... فإن أرضعن لكم فآتوهن أجورهن وأتمروا بينكم بمعروف. وإن تعاسرتم فسترضع له أخرى. لينفق ذو سعة من سَعَته ومن قُدِرَ عليه فلينفق مما آتاه الله لا يكلف الله نفساً إلا ما آتاها سيجعَل الله بعد عسر يسراً))٦-٧. واتە: ئەگەر ژنان شیریان بە منداڵ دا، ئێوەش کرێی ومزەی خۆیانیان بدەنێ و، بەشێوەیەکی پەسەندوباو لە گەڵیان پێك بێن، خۆ ئەگەر کار گەییشتە ئەوە پێك نەیەن، با ژنێکی تر - بەدەر لەدایکەکە - شیری پێ بدات، کێ بەدەسەلاتو دارایە، بەپێی خۆی، کێش بژێوی کەمەو دەسکورتە، لەوەندەی خوا پێی بەخشیوە بیبەخشێو بەختی بکات، خوا تەنها بەپێی بوونو توانا ئەرك دەخاتە سەر مرۆڤەکان، خواش پاش تەنگانە، بەزوویی فەرحانەو خۆشی دێنێ.

جا پاش کێشەو هەرای نێوان ژن و مێردو، ئەوسا تەڵاق، خوای گەورە — لەبارەی منداڵانی نێوانیانەوە — دەفەرمووێ: (والوالدات يرضعن أولادهن حولين كاملين لمن أراد أن يتم الرضاعة، وعلى المولود له رزقهن وكسوتهن بالمعروف لا تكلف نفس إلا وسعها لا تضار والدة بولدها ولا مولود له بولده وعلى الوارث مثل ذلك، فإن أرادا فصالا عن تراض منهما وتشاور فلا جناح عليهما، وإن أردتم أن تسترضعوا أولادكم فلا جناح عليكم أذا سلمتم ماآتيتم بالمعروف واتقوا الله واعلموا أن الله بما تعملون بصير))٢/٢٣٣. واتە: دەبێ دایکان دوو ساڵی ڕەبەق شیر بەمنداڵیان بدەن، بەتایبەتی بۆ ئەو کەسە دەیەوێ شیری تەواوی بداتێ، ئینجا دەبێ باوکەکە لەو ماوەی شیر پێدانەدا جل‌وبەرگ‌و بژێوی دایکە کە — بەپێی باوونەریتی خەڵکانی ئەو شوێنە — دابین بکات، هەر کەسیش بەدەر لە تواناو دەسەڵات، شتێکی لەسەر نییە، هیچ دایك‌و بابێ، نابێ — لەبەر ساواکەیان — زیان بەیەکتر بگەیەنن، (نابێ باوکەکە سۆزو میهرەبانی دایکەکە بقۆزێتەوەو، گوشار بخاتە سەریی‌و بڕوبیانووی لێ بنێتەوە، هەتا بەخۆڕایی شیری بداتێ، دایکەکەش نابێ ئەو بارودۆخە نائاساییەی باوکەکە بقۆزێتەوەو، بچێ بڕوبیانووی زۆرتری لێ بگرێ) جا ئەگەر منداڵەکە بابی نەبوو، بژێوی و جل‌وبەرگی دایکەکە دەکەوێتە سەر میراتگرانی بابی منداڵەکە، جا ئەگەر باب‌ودایك —بەخۆشیی‌و ڕاویژ— پێکهاتن کە زووتر منداڵەکە لەشیر بیڕێتەوە، قەیدی نییەو، هیچ گوناحێکیان ناگات، خۆ ئەگەر باوکەکە بەرژەوەندی منداڵەکەی لەوەدا دیتەوە، کە ژنێکی تر — بەدەر لەدایکەکە — شیری بداتێ، دیسان هیچ گوناحێکتان نایەتە سەر، بەو مەرجە بەپێی داب‌ونەریتی ئەو ڕۆژەیە، کرێ‌و مزەی تەواوی بدەنێ‌و غەدری لێ نەکەن، دەبێ — لەگشت ئەم کارانەدا — ترستان لەخوا هەبێ، دەبێ ئەوەش بزانن کە ئێوە هەر کارێ دەکەن خوا دەیبینێ.

ڕیعایەتی منداڵ‌و پەروەردەی ئەخلاقیی و ڕۆحیی‌و، لاشەو جەستەیی منداڵان بەشێکی زۆر گرنگە لە کۆمەڵگەدا هەر بۆیە لە دینی ئیسلامیشدا، ئێجگار بایەخ‌و گرنگی دراوەتێ‌و، سەدان فەرموودەو هەوڵی پیاو چاکان بەرامبەری هاتووەوکراوە، دیارە ئەوە بابەت‌و باسێکی جیاوازو سەر بەخۆی دەوێ، لەم باسەدا — باسی گرنگی قورئان بەکارو باری ژنان — فرە دەباو، باسەکەش دەگۆڕدرێ، بۆیە پشت بەخوا — ئەگەر خوا مۆڵەت بدات — سەربەخۆ باسی دەکەین، بەڵام — وەکو بەڕێز دکتۆر عبدالكريم زەیدان لە (المفصل)دا دەڵێت — چەند پرسیارێك دێتە پێش: ئاخۆ بۆ دەبێ تا دوو ساڵ شیر بەمنداڵ بدرێ...؟ ئایا نابێ لەو دوو ساڵە لا بدرێ: زیادو کەم بکرێ، ئەگەر بکرێ چ ئاسەوارێك لەسەر منداڵەکە پەیدا دەبێ، چ

حوکمێکی شەرعیی پێش دێت..؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە، خۆت چاوێ بە(مفصل)دا بگێڕە، لەوێ وەڵامی تێرووتەسەلتان دەست دەکەوێت.

هەشتەم- گیرووگرفتێکی تری ژنان لە سەردەمی جاهیلیەتدا:هەر ژنێك مێردەکەی مردبا، دەکەوتە رۆژێکی تاریکەوە: ژیانی پڕ دەبوو لە کوێرەوەریی، دەبوو پیستر و ناشیرینتر جلی لەبەر کردباو، هەتاماوەی یەك ساڵ بۆی ڕەوا نەبوو دەستی بەربۆنی خۆش کەوتبا! پاشان بەشێوەیەکی زۆر ناشیرین و کەمبەها لەماڵ ئەیانبردە دەرێ و، پشقەلێکی لە دەست دەگرت و فرێی دەدا، بە واتای ئەوە کە عیدەی تەواو بووە،ئەوسا سواری گوێدرێژێکیان دەکردو دەیانگێڕا..هتد.. لەگەڵ دەیان باوونەریتی خراپ و نەگونجاوی تر، لەگەل ٚ حورمەت و کەرامەتی ژناندا، پاشان کە ئیسلام هات، ئەو گشت رەفتارە نالەبارو سەختانەی لەسەر شان هەڵگرتن، وەلەبەر ڕێزی پێکەوەبوونی ماوەی ژن و مێردیان و، پەیوەندیی کۆمەلأیەتی لەگەڵ باب و برا و خزم و کەس و کاری مێردەکەیدا، وە بۆ کەمکردنەوەو سارێژبوونی برینی ئەو کۆسەی لێیان کەوتووە، ئیسلام ئەو حاڵەتانەی گشت گۆریی و هەڵیوەشاندەوە، عیددەو چاوەروانی-پاش مردنی مێردەکەی- بۆ کردە چوارمانگ ودە رۆژ، لەولایشەوە باری دوو گیانی بەو ماوەیە دەردەکەوێ، بۆ ئەمەیە خوای گەورەو کارزان لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿والذين يتوفون منكم و يذرون أزواجا يتربصن بأنفسهن أربعة أشهر و عشرا فإذا بلغن أجلهن فلا جناح عليكم فيما فعلن فى أنفسهن بالمعروف والله بما تعملون خبير﴾ ٢ /٢٣٤. واتە: ئەو کەسانەتان کە دەمرن و، ژنیان لێ بە جێ دەمێنێ، دەبێ ژنەکانیان تا چوار مانگ و دە رۆژ چاوەنوارِبن، ئیتر پاش ئەوماوەیە، هەرکارێ دەکەن — هەر دزێوو ناپەسەند نەبێ — رێیان بدەن با بیکەن، ئێوە گوناهتان ناگات، وە هەرکارێ بکەن، خوا بۆخۆی ئاگادارە پێی.

بەڵێ لەبەر راگرتنی باری کۆمەلأیەتی ناو خزم و کەس وکاری هەردوولا، دەبێ لەوماوەی عیددەیەیدا وەکو ژنانی تر خۆ نەرازێنێتەوە و خۆی ئارایش نەدا، بەڵکو دەبێ بە قورس و سەنگین خۆی ڕابگرێ و ئەملاو ئەولا و سەرەتاتکێ نەکاو، وا خۆی نیشان نەدا کە دەیەوێ مێرد بکاتەوە، هەر لەبەر ئەمەش بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لا يحل لأمرأة تؤمن بالله واليوم الآخر أن تحدّ على ميت فوق ثلاثة، إلا على زوج أربعة أشهر و عشرا)) واتە: هەر ژنێ باوەڕی بە خواو بە رۆژی پەسلأن هەبێ، رێگەی نییە کە بۆ مردوان -پتر لە سێ رۆژان- نیشانەی تازیەی وخەمباری پێوە دیار بێت، مەگەر ژنی مێرد مردوو، دەبێ ئەو چوار مانگ و دە رۆژان چاوەڕوان بێت. (زەینەبی کچی ئوم سەلەمە) دەڵێت: بەر لەئیسلام باوبوو کە هەر

ژنێك مێردەكەی مردبا، ژنەكەیان دەكردە ژوورێكی یەك نەفەریی و، خراپترین جل وبەرگیان لەبەر دەكرد و، نەدەبوو نزیكی بۆنی خۆش كەوتبا، تاماوەی یەك ساڵ، ئەو سا لە ماڵیان دەردەهێناو، پشقلێكیان لەناو دەست دەناو فرێیدەدا (بەواتای عیددەی تەواو بوو)، بەڵام كە دینی خوا هات، ئەو ژنە لەو گشت سووكایەتیی و ڕێلێگرتنە ئازاد بوو، پاش ئەو چوارمانگ و دە ڕۆژەیە، ئازادەو هیچ كەسێك نییە لە خزمانی هەردوولا، بتوانێ ڕێی لێ بگرێ لە خۆ ئارایشدان و، لە دەستگیران گرتن و لە شووكردنەوە ئەگەر بیەوێ. وادەزانم ئەگەر بە ویژدانەوە —ژن و پیاو— بڕواننە چاكسازییەكانی ئیسلام —لەهەموو ڕوویەكەوە— كاری باش و ڕێكوپێكی زۆری بۆ ژنان ئەنجامداوەو، زۆرێكی زۆرینە لە باوونەریتی —پاش ماوەی جاهیلیەتی ئەو سەردەمەی— لەسەر شان هەڵگرتوون، یان كەمیكردوونەتەوە، بە ئایەتەكانیشدا بەدەر دەكەوێ كە ژنان بەر لەئیسلام زۆر چەوساوەو بێ هەق و ماف بوون و، بە هیچ شێوەیەك خاوەنی ڕاووبۆچوونی خۆیان نەبوون، هەمیشە بەدەست باب و براو خزم و كەس وكارەوە، یان بەدەست خزمانی لای مێردەكەیەوە ناڵاندوویانە!.

ئینجاپاش ئەو چاكسازییە ڕوودەكاتە پیاوان، ئەوانەی دەیانەوێ ژن بهێنن و لەگەڵ جۆرە ژنێكی ئاوادا ببنە هاوسەر، پێیان دەفەرموێ: ﴿ولاجناح عليكم فيما عرضتم به من خطبة النساء أو أكننتم فى أنفسكم علم الله أنكم ستذكرونهن و لكن لا تواعدوهن سرا إلا أن تقولوا قولا معروفا ولا تعزموا عقدة النكاح حتى يبلغ الكتاب أجله واعلموا أن الله يعلم ما فى أنفسكم فاحذروه واعلموا أن الله غفور حليم﴾ ٢/٢٣٥. واتە: هیچ گوناهێكتان ناگاتیِّ، كە ژنانی شووەمردوو —ناڕاستەوخۆ— ئارەزوو بكەن و بخوازن. (ئیبن عەباس) دەڵێ: وەك ئەوە پێیان بڵێت: دەمەوێ ژن بخوازم، پێویستم بە ژنە، حەز دەكەم ژنێكی باشم دەست كەوێ (بوخاریی دەیگێڕێتەوە) یان هەر لە دڵا بڕیاری خواستنیان بدەن، خۆ خوا بۆخۆشی دەزانێ كە هەر باسیان دەكەن، بەڵام نابێ بەنهێنی ژوانیان بدەنێ و قسەیان لەگەڵ بكەن بۆ مارەكردنیان — پاش عیددەیان— مەگەر خواپەسەندانە بێت، وە دەبێ تا ئەو ماوەی عیددە بەسەر دەچێ، ئێوە نیازی مارەكردنیان نەكەن، چاكیش بزانن كە خوا دەزانێ ئێوە چی لەدڵتانایە، وەلەخوا بترسن‌و بشزانن لەگوناحان دەبوورێ‌و لەسەر خۆیە.

**بەكورتی**: نابێ پیاوان لەگەڵ ژنانی مێرد مردوودا، لە بارەی خواستن‌و، ژن‌و مێردی قسەو باس بكەن، تا عیددەیان بەسەر دەچێ، بەڵكو تەنها ئەمەندەتان بۆ هەیە كە: بەشێوەی ناڕاستەوخۆ، وە لای خەڵكی ئەو ناوچەیەش پەسەند بێت، بە گوێیاندابدەن كە: ژنی وەكو تۆ هەرگیز دانامێنێ، ئیتر قسەوباس وژوان دانان پێكەوەو هاتوچۆو نامە گۆڕینەوەو.هتد

کارێکی حەرامو ناڕەوایە، ئەمەیش – خوا باشتر دەزانێ – بۆ ڕاگرتنی کاروباری کۆمەڵگەو کۆمەڵایەتییە، لەوانەیە خزمو کەسوکاری مێردە مردووەکە توڕەبنو، هەراو کێشەشی لێ بووەشێتەوە، ئەگەرچی ڕاڤەکەرانی قورئان قسەی زۆرتریان لێکردووەو، بۆچوونی زیاتریان هەیە بۆ دیاریکردنی حیکمەتو فەلسەفەکەی، بەڵام هەرکامێکیان بێت –لەو بۆچوونانە– گرنگ گۆڕینی ئەو حاڵەتە نالەبارەبوو کە بەسەر ئافرەتی مێرد مردوودا سەپێنرابوو.

ئینجا باس لەو ژنانە دەکات کە: مێرد دەکەنو، بەر لە پێکەوە نووستنو سەرجێیی لەگەڵ کردنیاندا، – بەهەر هۆیەکەوە بێت– تەڵاق دەدرێن، ئەمانەیش دوو جۆرن: هەیانە لەناو (عەقد)ی مارە بڕینەکەدا ناوی مارەییان بۆهاتووەو، ڕێژەیەکیان بۆ دیاریکراوە، هەیشیانە بێ مارەیی، نیکاح کراون – کە ئەمە پێچەوانەی یاساو باوی نیکاحە، چونکە ناوهێنانی مارەیی لە ناو نیکاحدا –بەپێی ئایەتەکە– فەرزو پێویستە، جا لەو حاڵەتەدا کەبەبێ مارەیی نیکاح کراوە، جا ئەگەر تەڵاقدرا، دەبێ(موتعە) وقەرەبووی بدرێتێ. موتعەش: بەو ماڵو سامانە دەگوترێت، کە پاش تەڵاقدان، دەدرێتە ژنەکە –بۆ دڵخۆشکردنو ڕەواندنەوەی ئەو کەشو هەوا لێڵەیە، بەهۆی تەڵاقدانەوە ڕوویکردۆتە ژنەکەو کەسوکاری ژنەکە، دیارە دیاریکردنی ڕێژەکەی، بەپێی بوونو نەبوونی مێردە. خۆ ئەگەر مارەییان بۆ دیاریکرابوو لە گرێ بەستی عەقدەکەدا، ئەوا دەبێ نیوەی بداتێ، مەگەر سەماحەتو لێبوردنیان بەرامبەر یەکتر هەبێت:واتە: ژنەکە – یان سەرپەرستیاری ژنەکە – دەتوانێ لەو مارەییە کە قورئان بۆی دیاری دەکا دەس هەڵبگرێو ئازادی بکاو هیچی لێ نەسێنێت، پیاوەکەش هەروا بۆی هەیە دەس لەنیوەکەی خۆی هەڵبگرێو، هەموو مارەیی یەکەی بداتێ، لەگەڵ ئەوەیشدا عەفووو گەردن ئازادی لە تەواوی مارەیی یەکە باشترەو، بەخواناسینەوە نزیکترە، بۆیە (جوبەیری کوڕی مونعیم) کاتێ کچەکەی (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس)ی تەڵاقدا – بەر لەسەرجێیی– تەواوی مارەیییەکەی دایە، گوتیان: بۆچی وادەکەیت؟ گوتی: کاتی خۆی (سەعد) منی بانگ کرد بۆ مێردکردنی کچەکەیی‌و، لەو کاتەدا ڕووم نەهات بڵێم نامەوێ، بۆیە ئیستا هەموو مارەیەکەی دەدەمێ، چونکە من خۆم بەشیاوتر دەزانم بە فەزڵو بەخشین لەبەرخوا.

بۆ ئەو ئاراستەیە کە خودا دەفەرمووێ: ﴿لا جناح عليكم إن طلقتم النساء مالم تمسوهن أو تفرضوا لهن فريضة، ومتعوهن على الموسع قدره وعلى المقتر قدره، متاعا بالمعروف حقا على المحسنين، وإن طلقتموهن من قبل أن تمسوهن وقد فرضتم لهن فريضة فنصف مافرضتم إلا أن يعفون أو يعفو الذى بيده عقدة النكاح، وأن تعفوا أقرب للتقوى، ولا تنسوا الفضل بينكم، إن الله بما تعملون بصير﴾٢/٢٣٦-٢٣٧. واتە: ئەگەر ژنانتان – بەر

لەسەرجێیی کردن – تەڵاقدراو، هێشان مارەییتان بۆ دیاری نەکردبوون، مارەییان ناکەوێ بیاندەنێ‌و، ئێوەیش گوناحتان ناگات، بەڵام دەبێ لەماڵی خۆتاندا شتێکیان بدەنێ، هەر کەسیش بەپێی خۆی: دارا لەئەندازەی خۆیی‌و، نەداریش هەر بەئەندازەی خۆی، ئەمە هەق‌و فەرزە لەسەر چاکەخوازان.، خۆ ئەگەر مارەییتان بۆ بڕیبوونەوە، بەڵام لەگەڵیان نەنووستبوون، ئەوا لەحاڵەتی ئاواشدا، نیوەی مارەییان دەکەوێ، مەگەر خۆیان بیبەخشن،یان ئەو کەسە بیبەخشێ مارەییەکەی بەدەستە، خۆ بەخشینیش لە ئاکاری پارێزکارانەوە نزیکترە، نابێ چاکەکردن – لەگەڵ یەکتر – لەبیر بکەن. خوا – لەهەر کارێ ئێوە دەیکەن – چاودێرە.

بەڵێ هەر ئافرەتێك بەرلەوە لەگەڵ مێردا بخەوێت، تەڵاق بدرێ، بێ شك –لێرەولەوێ– تووشی هێندێ قسەوقسەڵۆکە دەبێ‌و، گەلێ گومانی خراپیشی پێ دەبرێت‌و، لەوانەیشە هەزارویەك شتی لەسەر جێ بکەنەوە، ئەگینە بە بۆ چوونی ئەوان تەڵاق نەدەدرا، جا بۆ ڕەواندنەوەی ئەو کەش‌وهەوا پڕلە بەدگومانی‌و دوودڵیە، قورئانی پیرۆز (موتعە)ی فەرزکردۆتە سەر مێرد، بیدا بەژنەکە، بۆئەوە گومانی گومانداران بڕەوێتەوە‌و بزانن کە ئەگەر تەڵاقدانەکە لەبەر شتێکی نابەجێ‌و ئابڕووبەر بوایە، ئەم پیاوە نەدەچوو بەشێك لەماڵی خۆی، یان ئەو نیوەی مارەیی یەکەشی بداتێ، دیارە ئەو کات وای لێ دێت کە دەبێ تەنها و تەنها مەسەلەکە پێك نەهاتن بووەو نەگونجاون، نەك شتێکی تر، لە(بوخاری)یدا هاتووە کە: پێغەمبەر ﷺ (ئەمیمەی کچی شەراحیل)ی مارەکردو بەر لەنووستن لێی جیابوویەوەو، پاشان فەرمانیدا کە: دوو کراسی سپی، سەرتاپێی، بدرێتێ‌و بەڕێ بکرێت.

بۆ ئەم (موتعە)یەش هێندێ لەزاناکان دەڵێن – دەبێ بەهەموو ژنێکی تەڵاقدراو – پاش پێکەوە نووستن‌و، بەر لەپێکەوە نووستن – بدرێ، بەڵگەی ئەو بۆچوونە ئەوەیە کەخوا بەگشتیی دەفەرمووێ: ﴿وللمطلقات متاع بالمعروف حقا على المتقين﴾، یان دەفەرمووێ: ﴿ياأيُها النبي: قل لأزواجك إن كنتن تردن الحياة الدنيا وزينتها فتعالين أمتعكن وأسرحكن سراحا جميلا﴾ دیارە کە هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ سەرجێییان لەگەڵ کراوەو مارەییشیان بۆ بڕاوەتەوە، کەچی ئامادەیە شتێکیان بکاتە هەدیەو دیاریی پاش جیابوونەوەکە. بێگومان ئەم ڕاوبۆچوونە – بۆ سارێژکردنی برینی ژنەکەو خزم‌و کەس‌وکارەکەیی‌و، ڕەواندنەوەی ئەو گشت دوودڵی‌و بەدگومانیەی ئەم‌وئەوە، زۆر جێگەی خۆیەتی‌و، لەگەڵ واقیعەکەدا زۆر پەسەندو لەبارە، بۆیە ئێمەش لەگشت لایە دەخوازین کە: ئەگەر – خوانە خواستە– تەڵاق هاتە بەین، هەر ئاوا بەسادەیەکەوە پاڵ نەنێین بەژنەکەوەو،

بیکەنە دەرەوە! بەڵکو دەبێ شتێکی باش‌و لەبارو شیاو بە ژیانی ئەو ڕۆژە بەژنەکە بدرێ کەلای خەڵکی خاوەن بەها بێ‌و کەم‌وکوڕی ژیانی ژنەکەی پێ پڕبکرێتەوە لەو ڕۆژەدا.

* لەپێشەوە گوتمان ژن‌وپیاو، دوو دروستکراوی خودای گەورەوکارجوانن، مرۆڤی یەکەم (واتە:بابە ئادەم) لەگڵ بەدیهاتووە، ژنی یەکەمیش (دایە حەوا) هەر لەجیسنی ئەو پیاوەیە (بابە ئادەم)ە واتە: مەگەر لە هێندێ تایبەتمەندی خۆیان، جۆرە فەرق‌و جیاوازییەکیان هەبێ، یان مەگەر لەبەر هێندێ کاروباری کۆمەڵایەتیی‌و سیاسیی‌و ئەخلاقیی فەرق وسونێك هەبێ، دەشکرێ نەرم‌و ناسکی لەش‌و جەستەی ئافرەت‌و بونیەی هەرەم‌و پەیکەرەکەی، هێندێ شتی ڕێ لێ بگرێت، ئەمەیش مانای ناتەواوی ژنان نابەخشێت، گوتیشمان هەر دوو ڕەگەزەکە لای خوا یەکسانن، هەردوو دەتوانن ئاکار چاکبن (وەکو ئەو هەموو پیاووژنە هاوەڵانەو، بەرلەوانیش، وە هەردووش لێیان دێت ناپاك‌و نالەبارو لاسارو نەگریس بن، وەکو ئەوانە لەدەورانی (ئەبوجەهل)و (ئەبوولەهەب)و خێزانەکەی ئەبوولەهەب‌و، دواترو ئێستاش هەن و دەژین، ئەمە مانای نەحلەتکردن لە ڕەگەزی هیچ کامێکیان نییە، هەتا ڕۆژی قیامەت، جائێستا دەگەڕێمەوە لای قورئان‌و دەچینە خزمەتی ئایەتی: (٣/٣٦) کە چۆن باس لەشەهامەتی خاتوونە (حەننەی کچی فاقوود) دەکات، دایکی (مەریەم) خانمی دایکی (عیسا) پێغەمبەر – علیهم الصلاة والسلام – ئەو ئافرەتە خواناس‌و چاك‌و پاك‌و دوعا خوێنە کە لەخوا پاڕایەوە، منداڵێکی نێرینەی پێ ببەخشێ‌و، تابیکاتە خزمەتکارو مجەوری (بيت المقدس)، زۆر حەزی لەوە دەکرد، بۆیە (نەزر)ی کرد کە ئەگەر خوا دوعاکەی گیرا بکات، هەر بەمنداڵی تەسلیمی دەرگاوانەکەی (قودس)ی بکا، تا لەوێ لەسەر خواپەرستیی پەروەردە بکرێ‌و، ڕابێت بۆ ئەنجامدانی کارەکەی لە ئایندەدا، جا ئایەتەکە دەفەرمووێ: ﴿إذ قالت امرأة عمران ربّ إنى نذرت لك ما فى بطنى محرّراً فتقبل منى إنك أنت السميع العليم فلما وضعتها قالت رّب إنى وضعتها أنثى والله أعلم بما وضعت وليس الذكر كالأنثى وإنى سمّيتها مريم وإنى أعيذها بك وذريتها من الشيطان الرجيم. فتقبَلها ربها بقبول حسن وأنبتها نباتاً حسناً وكفلها زكريا كلّما دخل عليها زكريا المحراب وَجَدَ عندها رزقا قال يامريم أنى لك هذا قالت هو من عند الله إن الله يرزق من يشاء بغير حساب﴾٣/٣٥–٣٧. واتە: ئەو کات وساتە وەبیر بێنە کە هاوسەرەکەی عیمران گوتی: ئەی پەروەردگاری من ! ئەو منداڵەی کەوتۆتە (ڕەحم)ی منەوە، من نەزری تۆی دەکەم، دەخوازم لێم قبوڵ بکەیت، بیسەرو ئاگاداریش هەر خۆتی. ئەوسا کە بارەکەی دانا، گوتی: ئەی پەروەرندەی من ! خۆ من مێینەم دیوە! – ئەگەرچی خواش چاتر دەزانێ بەوکارە – بێ شك

کچیش وەکو کوڕ نییە – بۆ ئەو کارەی من قەولاّنم – من ناوم لێ نا (مەریەم) ئەوا خۆیی و نەوەکانیشم بە تۆ سپارد، تالەشەیتانی نەحلەتی بیانپارێزی. ئینجا پەروەردگاریش زۆر بەباشی لێی وەرگرت ببێتە خزمەتکارو مجەوری (بیت المقدس) ئەگەرچی نێرینەش نییە، کەلای ئەوان تەنها نێرینە بەکەڵکی ئەو کارە دەهات. لە (بوخاری)و (موسلیم)دا هاتووە: لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ژنێکی ڕەش پێس هەبوو خزمەتی مزگەوتی دەکرد، پاشان کۆچی دواییکردو، بۆ دوایی پێغەمبەر ﷺ پرسیاری بۆ کرد؟عەرزیانکرد ماوەیەکە مردووە، فەرمووی: ئەی بۆچی ئاگادارتان نەکردووم، ئەوانیش بەجۆرێکی کەم بەها باسیان کرد. پێغەمبەریش فەرمووی: ((فدلُّوني على قبرِهِ)) گۆڕەکەییم نیشان بدەن، نیشانیانداو چووە سەر گۆڕەکەیی و، نوێژی لەسەرکردو داوای لێبوردنی –لەخودا– بۆ کرد. بوخاری: ژمارە: ١٣٣٦. ئەی ئەمە ڕێزو حورمەتنان لە ژنان نیە؟ بەتایبەتی ئافرەتێکی مجەوری – کەمبەهای لای کۆمەڵگەی ئەو سەر دەمە –.

دیارە بابی (مەریەم) دەمرێ و، (حەننە)ی دایکیشیی، مەریەم دەبا تەسلیمی نووسینگەی چاودێری کاروباری (بیت المقدس)ی دەکات: (زەکەریا)ی – مێردی پووری مەریەمیش – سەرپەرستیی دەکا، جا هەرکە زەکەریا لە میحرابی خواناسینەکەیدا سەری دەدا، بژێوی دەدیت لەلایداو، پێیدەگوت مەریەم! باشە ئەمەت لەکوێ بوو ؟! ئەویش دەیگووت: لەلای خواوە بۆم دێت، بێ شك خوا، حەزی لەهەر کەسێك بێت، بێ ئەژمار بژێوی دەداتێ.

هەر بۆ گرنگیدانی قورئانی پیرۆز، بەکاروباری ژنان و، پشتگوێ نەخستنیان، دەچینە خزمەتی خاتوونە (مەریەم)ی کچی (عیمران)، دایکی (عیسا)و پووری (یەحیا)ی پێغەمبەر – خوای لێ ڕازی بێت–. مەریەم – سلاّوی لەسەر بێت – لەقورئاندا (١١) یازدە جار بەم جۆرە ناوی هاتووە: لەسوورەتی (ئالی عمران) (٤)جارو، لەسوورەتی (مەریەم)یش لەئایەتی (١٦–٢٧) هەر لەو باس دەکات، لەسوورەتی (مۆمینون)یش ئایەتی(٥٠)ی لەو دەدوێت، (زوخروف)یش لەئایەتی(٥٧)ی و، (تەحریم)یش ئایەتی(١٢)و، سوورەتی (ئەنبیاء)یش ئایەتی (١٥٢). خاتوو مەریەم لەکەش و هەوایەکی پاك و خاوێنداو، لەژێر چاودێری یەکێ لە پێغەمبەرانی خوادا (زەکەریا) سلاّوی لێ بێت، پەروەردەکراو، لەخەڵوەتگایەکی تایبەتدا پێگەیشت، وە لەخوانەبێ ترسی لە کەس نەبوو، خوای گەورەش دەیەوێ ڕووداوێکی مێژوویی و، هەرگیز لەبیر نەچووی، لەسەردەستدا ئەنجام بدات، کەپیاو هەڵگری ئەو قابیلیەت و توانایە نییە و، ئەوەی لێناوەشێتەوە کەلە مەریەم وەشایەوە، دەیەوێ بەبێ پەیوەندی لەگەڵ توخم و ڕەگەزی نێرینەدا، بەبێ (تەلقیح)و متوربە، منداڵێکی وەکو

(عیسا)ی ببیٚو دنیا پڕ بکەن لەکەرامەتو موعجیزە. ئەمەیە کە خوا بەخاتوونە (مەریەم) دەفەرمووێ: ﴿وإذ قالت الملائكة: يامريم إن الله اصطفاكِ وطهرك واصطفاك على نساء العالمين، يامريم اقنتي لربك واسجدي واركعي مع الراكعين﴾٣/٤٢-٤٣.واتە: ئەو کاتە وەبیر بێنە کە فریشتە (جوبریل) هاتو بەمەریەمی گوت: خوا تۆی هەڵبژاردووە بۆ خزمەتی (بیت المقدس)، وە لەهەر کاروکردەوەیەکی قێزەونو نالەباریش پاك ڕایگرتوویی‌و، فریشتەشی نارد قسەی لەگەڵ کردیت، لەچاو ژنانی دنیاش بەڕێزتر سەیری کردیت.

لەسوورەتی (مەریەم)دا خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: لەم قورئانەیشدا باسی مەریەم وەپێشبیێنەو بۆ خەڵکانی دنیای باس بکە، ئەوکاتە کە خاتوو (مەریەم) لە کەس‌وکاری خۆی دوورکەوتەوەو، بەرەو جێگایەکی خۆرهەڵاتی مزگەوتی (قودس) چووو کردیە بارەگاو حەشارگە بۆ خۆیی‌و، نەیدەویست هیچ کەسێك بیبینیٚ، جا لەو بارودۆخە پڕ لە سۆزو خۆشەویستی بۆ خواو، دوورکەوتنەوە لە دنیای سەرقاڵو، پڕ لەهەراو ئاژاوەو، وە دڵ پڕە لە ئاسوودەیی‌و، ئۆقرەو بەدەر لەخوا بەندایەتی بۆ کەس ناکاو، ملکەچی هیچ شتێك نابێت، هەواو ئارەزووبازیی‌و، عیشق‌و ئەوین، خۆ ڕازاندنەوەو ئارایيش، لای ئەو بایەخێکی نییە، تەنیاو تەنیا عاشقی نووری خوایە... لەکاتێکی ئاوادا خوا (جوبریل)— کەبە روح ناوی دەبا — دەنێرێتە لای، بەڵام لەسیمای بنیادەمێکی تەواودا هاتە بەرچاوی ئەو، بۆیە ئەویش کتوپڕ زۆر بەتوندی داچڵەکی‌و، ترسێکی زۆری لیٚ نیشتو بەپیاوەکەی گوت:ئەر لە خوا دەترسی‌و ئیمانداریت، زیان لەدەستت نابینمو لێم مەیە پێش، مەریەم ترسا ئەو کەسە پیاو خراپ بێت، خۆ پێشتریش تا ئەو کاتە جگە لە زەکەریای سەرۆکی هەرەمەکەی قودس، کەسی تر ئەوی نەدیتووەو، نەچۆتە ئەو جێگایە، بۆیە قورئان لە سەر زاری ئەو دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: ﴿إني أعوذ بالرحمن منك إن كنت تقيا﴾. جوبریل کە دیتی حاڵی زۆر شپرزەو، خەریکە وزە لەدەست دەدات، بەپەلە گوتی: من فریشتەمو لەلای خواوە ڕاسپێراوم کە — بەفەرمانی خۆی — فرزەندێکی چاك‌و پاکت پیٚ ببەخشم ! کەئەوەی لیٚ بیست لەبەر شەرمو حەیای خۆی گورج گوتی: باشە! من چۆن منداڵم دەبیٚ، خۆ من مێردم نەکردووەو، هەرگیزیش داوێن تەڕیم نەکردووە؟! دیارە کە مەریەمیش هەر وەکو خەڵکانی تر پێی وابووە کە منداڵ تەنها لەڕێی زاوزێوە پەیدا دەبێت، هەرگیز بیری لەوە نەکردبوویەوە کە بەبیٚ پەیوەندی نیرو میٚ، منداڵ پەیدا ببێت. بۆیە ئەو پرسیارانە دەکاو ڕووبەڕووی پیاوەکە وەستاوە. فریشتەکەش گوتی: قسە هەر ئەوەیە پەروەرندەی تۆ گوتویەو، بۆ خواش — کاری وا — زۆر ئاسانەو، دەشمانەویٚ بیکەینە مایەی ڕەحمەتو دلۆڤانی بۆ (بەنی ئیسرائیل)و

سەرجەم خەڵکانی دنیاو، هەتا لەوێوە باشتر بتوانن خوا بدۆزنەوەو بیناسن، ئیترئەم بڕیارو فەرمانە بڕاوەتەوەو دێتە جێ.

لێرەدا گفتو گۆی نێوان فریشتەکەو خاتوونە مەریەم دەبڕێتەوەو، نازانرێ دوای ئەوە چی دەبێ، بەڵام گشت زانایانی پێشینو پاشین (سەلەف)و (خەلەف) یەکدەنگن کە: هەر ئەو فریشتە – بەفەرمانی خوا – فوودەکاتە خاتوو مەریەمو، هەر بەو فووە دووگیان دەبێو، وەکو بابە (ئادەم) گیان وەبەریا دەکرێت، وەکو خوا لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿إن مثل عيسى عند الله كمثل آدم خلقه من تراب ثم قال له كن فيكون﴾٣/. ئیتر ئایا ئەو دووگیانیە، هەروەکو دووگیانی ژنانی تر بوو و(٩) مانگی خایاند، یان ئەمیش هەر بەشێوەیەکی سەیرو سەمەرەو موعجیزە رەنگێك قۆناغەکانی منداڵبوونی بڕیی و لەدایك بوو؟ قورئان لەمانە بێدەنگە، هەر ئەمەندە دەفەرموێ کە: مەریەم پاش ئەو فوو پیاکردنە، بەعیساوە دووگیان بوو و لەتاو شەرمو حەیای ناو کۆمەڵگە دوورکەوتەوەو خۆی گەیاندە جێگایەکی دوور لەوان. (ئیبن کەسیر) دەڵێت: هەر لە مزگەوتی (قودس)دا پیاوێکی زۆر صالحو ناودار، –وەکو مەریەم– بەناوی (یوسف)ی دارتاشەوە هەبوو، ئەویش خزمەتی مزگەوتی دەکرد، جاکاتێ حاڵەتی مەریەمی بە شێوەیەکی نائاسایی دیت، ناچار بوو گوتی: ئاخۆ ببێ درەختێکی بێ تۆو ڕەگەز سەوز ببێ؟ ئاخۆ تۆو بێ بنەتۆو دەڕوێ ؟ ئەی منداڵ بێ باب دەبێ ؟! مەریەمیش تێگەیی چی دەڵێت، بۆیە خێرا گوتی: بەڵێ. چونکە لەسەرەتای ژیانەوە، هەر خوابوو دارو درەختو گژوگیاو ڕووەکی – بێ دنکە تۆو – ڕواند، هەر خوا بوو، بابە (ئادەم)ی بێ بابو دایك بەدیهێنا، کەوابوو دووگیان بوونی منیش – بێ هاوسەرو مێرد – هەر لەدەسەڵاتی ئەو خوایەوە دەوەشێتەوەو، هەر ئەویشە – جل جلاله – ئیرادەو خواستی لەهەر شتێ ببێ دەیکات.

پاشـــان ژانـــی منـــاڵبوون هەڵیپێـــچاو – بـــێ کـــەسو هاوکـــارو مامـــان !– بردیـــە لای دارخورمایـەكو پـاڵی پێوەداو گوتی: کاشـکا بـەر لەمـە مردبـامو ئەمـەم بەخۆمـەوە نـەدیتباو بەهەتا هەتایی لەبیر دەبرام. جا بۆ دیاریکردنی ئەو جێگایەش – لەناو عیسایییەکاندا – کێشە هەیە: ئاخۆ (میصر)ی ئێستایە؟ یان (بیت لحم)ی قودسە؟.

جا لەو حاڵەتە زۆر ناسۆرەدا، (عیسای کوڕی) لەژێریەوە بانگی کردو گوتی: خەم مەخۆ، بێ شك پەروەردگارت لەژێرتەوە جۆگە ئاوێکی فەراهەم هێنا، لەلای پێتا ئاوی هەڵقوڵان بۆ خواردنەوەو، ئەو دارە خورمایەش پاڵت پێوەداوە – بیهەژێنە، فەریکە خورمات بەسەردا، دەوەرێنێو لێی بخۆ، دیارە شیرینیو حەڵواو خورماش بۆ ژنی زەیسان زۆر بەکەڵکە، بەچاوی ڕوونو دڵی خۆش بخۆو بخۆوەو، دڵنیابە خوا هاوکارت دەبێت، هەر کەسێکیشت

ڕووبەڕوو بوو پێی بڵێ: بڕیارم داوە – لەبەرخوا – خۆم لەئاخافتن بگرمەوە لەگەڵ كەسدا قسە نەكەم. پاشان هاتەوە بۆ ناو كەس‌وكارەكەیی‌و منداڵێك بەباوەشیەوەبوو، بەڕاستیی ڕووداوی وا، ڕووداوێكی تاڵ‌و تفت‌و ناڕەحەت بوو، ئەو كچە پاكە خواناسە، داوێن پاكە، وامناڵێكی بەباوەشەوەیە، دەبێ خەڵكان‌و خزم‌وكەس‌وكار چی پێ بڵێن؟ پێیانگوت: مەریەم ! هەرگیز لەتۆمان ڕانەدەبینی كاری سەمەرەی وات لێ ڕووبدا ! خوشكی هاروون ! تۆ نە(باب) ت پیاو خراپ بوو، نەدایكیشت داوێن تەڕ بوو، هەتا كاری وات لێ بووەشێتەوە.

مەریەمیش هێمای بۆ كردن كە: لەگەڵ منداڵەكە دا بێنە ئاخاوتن ! ئەوانیش گوتیان: جاچۆن لەگەڵ مناڵێكی ساوای سەربێشكە قسە بكەین ؟ مناڵەكە – بەفەرمانی خوا – لێیان دێتەوە وەڵام و دەڵێت: من خوڵام و بەندەی خوام، (واتە: نە خوام و نە كوڕی خوام، وەكو بۆ دوایی هێندێ چەواشە بوون و دەڵێن كوڕی خوایە !) كتێبی بە خەڵات دامێ و كردمیە پێغەمبەری خۆی. لە هەر كوێش بم پیرۆزیكردوم و پێووقەدەمم خێرە، هەتا زیندەش بم، ڕایسپاردووم نوێژ بكەم و زەكاتی ماڵم بدەم و، هەمیشە گوێڕایەڵ و گوێ لە مستی دایكم بم و، بە مڵهوورو زۆرداری دانەناوم، سڵاوم لێ بێ ڕۆژێ كە لەدایك بووم و، ئەو ڕۆژە دەمرم و، ڕۆژێ كە زیندوو دەكرێمەوە.

بەڵێ ژنیش هەروەكو پیاو، خێرو شەڕی لێ دێت و، دەتوانێ ببێتە نموونەی دەست پاكیی و، داوێنپاكیی و، هەتاهەتایە ناوو شۆرەتی هەر بڵندو بەرز بێت، خۆ بینیمان خاتوونە مەریەم چ ژنێكی خووڕەوشت بەرزو لە خواترس بوو، خۆ دیتمان چۆن بەرگەی ئەو گشت گێروگرفتانەی گرت، دیتمان كە فریشتە دێتە لایی و قسەی لەگەڵ دەكاو، دڵخۆشی دەداتەوە. قورئان هەروەكو باسی خاتوونە مەریەم دەكات، لەمەڕ پاكی و لێهاتوویی و، كۆڵنەدایی بۆ خواپەرستیی، هەرئاواش دێت باسی لاوێكی جوان و شۆخ و شەنگمان بۆ دەكات، دێت باسی (یوسف)مان بۆدەكات كە چۆن لە فێڵ و فەرەجی ژنانی ئەو سەردەمە خۆی گرت و، خۆی بەدەستیانەوە نەدا، دیارە كە ژن و پیاو– هەردوو– لای خوا گرنگن و، وەكو یەك حسێبیان بۆ دەكرێ.

كەوابوو ئافرەت دەتوانێ لە خەڵوەتگای خواپەرستیدا بژی، دەشتوانێ لە شەوە پەمەییییەكاندا ڕۆژبكاتەوە، دەتوانێ ببێتە دایكی (عیسا)، دەشتوانێ ببێتە دایكی (فیرعەون) و (هامان) و (قاروون) و دڕندەكانی سەردەمی خۆشمان، دەسا هەزاران سڵاو لەو ئافرەتانە كە پیاوی دەسپیس و، داوێن تەڕ فریوی نادات، هەزاران درورد بۆ ئەو ژنانەی خۆیان بۆ بەهەشت ڕادەگرن.

## كيژانى هەتيوو بێ باب، گەلێ ستەم وناهەقيان لێدەكرا

قورئانى پيرۆز – ئەگەر بەوردى تێڕوانين – دەبينين هەميشە دووكارى زۆر مەزن و گرنگى هەبووە، يەكێ سڕينەوەى باوونەريتى جاهيليەت و، سەردەمى نەفاميى، يەكێ بونيادنانى ياسايەكى نوێ لە جێگەى ئەودا، بۆ نموونە: ئەو ڕۆژە ئيسلام هات، كۆمەڵگە ماڤى هەتيوانى پێشێل دەكرد، بەتايبەت ئەو كيژانەى لە كۆشى خزم و كەس وكارو چاودێردا دەژيان، ئەر ماڵێكيان بووبا، دەيان گۆڕى بەماڵێكى خراپى خۆيان، يان بێ بەرامبەر دەيانخوارد، تەنانەت كە كيژەكانيان لاى خۆيان ڕادەگرت، بەو نيازەوە بوو مارەيان بكەن وماڵ وسامانەكەيان بخۆن!، ئيتر بێ ئەوە ماڤى ژن و مێردى ڕەچاو بكرێت، هەيشيان بوو، منالْ و مرۆڤى لاوازو ژنانيان لە بەشە ميراتى خۆيان بێ بەش دەكردو، دەيان دا بەو كەسانە بتوانن چەك لەشان بكەن و،بچنە گۆڕەپانى جەنگەوە.ئەو كۆمەڵگەيە، كۆمەڵگەيەك بوو بەتەواوى پلەى ئافرەتيان دابەزاندبوو، بەردەوام ستەم و ناهەقييان بەرامبەر دەكرد، گەلێ جار وەكو ميرات دەكەوتە دەستى كەس وكارەكەى، خۆ هەركە مێردەكەى دەمرد، خێرا سەرپەرستيارەكەى دەهات بەردێكى بۆ هەڵدەدا، ئەو بەردە واتاى ئەوەبوو ئەو كابرايە ئەو ژنەى دابڕيوە بۆ خۆيى و، پاشان ئارەزووى بووايە، بێ مارە دەيكردە ژنى خۆى،يان بەشووى دەداو، خۆى مارەييەكەى دەخوارد! ئەر مێرديش تەڵاقيدابا، دوايى ئەم ڕێى نەئەدا مێرد بكاتەوە! واتە: نە تەڵاقى دەدا، نەلاى خۆيشى ڕايدەگرت، ئيتر بەوە ناچار دەبوو خۆى لە مێردەكەى بكڕێتەوە ! جالەبەرامبەر هەريەك لەو ياسا نەفامانە، ياسايەكى پڕ سەروەريى و دادگەرانە هات و، سەرجەم ئەو ستەمانەى سڕيەوە، ديارە زۆربەى ئەو ياساو ئەحكامە تازەو نوێيانە لەسوورەتێكدا بەناوى سوورەتى (نساء=ژنان) كۆكراونەتەوە، چونكە گەلێ ماف و ياساى ژنان باس دەكات، ئيمەش بە پشتيوانى خوا – هەرچيمان توانى – لەم نووسينەدا باسى دەكەين، هيواداريين (خانمەكان)مان قازانجى لێ بكەن و بكەونە سەر بارى ڕاستى ژيان و، تێ بگەن كە لە نيوە دورگەى عەرەبيدا – بگرە لەتەواوى دونيادا – وەكو مرۆڤيش تەماشا نەدەكران! چ جاى ماف و هەقيان بدرێتێ، ئەگەر چى – سەد مەخابن – ئێستاش لەناو كۆمەڵگەى – بەناو ئيسلاميدا – سەرو خوارێكى زۆر هەيە بەرامبەريان، يەكێ ناهێڵێ لەماڵ بێتەدەر، يەكێ سەرەڕاى ئيش و كارەكانى ناوماڵيشى، كردوويەتى بە شوانى مەڕوماڵات و، باخەوانى باخ و كشتيارو.......هتد. ئيتر بێ بەشكردن لە ميراتى بابيان و، ڕێگرتن لە مێردكردنيان – بەئاوات و دڵى خۆيان – بڕێ جاريش بە خوێندانيان و، هێندێ جاريش بەمێرددانيان بە پياوێكى پيرو پەككەوتە و كەنەفت، يان مارەكردنى لە منداڵێكى سەر

بێشكه، یان... یان...!! ئەو كارو ڕەفتاره نادروستانه له ئەژمار نایەن. هیوادارم — بەهەموومانەوه — بتوانین ئەو ستەم و ناهەقیانه ڕاست بكەینەوەو، ژنانیش بۆ داوای ماف و هەقیی خۆیان ئازادبكەین، ئەر داوای بەشەمیراتی خۆیكرد، بەبێ ئەقڵی دانەنێین، ئەر نەیویست به فلانەكەس مێرد بكا، بەزۆر پێی نەكرێت، ئەر مێردی كردو، دوایی نەیدەتوانی لەگەڵ ئەو مێرده بژی، بەزۆر نەیبەسین به دەستیەوه، چونكه فەلسەفەی ژن و مێردی، خۆشەویستیی و سۆزو میهرەبانیه بۆ یەكتر، بێگومان ئەگەر لەجێی ئەوانەدا چەلەحانێ و هەراوكێشه پەیدابوو، دەبێ به شێوەیەكی دادگەرانه لێك بكرێنەوه، تا سەر له نوێ — هەردوو — له لایەكی ترەوه هەوڵ بۆ خۆیان بدەن و ژیان دەست پێ بكەنەوه.

ئێستا — بەئیزنی خوا — دەچینه خزمەتی سوورەتی (نساء)، بابزانین چیمان پێدەفەرموێ ؟ چ دیفاع و بەرەوانیەكی تێدایه بۆ ژنان بەر له (١٤٢٦) ساڵ، ئەگەر سەیرێكی مێژووی ناوچەكه بكرێ — سەبارەت به ژنان — بەر لەو مێژووەو، لەگەڵ باره ڕاستەكەی — كه ئیسلام خستوویەتەڕوو — چاك دەزانرێ كه هەنگاوی باش نراوەو، خزمەتی باش بەژنان كراوه،ئەمەیش وەك منەت وخێر باسی ناكەین بۆ ژنان، بەڵكو وەكو هەق ومافی خۆیان باسی دەكەین، دیاره هێمان كۆمەڵگه زۆری ماوه تەواو ڕاست بكرێتەوەو بگەڕێتەوه بۆ لای ئیسلام وله هەموو شتێكدا ((دین)) زاڵ بێ و بەرجەسته بكرێ و، كارو باری باوو نەریتی خۆیانی تێكەڵ نەكەن. جالەسەرەتای سوورەتەكەوه — لەبەرامبەر ئەو گشت سووكایەتیەوه كه بەژنان دەكرا، قورئانی پیرۆز — لەسەر زمانی پێغەمبەرەوه (محمد-ص) ڕایگەیاند كه: ژن و پیاو یەكسانن و، ژنیش هەر لەو توخمه دروستكراوه كه ئادەمی لێ دروستكراوه،یان هەر پارچەو بەشێكه له ئادەم خۆی: ((يا أيُها الناسُ اتقوا ربكم الذى خَلقكم من نَفس واحدة وَخَلَقَ منها زوجها...))٢/٤. پێغەمبەریشﷺ له ڕووی ئەو گشت زاڵم و ستەمكارانەوه له ژنان، وەستاو فەرمووی: ((إنما النساء شقائق الرجال/ رواه أحمد وأبوداود والترمزى وغيرهم)).واته:ژنانیش وەكو پیاوانن، یان هەر له پیاوان بەدیهێنراون.

ئەو خەڵكانەی بەر له ئیسلام خواناسییان دەكرد، پێیان وابوو، دایه (حەوا) هۆی سەرەكی دەرپەڕاندنی بابه (ئادەم) بووه له بەهەشت و، تەنها ژنان هۆكاری ئەو كاره بوون، ئیسلام ئەوەشی سڕیەوەو كردیه تاوانی هەردوو:﴿فأزلّهما الشيطانُ عنها فأخرجهما مما كانا فيه.....﴾ أعراف/٢٠. بەڵكو له هێندێ ئایەتا بەتەنها دەیخاته سەرشانی پیاو: ﴿وعصى آدم ربه فغوى..﴾ ١٢١/١٦.

ئیسلام هات و چوو بەگژ ئەو خووه پیسەیاندا كه: هەر كەسێكیان بینیبا كیژی بووه،

زۆر خۆی بێ تاقەت و بێ وزە دەکردو، خۆی بەکەم و سووك و کەم بەها دادەنا ! نەیدەزانی چۆن ڕای بگرێ ؟ زیندە بەچاڵی بکا باشە، یان قبووڵی ئەو گشت سووکایەتیەی ناو کۆمەڵگەیە بکاو نەیکوژێ: ﴿وإذا بشر أحدهم بالأنثى ظل وجهه مسودا وهو كظيم. يتوارى من القوم من سوء ما بُشر به أيمسكه على هونٍ أم يدسه في التراب ألا ساءَ ما يحكمون﴾ نحل: ٥٨-٥٩. ئەمەو بەدەیان خوڕەوشتی نادروست و ناڕەوای تریان. سەیری (المرأة بين الفقه والقانون) بکە.

* لە (بوخاری)یدا هاتووە کە: کیژە هەتیوەکان لای خزم و کەس و سەرپەرستیارەکانیان دەژیان، پاشان حەزیان لە ماڵ و سامان و باخ و باخاتەکەیان دەکرد، ئەوسا - لەبەرئەوە - دەهاتن مارەیان دەکردن، بێ ڕەچاوکردنی مارەیی و مافی ئاسایی خۆیان، جا بۆ دوایی لەو کارە ناپەسەندەیان ڕێیان لێگیراو فەرمووی: ﴿وَإن خفتم ألا تقسطوا في اليتامى فانكحوا ماطابَ لكم من النساء مثنى وثلاث ورباع...﴾ واتە: ئەگەر لە بارەی کیژە هەتیوەکانەوە، ترستان هەبوو نەتوانن بە شێوەیەکی ڕەواو دادگەرانە ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن (ترستان بوو ماڵ و داراییەکەیان بخۆن و، مارەییان بۆ دانەنێن و ستەمیان لێ بکەن) دەبێ وازیان لێ بێنن و مارەیان نەکەن، جاکە ئەم ئایەتە - لەمەڕ ئەو کچە بێبابانەوە - هاتە خوارێ، موسڵمانەکان لەبەر پەرۆشی بۆ دینەکەیان، کەوتنە ناو کۆمەڵێ پرسیار لەکاروکردەوەکانی بەر لە ئیسلامیان، چونکە بەر لە ئیسلام بەبێ دینانە ژیاون و، هەرچیش لە بەرژەوەندییاندا بوو، بێ کردوویانە، بەڵام ئێستا مەنهەج و دەستووری هەتا هەتاییان بۆ هاتووە، بۆیە لە گشت کارێکیاندا - دەترسان نە وەك لای ئیسلام پەسەند نەبێ و، لای خواش یاخیبوون بێ، بۆیە پەیتا پەیتا لە پێغەمبەر ﷺ دەپرسن: ئاخۆ ئەوە شتە حەڵاڵ بێت، یان حەرام و قەدەغە بێت..؟.

(ئیبن عەباس) دەڵێ: لە سەردەمی جاهیلیەتدا هەندێ هەبوون، کیژۆڵەی هەتیویان بۆ بەخێوکردن هێنابوویە لای خۆیان، بۆ دواییش بەشێوەی ئەو سەردەمە دیاریی دەکرد بۆ خۆی ! ئیتر کوڕ نەبوو بوێرێ لێی نزیك بێتەوەو بیخوازێ، پاشان ئەگەر خۆی حەزی لێکردباو جوان بووبا، مارەی دەکرد بۆ خۆیی و، ماڵەکەشی دەخوارد ! خۆ ئەگەر حەزی لێ نەکردبا، ئەوا هەر نەیدەهێشت مێرد بکا، هەتا دەمردو بۆ خۆی ماڵەکەی بە میرات دەخوارد، خوا ئەوەشی ڕێ لێگرتن و، بۆ تەواو کردنی کاروباری کیژە هەتیوەکان ئایەتی: (١٢٧)ی سوورەتی (نساء) هات و فەرمووی: ﴿ويستَفتونك في النساء قل الله يفتيكم فيهن وما يتلى عليكم في يتامى النساء اللاتي لا تؤتونهن ما كتبَ لهن وترغبون أن تنكحوهن....﴾ ئیتر خودا ڕێی لێگرتن و بڕیاریدا کە دەبێ وازیان لێ بهێنن و بچن لەجێی ئەواندا ژنانی تر -

چەنتان پێ باشە – مارە بکەن: دوان، سیان، تا چوار پێکەوە، بەمەرجێ دادگەربن لەگەڵیانداو، ستەم لە هیچ کامێکیان نەکەن (لە جل وبەرگ و، خواردن و جێی حەوانەوەو خانووبەرەو سەرجێیدا). ﴿فإن خفتم ألا تعدلوا فواحدة أوماملكت أيمانكم ذلك أدنى ألاتعولوا..﴾ واتە: ئەگەر ترسان و پێتان وابوو ناتوانن وەکو یەك بەدادگەرانە تەماشای ژنەکانتان بکەن، وەکو خواش دەفەرمووێ: ﴿ولن تستطيعوا أن تعدلوا بين النساء ولو حرصتم...﴾. دەبێ یەك ژن مارە بکەن – ئەویش لەگەڵ ڕەچاوکردنی ماف ژن و مێردی لەنێوانیاندا – یان لەگەڵ ئەوانە بن بەیاسای ئەو سەردەمە بوونەتە موڵکتان، بۆ خۆ لە غەدرگرتن – لەژنان – یەك ژن پەسەندە. هەندێ لە تەفسیری (أدنى ألا تعولوا)دا دەڵێن: ئەم ئاکارە نزیکە بەوەوە کە ئەرکی ماڵ و منداڵتان زۆر نەبێ لەسەرتان و، بتوانن خواپەسەندانە ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن.، مەسەلەی ئاکاری چاك و خواپەسەندانە لەگەڵ هەموو بوونەوەردا، حوکم و بڕیاری خوایەو، دەبێ هەر شتە بەپێی شیاوی خۆی دادگەری بۆ ڕەچاو بکرێ، خۆ بێ شك مرۆڤ بۆ مرۆڤ دەبێ پتر بپارێزرێ، بەتایبەتی ئەو ژنە دەبێتە هاوسەرت، ئەگەرچی یەك ژنیش بێت، پێغەمبەرمان محمد ﷺ لە زۆرێك لە فەرموودەکانیا دەفەرمووێ: ((استوصوا بالنساء خيرا، فإنهن عُوانٌ عِنْدَكُمْ... فَحَقُكُمْ عَلَيْهِنَ: أَنْ لا يوطِئْنَ فرشكم من تكرهون، ولا يأذن في بيوتكم لمن تكرهون، ألا و حقهن عليكم أن تحسنوا إلهين في كسوتهن و طعامهن)). (رواهُ أحمد، أبوداود، ترمزي، وإبن ماجه). خۆ ئەگەر بوونە دوو ژن هەتا چوار، دەبێ ئاگاداری ئەو یاساو ڕێسا تایبەت بە فرە ژنی هەبێ.

## فرە ژنێتی

تا چوار ژن – لەئیسلامدا – ڕێی پێدراوە، بەمەرجی ڕەچاوکردنی (عەدل)و دادگەری لەنێوانیاندا، هەرکەسێ دڵنیا نەبێ کە بە (عەدل) ڕەفتار دەکات لەگەڵیاندا، ڕێی پێنادرێ لە تەنها ژنێ زیاتر مارە بکات. ئەم (عەدل)ـەش کە لە ئایەتەکەدا هاتووە: ﴿فإن خفتم ألا تعدلوا فواحدة...﴾ دەبێ هەبێ، ئەوسا فرەژنی حەلاڵ دەبێ. زاناکان یەکدەنگن لەسەریی و، پێغەمبەریش ﷺ خۆی بەکردەوە تەفسیری کردووە، کە مەبەست دادگەریە لە جێ حەوانەوەو خانووبەرەو جل وبەرگ و خواردن و خۆراك و خواردنەوەو هەرشتێکی تریش، بەپێی یاسای ناوچەکە بۆ فرەژنی پێویستەو بەکاردێت.

فرە ژنی – بەر لەئیسلام – هیچ سنورێکی نەبووەو، لای (چینی و هنوودو، بابلی و ئاشوریی و میسریەکانیشدا) باو بووە، ئەوەتە شەریعەتەکەی (لیکی) چینیی، تا (١٣٠) ژن

ڕێگەیداوە، وەلای یەکیٚ لە (ئەباطرە)کانیان (٣٠)هەزار ژن هەبوو، (جولەکە)ش بیٚ سنوور ڕێیان بەفرە ژنی دەدا، تەنانەتی پێغەمبەرەکانیان فرە ژنە بوون، لە تەوراتدا هاتووە کە: (سولەیمان) پێغەمبەر ـ ﷺ ـ (٧٠٠) ژنی ئازادو، (٣٠٠) کەنیزەی هەبوو! بەلاٚم لە (ئینجیل)ەکاندا، بە راشکاوی دەقێك نییە ریٚ لە فرە ژنی بگریٚ، بگرە مێژوو دەلێت: مەسیحیە پێشینەکانیش فرە ژن بوون.

(وسترمارك) زانای خاوەن متمانە لە مێژووی پیاوو هاوسەردا دەلێت: بەپیٚی قسەی کەنیشتە، فرە ژنی تا سەدەی (١٧) هەم مابوو و، بیٚ ئەژمار روویدەدا. (دیارماسدت) پاشای (ئێرلەندە)ش دوو ژن و دوو کەنیزەی هەبوو. سالٚی (١٦٥٠) زایینی، پاش ئاشتەوایی (سنفالیا)و، پاش ئەوە ژمارەی دانیشتوان بەهۆی جەنگە سـی سـالٚ درێژخایانـەکەوە – کەمبوویەوە، ئەنجومەنی (فرنکین) لە (نورمبرج) بڕیاری دووژنی دا. جاکە دینی ئیسلام هات، فرەژنی سنووردار کردوو، یاساو ڕێسایەکی بۆ دیاریکردو، بڕیاریشیدا بەدەر لە چوار ژن قەدەغەیەو ڕێگای نییە، ئەگەر چی وەکو گوتمان پێش ئیسلام بە هەزاران هەزار، ژنیان ڕادەگرت و دەیانکردە هاوسەر،پاشانیش ئیسلام کەڕێگەی فرە ژنیدا، زۆر پیٚی لەسەر ڕەفتاری دادگەری لەنێوان ئەوژنانەدا داگرت، تەنانەتی پێغەمبەرمان (محمد ﷺ) ئەوەندە سوور بوو لەسەر جێبەجێکردنی (عەدل) لە نێوان خێزانەکانیدا، لەکاتی نەخۆشییەکەشی هەمان بەرنامەی هەبوو هەولٚی دەدا کە: هەر شەوەی لای مالٚی یەکێکیان بمێنێتەوە، تا ئەو ڕۆژە کە نەخۆشییەکەی زۆری بۆ هێناو نەیدەتوانی بەئاسانی بەسەر مالٚەکاندا بگەڕیٚ، ئەوجا لە ژنەکانی مۆلٚەتی خواست کە لە مالٚی یەکێکیاندا بمێنێتەوە، ئەوەبوو چوویە مالٚی خاتوونە (عائیشە)و، پاش چەند ڕۆژێکی کەم بەو نەخۆشییەوە– درودو سلاٚوی خوای لەسەر بێت – کۆچی دوایی کرد.

جا بۆ دوایی لە ڕەفتارو گوتەی پێغەمبەریشەوە ﷺ زانا فەقیهەکان – درێژەیان بەباسی هەلٚسوکەوت لەگەلٚ ژناندا داو ناویان نا (قەسم)، واتە: دابەشکردنی کات و، ئەندازەی مانەوە لای ژنان و، دابینکردنی جێگەو ڕێگەی حەوانەوەو نان ونەفەقە یان. سەیرێکی (المنهاج)ی نەواوی بکە.

## فرە ژنی لە چەند ڕوویەکەوە پێویستە

### ١- لە ڕووی کۆمەلاٚیەتییەوە:

بیٚ شك گەلیٚ هۆو سەبەبی کۆمەلاٚیەتی هەیە، ڕێگە بەفرە ژنی دەدەن، لەوانە:

أ – زیاد بوونی ژمارەی ژنان لە ژمارەی پیاوان، وەکو لە هێندیٚ ناوچەدا بەیناو بەین

ڕوودەدا، بێ ئەوە جەنگ و هەراو ئاژاوە لەو ناوچەکەدا هەبێت، بێگومان فرەژنی لەکاتی ئاوادا، ئاکارێکی ئەخلاقیی و کۆمەڵایەتیە، چونکە ئەگەر وانەکرێ، دەبێ ئەو ژنە زیادانە بێ سەرپەرست و بەخێوکەر، لێرەو لەوێ بسووڕێنەوەو، خەریکی لەشفرۆشی بن. دکتۆر (سباعی) دەڵێت: پزیشکێکی (هلسنکی/فنلەدیی) پێی گووتم لە هەر چوار منداڵێك کەلەدایك دەبن، سیانیان کچن و، یەکێکیان کوڕە، گەلێ لە خۆرئاواییەکان — لەم دواییەدا — لە زۆر بوونی ژنانی بێ سەرپەرست و لەشفرۆش و، زۆربوونی منداڵی غەیرە شەرعیی، بەخۆیاندا چوونەوەو ڕایانگەیاند کە: تەنها چارەسەرێك بۆ ڕێگرتن لەو کارە دزێوو نالەبارەی ناو کۆمەڵگەیە، ڕێدانە بە فرەژنی. ڕۆژنامەی (لاغوص) لە ژمارەی ڕۆژی (٢٠)ی نەیسانی ١٩٠١ زایینی، بە پێنووسی خانمێکی ئینگلیزی، ئەم ڕاستییەی بڵاوکردەوە.

ب– لە کاتی شەڕ و ئاژاوەو جەنگەکاندا، دەکرێ پیاوێکی زۆر تیا بچێت و، ژنێکی زۆر بمێنێتەوە، وەکو ڕوودانی دووجەنگە جیهانیەکە، کەبەڕاستی پیاو ولاوێکی زۆر بوونە قوربانیی و، چەندین کیژوو ژنان بێ سەرپەرست و مێرد دەسووڕانەوەو لە بارودۆخێکی زۆر تاڵو تفتدا دەژیان، ئەوروپا گەیشتە حاڵەتێکی وا، خۆزگەیان دەخواست: پیاوێك هەبووبا — جگە لە ژنەکەی خۆی — چاودێری ژنێکی تری کردبا، دەئاخۆ لەو حاڵەتانەدا خۆ کەڕو کوێر کردن باشترە، یان ئاوڕێك بەلای ئەو ژنانەوە بدرێتەوەو، داخوازیەکانیان وەڵام بدرێتەوە؟

**٢- لەڕووی کەسێتی مرۆڤەوە:**

بێ سۆ حاڵەت گەلێك هەن، دێنە پێش و دووچاری مرۆڤ دەبن، لەوحاڵەتانەدا، چارەسەر تەنهاو تەنها ڕێ پێدانە بە فرە ژنی، بۆ نمونە:

١– خێزانەکەی نەزۆکە و، منداڵی نابێ و، ئەویش زۆر حەزی لە منداڵەو، دیارە خۆ لەمەشدا هیچ لۆمەیەك ناکرێ کەسێ حەزی لە منداڵ بێ، ئینجا ئەو مرۆڤە دوو ڕێگە چارەسەری لەبەردەستدایە: یان ئەوەتە دەبێ هاوسەرەکەی تەڵاق بدا، یان ئەوەتە بچێ ژنێکی تر بێنێت، بێگومان ژنەکەی ڕابگرێ و، بچێ ژنێکی تر مارە بکا، لە ئاکارو ئەخلاقی جوامێرانەوە نزیکەو، ئەمەش لەبەرژەوەندی ژنەکەدایە، چونکە ئەگەر وانەکرێ، دەبێ ژنەکە تەڵاق وەرگرێ و، بچێ یان ژورێك پەیدا بکات بۆ خۆیی و، بەتەنیا تێیدا بژی، یان دەبێ بگەڕێتەوە لای خزم و کەس وکاری، کە بێگومانیش ئەمانە لەبەرژەوەندی ژنەکەدا نین، کەوابوو چار هەر ڕێ پێدانە بە ژنێکی ترو، کابراش بێ فەرق و جیاوازی و، بەو شێوەیە شەریعەتی ئیسلام، بۆی دیاریکردووە بە عەدل — ڕەفتاریان لەگەڵ بکاو، تۆزقاڵەیەك بەلای هیچ کامێکیاندا لانەدا.

٢- ژنەکە تووشی نەخۆشییەك بووەو کەنەفتی سەر جێگەی کردووە، یان نەخۆشییەکی قێزەونی وای گرتووە، ژیان لەگەڵیا - بەو نەخۆشییەوە - سروشتی مرۆۆ بۆی هەڵناگیرێ و، ناتوانێ وەکو ژنێکی ئاسایی هەڵس و کەوتی لەگەڵ بکات، دووبارە مێردەکە - لەم کاتەشدا - دوو رێی لەبەردەم دایە: بچێ تەلاقی بداو وازی لێ بهێنێ، بابەو نەخۆشییەوە بتلێتەوە تا دەمرێ - کە بێگومان - دیسان ئەمە لەکاری مرۆڤی بەوەفاو بەئەمەك ناچێ، یان دەبێ رێی پێبدرێ ژنێکی دیکە بێنێ و، ژیانی لەگەڵدا بەرێتەسەر، ئایا ئەم دووانە کامیان لەبەرژەوەندی ژنەکەدایە؟

٣- دەگونجێ ژنەکەی - بەهەر هۆیەکەوە بێت - نەتوانێ ئارەزووی مێردەکەی تێربکا، جا لەحاڵەتی ئاوادا ئەگەر ئەو مێردە خۆی گرت و بەئارام بوو، دیارە هەراو کێشەیەك نییە، خۆ ئەگەر خۆی بۆ نەگیراو چارەی نەبوو، ئاخۆ رێ بەو پیاوە بدرێ بچێ بە شێوەیەکی ناشەرعیی و حەرام، لەگەڵ ئەم ژنەکەو، ئەو ژنەکەدا ڕابوێرێ و ئارەزووی خۆی تێر بکات - کە ئەمەش دیسان ژنی یەکەم هەر پێی ناخۆشە، لەو لایشەوە مافی ئەم ژنە دووەمە دەفەووتێ و، منداڵەکانیشی بەناشەرعیی دەدرێنە قەڵەم و بەخێوکەریان نابێت... یان بچێت بەشێوەیەکی شەرعیی و یاسایی ژنێکی تر مارەبکاو، هەردوو پێکەوە - بێ جیاوازیی - مامەڵەی شەرعیان لەگەڵ بکاو لەگەڵ هەردوولا بەسۆزو دلۆڤان بێت ؟

## پرسیارێکی سەیرو سەمەرە؟!

لەوانەیە هێندێ ئافرەت بڵێت: باشە! کە ئەو هەموو پاساوەت هێنایەوە بۆ ڕێ پێدان بە هێنانی ژنی دووەم، یان سێیەم و چوارەم، ئەی بۆچی هەرهەمان پاساو نابنە هۆی فرە مێردی بۆ ژنان؟ ئەگەر ژنێك مێردەکەی تووشی حاڵەتێك لەو حاڵەتانە بوو، ئاخۆ تەلاقی لێ وەرگرێ باش بێت ؟ یان بچێت مێردێکی تر بکاو، با هەردووکیشیان مێردی بن !

وەڵامی پرسیاری وا، وادەزانم هەموو ژنێکی ژیرو خاوەن هۆش دەیزانێ و، دەشزانێ کە فرە مێردی بۆژنان شەرعیەتیشی هەبێ و منداڵەکانیش بەناشەرعیی دەرنەچن، هەرگیز شتی وا دەست ناداو ناکرێ، چونکە خوای گەورە - بەپێی سروشت - پیاوی وەك ئامێر دروستکردووە، چۆن کاری پێ دەکەیت و، لە چ جێگایەك کاری پێدەکەیت، دەکرێ و دەگونجێت، ژنیش وەکو (زەرف) دەبێ شتی تێ بکرێ، بێگومان ئەگەر ڕێگە بدرێت کە چەند کەسێك هاتووچۆی یەك ژن بکەن و تێکەڵی بکەن، ئەو نوتفەیە تێکەڵ دەبێ و، نازانرێ منداڵەکە بەکامیان بدرێ؟ لەو لایشەوە چەند پیاوێك هاتووچۆی ژنێك بکەن، ئاخۆ نۆرەیان بۆ دابنرێ؟ کامیان تەمەنی زۆر بێ، ئەوەیان پێش بخرێت؟ یان ژنەکە خۆی کەسێکیان دیاری بکا.؟

ئێمەش ئەم پرسیارە دەکەین و دەڵێین: ئایا شتی وا دەکرێ و، سروشتی ئەو ژنە — وەکو ئاژەڵ — ئەوەی پێ قبوڵ دەبێو، ئەو چەند پیاوە دەیانکرێ پێکەوە؟ لەولایشەوە دەبێ منداڵ و بەرهەمی بۆ کامیان بێت؟! وەئایا سۆزو خۆشەویستی لەگەڵ چەند کەسێکی ئاوادا، وەکو خۆشەویستی و سۆزی نێوان ژن و پیاوێکە بە تەنها — دووبەدوو — بۆ خۆیان بە ئاسوودەو بێ هەراو کێشە بژین ؟ لەولایشەوە سروشتی ئادەمیزاد —بەئیسلامیی و نائیسلامییەوە — لەگەڵ ئەوەدا نەبووەو نەیکراوە کەژنێك چەند مێردێکی هەبێت، ئینجا بۆ مەسەلەی تێرکردنی ئارەزووی جنسیی ژنەکە، ئەگەر مێردەکەی نەیتوانی تێری بکات — لەبەر نەخۆشیی، یان لەبەر پیریی، یان لەبەر هەر هۆیەك بێت — دەتوانێ پێشنیاری خۆی ئاڕاستەی دادگا بکاو، سکاڵاکەی بگەیەنێتە ئەوێ، بێگومان دادوەر لێکیان دەکاتەوە، پاش لێکۆڵینەوە لەداواو سکاڵای ژنەکە. (المرأة بين الفقه والقانون).

سەرباری ئەوانەیش هەموو، فرەژنی لە ئیسلامدا نە (واجب)ـەو نە(سوننەت)، بەڵکو بۆ دورخستنەوەی کۆمەڵە خەڵکێکی زاڵم و ستەمکارە لە خواردنی ماڵو دارایی کیژە هەتیوەکانە لە ڕێی مارەکردنیانەوە، قورئان بەو تەماحبازانە دەڵێ: ئەگەر لە مارە کردنی ئەو کچە بێ بابانەدا دەترسان ماڵو سامانەکەیان بخۆن، دەسا واز لەوانە بێنن، بچن ژنی تر لەبەر دەستاندا هەیەو تا چوار مارە بکەن، کەوابوو ئەم مەسەلەی فرەژنیە لەڕێیەکی دوورەوە سەری هەڵداوەو، بە کۆمەڵێ مەرجەوە هاتووە، واتە: لەبەر خۆی (تەشریع) نەکراوەو، ئەوندە شتێکی گرنگ نییە لە دینی ئیسلامدا، بۆیە بە ((ئەگەر)) و ((گریمان))ـەوە باسی دەکات: ((وإن خفتم أن لا تقسطوا في اليتامى...)). لە ئایەتی پاش ئەوەشدا دەفەرمووێ: ((فإن خفتم ألا تعدلوا فواحدة أو مالملكت أيمانكم...)) دواتر دەفەرمووێ: ((ذلك أدنى ألا تعولوا)) گرتنی ڕێگەی یەك ژنی نزیکترە بە (عەدل)ـەوە، کەوابوو بێ هۆی شەرعیی هەڵمەکوتنە سەرفرەژنی، چونکە بەناعەدالەتییەوە نزیك دەبنەوەو، لە حاڵەتی ئاواشدا فرەژنی حەرام دەبێ، ئەگەر چی نیکاحەکەش لای زاناکان بەدامەزراو دابنرێ.

من وادەزانم ئەوەند کە ئیسلام ئەگەرو نەگەر دەخاتە بەردەم فرە ژنی، مەبەستی ئەوەیەکە مرۆڤەکان هەتا بتوانن لێی دورکەونەوەو، بچنەوە بۆ لای یاسای یەك ژنیی و، لەگەڵ یەك ژندا تێهەڵچن، خۆئەر لە (قەید)و (قیوود)ی ئایەتەکەش ورد ببینەوە، ئەوا دەزانین کە فرەژنی بۆ خۆشیی و ڕابواردن نییە، بۆ تۆڵە سەندن نیە لە ژنی یەکەم، یان لەکەس و کارەکەی، بۆیە دەتوانرێ لەلایەن کاربەدەستانی دەوڵەتی ئیسلامییەوە، کۆمەڵێ مەرجی تری بۆزیاد بکرێ و، هێندێ شتی (تعديل)بکرێ، دیسانەوە ئەگەر سەیری زەرەرو زیانەکانی فرەژنی بکرێ و،

ئێستاش پێشەوا (عومەر) – خوای لیٚ ڕازی بێت – لەژیاندا بووبا، ڕایدەگرت، هەروەکو ساڵی گرانیەکە، بڕینی دەستی دزی ڕاگرت، یان بە جاریٚ سیٚ تەلاقەکەی دەخست، یان بەش (مؤلفة القلوب)ی ڕاگرت. ئەمەش نابێتە مانای گۆڕین و دەستکاری بڕیارەکانی خوا، بەڵکو کاری وا دەبێتە هاندەری پیادەکردنی بڕیارەکانی خوا، چونکە کەدەستی دز لەو کاتەدا نابڕیٚ، بۆ ئەوەیە کە دۆڵەمەندەکان لە هەژاران بپرسنەوە، سیٚ تەلاقە (أنت طالق ثلاثا) بە کەڕەتیٚ دەخات، بۆ ئەوەیە خەڵکی لە تەلاق خواردن دەسهەڵگریٚ، ئەمەیش کە ڕیٚ لە فرەژنە دەگیردریٚ، بۆ ئەوەیە خەڵکی بە عەدالەت ڕەفتار لەگەڵ ژنان بکەن.

## ئەگەری سەرهەڵدانی ئاڵۆزی لە فرە ژنییدا

هـیچ گومانێـك نییـە کـە فرەژنـی – لەگـەڵ ئـەو پاسـاوانەدا بـۆی هێنرایـەوە – ئەگـەری سەرهەڵدانی کۆمەڵیٚ باری خراپ و نالەباریشی هەیە، لەوانە:

١- سـەرهەڵدانی نـاکۆکی و دژایـەتی لـە نێـوان ژنەکانـدا، بەشـێوەیەك خەریکـە خانوولانەیان بەسەرا بڕووخێنیٚ و، پیاوەکەش دنیای لیٚ دەبێتـە جەحەنـدەم و، هەمیشـە بیر لەوە دەکاتەوە، چۆن خۆی ڕزگار بکات لـە دەستیان، ئـەم شـاعیرە چەنـدە جوان و واقیعیانـە نمونەی پیاوی دووژنە باس دەکات:

| | |
|---|---|
| تزوَجـــت اثنـــتين لفـــرط جهلـــي | وَقــد حـــاز الـــبلاء زوج اثنـــتين |
| فقلـــت أعـــيش بينهمـــا خروفـــاً | أنَعَّـــمُ بـــين أكـــرم نعـــــــجتين |
| فجـاءَ الأمـر عكـس القـصد دومـاً | عـــــذاباً دائمـــــاً ببلـــــيَّتـــــين |
| لهـــــذى ليلـــــة وتلـــــك أخـــــرى | نقـــــار دائـــــم في الليـــــــلتين |
| رضـــا هـــذى يهـــيج ســـخط هـــذى | فــلا أخلــو مــن إحــدى الــسختطين |

واتە: لەبەر نەزانین ونەشارەزاییم، هەستام دوو ژنم هێنا، کەچی نەهامەتی هەردووکیانی گرتەوە ! گوتم: بۆ خۆم وەکو بەرخێك لەنێوان دوو مەڕی چاکدا بۆ خۆم دەژیم، کەچی بە پێچەوانەوە بۆم هات و، هەمیشەش گیرۆدەی دەستی دووبەلاٚبووم، شەوێکم بۆ ئەمیان داناو، شەوێکیش بۆ ئەویان، کەچی هەردوو شەوەکە شەڕە دەنووك بوو، هەرکامێکیان ڕازی بکەیت، ئەوی دیکە تووڕەیە! کەوابوو لە یەکێك لەو دووانە هەرگیز نەجاتم نابیٚ.

٢- ئەگەری پەیدابوونی ناکۆکی و بەربەرەکانیٚ لەناو منداڵەکانیاندا، بە شێوەیەك قابیلی چارەسەر نەبیٚ، دیارە ئەوەش بەپلەی یەکەم، ژنی یەکەم ئەوەدەکات و، دڵی منداڵەکانی پڕ دەکات لە رك و کینە، بەمەبەستی تۆڵە وەرگرتنەوە لەو ژنە دووەمەی شووی

بەسەر ئەمدا کردووە، دەگەنە حاڵەتی دژایەتی لەگەڵ یەکتر، بگرە هێندێ جار دەچنە سەنگەر بۆ یەکتر.

بەڵێ یاسای فرەژنی – لەگەڵ رەچاوکردنی عەدل و عەدالەت – یاسایەکە پڕە لە ئەخلاق و قییەم، بۆ مرۆڤی رەسەن و دەست پاك و داوێن پاك، چونکە رێ بە پیاو نادات بە ئارەزووی خۆی و، هەرکات ویستی و، حەزی لە هەر ژنێك بوو پەیوەندی پێوە بکاو، دەست درێژی بەسەر ژنەکەیدا بکاو، گوێ بەوە نەدا، ئاخۆ ئەو رازی بێت یانا؟ دەرەنجام دوای بکەوێ و واز لەم بهێنێ ؟ ئەم یاسایە مرۆڤ دەبەستێتەوەو ناهێلێ لە سنووری خۆی بچێتەدەر، رێگە بە هیچ پیاوێك نادات، بە نهێنی و پەنامەکی و لەژێرەوە پەیوەندی لەگەڵ ژنانی خراپ و نارەسەندا ببەستێ، تەنانەتی بۆ تەنها ژنێکیش دەبێ بەئاشکرا مارە بکرێ و دەف بۆ لێ بدرێ و زەماوەندی بۆ بکرێ و، خەڵکی گوند، یا گەڕەکی لێ بزرێنێ و، بەر لە هەموو شتێك دەبێ براو خزم و کەس وکاری ژنەکە ئاگاداربن.

بەڵام (خۆراوا) کە ئەوەندە لە فرە ژنی دەترسێ و، ئێستاش – بەرەوالەت هێندێکی لای خۆمان شین و گریە دەکەن بۆ کلۆڵی ژنان! – رازی نابن پیاوێك بچێتە دادگاو، عەقدی ژنێکی دووەم، یان سێیەم بەپێی کۆمەڵێ یاسای شەرعیی و یاسایی، گرێ بداو، بەشێوەیەکی رەسمیی و بە ئاشکرا پەیوەندی پێوە بکاو، هەر منداڵێکیشی بوو ماف نەفەوتێ و، لای کۆمەڵـگەش بەدنـــاو نــەبن، بۆ ئەمە رازی نین، کەچی بە غەیرە شەرعیی و نایاسایی لەبەردەم یاسای ئەو وڵاتەداو، لە پێش چاو سەرۆك کۆمارو، سەرۆك وەزیران و، باب و دایك و خزم و کەس و کاریەوە رێگە دەدات بە پیاوان بە ئارەزووی خۆیان لەگەڵ دەیان و سەدان کیژۆڵەدا دەست تێکەڵ بکاو، لەگەڵیا – بەهەموو شێوەیەك – رابوێرێ ! نابێ هیچ کەسیش فزەبکا، سەد جار ژنەکەی، یان کچەکەی بەدەستی ئەم و ئەوەوە ببینێ، بۆی نییە بە شێوەیەکی پێناخۆش بوون، چاو بەرزبکاتەوە !

سەیر ئەوەیە، ئەوانە کە دیفاع لەژنان دەکەن و، رێگە نادەن بەفرە ژنیی، هەر کامێکیان بگری، لەوانەیە بە دەیـان ژنـی، بۆ خۆیـان – بـێ سنوور – لەگـەڵ ئـەم و ئـەودا رادەبوێرن و، گـوێ بـە بـاوك و دایـك وخـزم و کـەس و کـار نـادەن، تەنانـەتی لەلایـەن پیـاوانی (حیـزب و دەوڵەتەوە) رێگرتن لە فرە ژنی، بۆتە پسووڵەیەکی خۆهەڵکێشان و، خۆبردنە پێشەوە لەناو کۆمەڵگەی ژناندا، لەوانەیە بەو رێگرتنە هەزاران هەزار دەنگ بۆ خۆی مسۆگەر بکات بۆ کاتی هەڵبژاردن و، لەوانەیە خۆیشی دوو سێ ژنی رەسمیی هەبێ، غەیرە رەسمیش خوا دەیزانێ. خۆ زیانی فرە ژنیش هەرگیز ناگاتە ئەو بێ سنووری و بەرەڵڵایی یە کە ئەمرۆ لەلایەن دەیان

و سـەدان كـچ و كـوڕەوە – ژێـر بـە ژێـر – دەكـرێ و لەگـەڵ یـەك ڕادەبـوێرن، وادەزانم ئەگـەر پزیشك و دەرمانخانەكان نەبووبان، ئێستا ڕێژەی منداڵی ناشەرعیی و لاكۆڵانیی، مەگەر خـوا خـۆی زانیبـای، دەباشـە، ئەگـەر چـوار كـچ لەوانـە بـە شـێوەی شـەرعیی لـە كـوڕێكی لاو مـارە بكـرێن باشـتر نییـە ؟ باشـە كـێ بـەر پرسـە لـەو هـەموو داوێـن تـەڕی و بـەرەڵڵایی و منداڵـە ناشەرعیانە – كە لێرەو لەوێ– لەدایك دەبن ؟ نابێ دەوڵەت و كار بەدەستانی سـەردەم بیرێ لەو ئازادیە بێ سنووره بۆگەنەیە بكەنەوەو، ئەوەنـدە نـەهێڵن كـچ و كـوڕ بـەو شـێوەیە تێكـەڵ ببن و وڵاتەكـەمان پـڕ بكـەن لـە كـاری ناپەسـەندو دزێـو ؟ دەبـێ دەوڵـەت پـێش هـەموو شـتێك خەمی كچ و كوڕە لاوەكـان بخـوات، ئاسـانكاری بـە یەكگەیانـدنیان بـۆ بكـات، تـا بتـوانن ببنـە خـاوەنی خێـزان، هـەر لاوەی پێویـستی بەچـەندەیە لـە پێداویـستییەكانی بـۆ ئـەو كـارە، بـۆی دابین بكات، تا زاڵ دەبن بە سەر ئەو حاڵەتە دزێوو نامۆیەدا، هاتۆتە وڵاتەكەمانەوە.

ئازادی بۆ ڕابواردنی كچ و كوڕ – هەرچۆنێكیان ویست – زۆر بە هەرزان و ئازادانە دەست دەكەوێ ! بەڵام ئازادی بۆ دەربڕینی ڕاوبۆچوون و بیروفیكرەو، بیركردنەوە بۆ ئاینده و چارەنووس،بۆ دینداریی و خواپەرستیی، كارێكی قەدەغەو بڤەیە !.

<u>**تێبینی:**</u>

(ئیبن جەریر) سەبارەت بە فرەژنی لەتەفسیری ئایەتێكدا دەڵێت: (وَأولى الأقوال التى ذكرناها فى ذلك بتأويل الآية قول من قال: تأويلها: وَإن خفتم ألاتقسطوا فى اليَتامى، فكذلك فخافوا فى النساء فلا تنكحوا منهن إلا مالا تخافون أن تجوروا منهن من واحدة إلى الأربع، فإن خفتم الجور فى الواحدة أيضاً فلاتنكحوها ولكن عليكم بما ملكت أيمانكم،فإنه أحرى ألاتجوروا عليهن(١))) واتە: تەفسیری شیاوو پەسەند – لەناو گشت ڕاكاندا – قسەی ئەو كەسەیە دەڵێت: كە ترسان لە مارە كردنی كچە هەتیوەكاندا دادگەر نەبن، دەبێ هەر ئاواش لەكاروباری ژنانی تردا ترستان هەبێ و، نابێ ئەو ژنانە مارە بكەن – یەك هەتا چوار – كە دەزانن ستەمیان لێ دەكەن، تـەنانەتی ئـەگەر دەتـانزانی ئەر ژنێكیش بێت، ئێوە هەر ستەمی لێ دەكەن نابێ ئەویش مارە بكەن، بچن لەباتی ئەوان كەنیزە مارە بكەن، چونكە ئەوان حسێبی سەرجێیان جیاوازە.

دەبا ئەوانەش لە ڕێساو یاسای ئیسلام، دژ دەدوێن و، پێچەوانەی ئەو، پەروەردەی كچ و كوڕ دەكەن و، دەیانەوێ هەر بە منداڵی پێكەوە گەورەببن و، پێكەوەش بژین و، پێكەوەش لە قوتابخانەدا بخوێنن، هەتا شەرم و شكۆو حەیایان لانەمێنێ و، سبەینێش زۆر بە ئاسایی لە سەر جادەكان و كۆڵانەكان و، لەشاری گەمەداو لەزانكۆو لە قوتابخانەكاندا، بە بێ پەردە

ڕەفتاری ناشیرین و قێزەون بکەن و، غیرەتی بەرگریی لە خۆیی و، ڕەتکردنەوەی دەستەناپاکەکانی نەمێنیٚ، بابێن لەباتی ئەوە، بیر لەماڤ ژیانی ئەو کچ و کوڕانە بکەنەوە، بێن بیر لەوە بکەنەوە: کچ و کوڕێك هەتا قـۆناغـەکانی خوێندن تەواو دەکەن (لەسەرەتاییەوە، بۆ زانکۆو باڵاتریش) تەمەنیان دەگاتە نزیکەی (٢٥-٣٠) ساڵ، بەپێی ئەو کەش و هەوایە خەریکی تاوان و گوناح بن بۆ تێرکردنی ئارەزووی (سێکسی)یان، بێن هاوکارییان بکەن و ئاسانکارییان بۆ بکەن، سووکە ژیانێکی ژن و مێردیان بۆ دابین بکەن و، هانیان بدەن - بابەشێوەی شەرعیی - یەکبگرن و، ئەو کاتە دڵ ئاسوودەتر دەبن و، باشتر دەتوانن درێژە بە خوێندنەکەیان بدەن وببنە خزمەتکاری دین و وڵات و نیشتمان و، گیروگرفتی کۆمەڵایەتیی و ئەخلاقیش زۆر کەم دەبیٚ، بە داخەوە باب وبراو کەس وکارو بەر پرسانی کارو باری دەوڵەت وباری کۆمەڵایەتی، چەندە بیر لە گەواهینامەو شەهادە دەکەنەوە بۆ کچ و کوڕ، لە سەدا یەکی ئەوە، خەمی ئەخلاق وقییەمی رۆڵەکانیان ناخۆن، خەمی مەسەلە سێکسیەکەیان ناخۆن!! باشە ئەگەر بمانەویٚ لاوێك قۆناغەکانی خوێندنمان بۆ تەواو بکا لەو کەش وهەوا گەنیوو گەندەڵەدا، دەبیٚ چۆنی تەواو بکات؟ ئایادەتوانیٚ پاك وخاوێن خۆی راگریٚ وشتێکیش روونەدات؟! کاتیٚ روویدا دەبیٚ کیٚ ئەو تاوان وتۆڵەیە هەڵگریٚ لای خوا؟ دەبیٚ کیٚ بەر پرس بێت لە پیس نەبوونی ژینگە؟ مەگەر کەش و هەوای ژینگە تەنهابە فڕێدانی چوار (عەلاگە)و توێکڵە مۆز دەبیٚ بۆ سەر شەقام و کۆڵانەکان؟ بۆ بەردەم دووکانەکان؟ ئەی کەش وهەوای ژینگە بەو هەموو کارە نارەواو ناشەرعییانە- لە زانکۆو پەیمانگا و بەشە ناوخۆییەکاندا روو دەدەن- پیس نابیٚ وگیرو گرفتمان بۆ دروست ناکات؟ بە تایبەتی خۆیان واتەنی ئازادییەکی بیٚ وێنە بۆ رابواردن و سێکسبازی دەرگا لە سەر پشتە؟!.

## فرە ژنێتی پێغەمبەر ﷺ

دکتۆر (سباعی) دەڵیٚ: ساڵی (١٩٥٦) لە (ئەرلەندا) گفت و گۆیەك - لەگەڵ قەشەکانی ئەوێدا - کەوتە نێوانمانەوە، لەو گوفت وگۆیەدا پێمگوتن: باشە ! بۆچی ئێوە لە قوتابخانەکانتاندا، قوتابییەکان دژی ئیسلام پەروەردە دەکەن وهانیان دەدەن و، پێغەمبەری ئیسلامیان لا ناشیرین دەکەن و، گەلیٚ شتی نا پەسەند و نابەجیٚ بۆ ئیسلام و بۆ پێغەمبەرەکەی موحەمەدمان ﷺ هەڵدەبەستن؟ گوتی: ئاخر ئێمەی خۆرئاوایی ناتوانین ڕێز لە پیاوێك بگرین (٩) ژنی بووبیٚ !گوتم باشە ! ڕێز لە (داود) و (سولەیمان) پێغەمبەر دەگرن؟ گوتی: بەڵیٚ ! چونکە ئەوانە ناویان لە (تەورات)دا هاتووەو پێغەمبەرن !گوتم: دەسا

بێگومانبه که (داود) پێغەمبەر ــ ﷺ ــ (٩٩) ژنی هەبووە، (سولەیمان)یش –سلاوی لێ بێت – وەکو لە تەوراتدا هاتووە،(٧٠٠) ژنی ئازاد و (٣٠٠) کەنیزەی هەبووە! کەوابوو بۆچی ڕێز لە کەسێك دەگرن (٧٠٠)ژنی هەبووە، بەلاّم ڕێز لە کەسێك ناگرن (٩) ژنی بووبێ ؟! بەمەرجێ (٨)یان بێوەژن بوون و، تەنها یەکێکیان کچ بووە؟ پێغەمبەری خوا (محمد ــ ﷺ) سەرباری ئەرکی پێغەمبەرێتی و، ئەو گشت کێشەو گرفتانە ڕووبەڕووی دەبوونەوە، کەلە تەمەنی لاسەرووی (٤٠) ساڵەوە، دەچێتە ژێر ئەرکی (٩) ژنەوە، دەئەوەندەی تر باری سەرشانی قورس دەکات، دڵنیابن کە کاری ئاوا لە خۆیەوە نییە و، بۆ ڕابواردن و خۆشی نییە، بەڵکو هەریەکە – لەو ژنانە – لەبەر بەرژەوەندییەکی ئیسلام بووە، پێش هەموو شتێك قازانجی ئیسلامی لەوەدا دیتووە، جا ئیتر بۆ ئەوە بووبێ کە بەجارێ (٩) ژن دەست بکەنە بلاّوکردنەوەی دینەکەی بەناو ژناندا، یان بۆ دروستکردنی خزمایەتیی لەگەڵ هۆزو خێڵەکانی سەردەمدا، یان وەکو وەفایەك لەگەڵ ئەو هاوەڵانەدا ئەوسا ماڵ و منداڵیان بێ سەرپەرست جێماوەو، ئەوان گەڕاونەتەوە لای خوا، یان لەبەر ئەمانە هەموو و، دەیان بەرژەوەندی تری دینەکەی بووبێ؟؟ بێگومان – وەکو یەکە یەکەی خێزانەکانی باس دەکەن – هەریەکەیان چەندین حیکمەت و فەلسەفە لە هێنانیدا هەبووە، وەئەوەی بەخەیاڵی مرۆڤی ژێردا نەیەت، مەسەلەی ئارەزوو (سێکس)یەتە، ئینجابەم شێوەیە لەیەکەیەکەیان دەدوێن:

**١- خاتوو ( خەدیجە ):**

خاتوو خەدیجە مێژووی بەرزو پاکی دیارو ئاشکرایەو، هەموو کەسیش دەزانێ ئەو کردیە سەر (محمد ــ ﷺ) مارەی بکات، بەتایبەتی ئەو دەمەی کە لەگەڵ (مەیسەرە)ی خولاّمیدا چوونە شام بۆ بازرگانیی و، لە گەڕانەوەدا (مەیسەرە) گەلێ ئاکاری جوامێرانەو مەردانەی موحەمەدی بۆ گێڕایەوە، ئەویش بۆ خۆی ژیر بوو، زانی کە ئەگەرچی تەمەنیشی چل ساڵەو، هێمای تەمەنی ئەو – محمد ﷺ (٢٥) ساڵە، بەلاّم هەرگیز هاوسەرێکی ئاوای دەست ناکەوێ، کە ڕێزو حورمەتی لێ بگرێ و ببێتە قەلاّیەکی مەحکەم بۆی، ئەڵبەتە لەو لایشەوە –کە بێ شك وایە– دەستێکی نهێنی هەبووە، کە موحەمەد ﷺ – لای خەدیجە خۆشەویست بکاو، حەز بە هاوسەرێتی بکا، چونکە بۆ دوایی دەبێتە پاڵپشت و هاوکارو یارمەتی دەرێکی باش و دڵسۆز بۆ خۆی و بۆ بانگەوازەکەی، سەرباری ئەقڵ و ژیری خۆی، ماڵ و داراییەکەشی خستە گەڕ بۆ خزمەتی دینەکەی – پاش ئەوە کە کرایە پێغەمبەر، تەنانەت کاتێ لە ئەشکەوتی حیرا وەحی بۆ هات و دەم بە لەرزەوە گەڕایەوە ماڵ، چونکە یەکەمجاری بوو فریشتە ببینێ، زۆر ماندوو شەکەت و دڵ نیگەران ببوو، هەر خاتوونە

(خەدیجە) بوو دڵی دایەوەو پێیگوت: دڵنیابە، هەرگیز پیاوی وەکو تۆ – بە میهرەبان و دلۆڤان لەگەڵ هەژاران و کەم نەوایان و هەتیوان و لێقەوماوان – تووشی دڵزویری و ناڕەحەتی نابێ‌و، خواش پشتیوانی لێدەکاو، بردیشی بۆ لای (وەرەقەی کوڕی نەوفەڵ)ی ئامۆزای، زانا بە تەورات و ئنجیل و کاروباری وەحی پێغەمبەرێتی.

شیاوی ئاماژە بۆکردنە تاخەدیجە لە ژیاندابوو – خوا لیٚ خۆش بێت – ژنی تری بەسەرا نەهێنا، ئەوەبوو لەتەمەنی پتر لە (٥٠) ساڵی و، سێ ساڵ بەر لە هیجرەت، کۆچی دواییکرد، هەزاران دروودو ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت.

**٢- خاتوو ( سەودەی کچی زەمعە ):**

ئەم بەڕێزەش پاش کۆچی دوایی خاتوونە خەدیجە، پێغەمبەر ﷺ خواستیی و مارەیکرد، خۆ هیچ ڕیوایەتێك نەهاتووە باسی جەمال و جوانیی و شەنگ و شۆخی و لاویەتی بکات،تا بڵێین ئەوە وایکردبێت کە پێغەمبەر مارەی بکات، بەڵکو بێوەژنێك بوو مێردەکەی – کە ئامۆزای خۆی بوو ناوی (سەکرانی کوڕی عەمر) بوو – لە موسڵمانە سەرەتاییەکانی ئیسلام بووو،کۆچی بۆ حەبەشە کرد، کاتیٚ گەڕانەوە (سەکران) کۆچی دوایی کرد، ئەویش بیٚ سەرپەرست مایەوەو، لەوانەبوو ئەگەر بچێتەوە لای خزمەکانی ئازارو ئەشکەنجەی بدەن و، لەدینی وەریگێڕن، جاوەکو وەفایەك بۆ ئەو خێزانە بەڕێزە، پێغەمبەری خوا ــ ص ــ مارەی کردو، بەهاوسەرێتی خۆی ڕێزی لێنا (خوای لیٚ ڕازی بیٚ).

**٣- خاتوو ( عایشەی کچی ئەبووبەکری صدیق ):**

ئەمیشی لە مەککە مارە کردو، لەمەدینە گواستییەوە، شیاوی باسە لەناو ژنەکانیدا تەنها ئەم کچ بوو، وەپاش نۆ ساڵ و پێنج مانگ لە هاوسەرێتی لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەری خودا – درودو سلاوی لەسەر بێت – کۆچی دواییکرد، شیاوی باسە – لەبەر کۆمەڵیٚ هۆکار – زۆری خۆش دەویست، دیارە حیکمەتی مارەکردنیشی تەنها نزیك بوونەوەبوو بە (ئەبووبەکر)ی زەحمەتکێشی بابیەوە، ئەو ئەبوبەکرە کە بەگیان و ماڵ لە ماوەی تەمەنیدا خزمەتی پێغەمبەری ﷺ کرد ئینجا ئەمیش وەکو ڕێز لێنانێك لە ئەبووبەکر، عایشەی مارە کرد، هەروەکو ئەمیش بۆ ڕێز کچی خۆی لە (عوسمان) و (عەلی) ــ خوای لیٚ ڕازی بیٚ ــ مارە کرد.

**٤- خاتوو ( حەفصەی کچی عومەر ):**

بەڵیٚ پاش دووساڵ و چەند مانگێك لە کۆچ بۆ مەدینە، حەفسەخانی مارەکرد، پاش ئەوە کە (عومەر)ی بابی ڕاستەوخۆ دای بە (ئەبووبەکر) و(عوسمان)، ئەوانیش پۆزشیان بۆ

هێنایەوەو مارەیان نەکرد، ئەوجا پێغەمبەر ﷺ لەبەر خاتری بابی مارەی کرد، شیاوی باسە خاتوو حەفصەش هەر بێوەژن بوو.

**٥- خاتوو ( زەینەب ):**

خاتوونە زەینەبیش ژنی (زەیدی کوڕی حاریس) بوو، (زەید)یش بەپێی یاساو باوی ئەو سەردەمە، پێغەمبەر ﷺ کردبووی بە کوڕی خۆی، جاکە زەینەب لەگەڵ (زەید)ا ڕێك نەکەوتن و لەلای خواوە بڕیار درا کە پاش تەڵاقدانی - لەلایەن زەیدەوە- دەبێ موحەمەد ﷺ مارەی بکا، دیارە لەیاساو عورفی ناوچەکەدا ژنی بەکوڕکراو، نەدەبوو مارە بکرێت، خواش دەیەوێت ئەو باوونەریتە نەفامییەیان هەڵوەشێنێتەوە، ئەوسا بە بڕیاری خوای کارزان مارەی کرد، ئەگەر چی خوانەناسەکان کردیانە هەرا کە: گوایا بووکی خۆی مارە کردووە !

**٦- جووەیریەی کچی حاریس:**

ئەم بەڕێزە کچی سەرۆکی هۆزی (بەنی المصطلق)ە، لەناوەڕاستی ساڵی شەشەمی کۆچی — دوای غەزاکردنی هۆزەکەی لەلایەن موسڵمانەکانەوە، پێغەمبەر ﷺ مارەی کرد، لەو لایشەوە نزیکەی دووسەد ماڵ لە خزمانی لەو غەزایەدا دیلکرا بوون، پێغەمبەر ﷺ ویستی بەو مارە کردنەی (جووەیریە) ئەوانە ببنە خەزورانی و، هاوەڵانیش دڵیان نەرم ببێ بۆ ئازاد کردنیان، دیاربوو هەرواش دەرچوو، گوتیان: چۆن دەبێ خەزوورانی پێغەمبەر ﷺ دیل بن؟ بۆیە سەرجەم ئازاد کران ودەرەنجام ئەو مارەکردنەی (جووەیریە)و، ئەو ئازاد کردنەیان پاڵی پێوەنان بۆ نزیك بوونەوە بە پێغەمبەر ﷺ و ئیمانیان هێناو بوونە هاوکارو یارمەتیدەری موسڵمانان، پاش ئەوەی کە نەیارو دژیان بوون.

**٧- خاتوو ( زەینەبی کچی خوزەیمە ):**

ئەم خانمەش دایکی موسڵمانان، پاش شەهیدبوونی مێردەکەی (عبدالله)، لە (ئوحود)دا، پێغەمبەر ﷺ وەکو وەفایەك بەرامبەر کارە خزمەتگوزارییەکانی بە کۆمەڵگە مارەی کرد، چونکە ئەوەندە بە خزمەت بوو، پێیان دەگووت (أم المساكين = دایکی هەژاران)، لەولایشەوە ژنی ئەو بەڕێزە بووە.

**٨- ئوم سەلەمە ( هند ):**

ئەمیش خێزانی (عەبوڵڵای کوڕی ئەسەد) بوو، کە یەکەم کەسێك بوو — لەبەر خوا — کۆچی کرد بۆ (حەبەشە)، پاشان لە جەنگی (ئوحود)دا بەسەختی بریندار بوو، هەر بەو

برینەش کۆچی دوایی کرد، (ئوم سەلەمە) (عبدالله)ی زۆر خۆش دەویست و، ڕێزی زۆری لیٚ دەناو، خۆیشی ئافرەتێکی جوامێر بوو، بۆیە (ئەبوبەکر) و (عومەر) خواستیان – پاش شەهیدبوونی (عبدالله) – شووی پیٚ نەکردن، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی دڵی دامرکیٚ و خەم و خەفەتەکەی بۆ (عبدالله) کەم بکاتەوە – وەکو وەفایەك بۆی – ماری کرد، ئەگەر چی پۆزشی بۆ هێنایەوە، چونکە ژنێکی مندالٚ دارو پیربوو، بەلاٚم لەگەڵ ئەوەیشدا پێغەمبەر ﷺ مارەی کرد، بۆ دواییش لە کێشەکەی (حودەیبە)دا، ڕۆڵی سەرەکی هەبوو، بۆ چارەسەری و کۆتایی پێهێنانی.

**٩- خاتوو ئوم حەبیبەی کچی ئەبی سفیان:**

خاتوو ئوم حەبیبە (ڕەملە) کچی ئەبوو سفیانە و لەو هۆزەیە، کە دۆزی گرنگیان – لە دژایەتی پێغەمبەرو ئیسلامدا – هەبوو، ئەمیش خێزانی (عوبەیدوالله) ناوێك بوو، کە هەردوو پێکەوە کۆچیان کرد بۆ (حەبەشە)، بەلاٚم مێردەکەی لەویٚ، بوویە عیسایی و، ئەم وەکو کێو – قایەم و مەحکەم – لەسەر دینی ئیسلام مایەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بۆ نزیك خستنەوەی هۆزەکەی لە خۆیی و، وەفایەکیش بۆ (ڕەملە)خان، هەر لە (حەبەشە) مارەی کردو، مارەیەکەشی (نەجاش)ی حەبەشە بۆی دابین کرد، پاشان لە حەبەشە گەڕایەوە بۆ مەدینە. باشە ئافرەتێکی ئاوا، هەقە وێڵ بکریٚ و ڕێزو حورمەتی لیٚ نەگیردریٚ ؟، لەکاتێکدا تووشی ئەو دوو بەلاٚیە بووە: لەلایەکەوە هۆزەکەی دژایەتی پیغەمبەر ﷺ دەکەن، لەلایەکی دیکەوە مێردەکەی لەدین وەرگەڕاوەو بۆتە عیسایی.

**١٠- صەفیە خانی کچی ( حویەی ) سەرداری ( بەنی نەزیر ):**

هەر دوا بەدوای (خەیبەر) و پاش ڕێکەوتنەکەی (حودەیبیە)، پێغەمبەری ئیسلام ﷺ مارەی کرد، شیاوی باسە، هەم باوك و، هەم مێردەکەی (کینانە) کە یەکیٚ بوو لە سەرۆکانی جوولەکە لە خەیبەردا کوژران، پاشان لە بەسەرهاتەکەی (بەنی قورەیزە و بەنی نەزیر)دا دیلکراو، بۆدوایی پێغەمبەرمان محمد ﷺ لەبەر دروستکردنی پەیوەندی و نزیکبوونەوە بە جووەکانەوە خواستیی و کردیە هاوسەری شەرعیی خۆی.

**١١- خاتوونە ( مەیموونە )**

ئەم بەرێزەش ناوی (بەررە)یە، پێغەمبەر ﷺ ناوی گۆڕی بە (مەیموونە)، کاتی خۆیشی خێزانی (ئەبی بەرهەم) بوو، پووری (عبداڵلاٚی کوڕی عەباس) و (خالیدی کوڕی وەلید) بوو، لەوە دەچیٚ ویستوویەتی تێکەڵی لە نێوان (بەنی هاشم) و (بەنی مەخزوم)دا دروست بکاو، هەردوو باشتر ببنە پشتیوانی دینەکەی.

**کورتەی ئەم باسە :**

پێغەمبەری خوا ﷺ لەمارە کردنی هەر یەکێ لەو ژنە بەڕێزانەدا، بەرژەوەندییەکی گەورەو مەزنی ڕەچاوکردووە، ویستوویەتی خۆی بکاتە زاوای ئەو گشت پیاو ماقووڵ وسەردارانەی ناوچەکە، لەولایشەوە، هەریەك لە خێزانەکانی ببنە مەشخەڵێك بۆ ناو ژنان و کاروباری دینیان فێربکەن، لەمە بەو لاوە – لەوە ناچێ مەبەستێکی تری هەبووبێ، چونکە بێ شك ئەگەر ڕابواردن و لەزەتی دنیای مەبەست بووبا، نە دەچوو ئەو گشت بێوەژن و، هەتیوبارانە لە خۆی کۆبکاتەوە ! بەڵکو دەچوو – وەکو پاشاو سەردارەکانی دنیا– کام ژن زۆر جوان و شۆخ و شەنگ و هەڵکەوتە بووبا، ئەوەی دەهێنا، یان دەچوو کۆمەڵە کچێکی مارە دەکرد، دیارە ئەمانەی وەلا نان لەبەر خاتری دینەکەی خواو، پەیداکردنی پاڵپشت و پشتیوان بۆی.

خاتوو (عایشە) خوا لێی ڕازی بێت چەند جوان پێناسەی پێغەمبەر ﷺ دەکا، کاتێ دەچوویە لای ژنەکانی و سەردانی دەکردن: ((كان إذا خلا بنسائه ألين الناس، وأكرم الناس ضحاكا)) واتە لە هەموو خەڵکی دنیا نەرم و نیانترو، بەڕێزترو ڕوخۆشتر بوو. ژیانیشیان، شتێکی کەم و خودکەفایی بوو، ئەوەبوو –کە لەدەوڵەتدا دەسەڵات پەیدابوو– وایان دەزانی، دەبێ ئەمانیش وەکو ژنەکانی (کیسرا) و (قەیصەر) ڕابوێرن و بژین، بۆیە داوایان لە پێغەمبەرکرد کە خۆشگوزەرانتریان بکات، بەڵام پێغەمبەری خوا، قیامەتیان وەبیر دێنێ و، بێ بەهایی و بێ نرخی دنیاشیان دەخاتە پێش چاوو، سەربەرستیشیان دەکات کە: هەر کەسێکیان ئاوا دەژی و ئەو ژیانەی قبووڵە، بادانیشێ، هەر کەسێکیش ڕازی نییەو دنیای دەوێ، بابێتە پێش، بە شێوەیەکی خواپەسەندانە لێکجودا ببنەوە، درێژەی ئەم باسە لە سوورەتی (ئەحزاب)دا هەیە (١).

## مارەیی ژنان

مارەیی مافێکی پێویستی ژنانە – هەرکە مێرد دەکەن – دەبێ بە چەند ڕازیی دەبن و، بەپێی باوونەریتی ناوچە ئیسلامیەکە، لە گرێ بەستەکەدا بۆیان دیاری بکرێت، خۆ ئەگەر لە عەقدەکەدا دیارییان نەکرد، دەبێ پاش گواستنەوە، وەکو خوشك و خزمە نزیکەکانی تری ئەو ژنە، کە بە مێرد دراون و مارەییان بۆ دانراوە – شتێکیان بۆ دیاری بکرێ.

مارەیی مافێکە خوای گەورە خۆی بڕیویەتیەوەو، دایناوە بۆ ژنان و هیچ کەسێك بۆی نییە دەستی تێ بخات، پاش ئەوە کە لە سەردەمی (جاهیلیەت)دا، بە ئارەزووی خۆیان دەستیان تێوەر دەدا، هەبوو کچەکەی بەشوو دەداو مارەییەکەی خۆی قووت دەدا،

هەیشبوو – وەکو ئاژەڵ بفرۆشیٚ – کچەکەی، یان خوشکەکەی لە پیاوێك مارە دەکرد و، ئەویش کچەکەی خۆی لەم مارە دەکردو، لەو نێوانەدا ئافرەتەکە هیچ قازانجێکی نەدەکرد... بەڵام ئیسلام هات، ئەوانەو، هەر فیڵ و فەرەجێکی تر لە ژنان دەکرا، هەمووی حەرام و قەدەغەی کرد.

بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو بارە نالەبارو ئاڵۆزەو بۆ چەسپاندنی ئەو ماف ومارەو خەڵاتە بوو، کە خوای گەورەو دلۆڤان فەرمووی: ﴿وآتوا النساء صدقاتهن نحلة فإن طبن لكم عن شيء منهُ نفساً فكلوهُ هنيئاً مَريئاً﴾٤/٤. دەبیٚ وەکو پێشکەشیەك مارەیی ژنەکانتان بدەن، ئەمەش (فەرز)ەو خوا خۆی بڕیویەتیەوەو، پێویستە ئێوەش پەیڕەوی لیٚ بکەن و، بەهیچ شێوەیەك گزی و خەیانەتی تێدا نەکەن، خۆ ئەگەر ژنان بۆ خۆیان شتێکیان لە مارەییەکەیان پێبەخشین، ئێوەش – لەحاڵەتی ئاوادا – بیخۆن و نۆشی گیانتان بێت.

بەڵیٚ خوای میهرەبان – وەکو ڕێزلێنان لە ژنان و ڕەچاوکردنی هەموو حاڵەتە تاڵ و تفتەکانی قۆناغی ژیان – مارەیی فەرز کردووە لەسەر پیاوان، دەبیٚ بەئەوپەڕی ڕەزامەندیی و خۆشحاڵیەوە پێشکەشی ژنانی بکەن و، ئیتر پاش ئەوە هیچ کەسێك – نەمێرد، نەبرا، نەباوك، نە هیچ کەسێکی تر – بۆی نییە بیخواو دەستی تێوەردا.

ئیسلام ئەو مارەییەی کردووە، بە ڕەمزو نیشانەی خۆشەویستیی و دلۆڤانی مێرد بۆ ژن، وانیشان دەدریٚ کە ئەو پیاوە زۆر خۆشەویستیی ئەو ژنەی هەیەو، زۆریش بەخاوەن حورمەت و ڕێزداری دەزانیٚ، بۆیە چەند دەسەڵاتی هەبیٚ، ماڵ و سامانی پێشکەش دەکات، لەیەکەم ڕۆژی بەیەکگەیشتنەوە، ڕێزنانە لە خزم و کەس وکار و بنەماڵەو هۆزو نەتەوەی ژنەکە، ئیسلام لەم ڕووەوە تەماشای مارەیی دەکاو قورئان دەفەرمویٚ:(وآتوا النساء صدقاتهن نحلة....)، ئەگەر چی ماڵ و سامانێکیشە دەستی ئەو ژنە دەکەویٚ و، ئەندازەیەك بژێوی خۆی پیٚ مسۆگەر دەکاو، دەتوانیٚ بازرگانی پێوە بکات، خانووبەرەو زەوی لیٚ دابین بکات، مارەیی بۆ ئەمە دانراوە، ئیتر ئەوە نییە کە بەداخەوە – ئەمڕۆ ژنان بە ڕەمزی بیٚ توانایی و، هیچ لیٚ نەهاتوویی خۆیانی دادەنێن و، سروشتیان نەفرەتی لیٚ دەکا، گوایا دەست پانکردنەوەیەو، پیاوان خێریان پیٚ دەکەن!.

هەر شتیٚ لە کڕین و فرۆشتن و ئیجارە و بە کرێدان بەکاربێت، ئیتر قەرزو حازر بیٚ، زۆر بیٚ یان کەم، بەلای زاناکانەوە ڕەوایە بکرێتە مارەیی و، ژنەکە قبووڵی بکات،ژن دەتوانیٚ مارەییەکەی فێرکردنی قورئانی پیرۆز بێت، یان خوێندنی (بوخاریی) و (موسلیم) بێت، یان فێرکردنی زانیاریی ئەندازەو پزیشکی و، هەر کارو پیشەیەکی تر بێت، یان خانووو دوکان و باخ

و زەوی و مەڕومالاَت و..هتد. ئەگەرچی ئێستا عورفی ناوچە لەسەر زێڕو ئاڵتوون دامەزراوەو، خەڵكی زێڕ دەكاتە مارەیی، ژنان لەوەدا ئازادن لە سەرچی پێكدێن وچۆن پێكدێن.

(سەهل – خوا رازی بێ لێی) دەڵێت: پیاوێك ویستی ژنێك مارە بكات، پێغەمبەر ﷺ پێیفەرموو: شتێ لە قورئان دەزانی ؟ گوتی: بەڵێ. ناوی چەند سوورەتێكی برد كە دەیزانین، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەسا وا لێم مارە كردیت لەسەر ئەو چەند سوورەتە فێری بكەیت. بوخاریی.

مارەیی لە قورئان و فەرموودەدا سنوورێكی بۆ دیاریی نەكراوە – كەمی و زۆری –، بۆیە ژن و پیاوەكە لەسەر چەندە رێك دەكەون، دروستە بكرێتە مارەیی و لەسەری ڕێك بكەون. واتە: دەبێ ژن و پیاوەكە بۆ خۆیان ئازاد بن لە دانانی مارەییەكەداو، كەسێك لە خزمان زاڵ نەبێت بەسەر دین و ویژدانیاندا بۆ زۆرو كەم دانانی... ئەمەیە مارەیی ڕاستەقینە لە ئیسلامدا، خۆ ئەگەر – لەگەڵ ئەوەیشدا – بوون و نەبوونی مێرد ڕەچاو بكرێت لەلایەن ئەو خانمەوە دەبێتە هاوسەری، ئەوە كارێكی پەسەندی شەریعەتی ئیسلامە، ئەگەر ئەوخانمە – لەباتی ئەو زێڕەو، ئەو هێندە بڕوبیانووەی تر بە زاوای دەگرێ – ئاسانكاری و، هاوكاری دەستگیرانەكەی بكاو، بەپێی بوون و نەبوونی ئەو كوڕەلاوە داوای مارەیی لێ بكات و، شوێنی مۆدێرن نەكەوێ، دیارە كاری وا، بۆ دنیاو بۆ قیامەت پەسەندەو ئافەرینی دەوێ و، زوتر دەتوانن كارەكەیان ئەنجام بدەن.

ئەگەرچی خانمەكە ئازادە لە دانان و دیاریكردنی مارەییدا، بەڵام شەریعەتی ئیسلام، حەز دەكات مارەیی كەم بێت و، زێدەڕەوی تێدا نەكرێت، پێغەمبەرمان (محمد – ﷺ) دەفەرمووێ: ئەو نیكاحە بە پیت و بە بەرەكەتە، كەمارەییەكەی كەم وئاسانە.(ئیمامی بەیهەقیی و ئیمامی ئەحمەد هێناویانە). یان دەفەرمووێ: پیرۆزی ژن لەوەدایە: خوازبێنی و مارەییەكەی ئاسان بێت.(ئیمام بەیهەقیی روایەتی دەكات) كەوابوو دەركەوت كە:

١– هیچ كەسێك بۆی نییە دەست بخاتە كاروباری مارەیی ژنانەوە، بەڵكو تەنهاوتەنها خانمەكە خۆی بۆی هەیەو، دەتوانێ باسی زۆریی و كەمی بكاو، هەر ئەو دەتوانێ مێردەكەی ئازاد بكا لێی.

٢– لە بنەڕەتدا مارەیی لای سەروویی و، لای خوارووی دیاری نەكراوە.

٣– ئێستا ڕوو لە خانمەكان دەكەین، كە دەبێ لای خوای گەورەو میهرەبان بەرنەدەن و، بیرێ لە فەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ بكەنەوەو، بزانن كە پێغەمبەری ئیسلام پێیخۆشە ئەوەند چاویان لە مارەییەوە نەبێت – لەگەڵ ئەوەشدا كە ئازادن – تا لەگەڵ كوڕە لاوەكاندا

زووترو باشتر بگەنەیەك و، لەئایندەدا مێردەکەی قەرزار نەکات، سیٚ ساڵ، چوار ساڵ هەر قەرزی مارەیی ببژێرێت.

مارەیی وەنەبیٚ (فەرز) بێت، ئەگەر خانمەکە داوای نەکا پێی گوناحبار ببیٚ، نەخێر... بەڵکو کە مارەیی ئیکرامیی و رێزانەیەو، خوای گەورە فەرزی کردووە لە سەر پیاوان – لەبەر خاتری ژنانە – هەر ئەو ژنانە دەتوانن، خۆیمان مارە بکەن لە بەرامبەر یەك میسقاڵ ئاڵتوونەوە،یان لەبەرامبەر فێرکردنی سوورەتی فاتیحەوە، پاشانیش لەوەش گەردنی ئازاد بکات.

## ئایا مارەیی سنووری بۆ دادەنرێت ؟

کتێبەکانی فیقه و تەفسیر دەڵێن: لەسەردەمی (عومەر)ی پێشەوادا (خوای لیٚ ڕازی بێت) مـارەیی تـەکانێکی سـەیرو سـەمەرەیداو، لەوانـەبوو ئەسـتەمێك بخاتـە بـەردەم نیكـاح و بەیەکگەیـشتنی کـچ و کوڕەکـان، لەبـەر ئـەوە پێـشەوا عومـەر – وەکـو سەرپەرسـتیاری موسڵمانان و چاودێری خێرو شەڕی کۆمەڵگە – لای سنووری دیاری کردوو، بڕیاریدا: ئەر لە مارەیی ژنەکانی پێغەمبەر ﷺ زیاتر بێت، زیادەکەی بخاتە (بیت المال)ـەوە، ئەم بڕیارەی لەسـەر میمبـەر خوێنـدەوەو، دەست بـەجیٚ ژنێکی شـارەزای قورئـان هەڵـسایەوە سـەر پـیٚ و پێیگـووت: تـۆ چـۆن سـنووری مـارەیی دیـاری دەکـەیت بـۆ ژنـان ؟ ئـەی ئـەوە نییـە خـوا ئەفـەرمووێ ﴿وأتيـتم إحـداهن قنطـارا...﴾ واتـە: ئەربـە کلـوو ڕێـك زێڕتـان دابـوو بـە ژنـانی پێشوو، نابیٚ لێیان بسێننەوە، کەوابوو ژنان دەتوانن بەئارەزووی خۆیان مارەیی بخەنـە سـەر پیاو، پاشان (عومەر) قسەکەی پەسەند کردو بڕیارەکەی خۆی هەڵوەشاندەوە!(ئەم مەسـەلە زیاتر لە فتح الباری، بەرگی (٩) لاپەرە (٢٥٦) هەیە.

مـن وادەزانم ئـەو شـتانەی کـە لـە بەرژەوەنـدی کۆمـەڵ و کۆمەڵگـەن و، مایـەی ژیـانی ئاسوودەیی ئەو خەڵکەن، هەرکات گرفتێك پەیدابوو لە پیادەکردنیاندا، پێشەوای موسڵمانان (تەعـدیل)ی بکـاو، ڕای بگـریٚ، ئـەم مەسـەلەی مارەییيـەش – کـە ئـەمڕۆ هـیچ کـچ و کوڕێـك بەئاسانی ناتوانن بگەنەیەك – یەکێکە لەو گرفتانەو، پێویستە سەرپەرستیارو چاودێر، ڕاستی بکاتەوەو، سەروخوارێکی پیٚ بکات، بەپێی ڕۆژگاری کۆمەڵگە، ئەگەرچی بەداخەوە زۆرێکی کیژەکان خۆیان دەبنە لەمپەرو بەربەست لە بەردەم شووکردندا، چونکە لەگەڵ ئەوەیشدا کە لە دەسـەڵاتی بـاوك و دایـك و خـزم وبـرا و کـەس و کـار، ئەندازەیـەك ئازادن و دەتـوانن بـۆ خۆیـان چارەنوسـی خۆیـان هەڵبـژێرن، بـەڵام هـەر کیـژەکان خۆیـان ئەوەنـدە داوای زێـڕو زیـوو خـانوو سەیارەو.... هتد دەکەن، هیچ لاوێك نەتوانیٚ نزیك ببێتەوەو مارەیان بکات.

گەڕانە دواوەو پەشیمانی پیشەوا عومەریش لەو بڕیارەی – سەبارەت بە دیاریکردنی لای سەرووی مارەیی – ئەگەر ڕاست بێت، جێگەی سەرسوڕمانە، چونکە بڕیاری ڕاگرتنی بڕینی دەســتی دزو، ڕاگــرتنی بەشــی (مؤلفــة القلــوب)یــش، هــەر لــە کاروبــاری کۆمەڵگــەن و، بارودۆخەکەی جارانیان گۆڕاو، ئەمیش حوکم و بڕیارەکەی ڕاگرت، تا ئەو هۆیانە – ڕێیان بۆ خۆش دەکەن – پەیدا دەبنەوە.

مارەیی – بەپێی باوونەریتی ناوچەکە – دەتوانرێ هێندێکی حازر بێ و، هێندێکیشی قەرز وماوەی بۆ دیاری بکا، یان هەر بێدەنگ بێت لێی، بەڵام دەبێ بزانرێ: ئاخۆ چەندەی حازر دەبێ و، چەندەیش قەرز؟

ئافرەت، دەتوانێ هەتا مارەیییە حازرەکەی وەرنەگرێ، خۆی نەدات بەدەستی زاواوە.

ئافرەت، بۆ دڵنیایی خۆی لەمەڕ مارەیییەکەیەوە – بۆی هەیە داوای کەسێك بکات، ببێتە کەفیل و دەسەبەر بۆ نەفەوتانی مارەیییەکەی.

ئافرەت، هەر مارەکرا، دەتوانێ داوای مارەیییەکەی بکا.

## بە یەکێ لەم شتانە هەموو مارەیی، دەکەوێتە سەر مێرد

١- سەرجێیی لەگەڵکردن.

٢- ژن وپیاوەکە هەرکامێکیان بمرێ– ئەگەرچی بەر لە پێکەوە نووستنیش بێ– هەر شتێ لە (عەقد)ەکەدا ناوبرابێ، بۆی سابت دەبێ، خۆی یان میراتگری داوای دەکاو وەری دەگرێ.

٣- هێندێ مەزەبەکانیش – خەڵوەی تەواوو بێ هیچ لەمپەرێك، دەکەنە هۆیەکی تری سابتبوونی مارەیی.

هەر ئەم تاقمە زانایە دەڵێن: هەرکە کەش و هەوا بۆ سەرجێیی ژن و پیاوەکە جێبەجێبووو، هیچ ئەستەمێك نەبوو بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەیەو، ئەوسا بەر لەوە لێك جیابوونەوە، دەبێ ئەو ژنە (عیددە) ببینێ.(١)

## بە یەکێ لەمانە نیوەی مارەیی دەکەوێتە سەر زاوا

١- بەر لە پێکەوە نووستن، تەڵاقیداو، لەهەمانکاتیشدا لە گرێ بەستی عەقدەکەدا، مارەییان باسکردبوو. (لەپێشەوە لە سوورەتی بەقەرە، ئایەتی: ٢٣٧ دا باسێکی ئەمە کرا).

٢- خەڵوەی شەرعیی و بێ ئەستەم لەبەردەمدا بۆ سەرجێیی، ئەوسا بەر لە ئەنجامدانی تەڵاقیدا و، دیسان ژنەکە نیوەی مارەیییە ناوبراوەکە دەبات.

٣- هە جیابوونەوەیەك، مێردەکە ببێتە هۆو سەبەب، بەر لە پێکەوە نووستنیش بێ، هەمیسان خانمەکە نیوەی مارەیی ناوبراوی پێ دەبڕێت.

## لەم حاڵەتانەشدا هەموو مارەیی لە کیس دەچێ

١- خانمەکە لە دین وەرگەڕێ و واز لە ئیسلام بێنێت.

٢- مێردەکە موسڵمان ببێ و، ژنەکە موسڵمان نەبێت.

٣- ژنەکە لەگەڵ یەکێ لە خزمانی مێردەکەی، دەست تێکەڵ بکاو بگەنە سەرجێیی!.

٤- ژنەکە - لەبەر هەژاریی مێردەکەی، یان لەبەر هەر عەیب و ناتەواوییەکی - نیکاحەکە هەڵوەشێنێتەوە.

ئەمانە، لەگەڵ چەند حاڵەتێکی تردا، کە لە کتێبە فیقهیەکاندا باسکراون، دەبنە هۆی لە دەستدانی مارەیی ژنەکە.

**بـــەکورتیی**: مـــارەیی ڕێـــزو حورمەتێکـــە، دیـــنی ئـــسلام - بـــەر لـــە (١٥) ســـەدە، چەســـپاندوویەتیی وقایـــەلبووە پێـــی بـــۆ خانمـــەکان و، دەبـــێ مێـــرد - لـــە یەکـــەم بەیەکگەییـشتندا- ئـەو میوانـداریی و ڕێـزە پێـشکەش بکـا، خـۆ ئەگـەر ژنەکـە بـۆ خـۆی نەیویست و قبووڵی نەکرد، هیچ تاوان و گوناحێك لـە سـەر هیچکامێکیان نییـە، بەڵکو جێی سـوپاس و پێزانینـە، هـەم لەلایـەن شـەریعەتی ئیـسلامەوە، هـەم لەلایـەن کۆمەڵگـەوە -بـە گشتیی-، چونکە هاوکاری و بارسوکیەکە لەبەردەم ئەو سووننەتە گەورەدا، ڕێ ئاسـانکردنە لەبـەردەم کچان و کوڕانـدا، شـکاندنی ئـەو بەربەسـت و کـۆت و زنجیرەیـە کـە لاوان نـاتوانن لـە سەرەتای تەمەنیانەوە جورئەت بکەن، بیر لە خێزان و خانەوادە بکەنەوە..

خوشکی بەڕێز! دڵنیابە ئەگەر هەردوو لاتان بە پێی ئاڕاستەکانی ئیسلام ڕەفتار بکەن و، بەرنامەی ئیسلام حاکم و بڕیار دەربێ، هەرگیز گیروگرفتێکی وا نایەتە بەردەم لاو پیرو سەرجەم کۆمەڵگە، ئەگەر تۆی بەڕێز گوێ بۆ ئەو فەرموودانە بگریت کە: پێغەمبەرﷺ لەبارەی قایەلبوون بە مارەییەکی کەم فەرموویەتی، یان هەر هیچت لە زاوا نەوێ، ئیتر چ گرفتێك هەیە ڕێ لە تۆ بگرێ، هەتا ببیتە گەورە کچ و، پاشان بۆ خۆت داکەویی و، کاتی بەشووکردنت بەسەر بچێت، یان ئەو کوڕە تەمەنی بچێتە (٣٠-٤٠) ساڵ، هێمان هەژارەو ناتوانێ داخوازییەکانی تۆ: ٥٠ میسقاڵ ئاڵتوون، خانووبەرە، کەلووپەلی ناوماڵ، بەئەندازەی ماڵێکی (٤٠) ساڵ، سەیارە و مۆدێلاتی تر - جێبەجێ بکات ! ئەی بۆچی زۆر بەئاسانی (عەقد)ەکە ئەنجام نادەن و، خێرا بگەنە یەکتر، ئەگەر ئاوا بکەن، هیچ کامێکتان تەمەنتان لە کیس ناچێو، لەکاتی خۆیدا سوود لە تەمەن و جەستەتان وەردەگرن.

شیاوی ئاماژە بۆکردنە کە لە سەرەتای ئیسلامەوە (جەهازیی) و کەلووپەلی ڕێك خستنی بووك، لەسەر ماڵی باب و خزم و کەس وکاری ژنان بووە، ئیمامی (نەسایی) لە (عەلی کوڕی

ئەبی تالیب)ـەوە –خوای لێ ڕازی بێت– دەگێڕێتەوە: ((جهّزَ رسول الله – ﷺ – فاطمة فی خميل، وقربة، ووسادة حشوها إذْخَرٌ)) واتە: پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی خاتوونە (فاتمە)ی کچی ڕێکخست و جەهازی بۆ ئامادەکرد، جەهازیەکەشی بۆ ئەو ڕۆژە: لێفۆڵکەیەکی کورك و، پشتییەك و، جەوەندەیەکی ئاوخواردنەوەبوو.

## کیژۆڵە بەر لە هاتنی ئیسلام لە میرات بێ بەش بوو !

(ئیبن عـەباس – خـوای لێ ڕازی بـێ) دەڵـێ: بـەر لـە ئیسلام نـە کیژۆڵـە، نـە کـوڕی بـچکۆڵە، میراتیان نەدەدانێ، چونکە –بەپێی باوی ئەوان– ئەوانە ناتوانن سواری ئەسپ ببن و، شالاّوی ناحەزو نەیاریان لێ وەدوور بخەنەوە، واتە: میراتبەر کەسێك بوو، توانای بەرگری لـە خـۆیی و لە هۆزو نەتەوەکەی بووبا ! جا کە ئیسلام هاتە گۆڕێ، ویستی هـەموو شتێك بخاتـەوە جێگـەی شـیاوی خـۆی، بەتایبـەتی مـیرات، چـونکە ئیـسلام تێـڕوانینی خـۆی هەیـە – لەتـەکافول و دەسـەبەربوون دا– لـەناو تاکەتاکـەی گـشت خێزانێکـدا، ئەوەتـە لـە ئەسـتۆی کـاکی خـاوەن دەسەلاّتی پێویست کردووە، لـە خزمـە نزیکـە هـەژارەکانی بپرسـێتەوە، وەکـاتێ خـوێنێ هاتـە سەری، دەبێ هاوکاری بکا... هەروەها، کەوابوو ئەگەر ئەو کەسە مردیش، هەقە ئـەم کەسـە زۆر نزیکـەی میراتـی لـێ ببـات، بـەپێی پایەوپـلەی نزیـکی بـە مـردووەکەوە، ئیـسلام یاسـاو ڕێسایەکی چروپـڕی هەیـە لە دابەشکردنی ئـەرك ومافەکانـدا.... میراتیش هـەر لـەو ڕێچکەوە هەڵدەقوڵێو، سەرچاوە دەگرێ، ئەگەرچی –مخابن– لێرەو لـەوێ خـەڵکانێك هـەن، لەبـەر بیری تەسکیان، هێرش دەکەنە سەر ئەم یاسای میراتە ! بێ شك ئەم یاسایە لەسەر بنەمای (تـەکافولی ئیجتیمـاعی) داڕێـژراوە، کـە چـڕو پـڕ لەگـەڵ (فیطـرە)و سروشـتی ئـادەمیزادا – بەئاسـانی – یەکدەگرنەوە. ئینجا ئەگەر ئەم خزمایەتییە دەرەقەتی کێشە کۆمەڵایەتییـەکانی کۆمـەڵ نـەهات، بۆ چارەسەری کێشەکان دەگوێزێتەوە بۆ لای خەڵکی گەڕەك، دەبێ ئەوان بۆی چارەسـەر بکـەن، خۆئـەر خـەڵکی گـەڕەکیش بۆیـان چارەسـەر نـەکرا، ئەوسـا سـەرەی دەوڵـەت دێـت.. ئـەم دابەشـککردنەش بـەو جۆرەیـە، لەبـەر ئەوەیـە ئـەرك و مـافێکی زۆر نەکەوێتـە سـەر دەوڵـەت و لـەکاروانی پێـشکەوتندا دوا نەکـەوێت. (تـەکافول) لەسـەرەتاوە لـەناو خێزانێکدایـە، بێگومـان ئەگـەر ئەوخێزانـە لـە کێـشەکانی یـەکتر بپێـچنەوە، سـۆزو خۆشەویـستیان بۆیێکـدێ و، دەبنـە خۆشەویستی یەکتر، خۆ لەئاستی کۆمـەڵ و دەوڵەتیـشدا ئاشکرایە کە دلۆڤانی بـۆ کۆمەڵگـەو دەوڵەت بەرپا دەبێ وهەموو حەزدەکەن ئەو دەوڵەتـە دەئەوەنـدەی تـر پایـەدار تـر بێـت، وەنـەبێ باوك و دایك و براو خزم و کەسوکار، دەبێ تەنها لەبواری ماڵ و ساماندا، هاوکاری ڕۆڵـەکانیان

بکـەن، بەڵــکو پێویـستە لـە گـشت بوارێـکدا، بەشـێکیان لـیٚ بـدەن، تەنانـەتی لـە زیرەکیـی و تەمەڵیشدا، لەنەخۆشیی و دروستیدا، لـەئازایی و بیٚ جورئـەتیـدا، لـە پیـشەو ئیش و کاردا، لەبەژن و بالاو، جوانیی و ناشیرینیدا،... هتد. کەوابوو (عـەدل) لەوەدایـە کە لـە (میرات)یشدا بەشـی خۆیـان ببـەن... لێرەوەیـە ئـەم یاسـایە سەرچاوە دەگـریٚ و، خـوا دەفـەرمووێ: (للرجال نصيب مما ترك الوالدان والأقربون وللنساء نصيب مما ترك الوالـدان والأقربـون – مما قلّ منه أوكثـر– نـصيبا مفروضـا.) ٤/٧. لـە ئایـەتی ١١–١٢ درێـژتر لـەم باسـە دەدوێـت، ئێمـەیش – بەپێی توانای خۆمان ڕاڤەی دەکەین و، هەر تۆزو گەردێکیشی لەسەر کەوتبێت دەیسڕینەوە.

ئەم ئایەتی (٧)ی (نیساء)یە دەفەرمووێ: میراتی باوك ودایك و خزمانی نزیـك – کـەم یـان زۆر – نێرینە بەشی خۆی هەیەو، مێینەش تێدا بەشدارەو، بەشیان بۆ بڕاوەتـەوە، هەریەکە بـەپێی پلـەی نزیکـی و دوری لەمردووەکـەوە، یـان بـەپێی ئـەرکی سەرشـانی. کـەوابوو هـیچ کەسێك بۆی نییە ژنان و منداڵان لەمیرات بیٚ بەش بکات.

## میرات لە ئیسلامدا

میرات: بریتییە لەو ماڵ و سامانە لە دوای مردووەوە بـەجیٚ دەمێنێـت، بە تایبـەتی پـاش لێدەرکردنی هەر قەرزو قەرزارییەك بەسەر مردووەکەوە هەبیٚ.

مـیرات وکەلـەپوور بـەر لـە ئیـسلام، یاسـایەکی ئـەوتۆی نـەبوو، تاپـەیڕەویی لـیٚ بکـریٚ، ئەوەند نەبیٚ کە سەرۆك خێڵ و هۆزەکان بەئارەزووی خۆیان، ئەمیان بەشدار دەکردو، ئەویان بیٚ بەش دەکرد! ئەو ناهەقیی و ستەمەش بەتایبەتی – لە ژنـان و منـداڵ و هـەتیوان دەکـرا – هەر لەو بیٚ یاسایی و بیٚ سەروبەریەوە سەرچاوەی گرتبـوو، جـا ئەوسـا کـە ئیـسلام هـات بـە سیٚ (ئایەت). لـە سـوورەتی (نـساء): (١١–١٢)، وە کۆتـا ئایەتیـشی یاسـای تـەواوی (زانیـاری بەشی میرات بەرەکانی) دیاریکردو، ئەوەیش کە مابوو، یان پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردەوە، یا زاناکانی پاش ئەو – لەژێر ڕووناکی یاسای (علم الفرائض)دا بەیانیان کرد.

بنەماو بنچینەی میرات بـەم ئایەتانـە دامـەزراو، لـق و پۆپـەکانی تریـشی سـەرجەم لەمـەوە سەرچاوەیان گرت کەدەفـەرمویٚ: ﴿يوصيكم الله فى أولادكم للذكر مثـل حـظ الأنثـيين فإن كـن نساء فوق اثنتين فلهن ثلثا مـاترك وإن كانـت واحـدة فلـها النـصف ولأبويـه لكـل واحـد منهمـا السدس مما ترك إن كان له ولد فإن لم يكن له ولد وورثهُ أبواه فلأمه الثلث، فإن كانَ لـه إخـوة فلأمه السأدس من بعد وصـية يـوصى بها أوديـن آباؤكـم وأبـناؤكم لاتـدرون أيهـم أقـرب لكـم نفعا فريضة من الله إن الله كانَ عليما حكيما. ولكم نصف ماترك أزواجكم إن لم يكـن لهـن ولـد

فإن كان لهن ولد فلكم الربع مما تركن من بعد وصية يوصين بها أودين ولهن الربع مما تركتم إن لم يكن لكم ولد فإن كانَ لكم ولد فلهن الثمن مما تركتم من بعد وصية توصون بها أودين وَإن كانَ رجل يورث كلالة أوامرأة ولَهُ أخ أو أخت فلكل واحد منهما السدس فإن كانوا أكثر من ذلك فهم شر كاء في الثلث من بعد وصية يوصى بها أودين غير مضار وصية من الله والله عليم حكيم﴾ ٤/١١-١٢. واتە: خوا بەتایبەتی پێتان ڕادەگەیەنێ: کەلەپوورتان بۆ نێرینە دووبەش و، بۆ مێینەش نیو بەشی نێرینە بێ، جا ئەگەر ژمارەی مێینە میراتبەرەکان لەدوان پتر بوو، ئەوا دووبەش لەسێ بەشی میراتەکە دەبەن، خۆ ئەگەر مێینە یەکێ بوو، نیوەی کەلەپوورەکە دەبات. جا ئەگەر مردووەکە منداڵی لەپاش بە جێما، دایك و بابی هەریەکەیان شەش یەك لەو ماڵە دەبا، ئینجا ئەگەر هیچ منداڵی نەبوو، دایك و باوکی میراتەکەیان دەبرد، ئەوا لە سێ بەش، بەشێك بۆ دایکە، ئەوسا ئەگەر مردوو براو خوشکی بەجێ هێشتبوون — پاش دانەوەی قەرز و فەرزو پێکهێنانی وەسیەتەکە — دایك شەش یەکی دەکەوێ.

بەڵێ ئەم مەسەلەی میراتە، لەدێرین ڕۆژگارەوە، بۆتە چەقڵی چاوی ناحەز و نەیارانی دینی ئیسلام، لەوێوە خۆیان خزاندۆتە نێو جەرگەی جیهانی ئیسلامەتیەوەو، بەدەیان و بەسەدان بەدگومانیان دروستکردووە بۆ ژنان و پێیان دەڵێن: ئەگەر ئێوە لای ئیسلام ڕێزدارو خاوەن ڕێز بووبان، چۆن ئاوا بۆ نێرینە دوو بەشی دادەناو، بۆ مێینەش بەشێك؟ دیارە ئەوە ماناو واتای کەم بەهایی ژنانە ! ئێمەش -پشت بەخوا- بەم جۆرە لەو مەسەلەیە دەدوێن و دەڵێین:

١- دانانی میرات بەو شێوەیە، لە بەر بێ ڕێزی و کەمبەهایی ژنان نییە وەکو ئەوان دەڵێن — بەڵکو لەبەر ئەوەیە:

أ- پیاو هەموو بژێویی و نەفەقەی ماڵ و منداڵی بەسەرا دراوە.

ب - پێویست کراوەتە سەر پیاو کەمارەیی پێشکەش بەژنان بکات، ژنیش لە بەرامبەر ئەوەوە کارو باری بەڕێوە بردنی ماڵ و، دووگیان بوونی خۆیی و، منداڵبوونی و، خۆتەرخانکردن بۆ بەخێوکردنی منداڵانی بۆ دانراوە، کەوابوو دابەشکردنی میرات بەو جۆرەیە لە فەرهەنگی ئیسلامدا — لە بەر ڕێزو حورمەتی ژنانە، لەبەر ئەوەیە کە بەوردی بتوانن کاروباری ناوماڵ و، منداڵان بەڕیوەبەرن و، گرفتی پەیدا کردنی بژێویان نەبێ و، بەڵکو پیاوەکەی خەمی ئەو شتانەی بۆ بخوات.

ج -ژن هەموو پێداویستیەکی لەسەر پیاوە، مەگەر ژنەکە خۆی دەستی یارمەتی درێژبکات بۆ مێردەکەی، ئەو بژێویی و جل وبەرگ و خانووبەرەو....هتد پیاو دابینی دەکات بۆ ژنان، خوا دایناوەو بۆتە هەقێکی شەرعیی و یاسای خوایی، هیچ کەسێك ناتوانێ منەت

بكات به سەر ژنەكەدا، بەڵام ئەگەر ژنەكە دەستی یارمەتی ڕاكێشا بۆ پیاوەكە، دەتوانێ منەت بخاتە سەری، هەر لەو ڕووەشەوەیە كە پیاو ناتوانێ زەكاتی ماڵەكەی بداتە ژنی خۆی، بەڵام ژن دەتوانێ زەكاتی ماڵی خۆی بە مێردەكەی بدات.

د –ژن كە تەڵاق درا، دەبێ پیاو نەفەقەی ماوەی تەواوكردنی (عیدەی) بۆ بدات.

ھ –ژن كە تەڵاق درا، شەریعەتی ئیسلام بە پێی بوون و نەبوون (موتعە)ی بۆ پێویست كردۆتە سەر پیاوەكەی.

٢– ئەم میراتە – كە نێرینە دوو ئەوەندەی مێینە لێدەبا – تەنها لەنێوان براو خوشكیی باوك و دایكیدایە، ئەگینە هێندێ جار، مێینەش بە ئەندازەی نێرینە دەبات، بۆ نموونە:

* خوشكی دایكیی – ئەر تەنها خۆی بوو– لەمیراتەكە شەش یەك دەبا، هەر چۆنێ برای دایكیش ئەر بەتەنها بێت، شەش یەك دەبا.

* ئەر خوشك و برای دایكیی، دوان بوون، یان زیاتر، ئەوا وەكو یەك سێیەك دەبەن.

* ئەگەر – لەدوای مردووەكەوە – منالی نێرینە، یان نێرینەو مێینە، لەگەڵ باوك و دایكیدا بەجێمان، ئەوا باوك و دایكەكە – هەریەكەیان شەش یەكی میراتەكە دەبەن.

* ئەر مردووەكە بەتەنها منداڵی مێینەی لێ بەجێما، دیسان باوك و دایك شەش یەك دەبەن، واتە: لەم حاڵەتانەو لە هێندێ حاڵەتی تردا، نێرینە و مێینە وەكویەك میرات دەبەن.

كەوابوو ئەوەی بۆتە جێگەی مشت و مڕی خۆرئاواییەكان، تەنها مەسەلەی ئەو كیژو كوڕانەیە باوكیان دەمرێ و، ئەوسا پاش مردووەكە، میراتەكە دەكرێ بە سێ بەشەوە: دووبەشی بۆ كوڕەكەو، بەشێكی دادەنرێ بۆ كچەكە، هەر ئەمەیە كە نەزان و ناحاڵیەكان – لێرەو لەوێ – لە ئیسلامیان كردۆتە هەراو، بۆ پشتگیری خۆیان خەڵكیان كۆكردۆتەوەو، گشت پێكەوە دەهۆڵ لێ دەدەن! خۆ بێگومان – وەكو لەپێشەوە كورتەیەكمان باسكرد – دابەشكردنی ئەو میراتە بەو شێوەیە (كچ سێیەكی كوڕ دەبا) كە دەكەونە دوای بابیان و، كچەكە سێیەكی كوڕەكە دەبا، لەبەر ئەوەیە كە ماڵ و سامانی كچەكە هەر لە زیاد بووندایە: چونكە كچ كە مێرد دەكات، مارەیی وەردەگرێ بۆ خۆیی و، دەشتوانێ بازرگانی پێوە بكاو وردە وردە زیادی بكات، لەولایشەوە هەموو پێداویستێكی ژیانیش خۆیی ومنداڵی لەسەر مێردەكەیەتی. بەڵام كوڕ كە زەماوەند دەكات، مارەیی دەداو، پێویستی زەماوەندەكەشی لەسەرە،وەكو كڕینی ناوماڵ و، پەیداكردنی خانوو جێی حەوانەوە...دەسا ئیستا كچەكە زۆر وەردەگرێ، یان كوڕەكە؟ كامیان قازانجی كردووو، كامیان زیان؟.(لەم كتێبانە سوود وەرگیراوە: (فی ظلال القرآن، تفسیر المنار، المرأة بین الفقة والقانون، الإسلام عقیدة وشریعة).

## گەواهی ژنان لە ئیسلامدا

ژن و پیاو لە فەرهەگی ئیسلامدا وەکویەکن، مەگەر هێندێ شتی تایبەتمەندی هەریەکەیان، بۆ نموونە: هێندێ شت هەیە، تەنها گەواهی ژنانی لەسەر وەردەگیردرێ، چونکە لە وڵاتی خاوەن ئەدەب و بەئەخلاقدا، باو نەبووە ئەو شتانە پیاوان ئاگایان لێی بێ و بیزانن،بۆ نموونە:(لەدایکبوون و کچێتی و، عەیب و ناتەواوی ناوەوەی ژنان) هەر وەکو بڕێ مەسەلەو باسیش هەیە لەبەرئەوە کە ژنان بەسۆزو بە میهرەبانترن، ناتوانن لەکاتی ڕوودانیاندا ددان بەخۆدا بگرن و لایان بمێننەوە، تا بەتەواوی ببینن و ئاگایان لێی بێ و بۆ دوایش شایەتی لەسەر بدەن، هێندێ شتیش هەیە شایەتی هەردووکیانی — وەکو یەك — تیا وەردەگیردرێ، بۆ نموونە: لە شەهادەتی (لیعان) دا، ئەوکاتە پیاوکە ژنەکەی تۆمەتبار دەکات بە مەسەلەی زیناوەو، شایەتیشی نییە بۆ چەسپاندنی، لەکاتی ئاوادا دەبێ پیاو چوار (أشهد بالله) بکێشێ کە ڕاست دەکا، بۆ جاری پێنجەم بڵێ: ئەر درۆ بکەم، نەفرین و نەحلەتی خوام لێ بێت، دیارە پیاوەکە بەم گفتوگۆ و (أشهد بالله)یە، لە قامچی وشەلاق لێدان خۆی ڕزگار دەکاو، ژنەکەش ئەگەر خۆی بێدەنگ بکا بەردەباران دەکرێ و تۆڵەی ئەو گوناحەی — لە قیامەتدا — لەسەر نامێنێ، خۆ دەشتوانێ وەکو پیاوەکەی، چوار جار (أشهد بالله) بکێشێ کە: پیاوەکەی لە درۆزنانە و درۆی بۆ هەڵدەبەستێ، بۆ جاری پێنجەمیش: دەڵێ: بەر غەزەب و تووڕەیی خوا بکەوم ئەگەر ڕاست بکات.

بەڵام کە ئیسلام هات سەیری یاسای ژیانی ژن و پیاوی کردو، دیتی ژیان بە هەردووکیان ئەوجا بەرێوە دەچێ، هەستا لەبەر ئەوە کەپیاو باشتر بەرگەی سەرماو گەرماو، ناڕەحەتییەکانی تر دەگرێ، ئیش و کارەکانی دەرەوەی ماڵی دابەسەر پیاودا، لەبەر ئەمانەو لە بەر رەچاو کردنی هێندێ لایەنی تر، بڕیاریدا:ژنان خانم و سالارەی ماڵ بن و، ڕێگەی نەدا بچێتە بەر خۆرو ناو سەرماو دەشت و دەر بکەن و، بنێرینە بازاڕەکانی کڕین و فرۆشتنەوە ! چونکە ئیسلام ژیان و بژێوی ژنانی (فەرز) کردۆتە سەر پیاوان، بۆ نوونە: تا کیژۆڵەن، لەسەر باب و براو کەس وکاریەتی بیانژێنن، هەرکە مێردیشیان کرد، ژیانیان لەسەر مێردیانە... جا لەم سۆنگەیە دەردەکەوێ کە ژنان ئەوەندە سەرقاڵی کڕین و فرۆشتن و بازاڕ نابن، تا ئاگایان لە مامەڵەی پیاوان ببێ وبتوانن سبەینێ شایەتییان بۆ بدەن، کە پێوەی سەرقاڵیش نەبوون، دیارە ئەوندەش لەدڵ و مێشکیاندا نامێنێتەوە، چونکە — لای ئیسلام — کاری وا، کاری ئەو نییە، بەڵکو کاری ئەو، کاروباری ماڵ و منداڵانە، پێگەیاندن و پەروەردەیانە، هەر لەم سۆنگەشەوەیە کە بۆ هەڵگرتنی شایەتی و، شایەتیدان، بەقەد پیاو بەرپرس نیەو، لەوانەیە

وەکو پیاو ئەوەند گوێ بە مەسەلەی (ماڵ وسامان) نەدا، بۆیە قابیلی لە بیرکردنەو، لەوانەیە هەڵەی تێدا بکەن، لەوانەیە لە ئاییندەدا نەتوانن، ماڵ و سامانی ئەو کەسە بپارێزن و نەفەوتێ، هەر لە بەرئەمەیە کە قورئان دەفەرموێ: ﴿.. واستشهدوا شهيدين من رجالكم فإن لم يكونا رجلين فرجل وامرأتان ممن ترضون من الشهداء...﴾ ٢/ ئەمەیە کە دوو ژن بە پیاوێك وەردەگیردرێ و، دەبێ بۆ کاتی شایەتی هەردووکیان لای (قاضی) ئامادەبن و قسەبکەن و گوێیان لەیەکتر بێت، جا ئەگەر ژنی یەکەم بەرێك و پێکی شایەتییەکەی ئەنجامدا، ئەوا ژنی دووەم دووپاتی دەکاتەوە، ئەگینە هەڵەکەی بۆ ڕاست دەکاتەوە.

بەڵێ...ئەم مەسەلە لەبەر بێ ڕێزی ژنان نییە، بەڵکولەبەر ئەمەیە کەدینی ئیسلام وای بەباش زانیوە ژنان نەچنە بەرخۆرو سەرماو بازاڕ، دیارە کە نەچوونە ناو بازاڕەوە زۆر کەمیش ئاگاداری ڕوداوەکان دەبن، هەرئەوەشە کە لە (جنايات) و تۆڵەدا، شایەتیان وەرناگیرێ.

سەرباری ئەمانەش بەڕیز (دکتۆر محموود شەلتووت شەیخی ئەزهەر) دەڵێ: ئایەتەکە بۆ دڵنیاکردنی خاوەن ماڵەکان هاتووە، وەکو پێیان بفەرموێ: باشترین ڕێگا بۆ ئۆقرەی دڵتان بەرامبەر بەسامانەکەتان، ئەوەیە: یان دوو پیاو ئاگاداری مامەڵەکەتان بکەن، یان دوو ژن و پیاوێك... مەسەلەکە دڵنیایی و دڵ ئۆقرە بوونە، نەك ئامادەبوون لەبەردەم (قاضی)یدا.

((تەفسیری کاشف))یش دەڵێ: هێندێ جار(قاضیی) ئەوەند کە دڵنیا دەبێت بە شایەتی تەنها ژنێك، بەشایەتی دەپیاوی ناعادڵ، ئەو زانیاریانەی بۆ پەیدا نابێ و، دڵنیا نابێت لەمەسەلەکەدا، خۆ((قاضیی)) یش هەرکات گەیشتە ئەودڵنیاییە، دەتوانێ کار بەو زانستیەی خۆی بکات، ئەگەرچی تەنها ژنێکیش بێت، چونکە لێرەدا کار بۆ ئەو زانست ودڵنیاییە دەکرێت.هەروەها لەبەرامبەر دانانی دووژنەوە بەیەك شایەت – پاش هێنانەوەی هێندێ پاساو بۆی – دەڵێ: چاك وایە خۆمان ببەستین بە دەقی قورئانەکەوەو، ئەوەندە نەڵێین.

## تۆڵەی سەرەتایی بۆ ژنانی زیناکار

ئیسلام کاتێ دێت، کۆمەڵگە – بە پیاووبە ژنەوە– لەکاری قێزەون و بەدکاریدا نقومببوون، دیارە ڕاست کردنەوەی هەڵەو تاوانی کۆمەڵگەیەکی ئاواو، تۆڵەدانی ئەو کۆمەڵگە فاسیدە بەشێوەیەکی توندوتیژ، پێیان قبووڵ نابێ و، لە هێڵ دەردەچن، بۆیە لەسەرەتاوە کەدێت ئەو ژنانە فاحیشەچین و داوێن تەڕن، لە کۆمەڵگەیان دادەبڕێ و دووریان دەخاتەوەو، ڕێگە نادات تێکەڵی کۆمەڵگە بن، تا خەڵکەکەی تر تووشی ئەو پەتایە نەکەن و، لەوانەوە نەتەنێتەوە بۆ ژن و کیژۆڵەکانی تر، هەروەکو ئازارو بێزاری پیاوە بەدکارو فاحیشە

چیەکانیش دەدا، ئەوانەی کە بەکاری نامۆو (شاذ) ەوە خەریك دەبن. ئەوەیە کە هەر لە سوورەتی (نساء)دا، ئایەتی (١٥) دەفەرمووێ: ﴿واللاتی یأتین الفاحشة من نسائکم فاستشهدوا علیهن أربعة منکم، فإن شهدوا فأمسکوهن فی البیوت حتی یتوفاهن الموت أو یجعل الله لهن سبیلا﴾.هەر کە هەستتان بە ژنێك کرد لە خۆتان (واتە: لە ژنانی موسڵمان و ئیماندار) کە خەڵکانی نامۆو بەدرەوشت بەخۆ فێردەکەن، ئێوەش — بۆ سەلماندن و چەسپاندنی ئەو کارەیە — چوار کەسی موسڵمانی ئیمانداریان لێ بکەنە شایەت — ئەو کات وساتە لێك جووت بوون — جا هەرکە شایەتەکان هاتن شایەتیان لەسەر دان، دەبێ ئێوەش — ئەی کاربەدەستانی ئیماندار ! — هەر لەماڵدا قەتیسیان بکەن و، ڕێگەیان مەدەن تێکەڵیی کۆمەڵگە بکەن و، مێرد بە خەڵکە پاکەکە بکەن، تا یان دەمرن، یان ئەوەتە خوای دلۆڤان ڕێگەی دیکەیان بۆ دادەنێ.

بەڵێ لەسەرەتاوە تۆڵەی ژنی داوێن تەڕ و زیناکار هەر ئەمە بوو، تا بۆ دوایی لە سوورەتی (نوور)و لە فەرموودەکاندا، فەرمان و بڕیاری نوێ و هەتا هەتایی هات و بووبە کۆتا بڕیار. (عوبادەی کوڕی صامیت) دەڵێ: هەر کە وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەهات، پێوەی دیار دەردەکەوت و ماندوناڕەحەت دەبوو ڕەنگیشی دەگۆڕدرا. جا کە ئەمجارەیان وەحی بۆ هات، فەرمووی: ((ئەم بڕیارەم لێ وەرگرن... بێ شك وا خوای گەورە لەبارەی ئەو ژنانەوە بەم شێوەیە، فەرمان و بڕیاری یەکجاری خۆیدا: کچ لەگەڵ کوڕدا جووت بن، دەبێ هەر یەکە سەد قامچیان لێ بدرێ‌و، ساڵێکیش — لەجێ و شوێنی خۆیان — دوور بخرێنەوە. پیاو وژنیش — هەرکە لە یەك جووت بوون— بەردەباران دەکرێن و، قامچی بۆ ئەمان نیە. ئیمامی (ئەحمەد) و ئیمامی (موسلیم) ڕیوایەتیان کردووە.

لەبارەی پیاوەکانیشەوە دەفەرمووێ: ﴿واللذان یأتیانها منکم فآذوهما فإن تابا وأصلحا فأعرضوا عنهما إن الله کان توابا رحیما﴾ ١٦/٤. واتە: ئەو دوو کەسەشتان — ئەی ئیمانداران !— کە ئەو کارە دزێوو شاززە(نێر بازیی) دەکەن، دەبێ ئێوە — پاش ئاشکرابوونی بەچوار شایەت —، بەتاکە پێڵاوو قسەی تاڵ ئازاریان بدەن، دیارە بۆ ئەمانیش ئاوایە تا خوا — بەیەکجارەکی — بڕیاری خۆیدەدا بەرامبەریان....ئەوەبوو بۆ دوایی، قامچی، یان بەردەبارانیان پێویست کرا.

(ڕەشید رضا) دەڵێت: بەڕێز (محمد عبده)ی مامۆستام ڕای وابوو هەردوو ئایەتەکە: (١٥-١٦)هەر لەبارەی زیناکارانەوە هاتوون، ئایەتی پازدە مەبەستی ژنانی مێرد کردوو و زینا کارن، جا ئەوجۆرە ژنانە نابێ تێکەڵ بە کۆمەڵ بن و، ڕێیان بدرێ لەماڵ بێنە دەر،تا

خوا بڕیاری تریان بۆ دەدا، ئەوە بوو بۆ دواتر سوورەتی (نوور) هات.

مەبەست بەئایەتی شازدەش ئەو کچ و کوڕانەیە زینا دەکەن، ئەمانیش دەبێ بەقسەی تاڵ و ناشیرین و، بەتاکە نەعل ئازار بدرێن، تا بڕیاری کۆتا دێت. ئەوەبوو ئەمیش لە سوورەتی (نوور)دا هات و یەکلاکرایەوە. بەڵێ ژنانیش ئیعتیباری خۆیانیان هەیە، ڕێز لە چاکەکانیان دەگیردرێ و، تۆڵەی بەدکارو فاسیدەکانیان دەدرێ. (بەپیشتوانی خوا لە سوورەتی نوور، درێژتر لەم باسە دەدوێین).

## ژنان کرابوونە ماوەو کەلە پوور!

بەر لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام و، دەسەڵات پەیداکردنی، کەسێك مردبا، کەس وکارەکەی دەهاتن وەکو کەلەپووردەستیان بەسەر ژنەکەیدا دەکێشا! ئەرپێویستی بووبا مارەی دەکرد، یان بەمێردی دەداو، مارەیییەکەی دەخوارد، یان هەرنەیدەهێشت شوو بکاتەوە...تا خۆی لێ دەکڕییەوەو فیدیەی لێ دەسەند! یان تەڵاقی دەداو، دەیکردە مەرج لەسەری کە: نابێ مێرد بەفڵانە کەس بکات، هەتا خۆی نەکڕێتەوە بە مارەیییەکەی. هەیشبوو ئەیهێشتەوە تا کوڕە بچکۆڵەکەی گەورە دەبووو لێی مارە دەکرد! وەهەروەها دەیان کاری نامرۆڤانەی تریان بەرامبەر ئەو ژنە بێ چارانە دەکرد.... ئەمە هەر بەردەوام بوو تا وەختی ئەوە هات کە ئەو کۆمەڵگە بێ ئاوەزە، لەبارەی ژنانەوە حاڵی بکاوپێیان بڵێ: ژنیش وەکو پیاو بۆ خۆی ئازادە، بۆ دیاریکردنی ئایندە و چارەنووسی خۆی، هیچ کەسێك بۆی نییە یاری پێ بکاو پێی ڕابوێرێ و، بەرژەوەندییەکانی ڕەچاو نەکات، تێبگەیاندن کە پەیوەندی ژن و مێرد، وەکو پەیوەندی ئاژەڵ نییە، بۆ بازرگانیی و کاتێکی کەم نیە، پاشان دەست بکێشێ بەسەریاو ئازادیی لێ زەوت بکات...ئیسلام هات حەرامی کرد ژنان بکرێنە کەلەپوور، قەدەغەی کرد ئازادییان لێ بگیردرێ، چۆن شوو دەکەن و، بەکێی دەکەن ؟؟ ئەمەیە کە خوای میهرەبان و دلۆڤان دەفەرمووێ: ﴿يا أيُها الذين آمنوا لايحل لكم أن ترثوا النساء كرهاً، ولا تعضلوهن لتذهبوا ببعض ماآتيتموهن – إلا أن يأتين بفاحشة مبينة – وعاشروهن بالمعروف فإن كرهتموهن فعسى أن تكرهوا شيئاً ويجعل الله فيه خيراً كثيراً وإردتم استبدال زوج مكان زوج وآتيتم إحداهن قنطارا فلا تأخذوا منهُ شيئاً. أتأخزونه بهتاناً وإثماً مبينا وكيف تأخذونه وقد أفضى بعضكم إلى بعض وأخذنَ منكم ميثاقاً غليظاً﴾ ٤/١٩–٢١. واتە: ئەی خەڵکانی خاوەن باوەڕ ! بۆتان حەڵاڵ نیە ژنان بەزۆرداری بکەنە ماڵی میراتیی، نابێ زۆریشیان بۆ بێنن،هەتا بڕێك لەوەی پێتان داون – دیسان – لێیان بسێننەوە، مەگەر بە ئاشکرا لاساربن و کاری دزێوو ناپەسەند ئەنجام بدەن، دەبێ بە بەشێوەیەکی جوان و پەسەند ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن، خۆ ئەگەر هەر چارەتان نەدەویستن، ددان

بەخۆتان بگرن باشترە لەتەڵاقدانیان، چونکە گەلێ شتی وا هەیە ئێوە حەزی لێناکەن، بەڵام بۆ ئاییندە خوا خێرو چاکەی زۆری تیاداناوە. ئەگەر ویستتان ژنی خۆتان تەڵاق بدەن و، لەجێی ئەودا ژنی تر بێنن، یان هەر ئیترپاش ئەو، ژن نەهێنن، ئەگەر بەو ژنەتان – کە دەتانەوێ تەڵاقی بدەن – کلوورێك زێڕودراوتان دابێ، نابێ لێیان بسێننەوە، دەتانەوێ بەبوختان و درۆو دەلەسە وکاری حەرام بیسێننەوە ؟ واتە: بڕوبیانوویان بۆ هەڵبەستن و لەبەرامبەر تەڵاقەکەیانەوە مارەیی یەکەیان بخۆن و، ئەوانیش لەبەر خۆ ڕزگارکردن لێتان، دەست لە مارەیییەکەیان هەڵگرن ؟

جا کە ئێوە ماوەیەك بەژن و مێردی پێکەوە بوون و ڕاتان بواردووەو هەر لە جێ و بانێکدا خەوتوون و، پەیمانی پتەویان لەگەڵ ئێوەدا – ئەی مێردان ! – بەستووەو، مارەکراون و بوونەتە هاوسەرو حەڵاڵتان ؟ کەی ڕەوای هەقە مارەییەکەیان لێ بسێننەوە؟. (قەتادە) دەڵێت: ئەو پەیمانە ئایەتی: ﴿فإمساك بمعروف أو تسريح بإحسان﴾ ٢٢٩/٢. واتە: ڕاگرتنی ژنان و تەڵاقدانیان، هەردوو بارەکەی دەبێ بە چاکەو جوامێرانە بێت، یان ئەو گرێ بەسی نیکاحە، هەر بۆ حورمەت و ڕێزنانە لە یەك، هەرگیز ڕەوا نیە بۆ مێرد، پاش ئەو هەموو تێکەڵی و پێکەوە بوونەو، لەڕازو نیازی یەکتر گەیشتن، ناکۆکبن و، هەراو کێشەیان لەگەڵ دروست بکەن و، ئەوانیش بەناچاری هەر چیتان پێدا بن – بەهۆی نیکاحەوە – دەستی لێ هەڵبگرن؟!.

بەڵێ ئەو ئیسلامەی کە دیدو بۆچوونێکی تایبەتی هەیە، سەبارەت بە تێڕوانینی مەسەلەی ئافرەت، ئەو ئیسلامە کە خانوو و ناوماڵ، بەجێگەی ئەمن و ئەمان و ئۆقرەی دڵ دادەنێت، وەبەمیهرەبانی و بەزەیی و دلۆڤانەوە دەڕوانێتە پەیوەندی نێوان ژن و پیاو، هەر ئەو ئیسلامەیە کە بە (مێرد) دەڵێ: ئەگەر بێ هۆکاری شەرعیی – وەکو کاری فاحیشەو دزێوو.... تاد– چارەی ژنەکانتان نەویست، هێمان بەئارام بن و، ددان بە خۆتاندا بگرن و، هەوڵ بدەن لێك جیامەبنەوە، دوور نییە خوا ئەو حاڵەتە ناڕەحەتی یەتان بە خێرو چاکە و ژیانی خۆش بۆ بگۆڕێ.

زۆرێك لە ژن و پیاو هەبووە، کاروباریان شێواوەوئاڵۆز بووە، ژنەکە، یان پیاوەکە ددانی بەخۆدا گرتووەو، لەوماوەیەدا، خوا منداڵی پێداون و بەوهۆیەوە هەردوولا ئاشتبوونەتەوەو خۆشەویستی کەوتۆتە نێوانیان و، ژنەکەش بەتایبەتی شیرین تر بووە لای پیاوەکەی.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەهەموو کەسێ ڕەوشت بەرزترو، ڕەفتار شیرینتر بووە لەگەڵ هاوسەرەکانیدا، بەڕووی خۆشەوە، بەڕوویاندا چووە، قسەی خۆش و گەمەی لەگەڵ کردوون، زەردەخەنەو پێکەنینی لە ڕوویاندا کردووە،تەنانەت کێ بەرکێی لەگەڵ کردوون ! خاتوو (عایشە– خ) دەڵێ: بەر لە قەڵەوبوونم پێشبڕکێم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کردو پێشی کەوتم و،

پاش قەڵەوبوونیشم هەر پێشبڕکێمان کرد، بەڵام ئەمجارەیان لێی بردمەوە، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (داش بەداش). پێغەمبەر ﷺ لەهەر ماڵێکیاندا بووبا، زۆربەی شەوەکان دەینارد بە دوای هاوسەرەکانی تریدا، بۆ خۆشیی و خۆشەویستی نێوانیان، لەوماڵەدا کۆی دەکردنەوە، پاشان کاتی خەو هەریەکەیان دەگەڕایەوە ماڵی خۆی، پێغەمبەر ﷺ لەبەر ڕێزو پایەی ژنان بوو، کە فەرمووی: ((خيركم، خيركم لأهله، وأنا خيركم لأهله)). (ئەبوو داود، ئیبن ماجە) واتە: هەر ئەوەتان چاکە، کە بۆ ژن و هاوسەرەکەی زۆر چاکە، شیاوی باسە، من لە گشتتان بۆ ژن وماڵم باشترم. هەر ئەو پێغەمبەرە ﷺ ئەوەندە سۆزو خۆشەویستی ژنەکانی لا مەبەست بوو، هەوڵی زۆری دەدات، دڵیان نەیەشێ و گەرد نەگرێ بەرامبەری، بۆیە هەر کە دەرچووبا بۆ سەفەرێك، یەکێکیانی لەگەڵ خۆی دەبر، بەڵام چۆنی دەبرد؟ حەزی لەهەرکامێکیان بووبا ئەوەی دەبرد ؟ حاشە! وای نەدەکرد، بەڵکو تیروپشکی بۆ دەکردن و، ئینجا بۆ کامیان دەرچوایە، ئەوەیانی دەبرد... بەڵێ ژن لە ئیسلامدا – بێ جیاوازیی – وەکو پیاوەو، نابێ بە هیچ شێوەیەك ستەمی لێ بکرێ و، ئازادیی لێ زەوت بکرێت.

## بەرلە ئیسلام ژنی باب مارە دەکرا !

بەر لە هاتنی ئیسلام – وەکو ئاماژەمان پێکرد – ژنان کرابوونە میرات و کەلەپوور و زۆر جاران کە باوك دەمرد، نەیان دەهێشت ژنەکەی – بەئارەزووی خۆی – شوو بکاتەوە، هەتا منداڵە بچکۆڵەکەی گەورە دەبوو، ئەوسا یان مارەی دەکرد، یان دەیکردە کەلەپوورو بەشووی دەدا،جا کە ئیسلام هات، زۆر بەخەستی چوو بە گژیانداو، بەسەختیش ئەو کارەی حەرام کردو فەرمووی ﴿ولاتنكحوا مانكحَ آباؤكم من النساء الإ ماقد سلف، إنه كان فاحشة و مقتا وساء سبيلا﴾ ٢٢/٢٠ بەواتای: ئەو ژنانە کە بابتان مارەیکردوون، هەرگیز ئێوە مارەیان مەکەن – مەگەر ئەوی تێپەڕیوە – بەڕاستی کاری وا زۆر دزیوو مایەی رك و تووڕەبوونی نێوانتانە و، ڕێگاو ڕەوشتێکی خراپ و ناپەسەندە. دەکرێ هۆی حەرام بوونی ژنی باوك لە سێ شتاندا کۆبکەینەوە، ئەگەرچی لەوانەیە گەلێ هۆی تریش هەبێ و، ئێستا ئێمە درکیان نەکەین:

یەکەم: لە ئیسلامدا باوەژن حیسابی دایکی هەیە.

دووەم: نابێ کوڕ بچێتە جێگەی بابی و بێتە نیارو دژی، چونکە مرۆڤ – بەپێی سروشت – رکی لەو کەسە دەبێتەوە ژنەکەی مارە دەکاتەوە.

سێیەم: کاری وا لە کاری جاهیلیەتی بەر لە ئیسلام دەچێ کە: ئەوان ژنی بابیان دەکردە میرات و مارەیان دەکردو، بەوە لە ڕێزی ژنانیان کەم دەکرد. پاشان خوای گەورە پتر لەسەر

مەسەلەی حەڵاڵ و حەرامی ژنان دەچێ و دەفەرمووێ: ﴿حرمت عليكم أمهاتكم وبناتكم وأخواتكم وعماتكم وخالاتكم وبنات الأخ وبنات الأخت وأمهاتكم اللاتى أرضعنكم وأخواتكم من الرضاعة وأمهات نسائكم وربائبكم اللاتي فى حجوركم من نسائكم اللاتى دخلتم بهن فإن لم تكونوا دخلتم بهن فلا جناح عليكم وحلائل أبنائكم الذين من أصلابكم وأن تجمعوا بين الأختين إلاما قد سلف إن الله كان غفوراً رحيما﴾٢٣/٤. واتە: ئەم ژنانەتان لەسەر حەرام کراوەو پێتان ناشێن: دایك و کچ و خوشك و پوور — لەهەردوولاوە — وکچی براو کچی خوشك و، ئەو ژنانەش بە ساوایی شیرتان خواردون و، ئەو کیژەی هاوشیرتان بووەو، خەسووتان و، ئەو کیژانەی خۆتان بەخێوتان کردوون و، لەو ژنانەن سەرجێیتان لەگەڵ کردون، خۆ ئەر دایکەکانیانتان مارە کردو نەکرا لەگەڵیان بنوون ئەوە قەیدی نیەو دەتوانن کیژەکانیان بخوازن، وەژنی کوڕی پشتی خۆیشتان، دووخوشکیش پێکەوە قەدەغەیە بکرێنە هاوسەر — مەگەر بەر لە ئیسلام ئەو کارانە کرابن — بیٚ شك خواش لە هەڵەو پەڵە دەبووریٚ و دلۆڤانە. بەڵێ مەسەلەی ژنانی مەحرەم، لە هەموو گەلێکی سەرەتایی و پێشکەوتوودا حیسابی خۆی بۆ کراوە، لە ئیسلامیشدا ئەمانەن لەم ئایەتەداو، لەئایەتی پێشوویداو، دواتریش هێندێکیان باس دەکرێن.

ئەو ژنانەی حەرامە مارەکردنیان ئیسلام کردوونی بەسیٚ بەشەوە: بەشێکیان تا دنیا دنیا بیٚ حەرامن، یان لەسات و کاتێکی تایبەتدا — مارەکردنیان حەرامە— بەهۆی ڕشتەو ڕەگەزەوە. یان بەهۆی شیر خواردنەوە. یان بەهۆی ژن و ژنخواستنەوە ئیتر بەدەر لەوانە، ئیسلام هەموو ئیعتیبارێکی تری هەڵوەشاندۆتەوە — کەلەناو کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکاندا باوبوون —.

**وە بەهۆی خزمایەتی زۆر نزیکیشەوە چوار جۆریانی قەدەغە کردووە:**

یەکەم: لە بنەڕەت و بنچینەوە (أصول)، ئەمانەش دایکی خۆیی و، دایکی باوکیی و، دایکی دایکیی و، دایە گەورە لە هەردوولاوەوە: ﴿حرمت عليكم أمهاتكم﴾.

دووەم: لق و وەچە (فروع). ئەمانەش: کچی خۆیی و، کچەزاو کوڕەزا دەگرێتەوە: ﴿وبناتكم﴾.

سێیەم: لق و وەچەی باوك و دایکیی، کەوابوو مارەکردنی کچی خوشکی خۆی و، خوشکەزایی و برازایی و نەوەی ئەوانیش: ﴿وأخواتكم﴾... ﴿وبنات الأخ وبنات الأخت﴾ یاساغە.

چوارەم: لق و نەوەی ڕاستەوخۆی باپیرە، بۆیە مارەکردنی پوور — لەهەردووسەرەوە — قەدەغەیە، هەروەها پووری باوك خۆی، پووری باپیرەی باوك ودایکیی... ﴿وعماتكم وخالاتكم﴾. بەلاٚم لق و نەوەی ناڕاستەوخۆ، ڕەوایە ژن ومێردی بکەن، کەوابوو ژن وژنخواستن لە نێوان ئامۆزاو، پورزاو خاڵۆزادا ڕەوایە.

## ئەم ژنانە بەژن و ژنخوازی حەرام دەبن

١- بنەڕەت و بنچینەی خێزانت. دایکیی و، دایە گەورەی ژن لە هەردوولاوە. ئەم حەرامبوونەش هەر بە مارەکردنی ژنەکە – بگوێزرێتەوە، یا نا – پەیدا دەبێ: ﴿وأمهات نسائكم﴾

٢- بەچەو وەچەی خێزان و هاوسەر.. واتە: کەژن خوازرا، ئیتر حەرامە کچ وکچەزاکانی بخوازرێت، بەڵام ئەمەیان بە گواستنەوەی ژنەکە پەیدا دەبن: ﴿وربائبكم اللاتي في حجوركم من نسائكم اللاتي دخلتم بهن، فإن لم تكونوا دخلتم بهن فلا جناح عليكم...﴾.

٣- ژنی باب و باپیرە – لەهەردوو سەرەوە –: ﴿ولاتنكحوا مانكح آباؤكم من النساء...﴾.

٤- ژنی کوڕی خۆت و، ژنی کوڕەزاکانت، یان ژنی کوڕی کچت، واتە: بووك: ﴿وحلائل أبنائكم الذين من أصلابكم﴾.

٥- ژن خوشك. دیارە حەرامبوونی ژن خوشك، کاتییەو، هەرکە ژنەکەی خۆی مرد، یان تەڵاقیدا، ژنخوشکەکەی حەڵاڵ دەبێتەوە: ﴿وأن تجمعوا بين الأختين﴾.

## ئەم ژنانەش بە شیر خواردن حەرام دەبن

١- دایکی شیریی و، بنەڕەتیی و (ئوصول)ییەکەی: ﴿وأمهاتكم اللاتي أرضعنكم﴾.

٢- کچی شیریی و، کچەزاکانی.

٣-خوشك و خوشکەزای شیری: ﴿وأخواتكم من الرضاعة﴾.

٤- پووری دایکی شیریی، یان خوشکی شیریی مێرد.

٥- دایکی شیریی ژنەکەی و، بنەڕەت و بنچینەی.

٦- کچی شیریی خێزانی.

٧- خێزانی باب و باپیرەی شیریی.

٨- ژنی کوڕی شیریی.

٩- کۆکردنەوەی ژن لەگەڵ خوشکی شیریی، یان پووری شیریی خۆیدا. (بوخاریی) و (موسلم) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموون: ((يحرم من الرضاعة ما يحرم من النسب)). واتە: هەر ژنێ بەهۆی رشتە و ڕەگەزەوە حەرام ببێ، بە هۆی شیر خواردنیشەوە حەرام دەبێ، ئەم فەرموودەیە لای زاناکان، کراوەتە ماددەو بنەمایەك بۆ ژنانی شیر خواردوو، لەژێر ئەو یاساوە ئەو (٩) جۆرە – باسمانکردن – بڕیاری حەرامیەتیان وەرگیراوەو حەرامبوون.

ئەمانە هەموو بە بڕیاری خوای کارزان و دلۆڤان، مارەکردنیان قەدەغەو حەرامە، واتە: پێویست ناکات بەدوای هۆکارو سەبەبدا بگەڕێین، چونکە خوا حەرامی کردوون، بەڵام لەگەڵ

ئەوەیشدا، ئەگەر بە بۆچوونی خۆمان هێندێ هۆکارو سەبەبی بۆ دابنێین و بیزانین، شتێکی باشەو، پتر هۆی حەرامبوونەکە بۆ ئەوانە ڕوون دەبێتەوە، ئیمانیان کزولاوازە.

بێ شك شەریعەتی ئیسلام دەیەوێ پەیوەندی نێوان دایك وکچ و پوورو خاڵۆو برازاو... تاد، وەکو پەیوەندی نێوان ژن و مێرد نەبێت، بەڵکو دەیەوێ پەیوەندی نێوانیان پڕ بێت لە سۆزو میهرەبانیی و حورمەت و ڕێزلێنان لەیەکترو، هەرگیز ڕۆژێ ئەو جۆرە هەراو کێشانە ڕوودەکەنە ژن و مێردو، ئەوساش دەگاتە قرەقرو چەلەحانێ و، بۆ دواتریش دەگاتە جیابوونەوەو تەلاَق، ئەوە لەنێوان کوڕو دایك و خوشك و.....تاد ڕوونەدات. یان دەتوانین بڵێین حەرامبوونی هەر یەك لەوانە لەبەر ئەوەیە کە پەیوەندی ژن و مێردیی بۆ فراوان کردنی سنووری ئوسرەو خێزانە، دیارە ئەوانە ئەوەند نزیکی یەکن، هیچ پێویست ناکات بەپەیوەندییەکی تر، وەکو پەیوەندی ژن و مێردیی..

دەشتوانین بڵێین – سەبەب هەرچی بێ بۆ حەرامبوونیان – هەڵبژێردراوی خوایەو، خوا خۆی ئەو بڕیارەی داوە، ئێمەیش ملکەچی گشت فەرمان و بڕیارەکانی خوای کارزانین و، ئیمانمان بەوە هەیە کە: هەر خوای گەورە بۆی هەیە حەرام و حەڵاڵ دیاری بکات، هەر شتێکی حەرام کرد، حەرامە، هەر شتێکیشی حەڵاڵ کرد، حەڵاڵە، ئیتر هیچ دەوڵەت وحکومەت و لایەن و گروپ و دەسەڵاتدارو زلهێزێك بۆی نیە دەسکاری ئەوانە بکا، ئەم بۆچوونەیە بنەڕەت و بنچینەی راستەقینەی دیین و ئایین.

لەلایەکی تریشەوە خوای گەروە ئەم بوونەوەرەی فەراهەم هێناوەو ئەم ئادەمیزادەی تێدا داناوەو، هەریەکە لە جێگاو شوێنێکی ئەم زەوییەدا دەژین و، هیچیان بە یەکتر ئاشنا نابن، جا بۆ ئەوەی ئاشنا بەیەك ببن و، لەیەك نزیك ببنەوەو لەیەکتر حاڵی ببن و، بیر لە زیانگەیاندن بەیەکتر نەکەنەوە، بەو سێ جۆرە ئاشنایەتی و دۆستایەتی و خۆشەویستی فراوان کرد لە نێوانیاندا: بەرەگەزو نەژاد، بەشیر خواردن، بەژن و ژنخواستن... بەم کارە دانیشتووی گوندێك، یان گەڕەکێك سەرجەم دەبنە براو، برازاو، خوشکەزاو، پوورزاو ئامۆزاو.... هتد. ئەوجار زۆر بە ئاسانترو باشتر گشت پێکەوە دەژین و، هەست بە هیچ کەسێکی نەیاریان ناکەن.(خوای گەورە خۆیشی باشتر دەزانێ).

بەڵام لە هەموو گرنگتر، ئەوەیە کە خودای میهرەبان هیچ لایەنێکی ژیانی ئافرەتانی بە ئاڵۆزیی و، بێ بەرنامە نەهێشتۆتەوە، هێندێکیان دەکاتە هاوسەری مێرد، هێندێك دەکاتە دایك و دایە گەورە، هێندێك خوشك و خوشکەزاو برازاو.... تاد جا ئیتر دەبێ کێ لەمانە ڕێز نەگرێت؟ کەوابوو ئەو صیفەت و ناز ناوانە بە ژنان خەڵاتکراون، باشترین ڕێزلێنان وخەڵاتن بۆیان... زۆر لەوە مەزنتر نیشانیان دەدات، کە بۆ تێر کردنی ئارەزووی سێکسییەت بن.

## بەر لە ئیسلام بەژنان لەشفرۆشى دەكرا !

ئیمامى (بوخاریى) لە خاتوو (عایشەوە – خ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لەسەردەمى جاهیلیەتدا، گەییشتنى ژن و پیاو بەیەك(بۆ ژن ومێردیى)، چوار جۆرى هەبوو:

یەكەم: وەكو ئەم باوونەریتەى ئەمڕۆى خۆمان بوو، پیاوێك دەچوو لاى كەس وكارەكەى خواز بێنى كچێكى كرد، ئینجا پاش ئەرێ و وەڵامدانەوە، لە لایەن زاواوە مارەیى بۆ دادەنراو لێى مارە دەكرا.

دووەم: هەركە ژنان لە بێ نوێژى پاك دەبوونەوە، دیاننادرنە لاى كابرایەكى ڕەسەن ونەجیمزادە! ئەویش سەرجێیى لەگەڵ دەكردودەینادرەوە، بۆ دواییش مێردەكەى لێى نزیك نەدەبووەوە، هەتا دەردەكەوت ئاخۆ لەو پیاوە دووگیان بووە یانا؟ مەبەستیشیان لەو كارە، ئەوەبوو بەشكو منداڵێكى قارەمان و نەجیمزادەى – وەك كەڵەگاكەى– لێ بكەوێتەوە...!

سێیەم: هەشت نۆ پیاو لەتەنها ژنێك كۆدەبوونەوەو، هەر هەموو سەرجێییان لەگەڵ دەكرد ! جا ئەگەر بەوە دووگیان بووبا، ژنەكە پاش منداڵبوونەكەى، دەینارد بەدوایاندا و كەسیش نەیدەتوانى دوا بكەوێ، ئەوسا بەئارەزووى خۆى دەیبڕى بەسەر یەكێكیانداو، ئەویش نەیدەتوانى نكووڵى لێ بكات.

چوارەم: لەشفرۆشیان دەكرد ! دەستە ژنێك دەچوون لەجێگایەكى تایبەتدا كۆ دەبوونەوەو لەسەر دەرگاكەى تابلۆیەكى لەشفرۆشیان هەڵدەواسى، ئیتر هەر كەسێك چووبا، بە ئازادانە دەچوو، پاشان ئەگەر دووگیان بووباو، منداڵەكەى دانابا، ژنەكە دەچوو بەژن وبالاناسێكى بانگ دەكردو، لەكێ چووبا دەیاندا بەسەریاو، دەبوو بە خێوى بكا!.

بێگومان جۆرى سێیەم وچوارەمى ئەو باوو نەریتە، لەشفرۆشى و (سەفاح)یەتەو، سرۆشتى پاكى ئادەمزاد قێزى لێ دەكاتەوەو، ڕێگا نادات هیچ ژنێك كارى ئاواى سووك و بێ بەها بەسەر خۆیدا بێنێت، ئیسلام نایەوێ كارىئاواى بێ بەهاو بێ ڕێز بەرامبەر بە ژنان بكرێ، بۆیە هەركە هات لە سەرەتاوە پلەو پایەى ژنانى گەیاندەوە جێى شیاو وگونجاوى خۆیان و لەوكارە دزێوە ڕزگارى كردن، بەڵام سەد مخابن، ئێستا دیسانەوە ژنانیان گێڕایەوە بۆ سەردەمى جاهیلیەت و لەشفرۆشى، چونكە نە دەوڵەتێك هەیە لە ژنان و بژێوى ژنان بپرسێتەوەو، لەكاتى خۆیدا بەمێردیان بدا، نەباوك و براو خزم و كەس و كارێكى وایش هەیە، چارەسەرى دەردیان بكات، دەرەنجام ئێستا دەبینى دنیا بەدەست لەشفرۆشى و منداڵى ناشەرعیەوە بەگیر هاتووە !.

بەڵێ ئیسلام هات و بە مرۆڤى گوت: خواى كارزان ژن و پیاوى دروستكردووەو، لەو

دیوی ڕابواردن و کاری سێکسیەتییەوە، گەڵێ کارو ئامانجی تری داناوە، دەیەوێ بە زاڕۆو وەچەی ئەوان کاروانی مرۆڤایەتی درێژە بەخۆی بدا، بۆیە ڕێگە نادا بەلاکۆلانی – وەکو ئاژەڵ – بەیەکابنووسێن و، پاشان هەریەکە بەلایەکا بچی ! مرۆڤ – ژن و پیاو – پاش پێکەوە جووتبوون، دەبێ چاوەڕوانی نەوەو وەچەی ئاییندەش بن، بزانن چی لەو جووتبوونەوە پەیدا دەبێ، هەتا کەش و هەوایەکی ساف و سازگاری بۆ سازبدەن و، بەڕێك و پێکی پەروەردەی بکەن، بێگومان ئەو کەش و هەوا سازگارەش تەنها لە سێبەری تاکە پیاوێکدا دەگونجێت، بۆیە ڕێگەی بەژنان نەدا، پتر لە پیاوێکیان هەبێ و، فەرمووی: ﴿والمحصنات من النساء إلاماملکت أیمانکم کتاب الله علیکم وأحل لکم ماوراء ذلکم أن تبتغوا بأموالکم محصنین غیر مسافحین فما استمتعتم به منهن فآتوهن أجورهن فریضة ولا جناح علیکم فیما تراضیتم به من بعد الفریضة إن الله کان علیماً حکیماً﴾٤/٢٤. واتە: ژنانی شووداریشتان پێناشێ، مەگەر ئەو ژنانەی بوونەتەماڵی خۆتان، ئەم بڕیارەش لەلایەن خواوە بۆتان نووسراوە، ژنانی تر (واتە: بەدەر لە ژنانی مەحرەم – بەهەرسێ جۆرەکەیەوەو، ژنانی بەشووکردو) حەلاڵن بۆتان بەپارەو سامانی خۆتان بیانهێنن، بەلام بەپاکیی وبە شێوەی شەرعیی، نەك بەداوێن پیسیی و شێوەی یارو دۆسگرتن لەگەڵیان ڕابوێرن. جا لەبەرامبەر ئەو لەزەتەی لە ژنانی خۆتانی دەبەن، دەبێ مارەیییەك – کەفەرزو بڕیاری خوایە – بیاندەنێ، خۆئەگەر لەپاش دیاریکردنی مارەیی، لەنێوخۆتان پێك بێن (ژنەکە لەتەواوی مارەیییەکەی، یان لە هێندێکی دەست هەڵبگرێت، یان پیاوەکە پاش نیکاحەکە بڕێکی تری بۆ زیاد بکا) ئیشێکی باشیان کردووەو گوناحبار نابن، خواش زاناو لەکارزانە.

خوای بەخشندە بۆ ئەوە ژن و مێرد یەك بخا، هێزی لەزەت و ڕابواردنیشی پێداون تا: بەنیازی هەتاهەتایی – بەشێوەی شەرعیی – ڕێك بکەون و، بەناشەرعیی و کاتیی، دەست ڕانەکێشن بۆ یەکتری، چونکە کە ئەونەوەو وەچە لەنێوانیاندا دەکەوێتەوە، پێویستی بەکات و ساتێکی زیاتر هەیە، بۆیە ڕێ دەگرێ لە نیکاحی کاتی - بۆ چوار ڕۆژ، یان بۆ چوار مانگ، یان بۆ ئەوەند ساڵ– لە بەر ئەمەیشە ڕێگە نادات – بەهیچ کچ و کوڕێك، یان ژن و پیاوێك – بەناشەرعیی و حەرامیی لەگەڵ ئەم و ئەودا ڕابوێرێ و، بیکاتە دۆست و یاری خۆی... بەتایبەتی ژنی مێرد دار... هەر ئەم بەرەڵاڵیی و بێ سنووریەیە وایکردووە کە: ئەمڕۆ زۆرێکی زۆرینەی کچ و کوڕ، ئامادەنین بەشێوەی شەرعیی لەیەك مارە بکرێن وئەرکی ژن و ماڵ بکەوێتە سەر شانیان، هەر ئەو هەرزان بەهاو ئاسان دەسکەوتنەیە کوڕان ناچنە ژێر ئەرکی مارەیی ژنانەوە – مارەییش پێشتر گوتمان: خوای گەورە لەسەر مێرد فەرزی کردووە بۆ

**خانمەکەی، جا ئەگەر ئەو خانمە بە ئارەزووو هەوەسی خۆی، لێی نەسەندو ئازادی کرد، کارێکی باش و پەسەندەو خوایش پێیخۆشە، ئایەتی: ﴿ولا جناح عليكم فيما تراضيتم به من بعد الفريضة...﴾ هەر جەخت لە سەر ئەومەبەستە دەکاتەوە.**

**بەڵێ ژن و پیاو ڕێزو حورمەتی تایبەتییان هەیە لای ئیسلام، دەبێ بەڕێزو حورمەتیشەوە ڕێك بکەون، دەبێ هێماو نیشانەی سۆزی پێکەوە ژیان دیار بێت، مارەیی یەکێکە لەوهۆکارانە خۆشەویستی زیاد دەکات، شتێکە مەمنوویەتی مێرد بەرامبەر بەژنەکەو بەرامبەر بەکەس وکاری ژنەکە نیشان دەدا.... ئیسلام ددان بەوەدا نانێ کە: پیاوان لە هەر جێگایەکدا ژنانیان بەرچاوت کەوتن و حەزیان لێکردن، تەپ بکوتنە سەریان و سنوورشکێنی بکەن و یاسای کۆمەڵگەو کۆمەڵایەتی پێ شێل بکەن... بۆ ئاسانکاری ئەو بەیەك گەیشتنەی کچان و کوڕانەیە، کە دەیان و سەدان فەرمووده هاتووەو، داوا لەکار بەدەستان و سەرپەرستیکارانی ژنان دەکەن: ڕێگری لە کچان و کوڕان نەکەن و، زۆر بە سادەو ساکار کارەکەیان بۆ ساز بکەن. (ئەر کات بوو – إن شاء الله– لە جێگەی تردا، زیاتر لەم باسە دەکۆڵینەوە).**

## قەووامە چییە ؟!

**بێ شك یەککستنی هەر ژن و پیاوێك و بوونیان بە خێزانێك و، ئەوساش بۆ ماوەی تەمەنیان پێکەوە بژین، هەروا کارێکی ئاسان و سادەو ساکار نییە، دەبێ – پاش ئەوە کە هەردوو هاوبەشی ژیانن – یاساو ڕێسایەکیان بۆ دابنرێت، ئیشەکانیان – هەریەکە بەپێی تایبەتمەندییەکانیان – بۆ دابەش بکرێ و، هیچ کامێکیشیان ستەمی لێ نەکرێت... دیارە لەبەر ئەوە کە ژنان زاوزێ دەکەن و منداڵ وەبەر دێنن و، پاشان دەبێ پەروەردەی بکەن، خوای دلۆڤان – بەپێی سروشت – جۆرە ئارام و سۆزو میهربانی و دلۆڤانیەکی بە ژنان بەخشیوە، کە لە پیاواندا بەدی ناکرێت، پیاویش لەبەرئەوە دەبێ لەدەرەوەی ماڵدا کار بکاو، نان و بژێوی بۆ ئەو ژنە دووگیانە – کە منداڵی بۆ بەرهەم دێنێ – پەیدا بکات، دیسان ئەمیش لەش و قەوارەیەکی تایبەت – بەو کارەوە – پێ بەخشیوە.. وای دروست کردووە بەرگەی ئەو هەمووسەرماو گەرماو وەبەرهێنانی کشت و کاڵ و بازرگانی و ئەم بەرو ئەوبەرە بگرێت، بە شێوەیەك درووستی کردووە بەرگەی ئەو گیروگرفتانە بگرێت دێنە ڕێگای، بەڵێ دووکەسی ئاوا – زەحمەتکێش – ژنەکە بەحەیزو بێ نوێژی و زەیسانی و دووگیانی و بەرهەم هێنانی منداڵەوە سەرقاڵە، پیاوەکەش دەبێ بژێوی بۆ ئەو ژن و منداڵە پێکەوە پەیدا بکات، بێگومان دەبێ کارەکانیان بۆ ڕێك بخرێ و، یەکێکیان بکرێتە بەر پرسی بژێوی و نان**

وتوفاق، تا له پشێوی و فەوزا ڕزگاربن، خۆ دیاره که ئیسلام هیچ شتێ بێ ئیدارەو سەرپەرست و چاودێر ناهێلێ، تەنانەتی دووکەس سەفەرێ بکەن، دەبێ یەکێکیان بەرپرس بێت.. جاباشه ! ئەی چۆن ماڵ و حاڵێکی ئاوا بێ سەرپەرست دەبێ....؟ ئێستا ئەگەر بڵێین با ژنەکه سەرپەرست بێ و (قەووامه) بەدەست ئەو بێ، وادەزانم ستەم له ژنەکه دەکرێ، چونکه ئەو لەلایەکەوە دووگیان دەبێ و منداڵ وەبەردێنێ، لەو لایشەوە بەرپرسیەتی بژێوی نان و توفاقیشی بدرێتێ — هەر لەبەرئەوە که حەز ناکا پیاو کوێخایی بەسەردا بکات — بێ سۆ لەحاڵەتی ئاوادا ستەم لەژنەکه دەکرێ و، پیاوەکەش بێ ئیش وکار دەمێنێتەوەو، دەبێتە ئاغاو کوێخای ناهەق بەسەر ژنەکەوە، ئەگەر نا پێشتر ڕەنجبەرو خزمەتکاربوو، خۆ ناشکرێ کارەکانیان بگۆڕنەوە، منداڵ بوون بدرێتە پیاوو، هەڵسوڕانی کاروباری بژێویش بدرێتە ژنان، چونکه دووباره هەر دەبێ وەکو ئێستا کارەکانیان بۆ دابەش بکەین و، هێندێ ڕازی دەبێ و، هێندێ ناڕازی.

لەبەر ئەمەیه که خوای کارزانیش دەفەرمووێ: ﴿الرجال قوامون على النساء بما فضل الله بعضهم على بعض وبما أنفقوا من أموالهم فالصالحات قانتات حافظات للغيب بما حفظ الله، واللاتي تخافون نشوزهن فعظوهن واهجروهن في المضاجع واضربوهن فإن أطعنكم فلا تبغوا عليهن سبيلا إن الله كان علياً كبيراً﴾٣٤/٤١. واته: پیاوان دەسەلاتیان بەسەر ژناندا هەیەو، سەرپەرستیی کاروباریان دەکەن، لەبەرئەوە که:

یەکەم: هێندێ له هێندێ، لەلەش و قەوارەو پێکهاتەی جەستەیی و بیرو هۆش و، هەوڵ بۆ بژێوی کامڵتروخوا بەتواناتر بەدیهێناون.

دووەم: پیاوان ئەرکی بەڕێ چوونی ماڵیان لەسەر شانه، جا ژنانی باش ئەوانەن که گوێ بیستن و — وەکو خواش فەرمانی داوه — بەتایبەتی گەر شووەکەیان نادیاربوو— شەرمی خۆیان دەپارێزن و ئاگاشیان لەماڵ و حاڵی دەبێ. ئەو ژنانەش که ئێوه دەترسن ئەشقی بن، ئامۆژگاریان بکەن و جێگەیان لێ جیا بکەنەوە، پاش بێ سوودی ئەو دووخاڵەیه، هەر لەبەر دامرکانەوەی کێشەو هەرا که، دەکرێ ئەر لێشیان بدەن، جا ئەگەر گوێ بیست بوونەوە، ئێوه بیانوویان لێ مەگرن، بەڕاستی خوا بەرزو بڵندو زانایه.

ئەم (قەووامه)یه لەبەر چاکیی ورێك وپێکی پیاوان و خراپی ژنان نییه، بەڵکو تەنها لەبەر ئەو دوو خاڵەیه که قورئانی پیرۆز باسی کردوون، جگه لەوەش بەپێی باوونەریتی سەرجەم هۆزو خێڵەکانی سەردەمیش، هەر پیاوان بەدەم ڕووداوه سروشتیەکانەوه بوون، هەر پیاوان —بەپلەی یەکەم— بەشداری شەڕو شۆڕەی خێڵەکانیان کردووه، هەر پیاوان زیاتر لەماڵ

چوونەتە دەر، بۆپەیداکردنی نان و بژێوی، خۆ پەیداکردنی نان وبژێوی ئەو سەردەمەش، وەکو ئێستا ئاسان نەبووە، ژنێك بەیانی درەنگانێك لە خەو هەستێ و، سواری سەیارەکەی ببێ و، بەسەر جادەی قیردا بچێتە مەڵبەندی کارەکەیەوە و پارێزەریشی هەبێ و، لەولایشەوە بە سووك و ئاسان بگەڕێتەوە – ئەگەر چی ئەم ژنانەش لەچاو ژنانی دنیادا ڕێژەیەکی زۆر کەمن، لە بەر ئەوە شەریعەتی ئیسلام یاساو ڕێسای گشتگیر دادەنێ ودەبێ بۆ هەموو کات وساتێك بە کەڵك بێت.

خۆ ژنانیش کەمتر دەتوانن – وەکو پیاوان دەشت و دەرو، شاخ و چیاو، بەرزایی و نزمایی بکەن، جا لەبەر ئەو هۆیانە، ئەو ئەرکانە بڕاون بەسەر پیاواندا و بوونەتە خزمەتکاری ژنان و، ژنانیش بۆ خۆیان ڕۆژ تا ئێوارە، خانمانە بۆ خۆیان ڕادەبوێرن...

لە کاتێکدا (قەووامە) بە پیاوان سپێردراوە، لەبەرامبەریەوە مارەیی ژنان و بژێوی و گشت پێداویستیەکانیشیان خراوەتە سەر شان، لەولایشەوە ئەم کوێخاییە، ئەوە نییە کە ئیتر ژنەکە هیچ ئیرادەو ویستێکی نەبێ و، نەتوانێ بەویستی پیاوەکە نەبێ بجوڵێتەوە، نەخێر. چونکە سەرپەرستیاری ئیش و کار، تەنها چاودێری دەکاو، ئەویش بۆ خۆی کار دەکات.

مەسەلەی قەووامە – پاش ڕەچاو کردنی هەموو صیفەتێکی بەڕێوەبردنی ئەو ئەرکە مەزنە – ئەوجا دراوەتە پیاوان، بۆیە سەرپێچی و لادان لێی، کارێکی ئاسان و سادەوساکار نییەو، دەرەنجامێکی باشی نابێت بۆ ئەو خانەوادەیە سەرپێچی لێ دەکات... چونکە ئەو منداڵانەی لە ژێر چاودێری بابدا گەورە – نابن و پەروەردە ناکرێن – دەرەنجام شەخصییەتێکی لاوازدەردەچن، یان بەدەگمەن ڕێك و پێك و صاڵح و کامڵ دەرچن.

ئینجا لەو کەش و هەوا سازگارەدا، ژنەکە بە (قەووامە) ی پیاوەکە رازیی و، پیاوەکەش بەرامبەر بە ژنەکە دلۆڤان و میهرەبان، دەبێ ئیتر ژنان گوێ بیست بن و، لاساری نەکەن وکەش و هەوای ماڵەکە نەشێوێنن، بۆیە لە (أحکام القرآن)ی (جەصاص)دا هاتووەو لە تەفسیری (قەووامە)دا دەڵێ: (أی أن علیها طاعته وقبول أمره مالم تکن معصیة) واتە: قەوامە ئەوەیە کە: ژنەکە گوێ بیستی مێردەکەی بێ و سەرپێچی نەکا، مەگەر لە کاری خراپ و تاواندا، خوای میهرەبان بەو ژنانە دەفەرمووی:﴿فالصالحات قانتات حافظات للغیب بما حفظ الله﴾. (ئیبن عەباس) لە تەفسیری (الرجال قوامون..) دەڵێ: (علیها أن تطیعه فیما أمر الله به من طاعته، وطاعته:أن تکون محسنة إلی أهله، حافظة لماله، وفضله علیها بنفقته وسعیه).

## ئەشقیبوونی پیاو

لەپێشەوەگوتمان: وادەبێ ژن و پیاو، هیچ کێشەیەکیان نییەو، هەردوولا ڕێزو حورمەت لەیەك دەگرن و، مافی ژن و مێردی یەکدی جێبەجێ دەکەن، دەشکرێ هەردوولا ئەشقی بېن و سنووری ژن و مێردی ببەزێنن،ئەوەبوو بۆ ژنەکە خوا لە پێشەوە فەرمووی: ﴿واللاتی تخافون نشوزهن....﴾ وبۆ چارەسەری ئەشقیبوونەکەشی سێ خاڵ دیاریکرا، وەبۆ ئەشقیبوونی پیاوەکەش قورئان دەفەرمووێ: ﴿وإن امرأة خافت من بعلها نشوزا أو إعراضا فلا جناح عليهما أن يصلحا بينهما صلحا والصلح خير...﴾ ١٢٨/٤. واتە: ئەگەر ژنێك هەستی کرد کە مێردەکەی ئەشقیبووە، یان ڕووی لێ وەردەگێرێ و ڕوویخۆشی ناداتێ، ژن وپیاوەکە دەتوانن هەوڵی ڕێکەوتن بدەن: ژنەکە دەست لە هێندێ هەق و هقووقی خۆی هەڵبگرێت، پیاوەکەش قبووڵی بکاو بەو شێوەیە ئەوهەرایە بکوژێننەوە، بێ شك ئاشتبوونەوە لەو هەراو کێشەو دڕدۆنگیە باشترە... ڕاستە ژنی ژیرو فامیدە هەرگیز ناهێڵێ پەیوەندی ژن و مێردی بچڕێت، ئەگەرچی لە پێناو ئەوەشدا، برە زیانێك لە خۆی بدات، چونکە لەدەستدانی مارەییەکەی باشترە، تا لەسەر خانەو لانەی چەند ساڵەی هەڵفرێنرێ و تەڵاق بدرێ.(تەماشای ((فتح الباری)) بەرگی(٨)، ژمارەی فەرمووده:٤٦٠١ بکە).

بەپێی قسەی پێشینان، پیاو هەبووە – بێ هۆ – حەزی لەناوچاوی خێزانەکەی نەکردووەو، خێزانەکەی بەدەستیەوە گیرۆدە بووە، ژنەکەش – سروشتی پیاوەکەی ناسیوە – هەڵساوە بەژیرانە لەگەڵیا ڕێکەوتووەو لەسەر ماڵ و حاڵی خۆی ماوەتەوەو ئەو ئاگرەی کوژاندۆتەوە، ژنی وایشبووە – بێ هۆ – حەزی لە هاوڕێتی مێردەکەی نەکردووە، ئەو ژنە هەستاوە – لەبەرئەوە تووشی گوناح نەبێ – مارەییەکەی قەرەبۆ کردۆتەوە بۆ پیاوەکەی و (خولع)ی لێ قبوڵکردووە، وەکو لەپێشەوە باسمان کرد.

## دانانی کە یخودا ( حەکەم ) لە نێوان ژن و مێردا

جا ئەگەر ئەو ژنە ناکۆکە لەگەڵ پیاوەکەی، بەهیچ شتێ دانەمرکایەوە (نە بە ئامۆژگاریی، نەبە جیاکردنەوەی جێی نوستن، نەبە سووکە لێدان) وە منداڵ و خزم و کەس وکار – بگرە خەڵکانی تریش – پێیانزانین، ئاینی پیرۆزی ئیسلام – هەر لەبەرئەوە ئەو دەزگایە هەڵنەوەشێتەوەو نەگاتە تەڵاق – بڕیارێکی تر دەدات، بەهیوای چارەسەرو نەڕوخاندنی دەزگاکە.

چارەسەرەکەیش ناردنی دووناوبژیکەرە، یەکێ لەخزم و کەسی پیاوەکە، یەکێ لەکەس

و کاری ژنەکە، دیارە دەبێ هەر کەسەیان بەخزمی خۆی ڕازی بێ، لەکەش و هەوایەکی پاکدا – بێ لایەنگری – دەیاننێرێ لە جێگایەك کۆ ببنەوە بۆ لێکۆڵینەوەی هەراو کێشەکەیان و، پاشان ڕامالینی و ئاشتکردنەوەیان، جا ئەگەر سەرکەوتوو بوون، ئەگەرچی – ئەگەر ئەوان نیەتیان باش بێت – نزیکە خوا سەریان بخا و ڕێ چارەسەر بدۆزنەوە، ئەمجارەش منداڵ و ژن و پیاوەکە ماڵ وێران نەبن و، خزم و کەس وکاریش دڵ بریندار نەبن لەبەر ئەوان.

## حەکەمەکان و کارەکانیان

لە ئیسلامدا پاراستنی پەیوەندی نێوان ژن ومێردو، هەوڵی بەردەوامیی ژیانیان، زۆر مەزن وگرنگە، بۆیە بۆ نەهێشتنی هەراو کێشەی ژن و پیاوەکە، ئەو هەموو ڕێگاچارانە دەگرێتە بەر، گوتمان ئەر لە ژنەکەوە کێشەکە پەیدا ببوو،پیاوەکە ڕێگای ئامۆژگاری بگرێتە بەر بۆی، ئینجا جێی نووستنی لێ جیابکاتەوە، ئەوسا سووکە لێدانێکی بکا، خۆئەگەر کێشەکە لە پیاوەکەوەبوو، ژنەکە دەتوانێ – بەئاوەزی خۆی – ئەو پیاوەی بەچی دەگیردرێ، هەوڵی لەگەڵ بدات، ئەگەر چی لەو پێناوەشدا قبووڵی هێندێ زیان بکا، جا پاش بێ کەڵکی ئەو هەموو هەولانە، پێویستە لەسەر موسڵمانان، لەسەر (قاضیی)، لەسەر خزم و کەس وکاریان بکەونە نێوانیان و، ئەو حەکەمە بنێرنە لایان و بەوردی لەمەسەلەکەیان بکۆڵنەوە، بەڵکو بتوانن چارەسەری بۆدابنێن.

جا ئەگەر هەوڵەکانیان بێهوودە بوون و نەیانزانی، کامیان – لەژن و پیاوەکە – هۆی کێشەکەیە، یان بۆیان دەرکەوت کامیان کێشە دەنێتەوە، بەلام وا بەو ئاسانیە بۆیان چارە نەدەکرا... دیارە ئیتر – بۆ ئەوەی خراپتری لێ پەیدا نەبێت – دەبێ لێك جیا بکرێنەوە..ئاخۆ ئەم دوو حەکەمە – هەر لەبەر ئەوە کاتی خۆی کراونەتە کەیخوا بۆ بڕینەوەی ئەو کێشەیە – ئێستا دەسەلاتی ئەوەیان هەیە – بێ ڕەچاوکردنی ڕەزایەتی ژن و پیاوەکە – لێکیان بکەنەوە بە تەلاق؟ بۆ وەلامی ئەمە تاقمێ زۆر لە زاناکانی پێشینان و پاشینان، ڕایان لە سەر هەیەو پەسەندیانە، یان دوو حەکەمەکە – بێ ڕەزایەتی ژن و مێردەکە – دەسەلاتی جیاکردنەوەیان نییە، دیسان کۆمەڵێکیش هەن ئەمەیان پەسەندەو هەردوولاش بەڵگەی خۆیانیان هەیە، جیاوازی زاناکانیش لەوەوە سەری هەڵداوە: ئاخۆ ئەو دووکەسە کە نێردراون بۆ ئەوکارە بە (وەکیل) دادەنرێن، یان بە (حەکەم)ن و دۆزی (حاکم)یان هەیەو، دەتوانن تەلاق بدەن و ئەو کێشەیە کۆتایی پێ بێنن؟. (شیخولئیسلام – ئیبن تەیمیە) و(ئیبنولقەییم) هەردووئەمەی دووەمیان هەڵبژاردووە، بۆیە (شیخولئیسلام) دەڵێت: (هوالصواب، ونص علیه الإمام احمد فی إحدی الروایتین).

## حەکەمەکان چۆن ژن و پیاوەکە لێکجودا دەکەنەوە؟

پاش گرتنەبەری ئەو عیلاج وچارەسەرانەو، دەستەوسان وەستان لێیان، (مالیك)یەکان دەڵێن: ژن و پیاوەکە ڕازی بن یا نا؟ دوو حەکەمەکە بڕیاری تەڵاقیان دەدەن وکار بە ئەنجامەکەیشی دەکرێ، بەڵام بۆ ئەوە شەرع پەسەند بێ، دەبێ یەك تەڵاقی بدا و، بەخوڕایش بێت، واتە: ئەگەر هۆکاری هەراو ئاژاوەکە مێردەکە بوو، ئەوا تەڵاقەکە بەخۆڕایی دەدرێ، خۆ ئەر هۆکارەکە ژنەکە بوو، ئەوا لەڕێگەی (خولع)ەوە چارەدەکرێ و، قەرەبووی مارەرەیییەکەشی دەکەوێتە سەر، خۆ ئەگەر کێشەکە لە هەردووکیانەوە سەری هەڵدابوو، ئەوا بەخۆڕایی تەڵاق دەدرێ و، پێویستە (قاضی)یش بێ دەسکاری ئەو بڕیارە پیادە بکا، شیاوی باسە ئەو تـەڵاقـە – لـەو دوو حەکەمەوە دەدرێ – تەڵاقی یەکلابوونەوەو (بائین)ـە.

**تێبینیەك:**

بەداخەوە لەگەڵ ئەو هەموو گرنگی وبایەخدانە بە مەسەلەی ژن و مێردو، چارەسەری کێشەکانیان لە قورئان و لەفەرموودەکاندا، کەچی ئێستاو سەردەمی پێشتریش، پشت گوێخراوەو، لای هیچ کەسێك باسی نەماوەو، ژنانیش نازانن کە ئەگەر ژیانیان لای مێردەکانیان تاڵ بوو، دەتوانن پەنابەرنە بەر (قاضی)یەکی موسڵمان و بەشێوەیەکی جوان و پەسەندی شەرع لێك جیاببنەوە.. هیوادارم بەچاوێکی وردەوە تەماشای ئەم گشت ئایەتانەی قورئان– کە سەبارەت بەژنان و ژیانیان هاتوون – بکەن و، ئەوجا کێشەکانیان و، ئەوساش چارەسەریان، تا دنیاش بزانێت کە ژن شتێك نییە هەرکات لە پیاوێك مارەکرا، ئیتر چاك بێ، یان خراپ، هەر دەبێ لەگەڵیا بێ و بەداخ وخەفەتەوە سەربنێتەوە! بەڵکو گەلێ جار (وەکو لەجێی خۆیدا باسی دەکەین بە ئیزنی خوا) دەتوانێ بەزۆر ملی مێردەکەی بگرێ و تەڵاقی لێ بسێنێ.

## سێ جۆر چارە سەر لە بەر دەستدایە بەر لە تەلاق

ئەوژنانەش دەبنە هۆی تێکدانی کەش و هەوای ماڵەکەو، خۆ لە پیاوان ئەشقی دەکەن – بێ هیچ گوناح وتاوانێکی مێرد – سێ جۆر چارەسەر لەبەردەست مێرددایە، دەتوانێ یەکە یەکە تاقییان بکاتەوە، بەڵکو یەکێکیان ببێتە چارەسەر بۆی و لەوحاڵەتەی دابەزێ:

**١- ئامۆژگاریی ( فعظوهن ):**

دەبێ مێرد فەرمانەکانی خوایان وەبیر بێنێتەوەو پێیان بڵێ خوا بڕیاریداوە، کە ئێوە لەگەڵ مێردتاندا چاك و گوێ ڕایەڵبن، وە سزاو تۆڵەی پاشە ڕۆژیان بیر بخاتەوە..، تێیان بگەیەنێت کە ئەو هەمیشە خێرو خۆشی بۆ ئەو دەوێ، دەیەوێ سەرفرازی دنیاو قیامەت

بێت، دەیەوێ لە قیامەتیشدا پێکەوە بژین.

هەروا منداڵەکانیشی وەبیر بێنێ – ئەر منداڵیان هەبوو –، شیاوی ئاماژە بۆ کردنە دەبێ بە نەرم و نیانیی و پڕ لە خۆشەویستیی و، دوور لە وشەی ناشیرین و فیزو دەعیەو خۆ بەزلزانین ئامۆژگارییان بکات، هەر وەك دەبێ دوو بەدوو بن و خزم و کەس و کاریان دیار نەبێ.

**٢- جێیا کردنەوەی جێی نووستنیان لێیان (واهجروهن فی المضاجع):**

پاش ئەوە کە ئامۆژگاریی و نەسیحەت کەڵکیان نەبوو، ئەوسا بیگوێزێتەوە بۆ قۆناغێکی تر، ئەویش ئەوەیە جێخەوی لێ جیا بکاتەوەو لە گەڵی نەخەوێت، یان خێر سەرجێیی لەگەڵ نەکات، یان بزانێ چی بەلایەوە سەخت و ناڕەحەتە، ئەوەی لەگەڵ ئەنجام بدا، ئەم لەگەڵ نەنووستنە چارەسەرێکی نهێنی و پەنامەکییە، نە منداڵ پێی دەزانێ تا ئەوانیش فێری شەڕوکاری فەساد بن، نە خەڵکانی بێگانەو نەیاریش گوێی لێوەیە، تا ئافرەتەکەی پێ سووك ببێ، وە نەخزم و کەس و کاریش پێدەزانن، تا کێشەو هەرای لێ بکەوێتەوە... چونکە تەنها مەبەست چارەسەری لووت بەرزی ژنەکەیە، نەك سووکایەتی پێکردنی.

**٣- سووکە لێدانێ بکرێن: (واضربوهن):**

بەڵێ وادەبێ جیاکردنەوەی جێی نووستن و پشتکردن لێیان، بێ کەڵك و بیهوودە دەبێ، ئایا دەکرێ لەوکاتەدا دەستەوسان بووەستین، تا ئەو خێزانە ماڵ وێران و سەرگەردان دەبن و تێدەشکێن...؟بێ شك چارەسەری تر هەیە – ئەگەرچی توندو سەختیش بێ – بەڵام هەر چۆنێك بێت ئەو چارەسەرە لە تێشکانی خێزانەکە باشترە، ئەویش سووکە لێدانێکی ژنەکەیە، لێدانێکی بێ ئێش و ئازار، لێدانێکی (نەفس) شکێن، پێشەوا (شافعی) دەڵێ... بۆ چارەسەری یاخیبوونی ژنان، مێرد دەتوانێ سووکە لێدانێکیان بکا، خۆ ئەگەر خۆی بگرێ و، لێدانیان نەکا هێمان هەر ئەمە باشترە لە لێدانەکە. (عەتا – خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ:لەباتی لێدان، دەتوانێ لێی تووڕە ببێ. بەدەر لە مانەیش پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من حەز ناکەم لەژنان بدەن و، کەچی پاش ماوەیەکیش بچن سەرجێییان لەگەڵ بکەن!. لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: هەندێ مۆڵەتیان خواست لە پێغەمبەر ﷺ بۆ لێدانی ژنان، ئەویش فەرمووی: دەتوانن لێیان بدەن، بەڵام پیاو چاك، هەرگیز لە ژنان نادات. (أحکام القرآن للجصاص). ئەم لێدانەش تەنها بۆ ئەو ژنانەیە کە سوور دەزانرێ، بەو لێدانە نەبێ تەمی خۆرنابن و، گوێ نادەن بەڕووخانی خێزانەکە.

بەڵام شەریعەتی ئیسلام هەرگیز ڕێگە نادات بە ناوی تەمێکردنەوە، کەسێك هەڵسێ و

خۆی بکاته (جلاّد) و بەهەق و ناهەق بەر ببێتە گیانی ژنان، هەروەك ڕێگەش نادات پیاوەکە ببێتە ژن و، ژنەکەش ببێتە پیاو ! یان هەردوو ببنە شتێکی سێیەم، بەناوی تێگەیشتن لە دین و سەردەمی گۆڕانکاریی و پێشکەوتن.

**پوختەتر بڵێین**: ئەم لێدانە کاتێك بەکاردێت، سوور بزانرێ کە ئەو ژنە بەوە چارەسەر دەکرێ، شیاوی ئاماژە بۆ کردنە کە ئیسلام لە بنەڕەتدا پێیخۆشە لێدان هەر نەبێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەرگیز لە ژنانی نەداوە.(لە فی ظلال القرآن، تفسیرالمنار، المفصل، سوود وەرگیراوە).

## نەفەقەو بژێوی ژنان

بە پێی قورئان و فەرموودەو، بەکۆی دەنگی زاناکانیش، هەموو بژێوی و پێداویستیەکی ژنان خراوەتە سەرشانی پیاوان، ئایەتی: ﴿وعلى المولود له رزقهن وكسوتهن بالمعروف...﴾٢٣٣/٢ و ە ئایەتی: ﴿أسكنوهن من حيث سكنتم من وجدكم ولاتضاروهن لتضيقوا عليهن...﴾ سوورەتی (طلاق/٦. فەرموودەی: ((...ولهن عليكم رزقهن وكسوتهن بالمعروف)). موسلیم. بەڵگەی ئەوراستییەن.

## بژێوی ژنان بۆچی خراوەتە سەر پیاوان؟

ئیسلامی پیرۆز لەم ڕوانگەیەوە دەڕوانێتە ئەو مەسەلەوە کە: هەرکات ژنێك مارەکرا لە پیاوێك، ئیتر بەهۆی ئەو مارەکردنەوە، ئەو ژنە بەو پیاوەوە قەتیس دەبێ و دەبەسترێتەوەو، لەهەموو ئیش و کارێك دەکەوێ و، دەبێ گوێ بیستی پیاوەکەی بێ و، – تا پێویست نەبێ – لەماڵ نەچێتە دەرو – خۆی بەماڵ و منداڵ و پێداویستی پیاوەکەیەوە سەرقاڵ بکا، پیاوەکەش لەبەرامبەر ئەوەوە لەدەرەوەی ماڵ هەڵدەسێت بەپەیداکردنی بژێوی و ژیانی ئەو ماڵ و منداڵە، ئیسلام ئاوا ئیش وکارەکانی دابەشکردووەو، ڕێزو حورمەتی لە ژنان ناوەو کردوونی بەسالارەو خانمی ماڵو، بژێوییانی پێویستی کردۆتە سەر پیاوان – بێ هیچ جۆرەمنەتێك – ئیتر ئەگەر ژنێك بەرژەوەندی خۆی نەزانێ و، مەسەلەی نەفەقەو مارەیی، بەشتێك بزانێ لەشانی ژنان کەم دەکاتەوە !– بەتایبەتی وەکو ئێستا – کە بەمەبەستی تێکدانی شیرازەی خێزان و ئازادبوونێکی بێ سنوور – لەهەموو کەناڵەکانەوە – لێرەو لەوێ – هێرش دەکرێتە سەر ئەو مەسەلەو، سەرمەسەلە خاوەن بەهاکانی تری ئیسلام !

هیوادارین خانمەکان، وردتر بڕواننە ئەو باسەوەو، بەفێڵ و فەرەجی ئەم و ئەو نەخەڵەتێن.

خۆ ئەم نەفەقەو مارەییەش نابنە لەمپەڕێك لەبەردەم سەرمایە گوزارییەکی ئازاددا بۆ

ژنان، بەڵكو بەپێچەوانەوە، ژن دەتوانێ ئیش وكارى تر بكاو، بەو مارەییەش بازرگانى بكاو، سەروەتێكى باشیش پێكەوە بنێ و، واى لێ بێت ئەو هاوكارى مێردەكەى بكاو، منداڵەكانى بژێنێ، لەكتێبى (المحلى)دا هاتووە: (١٩٢٦ – مسألة: فإن عجز الزوج عن نفقة نفسه، وامرأته غنية كلفت النفقة عليه، ولاترجع عليه بشىء من ذلك إن أيسر..)واتە: ئەر پیاو تواناى بژێوى خۆیى و،تواناى بژێوى ژنەكەى نەبوو – لە هەمانكاتدا ژنەكەش دەوڵەمەندو دارا بوو – دەبێ نەفەقەوبژێوى مێردەكەى بدات.

جا بۆ ئەم نەفەقەیەش، زاناكان كۆمەڵێ مەرجیان نووسیوەو لە كتێبەكانیاندا تۆمارە، من بە پێویستى نازانم بۆ خوێنەرانى هێژاى تۆمار بكەم، بەڵام پێویستە مەسەلەى ئەو ژنانە بزانرێ كە: ڕۆژ دەبێتەوە دەچن بەلاى ئیش و كاریانەوەو لە كۆمپانیایەكدا، یان لە دەزگایەكدا دامەزراون وكار دەكەن.. ئەم جۆرە ژنانە، ئەگەر مێردەكانیان ڕێیان نەدەن بچن كار بكەن و، ئەوان بەویستى خۆیان هەر بچن، ئەوە بێ شك نەفەقەیان ناكەوێ و بژێویان دەكەوێتە سەرشانى خۆیان، وەكو لە (المفصل)دا هاتووە.

شیاوى باسە، نەفەقەش بەپێى بوون و نەبوون دەگۆڕدرێ، هەروەكو ساڵ بۆ ساڵ و كات بۆ كات دەگۆڕدرێ، مەبەستى ئەم ئایەتە كە دەفەرمووێ: ﴿لينفق ذوسعة من سعته ومن قدر عليه رزقه فلينفق مما آتاه الله لا يكلف الله نفساً إلا ما آتاها سيجعل الله بعد عسر يسرا﴾ طلاق/٧. ئەو فەرق و جیاوازییە دەخات بۆ نەفەقە.(فقه السنة، المفصل).

## ژنانى ئاكار چاك

لەپێشەوە گەلێ جار گوتمان: ژن وپیاو هەردوو دروستكراوى خوان و، یەكێكیانى خۆشناوێ و ڕكى لەویان بێت، نەخێر، بەڵكو هەردوو بۆ بەهەشت بەدیهاتوون، وەكو (بابە ئادەم) و دایە (حەوا) – سەلامى خوایان لێ بێت – بەڵام بۆ دوایى بەهۆى كاروكردەوەى خۆیانەوە، چاكیان دەبێتە چاك و، خراپیشیان دەبێتە خراپ، زۆر جاریش دەكرێ، هێندێ ئافرەت لەسەدان پیاو باشترو بەخزمەت ترن، صاڵحترو چاكترن، بۆ ئەمەش مێژوو پڕە، جا ئێمە بۆ ئەم باسە لە قورئانى پیرۆزدا چەند ژنێ وەبیر دێنین، تا ئێمەش چاكمان بەلاوە چاك بێ و، خراپیشمان بەلاوە خراپ بێت،گەرچى ژنى پێغەمبەر ﷺیش بێت، نەك وەكو سەردەمى جاهیلیەت كە هەموو كارێكى ئافرەتیان بەلاوە خراپ بوو! فەرموون ئەمەش چەند ژنێكى ئاكار چاكن:

١- (سارە) خاتوونى ژنى (ئیبراهیم) پێغەمبەر – درودو سڵاوى لێ بێت – ئەم ژنە بەڕێزە

وەك دەڵێن تەمەنی (٩٩) ساڵ و، زۆریش صالْح و ڕێك و پێك بوو، تا دەگاتە ئەو تەمەنەش هیچ منداڵێکی نابێ و، ئەو تەمەنەش بە پێی سروشت و باوی ژنان، ساڵی نەمانی هیوا بەمنداڵ بوونە، وەکو تەمەنەکەی (ئیبراهیم)یش هەروا، مەگەر بەدەگمەن.. گەرچی لەتواناو دەسەڵاتی دروستکەری بوونەوەردا زۆر ئاسانە، بەڵێ خوای گەورە هەموو شتێکی ئەندازەگیر کردووەو هۆکارو سەبەبی بۆ داناوە، بەڵام بۆئەوەی خەڵکیی بیناسن، بڕێ جار هێندێ شت دەکات، بەدەر لەبۆچوونی ئەوانە، بۆیە ئیماندارەکانیان بەئاسانی تەسلیم دەبن و، بێ دینەکانیشیان یاخیی، بۆ نموونە: لەگڵ بابە ئادەم و، لە (مەریەم) عیسا – بێ پەیوەندی نێرو مێیی – وەدی دێنێ، خۆ ژنانیش لەدەوروبەری پەنجاکاندا لەزاوزێ دەکەون، بەڵام ئەوەتە لەوتەمەنەدا منداڵ دەداتە خاتوو (سارە) بۆئەوە دەوروبەر ڕاچڵەکێنێ و، بیانخاتە سەر بیرکردنەوەو ئیمان هێنان بەخوای تاك و تەنیا، بۆئەمەیە کە خوای گەورەو میهرەبان لە سوورەتی (هوود)دا دەفەرمووێ: ﴿وامرأته قائمة فضحكت فبشرناها بإسحاق ومن وراء إسحاق يعقوب. قالت ياويلتا أألد وأنا عجوز وهذا بعلى شيخا إن هذا لشيء عجيب. قالوا أتعجبين من أمر الله رحمة الله وبركاته عليكم أهل البيت إنهُ حميدٌ مجيد﴾/٧١-٧٣. واتە: ژنەکەی ئیبراهیم – درودوسڵاویان لێبێ – کە لە کاتی هاتنی فریشتەکاندا هەڵویستا بوو – لەو مژدە خۆشە پێکەنی (فریشتەکان هاتبوون بۆ فەوتاندنی خەڵکە خراپە نێربازەکەی قەومی (لووط)، ئەمیش ژنێکی صالْح و چاك و باش بوو، لەخۆشی ئەوەدا هاتە پێکەنین)، بۆ دواییش مزگێنیان پێدا بە لەدایکبوونی منداڵێك، ناوی (ئیسحاق) دەبێ و، سەرەڕای ئیسحاقیش بەیەعقووبی کوڕی ئیسحاق. ئەویش – بەپێی ئەو تەمەنەی هەیبوو، لەبار نەبوو بۆ منداڵ بوون – بۆیە گوتی: های لەمن ! ئاخۆ منی پیرەژن منداڵم دەبێ و، ئەمەیش شووەکەمە پیرە مێردێکە، بەڕاستی ئەم کارە، کارێکی سەیرو سەمەرەیە ! فریشتەکانیش بە (سارە)یان گوت: ئاخۆ فەرمانی خوات پێ سەیرە ! ئەی خێزانی ئەم ماڵە ! بەربەزەیی و بەرەکەتی خوا بکەون، بەڕاستی پایە بەرزی و پێ هەڵگوتن هەر لەخۆی دێ.

لەسوورەتی (زاریات)یشدا دەفەرمووێ: ﴿فأقبلت امرأته فى صرة فصَكت وجهها وقالت عجوزٌ عقيم. قالوا كذلك قال ربك إنه هو الحكيم العليم﴾ ٥١/٢٩-٣٠. واتە: ژنەکەی ئیبراهیم – پاش مژدەکە بە منداڵ – بەهاوار هاوار هات و چەمۆڵەیە (پووکاوڵ)ێکی لەخۆی داگرت و گوتی: من پیرە ژنێکم بێ زك وزا، ئاخۆ چۆن منداڵم دەبێ...؟ دیارە ژنێك تەمەنی گەیشتبێتە ئەوەندە ساڵ و، هێمان منداڵی نەبووبێ و، ئێستا پێی بڵێن منداڵت دەبێ، بێ شك ئەو قسەیە جێگەی سەرسوڕمانە! ئەگەر دەسەڵاتی خوا نەبێ شتی وا کەی دەبێت، بۆیە فریشتەکانیش

گوتیان: پەروەردگاری تۆ وای فەرمووەو بڕاوەتەوە، بۆخۆیشی کارزان و زانایە.

**تێبینی:**

١) (قورتوبی) دەڵێ: وشەی (أهل البيت) کە لە سوورەتی (ئەحزاب)یشدا هاتووە: ﴿إنما يريد الله ليذهب عنكم الرجس أهل البيت ويطهركم تطهيرا﴾ ٣٣/٣٣. ژنی پێغەمبەرەکانیش دەگرێتەوە، ئەگەرچی هێندێ بەرهەڵستی لەمە دەکەن !

٢) بوخاری لە کتێبەکەیدا دەڵێ: (باب القيام المرأة على الرجال في العرس وخدمتهم بالنفس). واتە: ژنان هەڵسن بەخزمەتی پیاوانی صاڵح و چاك و دۆس لە زەماوەندا. پێشەوا (موسلیم)یش لە (سەهل ی کوڕی سەعد)ـەوە دەگێڕێتەوەدەڵێ: ((ئەبوو ئوسەیدی ساعیدیی) زەماوەندی کردو پێغەمبەری ﷺ دەعوەتکردو، ژنەکەی (بووکەکە) خزمەتی دەکرد... زاناکانیش لەمەوەوەریان گرتووە کە: ژنان دەتوانن لە زەماوەندا خزمەتی مێردیان و هاوەڵانی مێردیان بکەن، هەروەها دەشکرێ ئافرەت لەبەردەم میوانی صاڵح و موسڵماندا هاتوچۆو خزمەت بکات، ئەگەرچی لەوانەیە ئەم ڕووداوە پێش ئایەتی (حیجاب)یش هاتبێ.

**٢- ژنە ئیماندارەکەی فیرعەون:**

ئەم ژنەش - ئاخۆ ئاسیەی کچی موزاحیم بێت، یان (ئیخناتوون) بێت - نموونەی ئیمان وقارەمانیەتییە بۆ ژنان، چونکە باوەڕدارێکی ڕاستەقینە بوو بەپەروەردگاری خۆی، ئەگەرچی ژنی فیرعەونیش بووو لە کۆشکی پاشایەتیدا دەژیا، وەلە هیچیش کەمی نەبوو، وەهەرچی ژنانیش حەزی لێ بکەن لە ڕابواردنوخواردن و جلوبەرگ و زێڕوزیوو، حورمەتوڕێز، لە کۆشکی پاشایەتیدا، دەستی ئەو کەوتبوو، بەڵام ئەمانە گشت نەبوونە ئەستەم ولەمپەرێك لەبەردەم ئیمانداریدا، ئیتر سەرباری ئەوەکە (فیرعەون) داوای خوایەتی دەکردو دەیگوت: ﴿ما علمت لكم من إله غيري. أنا ربكم الأعلى﴾، کاتێکیش فیرعەون زانی ئەو ژنە باوەڕی بەو نییەو، دەزانێ ئەویش یەکێکە لە دروستکراوەکانی خواو، خوا لەو مەزنترە، ئازارو بێزارێکی زۆریدا، بۆئەوە لەوە پەشیمان ببێتەوەو باوەڕ بەدەسەڵات و خوایەتی فیرعەون بێنێت! بەڵام ئاسیەخان وەکو کێوە سەربەرزەکان وەستاو نەلەرزیی و، ددانی بەخۆدا گرتو دەیگوت: خوایە ! لە فیرعەونو، لەکاروکردەوەی فیرعەونو، لەگەل و نەتەوەی ستەمکارێکی وەك فیرعەون نەجاتم بدە، خوایە ! لەلای خۆت ماڵوکەیەکم - لەبەهەشتدا - بۆ بنیاتنە.

بەڵێ هەڵوێستی ئەم ژنە دلێرو قارەمانە، کە هێماو ئاماژەی پیرۆزیو سەرفرازییە بۆ دنیاو قیامەت، ڕەمزی ئەوەیە کە ژنانیش - ئارەزوویان هەبێ - خۆ زاڵ دەکەن بەسەر گشت

ڕابواردن و ناوو نازناوێکی دنیادا، ئەگەر بە باشی لێبڕێن پاشاو گشت موڵکەکەی، ناتوانێ لەخشتەیان بەرن‌و، دەتوانن مێژوویەکی پڕلە سەروەریی‌و خەبات،بۆ گشت ژنانی دنیا تۆمار بکەن و لە قیامەتیشدا پلەی بەختیاریی‌و سەربەرزیی بەدەست دێنێ، پێغەمبەری خواش ﷺ لەبەرامبەرئەو ژنە ئاکارچاك و بەرزانەوە دەفەرمووێ: ((أفضل نساء الجنة: خديجة بنت خويلد، وفاطمة بيت محمد، ومريم ابنت عمران، وآسية ابنت مزاحم فرعون)).

دەسا هەزاران دروودو سڵاو بۆ ئەو خانمە ئیمانداره چاکە پاکانە کە هەرگیز ماددەو کۆشك‌و تەلار نایانخەڵەتێنێ. سڵاو بۆژنانێ لە پێناو ئاقیدەو باوەڕدا دەکۆشن وخۆ تەسلیمی زۆردارانی سەردەم ناکەن.

٣- دوو کیژەکەی (شوعەیب):

بەر لەوە باسی ئەو دوو کیژەیە بکەین، پێویستە کەمێ پێشتر بچین و وەکو دەسپێکێك، لەڕووداوی پێش ئەو بدوێین.

مووسـا - کـە بـۆ دوایـی دەبێتـە پێغەمبـەر، پاڵـەوانی ڕووداوەکەیـە - لاوێکـی (بـەنی ئیـسرائیل)ــەو لــەماڵی (فیرعــەون) ی (میــسر) گــەورە دەبــێ‌و، پاشــان بــەهۆی کێــشەو ڕووداوێکەوە لای فیرعەون قاچاخ دەبێ‌و، بەناچاری ڕێی (مەدیـەن) دەداتەبەر، شیاوی باسە نێـوانی (مەدیــەن) و (میــسر) (٨) ڕۆژان ڕێ دەبــێ، دیـارە ڕێگاوبـانی ئــەو ســەردەمەش، چۆڵ‌وبیابان دوورو، بێ ئاوونان بووەو، هیچ خزمەت گوزارییەکی تیا دەس نەکەوتووە، بۆیە زۆر بەخەسـتەو بەماندوویـەتی دەگاتـە لای ئاوێـك - کـە خـەڵکی مەدیـەن لـەوئاوە کـەڵکیان وەردەگـرن - دەگاتـە ئـەوێ، هێمـان نەحەواوەتـەوە، چـاوی بـە دیمـەنێك دەکـەوێ، ویـژدانی پیـاوی جوامێرو بەشـەهامەت بۆی قبـووڵ نابێت، بەتایبـەتی نـەفس پـاکێکی وەك ئـەو، بۆیـە دڵ‌و دەروونی هەژاند ! چونکە خەڵکێکی زۆری دیت لەسـەر ئاوەکـەن و هەریەکە مـەڕوماڵاتی خۆی ئاو دەداو، دووکیژیش بەر لەمـەڕەکانی خۆیـان دەگرن‌و لەئاوەکە دووریـان دەخەنـەوە، سا بەڵکو چۆڵ ببێ‌و، پاش ئەوان، ئەمانیش بچنە سەر ئاوەکە، دیارە لای مرۆڤی فیترەت پاك، دەبوو پیاوەکان - بەر لەخۆیان - ڕێیان بەکیژەکان دابا کە ئاوی مەڕەکانیان بدەن.

مووسا کە ئەوە دەبینێ - لەگەڵ ئەوەیشدا قاچاخەو هەڵهاتووەو غەریب‌و ئاوارەیە - لەکیژەکان دەچێتە پێشێ‌و لەو کارەساتە دەپرسێ ؟ دەپرسێ بۆچی ئێوە بەتەنها خۆتانن‌و، بۆچی لەدوورەوە مەڕەکانتان ڕاگرتووە...؟!

ئەوانیش گوتیان: ئەوانە کۆمەڵە خەڵکێکی بەهێزن، بەزۆری خۆیان مەڕەکانیان دەبەنە پێش‌و، ئەوەش بۆ ئێمە نەگونجاوەو دەس نادات، بۆیە هەر خۆشمانین، چونکە (باب)مان

پیرێکی بەساڵاچووەو، وزەی بگرەو بەردەی نەماوە، ئێمەش لەبەر بیّ کەسی هاتینە ئێرە.

ئەمە پتر شەهامەتی مووسای هەژاندو، چوویە پێش، بۆ ئاودانی مەڕەکانیان — کە هەقە هەموو کاتیّ پیاوان بەرامبەر بەژنان، خاوەن میهرو بەبەزەیی بن، ئاسانکاریان بۆ بکەن — بۆ خۆیشی ئاوارەو بیّ هاوکارو بیّ پاڵپشتە، لەوانەیشە زۆر پاڵ پاڵێنیّ بکات، تووشی شتێکی تر سناك ببیّ، بەڵام گشت ئەمانە نەیانتوانی لە ئەنجامدانی کارە خێرەکەی خۆی ببنە لەمپەڕ، بۆیە وەکو پاڵەوانێك مەڕەکانی دایەبەرو لەناو ئەو حەشامەتەدا گەیاندنیە سەرئاوەکەو، ئاوی دان بۆیانو،دڵودەروونی خۆی ئاسوودە کرد، پاشان — لەبەر ئەوە کەکاتێکی زۆر گەرم بوو، ماندووی ڕێگایشە، پشتی لەوان کردو چوویە بن سێبەرێك، بەڵکو کەمیّ بحەوێتەوە، لەویّ تەنها پەنایەك شك دەبا کە هاواری بۆ بەریّوداوای ناتەواوی‌و کەموکورتیەکانی خۆی لا بکات، بۆیە گوتی: پەروەردگارەکەم ! بۆ خۆت دەزانی زۆر گەرمە، بۆ خۆت دەزانی تەنیاو بێکەسم، بیّ هێزو بیّ تواناو لاوازم، زۆر ئاتاج وموحتاجی لوتف‌و فەزڵی تۆم: ﴿ربّ إنّي لما أنزلت اليّ من خير فقير﴾.

جا پاش موناجات‌و پاڕانەوەی مووسا ﷺ ئەوەندەی نەخایەند، هەتا جەڕەس‌و زەنگی ڕزگاریی‌و دەرووی خێری بۆ نێردرا ! خێرا کیژەکان ئەو ڕووداوە بۆ بابیان دەگێرنەوەو، بابیشیان ئەو کارە بەکاری مرۆڤێکی سادەو بیّ بەرنامە دانانێت، بۆیە یەکیّ لە کیژەکانی بەئەوپەڕی ئەدەب‌و وێڵ‌و شەرمەوە دەنێریّو دێتە لای مووساو پێی دەڵێت: بابم بانگت دەکات بۆ لای خۆی‌و دەیەویّ پاداشتی ئەو کارە جوامێرانەیەت بداتەوە !

بەڵیّ بەهەقیقەت خانمێکی زۆر بەحەیاو بەشەرم بوو، دیارە شێرە ژن بوو، بۆیە بابی هەڵیبژارد بۆ گەیاندنی پەیامەکەی‌و، ئەویش زۆر بەئازایانە هات‌و لەچەند ڕستەیەکی کورتدا مەبەستەکەی بە مووسا گوت: ﴿إن أبى يدعوك ليجزيك أجرماسقيت لنا﴾.. خۆ ئافرەت هەر بە فیترەت وا دروست بووە لەکاتی بەیەکگەیشتنی لەگەڵ پیاودا، جۆرەشەرم‌و حەیایەك دەیگرێت، بەڵام ئەوشێرە ژنە، زەحمەتکێشەی بابی لەئەوپەڕی متمانە بە پاك‌و خاوێنی، بیّ هیچ جۆرە شڵەژانێك هەواڵەکەی گەیاند.

لێرەدا ئەم دیمەنە تەواو دەبیّو، دیمەنی بەیەك گەیشتنی مووساو پیرە بەتەمەنەکەیە (بابی کیژەکان). بەڵیّ جاکە مووسا هاتە لای‌و داستانەکەی خۆی بۆ گێرایەوە... هەستی کرد، هەروەکو پێویستی بە خواردن‌و خۆراك هەیە، پێویستی بە ئەمن‌و ئاسوودەیی هەیەو، پێویستە پەنا بدریّو خەمی نەمێنێت، بۆیە خێرا پێی گوت: ﴿لا تخف نجوت من القوم الظالمين﴾. ترست نەبیّ، لەو خەڵکە ستەمکارانە ڕزگارت بوو، دەسەڵاتیان بەسەر (مەدیەن)دا نیە.

پاش ئەم قسەو دیالۆکەیەو پاڵبەستن بەشەهامەت‌و کارەجوامێرانەکانی، ڕۆژی ئاودانی مەڕومالاتەکەیان، یەکێ لە کیژەکان، زۆر بەئازایانەو، بێ پەردەو بێ ترس لە هیچ تۆمەتێك بدرێتە پاڵی، گوتی: بابە ! بەکرێی بگرە، با ئیش‌و کارەکانمان بۆ بکات، با مەڕەکان بەخێو بکات، با ئێمە جارێکی تر نەچینەوە ناو حەشامەتە بێ میهرەکە، دیارە ئەو کیژە ژیرەیە دەیەوێ بێ زەروورەت لەماڵ دەرنەچێ، دەیەوێ بەپاك‌و خاوێنی بمێنێتەوەو، بەپیاوانی نەیاردا هەڵنەتەقێت، بائامۆژگاری‌و وانەیەکیش بێت بۆ ئەوانەی شوانێکی نامەحرەم دێننە ناوماڵ‌و، گەلێ جاریش ئەنجامی باشی نابێت. ڕاستە ئافرەتی قورس‌و ژیرو فامیدە، حەز دەکات هەمیشە خۆی لەماڵ دانێ‌و، هەتا زۆر پێویست نەبێ لەماڵ دەرنەچێ‌و لەگەڵ پیاواندا شان لە شان نەدات، بۆیە ئەم کیژەش ئەو داوایەی لەبابی کردو، بۆسەر خستنی کارەکەیشی دوو سیفەتی گرنگی باسکرد کە هەردووبۆ پیاوی کرێکارو کارمەند پێویستن، بەتایبەتی ئەو ڕۆژە کە بەهاوار ئەوانەوە هات‌و زۆر بە بوێرانەو، پاکانە مەڕەکانی بۆ ئاودان.

یەکەم: بۆ تێپەڕاندنی ئیش‌وکار، لاوێکی زۆر بەهێزە، دەتوانێ بێ دامان‌و بێ ئەوە کەسێك ڕێی لێ بگرێ کارەکان ئەنجام بدات.

دووەم: دەسپاك‌و ئەمینە.. بەتایبەتی ئەو ڕۆژە، زۆر بە لاوێکی سەنگین‌و ئەمین کەوتە بەرچاوی. کەوابوو دەشێ ماڵەکەی بدرێتە دەست.

بەڵێ.. ئافرەت – ئەگەرچی کیژیش بێت – دەتوانێ بە ئازادانە لەگەڵ باب‌وبراو خزم‌و کەس‌وکاری خۆیدا، باسی کێشە کۆمەلایەتییەکان‌و چارەسەریان بکات‌و، ئەوانیش گوێی بۆ بگرن‌و جێبەجێی بکەن، بۆیە ئەمیش لەم دیمەنەدا، بێ ئەوە لە تۆمەتێك بترسێت پێشنیازی خۆی پێشکەش کردو بابیشی وەلامی دەداتەوە.

لەوە دەچێت (شوعەیب) بە ژیرانەی خۆی زانیبێتی، ئەم قسەو باسانە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کیژە حەز دەکات لەگەڵ ئەو لاوەدا ببنە هاوسەر، بەتایبەتی کە دوو صیفەتە بەرزە جوامێرانەکەی مووسای باس کرد، باسیکرد کە: پیاوێکی بەهێزو چاو نەترسە، ئەمین‌و دەسپاك‌و دڵپاکە.. خۆ ئەگەر وایش بێت کیژان هەقیانە، مێردی ئاوا بۆ خۆ هەڵبژێرن‌و، بدەن بە گوێی بابیاندا، بابیش هەقە بەگوێی کچی ئاوای ژیرو فامیدە بکاو، هاوسەری ئاوای بۆ بگرێ.

هەقیەتی زۆر بەسادەو بەئاسانیەکەوە بە مووسا ﷺ بڵێت: دەمەوێ یەکێ لەم کیژانەمت لێ مارە بکەم، ئەگەرچی ئەو کیژەی دەیەوێ لێی مارە بکات دیاری نەکرد، بەلام پێدەچێت هەموو هەست بکەن، بەو مەڕاسیم ونیکاح‌و مارەکردنە.

بەڵێ بە مێرددانی کیژ، دەبێ زۆر ئاسان بێت، دەبێ باوك‌و براو خزم‌و کەس‌وکاری تر، بە

پیاوی باش‌و بەدین‌و بەتەقواو بەخزمەت بڵێن: دەمەوێ ئەم کچەمت لێ مارە بکەم، بێ هیچ شەرم‌و سەرلێکردنەوەیەك، ئەگەرچی کۆمەڵگەی ئێستاش ئەمە قبووڵ ناکات، بەڵکو دەبێ مێردو لایەنی مێرد، بێنە خوازبێنی‌و مەمنوونیەت بەرامبەر بە کەس‌وکاری کیژەکە دەربڕن.

ئەو کۆمەڵگەیە ڕێنادەن باب‌و کەس‌وکاری کیژ، یان کیژەکە خۆی، بەئازادانە مێرد دیاری بکەن، بەڵام بێ خوازبێنی‌و، بێ هیوای بەژن‌ومێردبوون، ڕێگا ئازادە بۆ تێکەڵ‌و قۆڵ بە قۆڵ کردنا!

بـەڵێ مەسـەلەی ژنـان، مەسـەلەیەکە، تـا ئێـستاش هەقیقەتەکـەی — وەکـو پێویـست نەخراوەتـە ڕوو، بەئەنـدازەی ئەوەکـە لـە قورئـان و لـە فـەرموودەدا ڕوونکراوەتـەوە، بـەڵکو باوونەریتی کۆمەڵگە — لەباتی قورئان‌و سوونەتی پێغەمبەر ﷺ حاکم‌و بڕیاردەرە، بڕیاری داوە: لایەنی کچ نابێ خوازبێنی لە کوڕێك، یان لەکەس‌وکارەکەی بکەن بۆ کچەکەیان، ئەوە کە کچ بۆ خۆی لاوێکی باش‌و خواناس‌و هەڵکەوتە بۆ خۆی هەڵبـژێرێ، باسی شتی وا هەر نیە، بەڵکو ئەگەر بوو دەبێتە مایەی سووکبوونی ئەو کیـژە، یـان خزم‌وکەس‌و کارەکـەی لای کۆمەڵگە !

خۆ گوتیشمان قورئان — بەتایبەتی داستانی ئەم دوو کیژە — دەگەیەنێت کە کیژ هەقیەتی لاوی باش‌و تێگەیشت‌و پاك‌و خاوێن بۆ خۆی هەڵبژێرێ، ڕاوبۆچوونی لەدیاریکردنی چارەنووس‌و ئایندەی خۆی بە ئازادانە دەربڕێ، بتوانێ بۆ تەمەنێکی یەکجارەکی (ئەرێ‌و، نەرێی)هەبێ، عەیب نەبێ بڵێ: بەفلان مێرد دەکاو، بەفلانی نایکات، قەت شیاوو گونجاو نیە ئافرەت لەبەشووداندا ڕای نەبێت، بەخۆی نەزانێ مارە بکرێت، هەست‌و شعووری نەبێ ژن بە ژنی پێ بکرێت، بەخوێندا بدرێ...!

هەزار ڕەحمەت لە (شوعەیب) کاتێ کچەکە گوتی: بەکرێی بگرە (واتە مووسا)، چونکە بەڕاستی بەهێزو ئازاو ئەمین‌و دەسپاکە، ئەویش وەڵامی دایەوەو بەمووسای گوت: دەمەوێ یەکێ لەم کیژانەمت لێ مارە بکەم.

بەڵێ ئاسانکاری لەبەردەم کچ‌وکوڕدا، ژن‌وپیاودا، بۆبە هاوسەریی بوون‌و بەمێرد بوون، لەناو چین‌و نەوەی سەرەتاکانی ئیسلامدا، زۆر زۆربوو گرنگیشی: دەدرایە، ژنی ژیرو دیندار دەیکردە سەر پیاوی دیندار: دەیەوێ شووی پێ بکات، خۆ ئەو ژنە بەرێزە کەکردیە سەر پێغەمبەر ﷺ دەیەوێ مێردی لەگەڵ بکات، زۆر بەدەنگ‌و باسە، خۆ (عومەر) کچەکەی خۆی خاتوو(حەفصە) دەداتە (ئەبوبەکر)و پاشانیش (عوسمان)، هەردوو پۆزشی بۆ دەهێننەوە، جا کە هەردوو داوای لێبوردنیان کردو ئەمیش دڵ نیگەران بوو و، چوو بۆ پێغەمبەری گێڕایەوە ﷺ پێغەمبەریش ﷺ بۆ دڵدانەوەی (عومەر) گوتی: بەشکوم خوا لەوان باشتری کردبێتە بەشی

(حەفصە)، ئەوە بوو دوایی لەبەر عومەر خۆی مارەیکرد،ئەمە لە (سیرە)دا زۆر باسکراوە.

ئاسانکاری بۆ کیژان‌و کوڕان، سوننەتێکی گەورەی شەریعەتی ئیسلامە، ئەوەتە پێغەمبەری خوا ﷺ ژنێك – لەسەر دوو سوورەتی قورئان – لەپیاوێك مارە دەکات !هەزار سڵاو لەو ژنانە کە لەبەردەم سەختی ژیاندا ورەیان ناڕوخیٚ‌و، دەست دەدەنە کاروباری دەرەوەی ماڵ، ئەگەرچی شوانیش بێت، خۆ دیتت ئەو دوو کیژە بەڕێزە، سەربەرزەی (شوعەیب) چۆن پەزەکانیان بەخێوکردو ئاو دەدا؟. دیسان هەزار سڵاو لەو کیژانەش لە نەخشەی بابیان دەرناچن‌و مێردی قارەمان‌و ئەمین‌و دڵپاك و دەست پاك هەڵدەبژێرن، هەزار سڵاو لە باوکانەش، کە بیٚ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی کیژەکانیان، بەشوویان نادەن.

لەماڵ هاتنە دەرەوەی ژنان بۆ ناو ئیش‌وکارو کۆمپانیەکان‌و دام‌و دەزگاکان، هەتا زۆر پێویست‌و زەروور نەبیٚ، هەق نیە دەرفەت‌و ڕێگا بدریٚ، چونکە کاری وا گەلیٚ جار لەتوانای جەستەیی‌و (ئوونوسەت)ی ئەو خانمانەدا ناگونجێت، وادەزانم ئەگەر لەبەر ﴿وأبونا شيخ كبير﴾ نەبووبا، ئەو کیژانەی شوعەیبیش ناچاری پاڵەپەستۆی ئەو کەم ویژدانانە نەدەبوون‌و ئەوەند گوشاریان نەدەکەوتە سەر، کەهاتنە دەریش خۆدیتتان چەندە بەئەدەب‌و خاوەن وێڵ‌و ڕەوشت بەرز بوون: ﴿لانسقي حتى يصدر الرعاء...﴾ لەگەڵ: ﴿تمشي على استحياء﴾ ئەوڕاستیەمان پیٚ دەڵێن.

بەڵیٚ ئافرەتی چاك و خاوەن شەهامەت، بەشەهامەت‌و چاکە، ئافرەت دەبیٚ لەگەڵ کاروانی ژیاندا بەجیٚ نەمێنیٚ‌و، لەڕێگایەکی شەرعیەوە خۆی‌و منداڵی بەخێو بکات، ئەگەرچی لەڕێی شوانی‌و کشتوکاڵیشەوە بێت، گەلیٚ ژنە کوردی خۆمان هەیە، کەمێردیان دەمریٚ، شێرانە دەچنە گۆڕەپانی کردوکۆششەوەو ناهێڵن، ئاتاج‌و موحتاجی دەرگای نامەرد بن‌و سەربەرزانە بۆ خۆیان دەژین.

٤- بەڵقیس ی پاشای سەبا:

پێش ئەوە بچینە ناو باسەکەمانەوە، دەبیٚ ئەمە بزانین کە (سولەیمان – عليه السلام – پێغەمبەری ئەو سەردەمە بوو) دەسەڵات‌و توانایەکی فرەی – لەلایەن خواوە – پیٚ بەخشرابوو، (بەڵقیس)یش لەسەردەمی ئەودا لە (یەمەن) دەژیا، بەڵام ئەوەند لەیەك دوور بوون بەیەکیان نەدەزانی.

سولەیمان عليه السلام تەنها خوای تاك‌و تەنیای دەپەرست، (بەڵقیس)ی شای (سەبا)یش خۆرپەرست بوو !سولەیمان – بەفەرمانی خوا گفت‌وگۆی لەگەڵ پەلەوەراندا دەکردو لەدەنگ‌و ئاوازیان تێدەگەیشت‌و، جنۆکەو پەریەکانیشی بۆ کەوی ببوون و هەموو ئیش‌و

کارێکی پێدەکردن: ﴿يعملون له مايشاء...﴾.

ڕۆژێ – پاش ئەوە کە بە(دۆڵی مێرووله)دا تێپەڕی – لەحاڵی لەشکرەکەی دەگەڕا، دیتی (پەپووسڵێمانە)کەی دیار نییە، گوتی: ئاخۆ خۆی دزیوەتەوە؟ شەرت بێ لەسەر ئەوە سزای توندی بدەم، یان ملی بقرتێنم، وەیان دەبێ بەڵگەی خۆییم بۆ بێنێ، بزانم بۆچی دیار نییە؟ سولەیمان عليه السلام لەناوچەی (فەڵەستین و لوبنان و سووریەو عێراق و کەرتی فورات)ی ئێستا دەژیا، واتە: دەسەلات و پاشایەتیەکەی لەوە تێنەپەڕیبوو، بێگومانیش بەشێك لەپەلەوەرو جنیەکانی ئەو ناوچانەی بۆ رامببوو، هەر بۆیەش کاتێ سەری لەشکرەکەی داو پشکنینی، بەئاسانی زانی کە پەپووسڵێمانە دیار نییە،خۆ ئەگەر گشت پەلەوەرەکانی بۆرامبوو باو، لەناو ئەوانیشدا گشت پەپووسڵێمانە، ئاوا بەئاسانی لەناو (مەلایین) پەلەوەردا، نەیدەزانی پەپووسێمانە لەناو ملیونەهای تردا نادیارە، بۆیە کە دەڵی: بۆ دیار نییە....؟ دیارە پەپووسڵێمانەیەکی تایبەتە، دەکرێ لەناو ئەو گشت پەپووانەدا ئەو دنکە رامبووبێ و، هەر ئەوەش بەو شێوەیە خوای گەورە ئەو هەست و دەرکەی پێ بەخشیبێ! (خوای گەورە خۆی زانیاریی تەواوی بە کۆمەڵی جنیی و پەلەوەرو گشت بوونەوەر هەیە).

ئینجاماوەیەکی زۆری نەخایاند، پەپووسڵێمانە پەیدابوویەوەو گوتی: من شتێك دەزانم تۆنـەتزانیوە، مـن لـە ولاتـی (سـەبا)وە هـاتووم، دەنـگ و باسـێکی گـرنگ و دروسـتم بـۆ هێناوی.(سەبا) کەوتبوویە باشووری (یەمەن)، پێی ڕاگەیاند: لەوێ ژنێك پاشایەتیان دەکاو، تواناو دەسـەڵاتێکی کـەم وێنـەو تـەختێکی زۆر گـەورەی هەیـە (واتـە: لەوپـەڕ پێشکەوتن و خۆشگوزەرانیدان و، لەهیچیان کەم نیە) لەگەڵ ئەمەشدا خۆی و نەتەوەکـەی – لـەباتی خـوا – سوژدە بۆ خۆر دەبەن ! دیارە شەیتان لەخشتەی بردوون و چەواشە بوون، ئەگینە چۆن دەبێ لـەباتی خـوای بەدیهێنـەری (خـۆر) و گـشت بوونـەوەر، سـوژدە لـەخۆر ببرێـت؟! شـەیتان وای پێکردون کە: سوژدە بۆ ئەو خوایە نەبەن کـە گـشت شـاراوەو نادیارەکانی نـاو ئاسمانـەکان و زەوی دەزانێ و دەریان دەخات!

پەپووسڵێمانە لەسەر قسەکەی دەچێ و دەڵێت: ئەر شەیتان لای نەدابن لەڕێی ڕاست، چۆن دەتوانن سوژدە لەو خوایە نەبەن کە غەیرەز ئەو شتێکی تر بۆ پەرستن ناشێ و، خاوەن و پەروەردگاری تەختی هەرە گەورەیە! سولەیمان –علیه السلام–، ئەو قسەوباسەی ئەوەند لا گرنگ بوو، نەبەڕاست نەبەدرۆ تیشکی نەخستە سەر، بەڵکو گوتی: بەتەئکید لەسەری دەچم و دەڕوانم، بزانم ڕاستتگوت، یان لە درۆزنانی؟ چونکە هەواڵی وا، دەبێ گرنگی خۆی بدرێتێ، دەبێ هەوڵ بدرێ خەڵکێکی ئاوا لە (خۆرپەرستیی) ڕزگار بکرێ.

بۆیە نامەیەکی سەرمۆر دەداتە (پەپووسلێمانە) بیگەیەنێتە دەستی ئەو ژنە پاشایە، لەوەش دەچێ بەدەر لە خۆی کەسێکی دی، ئاگاداری ناوەڕۆکەکەی نەبووبێ، بۆ ئەوە بەر لەبڵاوبوونەوەی بزانێ چ وەڵامێکی بۆ دێتەوە: ﴿إذهب بكتابي هذا فألقه إليهم، ثم تولّ عنهم فانظر ماذا يرجعون﴾.

لێرەدا پەردە دادرایەوە لەوە کە پەپووسێمانەکە چۆن نامەکەی گەیاندو، پاشاژنیش چۆن بەدەستی گەیی و، دوای ئەوە چی کرد؟ ئەمە نەبێ کە بەسەیرو سەمەرێیەکەوە بەدەوروبەرەکەی دەڵێت: نامەیەکی بەڕێزم بۆ هێنراوە، لەوە دەچێ نەشزانێ کێ بۆی هێناوە، ئەگینە ئەر زانیبای و پەپووسڵێمانەکەی دیتبا، ناوی دەهێنا، چونکە کاری وا، جێگەی سەرسوڕمانەو، شوێنی خۆیەتی ناوی بهێنرێت.

پاشاژن زۆر بەڕێز و بەحورمەتەوە پەسنی نامەکەی کرد: ﴿ألقي إليَّ كتاب كريم﴾ دیارە کە نامەی مۆرکراوو سەرمۆرو، ناوەڕۆك جوامێرانە، جێگەی خۆیەتی پێی بڵێت (کەریم = بەڕێز) و ئەوسا (بەڵقیس) لەبەردەم پیاوانی باڵا دەستی وڵاتەکەیدا نامەکەی دەدرکێنێ و بۆیان دەخوێنرێتەوە، ئەمەیش دەقەکەیەتی: ﴿إنه من سليمان وإنه بسم الله الرحمن الرحيم ألا تعلوا عليّ وأتوني مسلمين﴾ واتە: لەسولەیمانەوەو، هەر بەناوی خوای بەبەزەیی و میهرەبانەوە (بۆ ئەو گەلە خۆرپەرستە)، وەرن موسڵمان بن و خۆ بەگەورە مەزانن، وەلەخۆرپەرستیی (دروستکراوی خوای بەدیهێنەر)واز بێنن و تەنیاو تەنیا ڕوولەخوای بەدیهێنەری جیهانەکان بکەن.

بێ شك سەرهەڵدانی کاری وا لەو وڵاتە پڕ لەخۆشی و ئاسوودەیی و، پڕ میوەجات و نێعمەتەدا، ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراوە بۆیان، وە بە خەتەرێکی گەورەی دەزانێ، بۆیە زۆر بەوردو ژیرانە بیر دەکاتەوەو، بێ مەشۆرەت بەدامو دەزگای دەوڵەتەکەی هیچ بڕیارێك نادات، وەبەهیچ شێوەیەك بەر ترس‌وبیمی ئەو هەڕەشەیە ناکەوێ کە سولەیمان پێیگوتوو: ﴿لاتعلوا عليّ وأتوني مسلمين﴾، ئەمەش بەپێچەوانەی زۆرێکی زۆرینەی پاشاو دەسەڵاتدارەکانی دنیا – بەژن و بە پیاوەوە – کەزۆر بەپەلەو بەملهوڕانە بڕیاری جەنگ و کوشتار دەدەن، بەرامبەر هەرشتێك لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیاندا نەگونجێت !

بەڕاستی پاشای ئاوا – بەتایبەتی ئەو ژنە بەڕێزە – کە دەڵێت: ﴿ياأيُها الملأ أفتوني في أمري ماكنت قاطعة أمرا حتى تشهدون﴾ ئەی گەورەکانی ولات ! بابزانم بەرامبەر بەو ڕووداوە ڕاتان چییە....؟ دڵنیاشبن – وەکو پێشتر بێ ئێوە هیچ بڕیارێکم نەداوە – ئێستاش هەتا ڕای ئێوە نەزانم، هیچ بڕیارێك نادەم.

ئینجا – هەروەکو باوونەریتە بۆ پیاوانی دەستو پێی دەوڵەت – ئامادەیی خۆیان دەردەبڕنو، کۆتا بڕیاریش دەدەنە دەستی پاشا: ﴿قالوا: نحن أولو قوة وأولو بأس شديد. والأمر إليك فانظري ماذا تأمرين﴾. پێیدەڵێن: بێ خەمبە، ئێمە خەڵکانێکی بەهێزو بەهەڵمەتین، لەگەڵ ئەوەیشدا خۆت چاك دەزانیت.

ئەگەر ئەم ژنە، ئافرەتێکی تەواو ژیرو فامیدە نەبووبا، دەبوو بەو کەش‌وفشەی پیاوانی دەوڵەتەکەی لەخشتە بردباو بەرنامەی جەنگی ڕاگەیاندبا، کەچی دەیەوێ نەتەوەکەی لەشەڕو هەراو کێشە بپارێزێو تووشی هەڵدێریان نەکات، بۆیە قورئان لە سەر زمانی ئەو دەڵێت: ﴿إن الملوك إذا دخلوا قرية أفسدوها وجعلوا أعزة أهلها أذلة وكذلك يفعلون وإني مرسلة إليهم بهدية فناظرة بم يرجع المرسلون﴾.بێگومان کە دەسەڵاتداران – بەتایبەتی پاشاکان – هەرکە بەشەڕو هەراو جەنگ چوونە شارێکەوە کاول‌و وێرانی دەکەن، سەروەت‌و سامانی بەتاڵان دەبەن، سەرکردەو سەرۆکەکانی ڕیسواو زەلیل دەکەن... جا من بۆ خۆ لادان لەهەڵگیرساندنی شەڕێکی کاولکەری وا، دەست‌و دیارییەکی باش‌و بەنرخیان بۆ دەنێرم، ئەوسا چاوەڕوان دەبم، وەڵامیان چۆن دەبێ؟

لەوەدەچێ – بەدەر لە گۆڕینی هەڵوێستیان بەرامبەر بە شەڕەکە – دەیشیەوێ (سولەیمان) بەو دیارییە تاقی بکاتەوە، ئەگەر قبووڵی کرد، دیارە پیاوێکی دنیاییەو، بەم جۆرە شتانە خۆمانی لێ لادەدەین، خۆ ئەگەر قبووڵیشی نەکرد، بێ شك کارەکە، کاری ئاقیدەو ئایدۆلۆژیایەو بەم شتانە چار ناکرێت.

لەم کاتەدا پەردە لەم دیمەنە دادەرێتەوەو، لەناکاو شاندەکەی (بەڵقیس) بەخۆیان‌و دیارییەکەیانەوە لەبەردەم سولەیماندان ! دەبینن سولەیمان لەو هەدیەو دیارییە زۆر بێ نیازو بێ تاقەتە، لەوە بێ تاقەتە کە دەیانەوێ بەو هەدیەو جۆرە شتانە، ڕێگای بانگەوازەکەی پێ بگۆڕن، بۆیە لەوپەڕی متمانە بەخۆیی‌و بەڕاشکاوانە دەڵێ: ﴿أتمدونن بمال فما آتاني الله خير مما آتاكم بل أنتم بهديتكم تفرحون إرجع إليهم فلنأتينهم بجنود لا قبل لهم بها ولنخرجنهم منها أذلة وهم صاغرون﴾ ئەوە ئێوە دەتانەوێ بەو سەروەت‌و سامانە لەخشتەم بەرن‌و لەئیشەکەم ڕامگرن؟ هەرگیز بیر لە کارو کردەوەی وا نەکەنەوە، چونکە ئەوی خوا پێیداوم زۆر زۆرترو باشترە لەوەی بەئێوەی بەخشیوە (زانست‌و زانیاریی و پێغەمبەرێتیی‌و،کەویکردنی جنیی‌و پەلەوەر، من بەهیچ شتێ لەوانە ئێوە بۆم دەنێرن خۆشحاڵ نیم، لەخشتە ناچم، ئێوەن بەو جۆرە هەدیەو دیارییانە دڵخۆشن.

هێمان لەو قسانە ڕەقتریشیان پێ دەڵێت، پێیان دەڵێت: خۆتان‌و دیاریتان وەگەڕێن‌و

چاوەڕوانی چارەنووسی خۆتان بن، ئەمەیش سوێندی بێت، لەشکرێکی وا دێنمە سەریان، بەهیچ جۆر نەتوانن رێی لێ بگرنو، دەرەنجامیش بەڕیسوایی دەریان دەپەڕێنم.

لێرەدا ئەم دیمەنەش کۆتایی دێتو، لەشێوەی گەڕانەوەی شاندەکەی بەڵقیسو هەڵوێستیان چۆن بوو بێدەنگە؟ کەچی کتووپڕ دەنگوباسی هاتنی بەڵقیس پەیدا دەبێو، سولەیمانیش بەمە دەزانێ و، لای سوپاکەی دەکەوێتە سەروخواری هێنانی تەختو عەرشی پاشایەتیەکەی، بۆیە گوتی: ﴿یا أیُها الملأ أیکم یأتینی بعرشها قبل أن یأتوني مسلمین﴾ ئەی دەستو پێی دیوان ! بەرلەوە ئەوانە بێن داوای (ئەمان) بکەن، کێ دەتوانێ تەختی ئەو ژنەم بۆ بێنێ....؟. لەوەدەچێ سولەیمان بیەوێت، بەرلە گەیشتنیان، تواناو دەسەڵاتێك نیشان بدات، پتر ملیان پێ ڕاکێشێو، خۆ تەسلیم بکەن بەخوای باڵا دەست.

دیارە نواندنی هێزو توانایی لەبەردەم بەرامبەری نەیاردا دەبێتە مایەی دابەزینی لەسەر هەر خەیاڵێکی خراپ هەیبێت، دیارە موسڵمانیش دەبێ هێزو دەسەڵاتیان هەبێ، چ دارایی، چ سەربازییو تەکنیکی، بۆ چاو بەسی خەڵکانی نەیارو ناحەز، بۆ تۆقاندنو شەرم کردن لەبەرامبەریان، گەر بزانن بەرامبەرەکەیان بەتواناو خاوەن هێزە، زۆر کەم بیر لە لەشکرکێشی دەکاتەوە بۆی، وەزۆر بەئاسانی خۆ دەدات بەدەستەوە.

سولەیمان لەداواو پێشنیازەکەی بوویەوەو، جنییەکی زەبەلاحی زلحۆرت گوتی: ﴿أنا آتیك به أن تقوم من مقامك وأني علیه لقوي أمین﴾ بەر لەوە لەجێی خۆت هەستی، من بۆتی دێنم، دڵنیاشبە بەتواناو دەسپاکم.

سولەیمان ئەو ماوە بەزۆر دەزانێ و، هەڵدەستێ هەوڵی تری بۆ دەدات، بۆیە ئەوشارەزاو زانا بە کتێب بوو گوتی:﴿أنا آتیك به قبل أن یرتد إلیك طرفك﴾ ئەمن بەر لەوەچاوت بترۆکێنی بۆتی دینم،چاکە سولەیمان دیتی تەختەکەی بەڵقیسی لایە، لە بەرامبەر ئەوەوەدەعیەوفیز نایگرێت، بەڵکو شوکرانە بژێر دەبێ و دەڵێت: ﴿هذا من فضل ربّي لیبلوني أأشکر أم أکفر ومن شکر فإنما یشکر لنفسه ومن کفر فإن ربي غني کریم﴾.

واتە: ئەمەش هەر فەزڵو چاکەی پەروەرێنی خۆمە، دەیەوێ تاقیم بکاتەوە: ئاخۆ شوکرانە بژێرم، یان سوپڵەو پێنەزان، خۆ هەر کەسێك شوکر بکات، بۆ خۆی دەکات، کێش سپڵە بێ، بێگومان پەروەردگاری من زۆر بێ نیازو دەهندەیە.

هێنانی ئەو تەختەی (بەڵقیس)ـە لەسەبای (یەمەن)ـەوە بۆ (فەڵەستین) بەر لەچاوتترووکانێك، هەر کەسێك باوەڕی بەتوانایی خوای باڵادەست نەبێ، بێ شك دەکەوێتە نێوان کۆمەڵێ شكو گومانو بێ ئاسانی تەسلیم نابێتو، سەد پرسیار بۆ خۆی دروست دەکاو دەڵێ: بێ هۆکارو

سەبەب، ئەو ماوە درێژەیە چۆن دەبڕدریێ...؟ زانستو زانیاریی ئەو سەردەمە كەی هێندە بووە، خۆ ئێستاش هێمان هەر بەوە نەگەیشتووە! ئەی ئەو تەختە گەورەو مەزنەی پاشایەتیەكەی بەڵقیس چۆن هاتو كێ توانی بەوەندە مەودا ئامادەی بكات؟.

بەڵام مرۆڤی ئیماندار، زۆر بەسادەو ئاسانێكەوە، باوەڕ دەكاو تەسلیم دەبێ، دەزانێ كاری وا بۆ خوای باڵادەستو بەدیهێنەری بوونەوەر، زۆر زۆر كەمو بچووكە، چونكە هەموو شتێكی لەنەبوونەوە سەر پێهەڵداوە، ئەی باشە ! چۆن ناتوانێ زانیاریی و سەلیقەو توانایەكی وا خەڵاتی كەسێك بكات – خۆی هەڵبژێرێ بۆ ئەو كارە – ولەچاوتروكاندنێك جێبەجێی بكات.....؟

پاش ئامادەكردنی تەختەكەی بەڵقیس، سولەیمان هێمان دەیەوێ شتێكی تری سەرسوڕهێنەری نیشان بدات، هەتا بزانێ ڕێژەی زیرەكی ئەو شاژنە چەندە؟، هەتا بزانێ سەری لێدەردەكات، یان چەواشە دەبێو سەری لێ تێك دەچێت؟: ﴿قال: نكّروا لها عرشها ننظر أتهتدي أم تكون من الذين لا يهتدون﴾ سولەیمان گوتی: هێندێ نیشانەی تەختەكەی لێ بگۆڕن، خۆشمان تەماشا دەكەین: ئاخۆ پێی دەزانێ، یان سەری لێ دەرناكات؟

بەڵێ دوای ئەو هەموو خۆ ئامادەكردنەی (سولەیمان)ـە ﷺ لەڕووی بەڵقیسدا، ئەوجا كە بەڵقیسیش هاتو، پێیانگوت: مەگەر ئەمە تەختەكەی تۆ نییە؟ گوتی لەوەدەچێ.

بەڕاستی ڕووداوێكی كتووپڕ بوو، هاتە پێشێ بۆ (بەڵقیس) ! ئەولە (بیت المقدس)ـەوە هاتووە، خۆ بەرلەوەش بێت كۆشكو تەلاری پاشایەتی خۆی قوفڵكردووەو، پاسەوانێكی زۆری بەدەوردا داناوە، ئێستا ئەمە چیە؟ بڵێی عەرشەكەی ئەو بێت، جا باشە ئەگەر ئەو بێت، چۆن هاتووەو كێ هێناویەتی ؟ خۆ ئەویش وەڵامێكی زۆر ژیرانەی دایەوەو گوتی: هەر دەڵێی خۆیەتی !. ئیتر بەڵقیس گوتی: هەر ئەو دەمە كە نامەكەو پەپووسێمانەكە هاتو، دیتم سولەیمان دیارییەكەی وەرنەگرت زانیم كە ئەوە پاشایەكی دنیایی نییە، بەڵكو پێغەمبەری خوایە، بۆیە هەر ئەوكات موسڵمان بووین.

بەڵام لەبەرئەوە كە خۆیو قەومەكەی (ڕۆژ)یان دەپەرست، ئەو ڕۆژپەرستنە بوویە لەمپەرێك لەڕووی باوەڕهێنانو پەرستنی خوای باڵادەستدا، دیارە وا ئێستا تەسلیم بوون.

سولەیمان ﷺ بەرلە گەیشتنی بەڵقیس، شتێكی سەیرو سەمەرەتری نیشاندا، هەتا باشتر مل ڕاكیشێو خۆ بەدەستەوە بداو، وانەزانێ هەر ئەودەسەڵات و توانای هەیە، بۆیە قورئان دەفەرمووێ: ﴿قيل لها ادخلي الصرح فلمّا رأته حسبته لجّة وكشفت عن ساقيها قال إنه صرح ممرّد من قوارير قالت ربّي إني ظلمت نفسي وأسلمت مع سليمان لله رب العالمين﴾.

بەڵێ كە گەیشتو، بردیان بۆ كۆشكی میوانداریی و حەوانەوە، پێیگوترا: دەفەرموو بچوو ئەم كۆشكەوە، بەڵام چونكە ناوەكەی لە بلوورو شووشە دروستكرابوو و ژێرەكەیشی ئاو بوو، بەڵقیس شا، تووشی حاڵەتێكی نائاسایی بوو و، وا لێی تێگەیشت دەریایەو، ئەگەر بەناویا بچێت لاقەكانی تەڕ دەبن! بۆیە هەردوو لاقی هەڵكرد، هەتا تەڕ نەبێت، ئینجا كە سولەیمان ﷺ ئەو حاڵەتە نائاساییەی بەڵقیسی دیت،گوتی: ئەوە تۆ بەدەریای دەزانیت، كۆشكێكە لە شووشە ! بەڵقیسیش خێرا گوتی: ئەی پەروەردگارم ! بێ شك من ستەمم لەخۆمكرد (ئەو ماوەیە لەتۆ دوور بووم، وا ئێستا لەگەڵ سولەیمان ملكەچ بووم بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

بەڵێ ئیمان بەخوا هەموو كەسێك – دەسەڵاتدارو بێ دەسەڵات – دەباتە ڕیزی یەكەوە، ئەوەتە (بەڵقیس)ی ڕۆژپەرست ی دوێنێ، ئەمڕۆ لەگەڵ سولەیمان پێغەمبەردا – هەردوو پێكەوە ملكەچی فەرمانی خوان. لێرەدا كۆتایی بەم باسەی (بەڵقیس)ـە دێتو، ئەنجامەكەی بەباوەڕهێنانی ئەو تەواو بوو، لە بەر ئەمەش خوای كارزان ئەم ڕووداوە بۆ پێغەمبەر – ص– دەگێڕێتەوە، تا قوڕەیش – كە بەلایانەوە زۆر سەخت بوو، لەبەر عینادیو خۆ بەگەورە ڕاگرتن، دوای پێغەمبەر بكەونو ببێتە گەورەیان – چاك بزانن كە ئیسلام بوون بۆ خوا، جیاوازی لە نێوان ئەموئەودا ناهێڵێت، كەسێك نابێتە سەرۆكو، كەسێكیش ژێر دەستە، بەڵكو هەموو لەگەڵ پێغەمبەرەكەدا دەبنە موسڵمان بۆ خوای جیهانیان: ﴿وأسلمت مع سليمان لله رب العالمين﴾.

## ژنانی ئاكار خراپیش هەن:

گوتمان مرۆڤ بەهەردوو جۆرەكەیەوە – ژن وپیاو– ئاكار چاكی هەیەو، بەدكاریشی هەیە، هەركامێكیان چاك بوو چاكە، هەر كامێكیشیان خراپ بوو خراپە، لە پێشەوە هێندێ ژنی ئاكار چاكمان باس كردن، ئێستاش بڕێ لە ژنانی بەدرەفتار دێنینە ناو باس، بەمەبەستی ئەوەكە ژنیش مرۆڤەو، قابیلی هەڵەو پەڵەیە و،نابێ هەمیشە خۆی بە فریشتە بزانێت، وەكو پیاو هەردوو جۆرەكەی هەیە و نابێ ئەمیش هەمیشە هەموو خراپەو تاوانێك لەوەوە بزانرێ، فەرموو ئەمەیش – بۆ نموونە – ئەم چەند ژنانە:

**١،٢– ژنەكانی هەریەك لە (نووح)و لە (لووط) سڵاویان لێ بێت:**

قورئانی پیرۆز لە سوورەتی (تەحریم) لەبارەیانەوە دەفەرمووێ: ﴿ضرب الله مثلا للذين كفروا امرأة نوح وامرأة لوط كانتا تحت عبدين من عبادنا صالحين فخانتاهما فلم يغنيا عنهما

من الله شيئاً وقيل ادخلا النار مع الداخلين﴾ ١٠. واته:خوا ژنەکەی (نووح)و ژنەکەی (لووط) بەنموونە بۆ کافرەکان دێنێتەوە کە: هەریەکەیان ژنی بەندەیەکی صاڵحی خوا بوون، هەردوو خەیانەتیان لێکردن، ژنەکەی نووح پاڵیدا بە نەیارەکانی (نووح)ەوە، ئەمیش وەکو ئەوان گاڵتەو مەسخەرەیان بە نووح و بانگەوازەکەی دەکرد ! ژنەکەی (لووط)یش، ڕێنمایی قەومەکەی دەکرد بۆ گیانی میوانەکانی (لووط)، کە نەتەوەیەکی فاحیشەچی و بەدکاربوون ! دیارە ئەمە خەیانەتە لە ڕێبازی دین و مەزهەبی مێردەکانیان ! ئەم دوو ژنە هەرچەندە خێزان وهاوسەری پێغەمبەران بوون لە گەڵیان ژیان، بەڵام کەنەهاتنە ژێر بەیداخی دینی خواوە، بوونە جەحەننەمیی و، لەگەڵ جەحەننەمییاندا ڕەوانەی ئاگر کران. کەوابوویە یاسای خوا: هەموو کەسێك بەگوناحی خۆی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکرێ و تۆڵەو سزای دەدرێ، لەو لایشەوە بە گێڕانەوەی ئەم داستانە بەژنەکانی پێغەمبەرمان (محمد – ﷺ) دەڵێت: ئێوەش وریابن! ئاگاداری خۆتان بن و بۆ خۆتان چاك بن، ئەگینە حیسابی ئەوانتان بۆ دەکرێ، چونکە بەهاوسەری بوونتان بۆ پێغەمبەر ﷺ بێ پەیڕەوی لەو، بێهوودەیە. کەوابووژنانیش لە ئەحکام ویاساو ڕێسای قورئاندا جێ ورێی خۆیانیان هەیەو، هەموو کردارو وتارێکیان حیسابی لەسەرە، بۆیە دەبێ هەوڵی چاکەو چاکسازی بدەن و، بۆ خۆیان کارو کردەی چاك ئەنجام بدەن، چونکە ئەوانیش بەشێکی ئەم کۆمەڵگەیەن و، ئەم کۆمەڵگەیە بێ ئەوان کەم وکورت وناتەواوە.

### ٣– ژنەکەی عەزیزی میسر / زلێخا:

ئەم ژنە، ژنی عەزیزو دەسەڵاتداری میسرەو، (یوسف)یش وەجاخزادەو نەوەی پێغەمبەرانە، پاش ئەو خەیانەتە براکانی بەرامبەریان کردو فڕەیاندایە قووڵایی بیرەکەوەو، کاروانێك هات و سەتڵێکیان هەڵدایە ناویەوە بۆ ئاو هەڵگۆزین، کەچی ئەوی هێنایە سەر، ئینجا هەڵسان بەنرخێکی زۆر هەرزان و کەمبەها فرۆشتیان ! قەدەری خوا وابوو ئەو بکەوێتە دەستی (عەزیز)ی میسرو بیکاتە خوڵامو ئیش وکاری ماڵەوەی پێ بکەن، چونکە (عەزیز) – وەکو دەڵێن – لەتەمەنی چل ساڵیدایەو، (زلێخا)ش لەدەوروبەری سی ساڵدایەو، هێشتا بێ منداڵن.

لەوەدەچێت ئەم قۆناغەش بۆ (یوسف)، تاقیکردنەوەیەکی تر بێت، چونکە هەرکە چووە ماڵی گەورەی (میسر)و لەبەردەست شاژندا کەوتە ئیش وکارو بێرەو بچۆ، لەبەرئەوە کە یووسف لاوێکی ئێجگار جوان و شیرین بوو، زلێخاش بەرنامەی لێدەگۆڕێ و دەیەوێ ئەوینبازی لەگەڵ بکات!

بۆ ئەمە دەچینە خزمەتی سوورەتی (یوسف)، گوێ دەگرین و ورد دەبینەوە بزانین چ

دەقۆمیٚ: ﴿وراودته التی هو فی بیتها عن نفسه وغلّقت الأبواب وقالت هیت لك قال معاذالله إنه ربّی أحسن مثوای إنه لا یفلح الظالمون﴾٢٣. واته: ئەو ژنەی (عەزیز) کە یووسف لە ماڵی ئەوا بوو، پێمایە یووسفو تەمای تێکرد. هەڵسا بۆ ئەنجامدانی ئەوەش دەرگاکانی لیٚ بەستو گوتی: خێرا ئامادە بە.....! دیارە ئافرەتێکی شاژنی شۆخو شەنگو لەسەرەتای تەمەنیدا، لاوێکی جوان چاکو هەڵکەوتەش وەکو یوسف، ڕۆژ دوای ڕۆژ پتر بەرەو جوانی دەچیٚ، لەماڵێکی تەنیاو چۆڵدا دابنریٚ، قابیلی ڕوودانی کاری دزێوی وایە، قابیلە شاژن تەماح بکاتە خوڵامەکەی خۆیو، پشت ملی بگریٚو بیەویٚ ئەو کارەی لەگەڵ بکات، خۆ ئەگەر یوسف، خوا نەیپارازتایە – وەکو لەئایەتەکەی تردا دێت – ئەوا کار لەکار دەترازا.

بێگۆمان ئەمە ئامۆژگارییەکی بەرزی کۆمەڵایەتییو خێزانی تێدایە بۆ هەموو کەس و بۆ هەموو خێزانێك، بەتایبەتی بۆ پاشاو پیاوە هەڵکەوتووەکان، ئەوانەی هەمیشە لە گوزەرانی خۆشدانو ڕادەبوێرن کە: خەڵکی نەیارو دزێو نەبەنە ناو ماڵو منداڵ، هەتا ژنو کچەکان گیرۆدەی ئەوین نەبنو دەست درێژی ڕوونەدا، خۆ ئەگەر هەر پلەوپایەیەك لە ئەوین گەورەتر بوایە، دەبوو زلێخا پێی عەیب بوایە، بیر لەوە بکاتەوە لەگەڵ یوسفێکی خوڵامی خزمەتکاری خۆیدا دەست تێکەڵ بکات، دیارە ئەوین لەهەموو شتێك مەزنترە، دیارە ڕەتدانەوەی (غەریزەی جنسیی) زۆر سەختە، مەگەر لاوێکی وەکو یوسف – کەئەویش دەستی خوای پێوە بوو – پارێزراو بێت.

ئەمەی من دەیڵێم، مانای دڵپیسیو بەدگومانی نییە لە هاوسەرو خێزانەکان، بەڵکو حەقیقەتو واقیعێکەو، سەدانو هەزاران جار، شتی ناپەسەندی وا ڕوویداوەو ڕوودەدات، بەڵام ئێستا – بەداخەوە – ئەوی زۆر بەهەرزانو بیٚ لەمپەر دەسکەوێت ئەو کارەیە! ئەوی ئاڵای ئازادی بۆ بەرز کرابێتەوە – لێرەو لەویٚ – ئەوەیە، هیوادارم پەندو عیبرەت لەم بەسەرهاتەی شاژنو خوڵامەکەی وەربگیردریٚو، ئامۆژگاریەکانی ئیسلام لەبەرامبەر جلی باڵاپۆشو تێکەڵ نەبوونی ژنوپیاوی نامەحرەمو، بەدروست بوونی (خەڵوەت)ی ژنو پیاوی نامەحرەم ڕێگە نەدرێت.

ژنەکە بەیوسفی گوت ئامادەبە ! یوسفیش گوتی: پەنا بەخوا، چۆن ئامادەبیم؟! مەگەر مێردەکەی تۆ گەورەو ئاغام نیە، ڕێزی نەگرتووم، لەبیرەکە ڕزگاری نەکردمو لەتەلاری پاشایەتی خۆیدا جێی نەکردمەوە؟؟ بەراستی کاری وا تۆ لەمن داوای دەکەیت، کاری پیاوانی ناهەقکارە، بیٚ شك پیاوانی وایش لەسزاو تۆڵە ناخەلەسێن.

یوسف هەرلە یەکەم قۆناغدا، زۆر بەمەردانە، وەڵامێکی جەرگ بڕی زلێخای دایەوە،

زلێخاش – پاش ئەوە – لێبڕا بەهەر جۆرێك بووبێ مەبەستەكەی خۆی پێ جێبەجێ بكا: ﴿ولقد همت به وهم بها لولا أن رأى برهان ربه....﴾ بەخوا سوێند بێ، بەدڵ لێبڕا ئەو كارە بە یووسف بكات،بەلاّم یوسفی لاوی تازەپێگەیشتووی بەردەستی شاژن لە كۆشكی پاشایەتییدا، خوا چاودێری كردو دڵی داچڵەكاندو نەیهێشت توخنی ئەو كارەدزێوو ناپەسەندە بكەوێتەوە، ئەگەرچی وەكو ئینسانێك نەفسیشی بۆی لێدابێ ! ﴿كذلك لنصرف عنه السوء والفحشاء إنه من عبادنا المخلصين﴾٢٤. خوا دەیەوێ و مەبەستییەتی (یوسف) لەكاری خراپو دزێوو ناپەسەند وەدوورخا، چونكە یووسف یەكێكە لەبەندە پاكو دڵسۆزەكانی خوا، یوسف بۆ خۆی لێبڕا لەوجۆرە كارانە هەڵبێت، خواش پشتیوانی لێ كرد ﴿واستبقا الباب وقدت قميصه من دبر وألفيا سيدها لدى الباب قالت ماجزاء من أراد بأهلك سوءاً إلا أن يسجن أو عذاب اليم﴾٢٥. هەردوو بەكێبەركێ بەرەو دەرگاكە چوون، یوسف بۆ خۆڕزگاركردن لە چەنگ ژنە ئەوینبازەكە، ژنەكەش بۆ ئەوە یووسفیلەدەستی دەرنەچێتو كارە ئاژەڵیەكەی ئەنجام بدات، كەوتە سەر یوسفو لەپشتەوە دەستی گەیاندە كراسەكەیو دڕاندی، لەناكاو لە دەم دەرگاكەدا تووشی (عەزیز) یمێردی زلێخا بوون، زلێخاش خێرا پێیگوت: دەبێ سزاو تۆڵەی كەسێ چی بێت، بیەوێ لەگەڵ ماڵو خێزانی تۆدا كاری شوورەیی بكات؟

ئەم ژنە ژنێكی ئەوینبازە، دەیەوێ پاكانە بۆ خۆی بكاو، یوسفیش – لەناو نەچێت – بۆیە گوتی: بەدەر لەزیندانی، یان جەزرەبەو سزایەكی بەژان، هیچی تری شایستە نیە ! ﴿قالَ هي راودتنى عن نفسي وشهد شاهد من أهلها إن كان قميصه قد من قبل فصدقت وهوَ من الكاذبين﴾ ٢٦. یوسف ناچار بوو پەردە لەسەر ڕاستیەكان هەڵماڵێو بڵێ: ئەوبوو لەمن پێچاو تەماحی كرد لێم، لەم قسەو باسانەدا بوون، یەكێ لەخزمەكانی ژنەكە ئەم لێدوانەی داو گوتی: ئەگەر كراسەكەی لەلای پێشەوە دڕابوو، ئەوە ژنەكە ڕاست دەكاو، یوسف درۆزنە، (چونكە دەكرێ یوسف دەرگای بەو گرتبێتو، ئەویش – بۆبەرگری لەخۆی – بەرەو ڕووی چووبێو دەستی لە كراسەكەی گیر كردبێو بەدەستیەوە دڕا بێ).﴿وإن كان قميصه قد من دبر فكذبت وهو من الصادقين﴾٢٧. خۆ ئەگەر لەدواوە دڕابوو، ئەوە ژنەكە درۆیكردوەو، (یوسف) ڕاستەو لەڕاست بێژانە، چونكە هەڵدەگرێ ژنەكە یەخەی پێگرتبێو، ئەویش – بۆ خۆلادان لەو كارە دزێوە – هەڵهاتبێو، ئەمیش لەدواوە دەستی بە كراسەكەی گەیشتبێو، بەدەستیەوە دڕابێ.

﴿فلما رأى قميصه قد من دبر قال إنه من كيدكن إن كيدكن عظيم﴾٢٨. ئینجا كە

(عەزیز)دیتی لەدواوەوە کراسەکەی دڕاوە، گوتی: بێ شك کاری وا، لە فێڵو فەرەجی ئێوەی ژنان دەچێ، خۆ فرتو فێلی ئێوەش گەورەو مەزنە.

بەڵێ ئەو پیلانو ڕووداوە مەزنەیە، بەلای بنەماڵە چەواشە بوو وخۆشگوزەرانەکانەوە، شتێکی زۆر بچووكو سادەیەو، هەمیشە دەیانەوێ بە شێوەیەکی زۆر سادەو ساکار کپی بکەنەوە، بۆیە بە یوسف دەڵێن: ﴿یوسف أعرض عن هذا واستغفری لذنبك إنك كنت من الخاطئين﴾٢٩. یوسف ! تۆ ئەم کارە پشتگوێ بخەو، لەهیچ جێگایەك باسی مەکە! (دیارە بەلای ئەوانەوە هەر ئەوەند بەسە بۆ تۆڵەو سەر کۆنە).

زلێخا! تۆش، بێ شك لەهەڵەکارانیت، دەبێ داوای لێبوردن بکەیت، (بەڵێ لەهەموو سەردەمێکدا چینی (ئوروستوقراتی) هەر ئەوەند جورئەت دەکەنو هەر ئەوەندەیان لێدەوەشێتەوە !.

لێرەدا پەردە دادرایەوەو، لەوەدەچێ پاشا هەرئەوەندەی بەبەس زانیبێ بەرامبەر زولێخا بیکـات، بۆیــە (یوســف) هــەر لەکۆشــکەکەدا لای شــاژن دەمێنێتــەوەوئیش و کـاری مـاڵی پێدەکەن، بەڵام خەریکە ئەو ڕووداوە لەناو تەلاری پاشایەتیدا دەچێتە دەرو ژنان لەدەرەوە دەیلێنەوە ! ﴿وقال نسوة فى المدينة امرأة العزيز تراود فتاها عن نفسه قد شغفها حبا إنا لنراها فـى ضـلال مـبين﴾٣٠.لەناوشـاردا ژنـان وتيـان: وای ! ژنەکـەی عـەزیز تەمـەحی لـە خولامەکەی خۆی کردووە!، وەئەوینو خۆشەویستی ئەو لاوەیە، چۆتە نێو پەردەی دڵیەوە، بەڕاستی ئێمە وای دەبینین بەئاشکرا چەواشە بووەو سەری لە خۆی تێکداوە ! ئەگینا ئەو ژنـە گەورەیـە، خێزانـی ئـەو پیـاوە مەزنەیـە، چـۆن دەچـێ لەگـەڵ خـولامێکی (عیبرانـی) فرۆشـراودا، ئـەوینبازی بکـات؟! زلێخـاش کـە دەزانـێ دەنـگو باسـەکەی کەوتۆتـە دەم ژنـان، دەیـەوێ بەرامبـەریان فێـڵو فـەرەجێ بکـات، هـەتا ئـەوانیش بڵـێن بەڕاسـتی زلێخـا ناهـەقی نـەبووە، کـە گـیرۆدەی ئـەوینی ئـەو لاوە بـووە ! بۆیـە: ﴿فلمـا سمعـت بمكـرهن أرسـلت إلـيهن وأعتدت لهن متكئاً وأتت كل واحدة منهن سكينا...﴾ هـەر کە ئەو حیلەو فێڵەیـەی بیستن، زانی کە چۆن سەرکۆنەیان کـردووە، هەڵسا میوانداریيـەکی –لەکۆشـکی خۆیـدا– بۆ کـردن و ناردی بەدوایانـداو، بۆ هەریەکـەیان ڕایـەخو پاڵەپشتی بۆ ئامادە کـرد، دیـارە دێـنو دەگەنـە تەلارەکـەو، کـاتی میـوە خـواردنیش دێـتو، بـۆ هەریەکـەیان چـەقۆیەکی میوەخـۆر دادەنـێ: ﴿وقالت اخرج عليهن فلما رأينه أكبرنه وقطعن أيديهن وقلن حاش لله ماهذا بشرا إن هـذا إلا ملـك كـريم﴾٣١. وسـەرقاڵی میـوە پـاككردن دەبـن، یـان بەچـەقۆ خـەریکی پـچڕاندنی گۆشـت دەبن، جا لەو کاتەدا بە یووسف دەڵێت: دە ئێستا بچۆ بۆ لایان، جا کە هاتو دیتیان، هەموو

مـەدهوش بـوون‌و چاویان بڕییـە یوسـف‌و، لەملایـشەوە – بـیٚ ئاگایانـە – دەسـت‌و پەنجـەی خۆیانیان بریندار کردو گوتیان: بێخەوشی بۆ خوا ! هەرگیز ئەمە ئادەمزاد نییە، ئەمە – بیٚ‌و نەبیٚ – هەر فریشتەیەکی بەڕێزە !.

زلێخا کە دیتی وا ژنەکانی تریش، وەکو ئەو مەدهۆش بوون بە یوسف، خۆی بەسەرکەوت‌و داناو بەڕاشکاوانە ﴿قالت: فدلکن الذی لمتنن فیە ولقد راودتە عن نفسە فاستعصم ولئن لم یفعل ما آمرە لیسجننّ ولیکونا من الصاغرین﴾٣٢. گوتی: ئەوەبوو، کە من بەبۆنەیەوە بۆمە جێی قسەوباس‌و تەشەری خەڵکان ! ئەها ئێوەش چیتان لێهات بەدیتنی ؟ ئێستاش چاك بزانن کە: ڕاستە من بووم تەمەحم تێکرد، بەڵام ئەو زۆر پەنای هێناو هاواری کرد کە وازی لیٚ بهێنم، دڵنیابن ئێستاش هەر وازی لێناهێنم‌و، ئەوە سوێندی بێت، ئەگەر ئەوی من دەمەویٚ لێی، جێبەجێی نەکات، تووڕهەڵدەدریٚ بۆ بەندینخانەو بیٚ دەسەڵات‌و زەلیل دەکرێت.

یوسفیش لەناو ئەو کۆمەڵە ژنە خۆئارایشکەرانەدا، کەژنان بەسروشت هەمیشە حەزیان لەخۆڕازاندنەوەو خۆ دەرخستنە، دەستی بەندایەتی خۆی بۆ لای پەروەردگاری بەرزەوە دەکاو دەکەوێتە موناجات: ﴿قال رب السجن أحب إلیّ مما یدعوننی الیە وإلا تصرف عنی کیدهن أصب إلیهن وأکن من الجاهلین﴾٣٣. و دەڵیٚ: پەروەردگارم ! بەندیخانەم لا زۆر باشترە، لەو کارەی ئەوان بانگم دەکەن بۆی، ئەر بۆ خۆت فێڵی ئەوانەم لیٚ لانەدەیت، مەیلم دەچی بۆ لایان‌و دەچمە ڕیزی نەزان‌و نەفامانەوە. (یوسف چەند خۆی بەپاك بزانیٚ، هێشتای پێویستی هەر بە پەنای زیاتری خوایە، بۆیە ئەو موناجات‌و هاوارەی لیٚ بەرزەوەبوو). ئینجا خواش بەهانایەوە هاتوو، هیوای لەدڵی ئەواندا بڕی کە لە یووسف شتیٚ هەڵکرێنن، بۆ خۆیشی تۆکمەتر بوو لە پشت هەڵکردن لێیان: ﴿فاستجاب لە ربە فصرف عنە کیدکن إنە هو السمیع العلیم﴾٣٤.

پاش ئەوە هیچیان لە یووسف سەوز نەکردو هەڕەشەکانیان یووسفی نەرم نەکردو، ئاهەنگێکی –بۆ ژنانی ناوداری نێو شار وەکو خۆی– گێڕاو کوڕە لاوەکەی بۆ نمایشکردن‌و، ئەوانیش بەبینینی مەستبوون‌و ئەقڵیان لەدەست دا، شاژنیش بەڕاشکاوانە ددانی نا بەداوەکەدا کە: ئەم تەماحی لەو لاوە کردووە.ئەوەش سوێندی بێت، دەبیٚ فڕە بدرێتە زیندانەوە ئەگەر وەڵامی داخوازییەکەی نەداتەوە، لاوەکەش زیندانی بۆ خۆی هەڵبژارد... پاش ئەم هەموو بەڵگانە بۆ خاوێنی یوسف، کۆشکی پاشایەتی وابەچاك دەزانیٚ کە بۆ ماوەیەك – ئەگەرچی پاك‌و بیٚ گوناحیشە – لاوەکە زیندانی بکریٚ، بەڵکو لەپێش چاوەوە نەمێنیٚ‌و، وردە وردە لەبیر بچێتەوە !

دیاره ئەوانەی لە كەش‌وهەوای (ئورستوقڕاتیەت)دا دەژین‌و، لەوجۆرە تەلارانەدان، ڕەنگ‌وڕوخساری جاهیلیەتیان لێ‌ نیشتووە، بۆیە لەباتی زیندانكردنی تاوانبارو، ئازادكردنی بێ‌ تاوان، دەچن بەپێچەوانەوە كاردەكەن ! یوسفی بەریی بۆ زیندان‌و، شاژن — پاش ئیعتیراف — بەهەزار ئاو شۆرایەوە !

جا من ئەوەی مەبەستم بوو لە گێڕانەوەی ئەم داستانەدا، تا ئێرەبوو، چونكە تا ئێرە پتر پەیوەندی بە ژنانەوە هەیە، جا ئیبتیلاو بەڵاكانی یووسف — ماوەی مانەوەی لە بەندینخانەو لێ‌ نەپرسینەوەی، بۆ دوایی خەودیتنی پاشاو، لێكدانەوەی تەنها لای یووسف‌و، نەهاتنە دەری لە زیندان، پاش ئەوە پاشا ناردی بەدوایدا، تا ڕاگەیەنراوێك لە كۆشكی پاشایەتیەوە دەردەچێ‌، تێیدا پاكانە بۆ یووسف بكا، بۆ ماوەیەكی تر دەبێتە وەزیری (ئابووریی)و، برا لاسارەكانی — ئەوانەی خستیانە بیرەكەو فرۆشتیان — لێیان دەقەومێ‌و دێنە لای یووسف بۆ گەنم‌وجۆو دانەوێڵە.... تاد ئەمانە گشت سەر دەنێینەوە. مەبەستیش لەم داستانە ئەوەیە كە ژنانیش — وەكو پیاوان — ناهەقیی دەكەن‌و، دەچنە ناو تاوانەوەو،، بە حیلەوئیفتیراو دەسەڵاتی‌خۆیان، خەڵكی‌بێ‌ تاوان دەنێرنە گرتووخانەكانەوەو، خۆشیان وەك سوورەی بانان بۆی دەردەچن !

مەبەست ئەوەیە وەكو گوتمان كە ئەم ئادەمزادەیە — بەژن‌و بەپیاوەوە — چاكیان هەیەو خراپیشیان هەیە، هیچ لایەكیان خۆی بە فریـشتە دانەنێ‌و، بەرامبەرەكــەی بەشەیتــان ! ئەوی كارەكانی پاك‌و جوان‌و جـــوامێرانە بـــوو، بێ‌ شك خۆیشی چاك‌و پاكە، بێگۆمان پێچەوانەكەیشی، مایەی خراپی‌و نالــەباریە.

## ژن وپیاوی داوێن تەڕ

پاش ئەوەی كە ژنان، بەتایبەتی لەكۆمەڵگەی عەرەبیدا، بەسووك‌و تاوانبار تەماشا دەكران‌و، بەهۆكاری تاوان دادەنران ! ئایینی پیرۆزی ئیسلام دێت، ئەو ڕاوبۆچوونانەیان بە هەڵەیەكی گەورە دادەنێ‌و، ئەو دوو (جنس)ـە هەردوو وەكو یەك سەیر دەكاو، فەزڵی هیچ كامێكیان نادات بەسەر ئەوی تریاندا، مەگەر بەتەقواو ئەنجامدانی كاری چاكە، هەروەك هیچ لایەكیشیان بەكارگەی شەڕوخراپە دانانێ‌، بەڵكو هەردوولا دەتوانن كاری چاك بكەن‌و خراپەش بكەن، وەكو لە پێشەوە گەلێك لەوبارەیەوە دواین، ئێستاش دەچینە خزمەتی سوورەتی (نوور) كە ئەحكامگەلێكی تێدایە — بەتایبەتی بۆ ژنان، بۆ یەكێ‌ لەو ئەحكامانە دەفەرمووێ‌: ﴿الزانية والزاني فاجلدوا كل واحد منهما مأة جلدة ولا تأخذكم بهما رأفة في دين الله إن كنتم تؤمنون بالله واليوم الآخر وليشهد عذابهما طائفة من المؤمنين﴾٢. واتە: لە هەریەكە ژن‌وپیاوی داوێن پیس،

سەد شەلاق بدەن، ئەگەر باوەڕتان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە، وە بۆ ئەنجامدانی ئەم حوکمی خوایە نابێ بەزەیی بتانگرێ بەرامبەریان و، کارەکەتان بۆ پیادە نەکرێت.

لەسەرەتای هاتنی ئیسلامدا تۆڵەی ژن و پیاوی زیناکار ئەوەبوو لەسوورەتی (نیساء)دا، ئایەتی: ﴿واللاتی یأتین الفاحشة من نسائکم فاستشهدوا علیهن أربعة منکم. فإن شهدوا فأمسکوهن فی البیوت حتی یتوفاهن الموت أو یجعل الله لهن سبیلا﴾ دەبوو ژنان لەماڵ نەیەنە دەر، پیاویش قسەی تاڵ و تفتی پێ بگوترێ. جا بۆ دوایی ئەم حوکم و بڕیارە نوێیە، لە سوورەتی (نوور)دا هات و سەبارەت بەو مەسەلەیەش بە کۆتا بڕیار دادەنرێ: شەلاق (قامچی = تازیانە) تۆڵەی کچ و کوڕە، بەمەرجێ موسڵمان و باڵغ و ژیرو ئازاد (حوڕ) بن. ژن و پیاویش (واتە:ئەوانەی لەمارەبڕینێکی شەرعیدا جووتبوون) ڕەجم و بەردەباران دەکرێن، بەپێی ئەوە کە پێغەمبەرمان (محمد–ص)، دەربارەی (ماعیز) و (غامدیە) کاری پێکردووە، وە پێی ئەم فەرموودەیە ئەو حوکمەی دامەزراند: ((خذوا عنّی، خذوا عنّی، قد جعل اللهُ لهن سبیلا: البکرُ بالبکر: جلدُ مأةٍ وتقریبُ سنةٍ، والثیبُ بالثیب جلدُ مأةٍ والرجمُ)) مسند احمد ومسلم، وسنن أبي داود، وابن ماجة، وعارضة الأحوذي.

ئەم بڕیارەش! چونکە ژن و پیاو (واتە: جووتبوو لە نیکاحێکی صەحیحدا) ڕێگەی پاک و حەڵاڵ شارەزان، بۆیە پاش ئەوە ئەگەر لایانداو زینایان کرد، وادەگەیەنێت (فیطرەت)یان تێکچووە، دەبێ ئەو تۆڵە سەختەیە بچێژن، بەڵام چونکە کچ و کوڕ هێمان بەو ڕێگایەدا نەچوون، تۆڵەکەشیان سووکەو تەنها جەلدەو شەلاقە.

شیاوی باسە دەبێ کۆمەڵێك لە ئیمانداران – لەکاتی تۆڵەسەندنەکە لێیان – ئامادەبن، بۆئەوە پتر کۆمەڵگە عیبرەت و وانەی لێوەرگرن و نەهێڵێن ئەو جۆرە کارانە ڕووبدەن، ژن و پیاوەکە، یان کچ و کوڕەکەش ئەوە دووبارە نەکەنەوە. درێژەی ئەم باسە لەکتێبە فیقهییەکاندا هەیە.

پاشان لەبەر خراپی و دزێوی زیناو زەرەرو زیانەکانی و، پتر قێزەونی دەکاو لەمپەرێك دەخاتە نێوان کۆمەڵگەو زیناکارەوە، بۆیە دەفەرمووێ: ﴿الزانی لاینکح إلا زانیةً أو مُشرکة والزانیة لا ینکحها إلا زان أو مشرك وحرّم ذلك علی المؤمنین﴾ واتە: پیاوی داوێن پیس، هەردەبێ ژنی داوێن پیس، یان بت پەرست بخوازێ، ژنی داوێن تەڕیش هەردەبێ: یان مێرد بە داوێن پیس بکات، یان مێرد بە بت پەرست بکات، ئەوکارەش بۆ ئیمانداران حەرام و بەربەرستکراوە.

ڕاگرتنی کۆمەڵگە بەپاك و خاوێنی و، ئەنجامدانی کاری (سێکس)یی لە ڕێگای شەرعیی خۆیەوە، خاڵێکە لە خاڵە هەرە گرنگەکانی ئیسلام، بۆیە ئەوند جەختی لەسەر دەکاتەوەو بەو شێوەش تۆڵە دەدات.

ئیسلام لەگەڵ (غەریزە)و هێزی ئارەزوو و سێكسدا دژ ناوەستێ‌و بەشتێكی خراپ‌و قێزەونی دانانێت، بەڵكو ئیسلام دەیەوێ بە شێوەیەكی پەسەندو دوور لە زیانی ڕۆحیی‌و جەستەیی ڕێكی بخات، مرۆڤ لەشكڵ‌و بچمی ئاژەڵ جیا بكاتەوە، چونكە هەر ئاژەڵ جیاوازی ناخات لەنێوان ئەم جەستەو ئەو جەستەدا بۆ تێركردنی ئارەزووە سێكسیەكانی، یان لە پێكەوەنانی ماڵ‌و حاڵ‌و خێزان بیر ناكاتەوە، ئیسلام بێ هیچ (ضمانات)و دەستەبەربوونێك ئەو تۆڵەیە نادات، بۆیە بەر لە هەموو شتێك كۆمەڵگە لەو كاروكردە ناشیرین‌و ناپەسەندانە پاك دەكاتەوە: (كچ لە كوڕ، پیاو لەژنان جیادەكاتەوە، ڕێ لەتێكەڵی دەگرێ، ڕێ لەڕوانین‌و ئەوینبازیی – بۆ تێركردنی ئارەزوو – دەگرێ، بەكەس‌وكاری كچ‌وكوڕ فەرمان دەدات كە ئاسانكاری بكەن بۆیان‌و، زوو بەیەكیان بگەیەنن‌و ئەستەم‌و لەمپەڕ مەهێننە بەردەمیان، بروبیانوویان لێ مەگرن، لەدەوڵەت – بگرە لەژن‌و پیاوبەگشتیی داوا دەكات – كە لەلاوو جوانەكان بپرسێتەوە..) پاش ئەمانە هەموو، ئینجا تۆڵەی داناوە، جا ئەگەر دوای ئەو هەموو (ضمانات)ـە شتێكی وا ڕوویدا، هێشتای دەگەڕێ چارەسەرێك بۆ دەربازبوون لە تۆڵە بدۆزێتەوە، بۆیە پێغەمبەرمان (محمد–ﷺ) دەفەمووێ: ((إدرأوا الحدود عن المسلمين ماإستطعتم فإن كان له مخرج فخلّوا سبيله، فإن الإمام أن يخطيء في العفو خير من أن يخطيء في العقوبة)) ترمزي. واتە: هەتا دەتوانن ڕێ چارەسەرێك بدۆزنەوە بۆ ڕاگرتنی تۆڵە، ئەگەر ڕێی دەربازبوونتان چنگ كەوت، لە تۆڵە واز بێنن، چونكە پێشەوا (دادوەر) لە ئازادكردن و عەفوودا هەڵە بكات، گەلێ لەوە باشترە بەهەڵە تۆڵە بسێنێت، خۆ دەزانی پێغەمبەر ص لەگەڵ (ماعین)دا چەندە هەوڵیدا بۆ ئەوە تۆڵەی لێ نەسێنێ ! بەلام (ماعین) هەر سوور بوو لەسەر ئیقرارو بە زینا.

## بوختان بۆ ژنانی داوێنپاك

لەبـەر ئـەوە كـە كۆمەڵگـە لەكـەش‌و هەوایـەكی هـێمن‌و ئاسـوودەدا بـژێت، وەدوودڵـی‌و بەدگومانی تێدا نەبێ، وە هەموو كەسێك لە خێزان‌و هاوسەری خۆی دڵـی پـاك بـێ‌و، كەسـێك نـەتوانێ بەئاسـانی تۆمـەتباری بكـات، ئیـسلامی پـیروز هـات تۆڵـەی ئەوانـەی درۆو دەلەسـە هەڵدەبەستن‌و ژنانی داوێنپاك تۆمەتبار دەكەن، نزیك بە تۆڵەی كوڕوكچی زیناكار، تۆڵـەی بـۆ دانـان كـە: (٨٠) شـەلاق‌و پووچـەڵكردنەوەی شایەتییان بـە هەتاهـەتایی‌و، بـە فاسـقدانانیان، ئەمەیە كە خوای میهرەبان لە سوورەتی (نوور)دا دەفەرمووێ: ﴿والذين يرمون المحصنات ثم لم يـأتوا بأربعـة شـهداء فاجلـدوهم ثمـانين جلـدة ولاتقبلـوا لهـم شـهادة أبـدا وأولئـك هـم

الفاسـقون﴾. واتـه: ئـەو كەسـانەی ژنـەداوێن پـاك‌و بەحورمەتـەكان، تۆمـەتبار دەكـەن بـەزیناو شەڕواڵ پیسیی، پاشان بەچوار شایەتەوە نایـەن – بۆ چەسپاندنی داواكەیان – ئێوە ئەی موسڵمانان ! (٨٠)قامـچیان لێبدەن‌و هـەرگیز شـایەتیان وەرمـەگرن‌و بـەوەش لای خـوا دەبنـە فاسق‌و سنوور بەزێن، مەگەر تەوبە بكەن.

ئەمەیە دین‌و شەریعەتی ئابڕوپارێز، حیمایەتكەری ئوسرەو خێزان، بێگومان ئەگەر تۆڵـەی وا لـە بەرامبـەر تۆمەتبارانـەوە دانـەنێت، لەوانەیـە هـەر مرۆڤێكـی لارو لاسـارو ناحـەزی هـەر خێـزان‌و بنەماڵـەو هۆزێـك، هـەر كـات بیـەوێ ئـەو خێزانـە سـووك بكـات لای كۆمەڵگـەی پـاكی ئیسلامیی، بەئاسانی ئەوكارە ئەنجام بدات، بـەڵام كـەدەزانێ ئەگـەر (٤) شـایەتی لەگـەڵ نـەبێت، قسەكە لەسەر خۆی دەكـەوێت‌و مۆركی ناعەدالـەتی لـەڕووی دەدرێ‌و ئازاری جەسـتەیی (٨٠) شەلاق دەچێژێ، ئیتر وا بەو ئاسانیە ئەو كارەی بۆ ناكرێ‌و خۆی دەگرێتە دواوە.

## بوختان بۆ هاوسەر

تۆمەتباركردنی خێزان‌و هاوسەر بە زینا، كارێكی ئابڕوبەرترە، وەلەتۆمەتباركردنی ژنانی تـر بەگـشتیی درێـوترەو، بـەو ئاسانیـشە چـوار شـایەت پەیـدا نـاكرێن بـۆ بینـینی لـەكاتی ئەنجامـدانی كارەكـەدا، چونكە ئـەو جـۆرە شـتە حـەرام‌و قەدەغەكراوانـە، هەمیشە لـە شـوێنی پەنامـەكی ونادیـاردا دەكـرێن، لەبەرئـەوە حـوكمی تۆمـەتباركردنی هاوسـەر لـە ئیـسلامدا بـە سەخت تر گیراوە لە تۆمەتباركردنی ژنانی تر بەگشتیی، جا بۆ ئاگربەسـت لـە شـەرەف ژنـان‌و بۆ ئەوە هەركەس بەئارەزووی خۆی – هەركات ڕقی هەڵسا لە خێزانێك – نەتوانێ تۆمەتباری بكـات، چـوار شـایەتی داوا كـرد بـۆ چەسـپاندنی ئـەو داوایە،ئەگینـە خـۆی جەزرەبەوسـزا دەدرێـت، ئینجـا بـۆ خێـزان‌و هاوسـەریش – نـەوەك هـەركات ئـەو خێزانـەی نەویـست بـچێ بوختانێكی بۆ بكاو داوێن پیسی بكات، هات پەرژینێكی پۆڵایـەنی ژنەكەی كرد، خۆ ئەگەر ئەو مێردە هەر گوێی نەداو تۆمەتباری كرد، دەبێ نەحلەت لە خۆی بكاو چوار جار ئەشهەدو بالله بكێشێ كە: ڕاست دەكاو، نەحلـەت لـەخۆی بكـا ئـەگەر درۆ بكـات، پاشـانیش ڕێگـایشی بۆ ژنەكە هێشتۆتەوە تا بتوانێ ئەگەر بییەوێ بەرگری لـەخۆی بكـات... جا بـۆ ئەمـە دەچینـە خزمـەتی ئایـەتی (٦-٩)ـی سـوورەتی (نوور) كـە دەفەرمووێ: ﴿والـذین یرمـون أزواجهـم ولم یكن لهم شهداء إلا أنفسهم فشهادة أحدهم أربع شهادات بالله إنه لمن الـصادقین. والخامـسة أنّ لعنة الله علیه إن كـان مـن الكـاذبین. ویـدرأ عنهـا العـذاب أنْ تـشهد أربـع شـهادات بـالله إنـهُ لمـن الكاذبین. والخامسةَ أنَّ غـضَبَ الله علیها إن كـان مـن الـصادقین﴾ ٦-٩. واتـە: ئەوكەسـانە بـۆ

ژنەکانیان بوختـان دەکەن‌و – جگـە لـە خۆیـشیان – شایەتیان نیە، دەبیٚ هەریەکەیان چوار جار ئەشهەدو باللە بکێشیٚ کە ڕاست دەکات، بۆ کەڕەتی پێنجەم: نەحلەت لەخۆی بکات ئەگەر درۆ بکات. ئەمە سەبارەت بە پیاوە بوختانکەرەکە، ئینجا ژنەکەش دەتوانیٚ ئەو سزایە (بـەردەباران) لـەخۆی دوور بخاتـەوە بـەوە کـە چـوار جـار ئەشـهەدو باللـە بکێـشیٚ کـە: ئـەو پیاوەی درۆی کردووە، بۆ کەڕەتی پێنجەم: بڵیٚ غەزەب‌و توڕەیی خوام لەسەر بێت، ئەگەر ئەو پیاوە ڕاست بکات. ئا بەم شێوەیە ئەوکێشەیە کۆتایی پیٚ دیٚ‌و، ژنەکـەش بەهەتاهـەتایی لەمێردەکـەی حـەرام دەبیٚ – ئەگـەر دووگیـانیش بـوو – منداڵەکـە هـی خۆیـەتی و، نـادریٚ بـە پیاوەکە، وەبەیاسای میرات، لەیەکتر میرات دەبەن.

لە (بوخاریی)دا هاتووە: (٤٧٤٥) کە (سەهلی کوڕی سـەعد) گـوتی: (عووەیمر) چـووە لای (عاصـیمی کـوڕی عـەدیی – گـەورەی بـەنی عـەجلان – وتـی: سـەبارەت بـە پیاوێـك کابرایـەك ببـینیٚ‌و لەگـەڵ ژنەکـەی و کـاری بـیٚ شـەرعیی لەگـەڵ بکـات، ئـەمیش بیکـوژیٚ، ئایـائێوە ئـەو بکـوژە دەکوژنـەوە؟ یـان چـی بکـات؟ لەپێغەمبـەر ﷺ پرسـیارم بـۆ بکـە، (عاصـیم چـووە لای پێغەمبــەر ﷺ و پرســیارەکەی لێکــرد، ئــەویش ﷺ لــە پرســیارەکە بێتاقــەت بــوو، پاشــان (عووەیمر) لە عاصیمی پرسیار کردەوە؟ ئەویش گـوتی: پێغەمبـەری خـوا ﷺ حـەز بـەو جـۆرە پرسـیارانە ناکـات، عـووەیمر گـوتی: سـوێند بـەخوا واز نـاهێنم هـەتا لـە پێغەمبـەر نەپرسـم‌و وەڵامێــك وەرنــەگرم، هەمیــسان عــووەیمر هاتــەوەو پرســیارەکەی لــە پێغەمبــەر ﷺ دووبارەکردەوە، ئەویش ﷺ فەرمووی: بەڕاستی خوا سەبارەت بەخۆت‌و خێزانەکەت قورئـانی دابەزاندو بڕیاری دا، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی قورئانەکـەی لەسـەر پیـادە کـردن، ئـەویش نەحلەتەکەی کردو پاشان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! بەڕاستی ئەگەر ئەو ژنە بـەو شـێوەیە ڕاگرم، ستەمی لێدەکەم، ئیتر تـەڵاقی داو، ئەو شـێوەیەش بـوو بـە حوکم‌و یاسا بۆ خـەڵکانی دوای ئـەوان. پاشـان پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: تەماشـا بکـەن، ئەگـەر منداڵەکـەی ڕەشـێکی چـاوڕەش و،نەرمــەی لاڕانــی گــەورە بــوو، وادەزانم (عــووەیمر) ڕاســت بــووە، خــۆ ئەگــەر سوورەیەکی گچکەبوو، پێم وایە درۆی کردووەو (بوختـان بـووە) پاشـان کـە منداڵەکـە لـەدایك بوو، لە (عووەیمر)ی نەکرد.

ئەمەیش دەقی فەرموودەکەیە: (عن سهل بن سعدأن عويمرا أتـى عاصـم بـن عـديّ – وكـان سيد بني عجلان – فقال: كيف تقولـون فـي رجـل وجـد مـع امرأتـه رجـلاً، أيقتلـهُ فتقتلونـه، أم كيف يصنع؟ سل لي رسول الله ﷺ عن ذلك. فأتى عاصم النبي ﷺ فقال: يارسول الله. فكـره رسول الله ﷺ المسائل، فسألهُ عويمر، فقال: إن رسول الله ﷺ كره المسائل وعابها قال عويمر:

والله لا أنتهي حتى أسئل رسول الله ﷺ عن ذلك. فجاء عويمر فقال: يارسول الله، رجل وجد مع امرأته رجلا، أيقتله فتقتلونه، أم كيف يصنع ؟ فقال رسول الله ﷺ: قد أنزل الله القرآن فيك وفي صاحبتك. فأمرهما رسول الله ﷺ بالملاعنة بما سمّي الله في كتابه فلاعنها ثم قال: يارسول الله، إن حَبَستها فقد ظلمتها، فطلقها، فكانت سنة لمن كان بعدهما في المتلاعنين. ثم قال رسول الله ﷺ: انظروا، فإن جاءت به أسْحَمَ أدْعَجَ العينين عظيم الإليتين خَدلّج الساقين فلا أحسب عويرا إلا أن قد صدق عليها. وأن جاءت به أُحَيْمرَ كأنهُ، وَحَرة فلا أحسبُ عويمراً إلا قد كذب عليها. فجاءت به على النعت الذي نعت رسول الله ﷺ من تصديق عويمر، فكان بعد يُنسَبُ الى أمه)).

**تێبینی:** ئیمامی (نەواویی) لە شەرحی (موسلیم)دا دەڵێت: زاناکان لە جیابوونەوەی ژنوپیاو (بە شێوەی مولاعە) قسەیان جیاوازە: (ئیمامی مالیكو ئیمامی شافیعیو جەماوەری زانایان دەڵێن: هەر بەنەحلەت کردنە (ملاعنە)کە ژنوپیاوەکە بەهەتاهەتایی لەیەك حەرام دەبنو پێویست بەتەڵاقدان ناکات، بەڵام ئیمامی شافیعی (هەروا هێندێ لە مالیکیەکانیش) دەلێێن: هەر بە (مولاعەنە)ی مێردەکە، ژنەکە حەرام دەبێ. (ئەبوو حەنیفە) دەڵێ: پاش (لیعان) دەبێ دادوەر بڕیاری جیابوونەوەیان بدات، هەرچەند جەماوەری زانایان گووتویانە: بڕیاری دادوەری ناوێ بۆ جیابوونەوە.

مەسەلەی زیناو شەڕواڵ پیسی لە ئیسلامدا بەو شێوەیە بووبە کورتیی باسکرا، لەوە بەولاوە هەر کارێکی تر بەرامبەر بە زیناکاران بکرێ، بەبڕیارو حوکمی ئیسلام نییە، بۆ نموونە، ئەگەر برا، یان باوك، یان هەر کەسێکی دی ژن، ئافرەتەکەی لەگەڵ نامەحرەمێکدا دیت، هەرگیز بەو دیتنە بۆی نیە هیچ کامێکیان بکوژێ، چونکە دیتنیان پێکەوە، مانای ڕوودانی ئەو کارە دزێوە نییە، تەنانەتی ئەگەر بەچاوی خۆی بینی خەریکی ئەو کارە بوون، هەر بۆی نیە بیانکوژن، چونکە ئەگەر کچوکوڕ بن، تۆڵەکەیان قامچیو شەلاقە، نەك کوشتن، ئەگەر ژنوپیاویش بن، دەبێ یان خۆیان ئیقرار بکەن بەزینا، یان دەبێ چوار شایەت هەبێ بۆ چەسپاندنی زیناکەو تۆڵەکەی، ئەوسا (ڕەجم) دەکرێن،وەدەبێ ئەو کارانە هەموو بگێڕنەوە بۆ دەسەڵاتدارانی موسڵمانان، دەبێ ئەوان حوکمو تۆڵەکە جێبەجێ بکەن..... ئیتر (غسل العار) واتە: کوشتن بۆ شتنەوەی عەیبوعار لەنامووس – بێ ئیسپاتی شەرعیی – لەئیسلامدا ڕێی پێ نەدراوە.

هیوادارم نەیارانو ناحەزانی ئیسلام بەوردو چاوی عەدالەتەوە سەیری ئەم مەسەلەیە بکەن.پێویستە لەم جێگایەدا پەنجە بۆ ئەو ڕاستییە ڕاکێشین وبڵێین کە کچوکوڕ، یان بڵێین

ژن‌وپیاو بۆ تۆڵە وەرگرتن لێیان فەرقێکیان نییە، ئەگەر سەرکۆنەو سەرزەنشتی کچەکە بکرێ، وەیان حاڵەتێکی تری بەرامبەر بکرێ، هەقە بەرامبەر کوڕەکەش، یان پیاوەکەش بکرێ، بەداخەوە ئەمەکە ئێستا لەناو کۆمەڵگەی کوردەواریدا هەیەو خووی پێوە گیراوە بۆ نموونە: بەردەبنە گیانی کچەکە، کەچی کوڕەکە لەگوڵ کاڵتری پێ ناوترێ ! لە هیچ شەریعەتێکی ئاسمانیدا نییە، بەپێچەوانەوەدەبێ هەردوو (نێرومێ) وەکویەك تەماشا بکرێن، ئەم ڕاستیەش لە ئایەت‌و فەرموودەکاندا بەڕاشکاوی دەبینرێ‌و لەچەرخی پێغەمبەرو خەلیفەکاندا کاری پێکراوە.

سەرەڕای ئەمەش بەکارهێنانی تۆڵە شتێك نییە، بێ خولقاندنی کەش‌و هەوای پاك بۆ (نێرومێ)و ئاسانکاری بۆ بەیەك گەیاندنیان دانرابێ، نەخێر، بەڵکو بەر لە هەموو شتێك داوا لەباوك‌و کەس‌وکاریان، ئینجا دەوڵەت‌و کاربەدەستان دەکات کە: لەکاتی خۆیدا ئەو نێرو مێیانە بەیەك بگەیەنن و گرێ و لەمپەریان بۆ دروست نەکەن، واتە: هەر کچ و کوڕ بەیەك ڕازی بن و خاوەن دین و ئەخلاق بن، بۆ ئەو مەسەلەیە بەسە، ئیتر بیانووی ماڵ‌و خانووبەرەو خوێندن‌و بڕوانامەو ئۆتۆمبێلی مۆدێرن و، لە شەریعەتی ئیسلامدا ئەمانە جێیان نیەو نابێ بکرێنە ئەستەمێك لەبەردەم ژن‌وپیاودا، وەمەسەلەی خاڵیکردنەوەی هێزی سێکس بۆ کچ‌وکوڕ بەشێوەی شەرعیی، خوای میهرەبان خۆی نێرو مێ‌ی دروستکردووە، خۆیشی بەو شێوەیە درووستیکردوون کە بگەنە یەك‌و (نەسل)ونەوەیان لێ بکەوێتەوەو درێژە بەژیان بدرێ.

## داستانی بوختانەکە بۆ خاتوو عایشە! خوا لێی ڕازی بێت

دوای باسکردنی بوختان وتۆڵەی بۆختان بەشێوەیەکی گشتیی، پاشان بە شێوەیەکی تایبەتی بۆ هاوسەرو خێزان، ئێستا نموونەی سەخترین بوختان لە مێژووی موسڵمانانندا دێنێتەوە، بوختان بۆ ماڵە پاکە بەرزەکەی پێغەمبەر ﷺ بوختان بۆ (عیرض) و شەرەفی پێغەمبەر ﷺ کەلای خوا زۆر بەرز وبڵوندە، بۆختان بۆ (عیرض)و شەرەفی (صدّیق)ی یارو هاوڕێی پێغەمبەر ﷺ کەلەلای پێغەمبەر ﷺ لەهەموو کەسێك بەڕێزترە، بوختان بۆ هاوەڵێکی پێغەمبەر ﷺ (صفوان بن المعطل) کە پێغەمبەر جگە لە خێرو چاکە شتێکی دی لێ نەدیتووە... بۆختانێکی گەورەو سەختی وابوو، یەك مانگی ڕەبەق بوویە مایەی ناڕەحەتی‌و بێتاقەتی موسڵمانەکان لە مەدینەدا، یەك مانگ دڵە گەورە پیرۆزەکەی پێغەمبەری ﷺ ئازاردا، یەك مانگ دڵە چاکەکەی (ئەبووبەکر)و دڵە خێرخوازەکەی خاتوو (عایشە)و دڵە بەرزەکەی (صەفوان) لە قەلەق‌و ئێش‌و ئازاردا بوون !

دەسا باھەموو بچینە خزمەتی خاتوو (عایشە)و پێکەوەگوێی بۆ بگرین‌و، لەسەرەتاوە تاکۆتایی بۆمانی بگێڕێتەوە.

خاتوو عایشە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ھەر کە خەیاڵی سەفەرێکی دەکرد، تیروپشکی بۆ خێزانەکانی دەکرد، ھەرکامێکیان ناوی دەرچووبا لەگەڵ خۆی دەیبرد، جا لەخەزایەکدا – غەزوەی (بنی المصطلق) کە ساڵی پێنجەمی کۆچی ڕوویدا – تیروپشکی کردو ناوی من دەرچوو، پاشان – ئەلبەت دوای ھاتنی ئایەتی حیجاب بوو – لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەرچووین، شیاوی باسە من بەتەنیا لەناو کەژاوەیەکدا سوار ببووم، ڕۆیشتین تا پێغەمبەر ﷺ لەخەزاکە بوویەوەو گەڕایەوە جا کاتێ بە (مەدینە) نزیك بووینەوە، شەوێك ڕایگەیاند کە سوپاو کاروانەکە بکەوێتە ڕێگا، ئەو حەلە منیش بۆ پێویستی خۆم کەمێك لە سوپاکە دوورەوەکەوتم و، ئینجاپاش ئەنجامدانی کارەکەم، گەڕامەوەو دەستم بەرسنگم کەوت، زانیم کە ملوانکە (یەمەن)یەکەم لە گەردنمدا نەماوە ! ئیتر بە ناچاری بۆی گەڕامەوەو کەمێك دواکەوتم، تەمەسە ھەر دوای من سوپاکە بەڕێ دەکەوێ و دەڕوا، ئەوانەش لەگەڵ کەژاوەکەی مندان، کەژاوەکە ھەڵدەگرن‌و وادەزانن منی تێدایەو دەیخەنە سەر وشتر – ژنانی ئەو کاتە لەڕولاواز بوون و خواردنێکی کەمیان دەخوارد – کاتێکیش کەژاوەکەیان ھەڵگرت، ھەستیان بەھیچ نەکرد (ئاخۆ کەسێکی تێدایە، یا نا؟) منیش کیژێکی لاو بووم، وشتریان لێخوڕی‌و ڕۆیشتن، پاش ماوەیەك لەگەڕان، ئەوجا ملوانکەکەم دۆزیەوە، کەھاتمەوە بۆ سەربازگەکە، دەبینم نەدەنگ ھەیە نەڕەنگ، منیش ھەر لەو جێگایە تێیدابووم مامەوە، دەمزانی ھەواڵم دەزانن‌و دەگەڕێنەوە بەدوامدا. ئەوەبوو کەماوەیەك دانیشتم، خەو بردمیەوەو بۆ خۆم خەوتم. (صەفوان)یش پشوویەکی دابوو کەوتبوویە دوای لەشکرەکەو شەو درەنگانێك جووڵاو ڕێی لە جێگاکەی من کەوت، لەدوورەوە تارمایی مرۆڤێکی خەوتووی دیت، نزیکبوویەوەو ناسیمی، چونکە پێش ھاتنی ئایەتی حیجاب دیتبوومی، منیش بەدەنگ گوتنی (إنا لله وإنا إليه راجعون)ی ئەوەوە خەبەرم بویەوە، ئیتر بەچارشێوەکەم دەم و چاوم داپۆشی، سوێند بەخوا تەنیا وشەیەکیشی لەگەڵ نەوتم‌و، جگە لە (إنا لله.....) ھیچیشم لێ نەبیست، ئینجا وشترەکەی پخ کردو منیش سوار بووم‌و، ئەویش حیلەوی ڕاکێشاو ڕۆیشتین ھەتا لەگەڵ قرچەی نیوەڕۆدا گەیشتینەوە پێیان. ئینجا تیاچوو ئەوی تیاچوو سەبارەت بەقسەوقسەلۆك دەربارەی من، بەسەرۆکایەتی (عبداللە کوڕی سەلوول). جا کە گەیشتمە مەدینە –لەحەسرەتدا– یەك مانگ نەخۆش کەوتم، خەڵکیش ھەر لە بوختانەکە دەدوان‌و بوو بوویە ڕازو نیازیان، ئەگەرچی لەئێش‌و ئازاری خۆمدا ھیچیم لەبیر نەما بوو،

بەلاّم هەستم دەکرد کە پێغەمبەر ﷺ میهرەبانیەکەی جارانی لە گەڵم نەماوە! چونکە کە جاران نەخۆش دەکەوتم و سەردانی دەکردم زۆر بە میهرەبان بوو، بەلاّم ئیستا وانەمابوو، تەنانەتی کە دەهات بۆ سەردانم سەلامی دەکردو بیٚ ناو هێنانم هەواڵ پرسیی لێدەکردم، بۆیە ئەوە پتر گومانی بۆ دروست کردم، ئەگەرچی هەستم بەشتی خراپ نەدەکرد روویدابیٚ، تا چاك بوومەوەو لەگەڵ (ئوم میسطە ح) پێکەوە چووینە دەرەوەی (مەدینە) بۆ دەست بەئاو گەیاندن – کەهەر شەواو شەو دەچووین – چونکە هێمان لە نزیك ماڵەوە جێگەی (ئەدەب)مان دروست نەکردبوو، وەئێمەش هەر بە عادەتی عەرەبی پێشوومان دەکرد، لەماڵیشەوە نەدەکرا (ئەدەب) دروست بکەین، لەبەر ناتەمیزیو شتی وا، جا منو (ئوم میستەح – پووری ئەبووبەکری صدیقو دایکی میستەح) چووین، لەکاتی ڕۆشتندا قاچی لە کراسەکەی هەڵکەوتو گوتی: میستەح ! یاخوا خێر نەیەتە ڕێت ! منیش پێمگوت: زۆر خراپت گوت بە میستەح، چۆن بە پیاوێك قسە دەڵێیت ئامادەی (بەدر) بووە؟ ئەویش گوتی: ئەی کەم سەلیقە، مەگەر نەت بیستووە چی دەڵێن ؟! ئەوسا دەنگو باسەکەی (ئەهلی ئیفك)ی بۆ گێڕامەوە، ئیترمنیش پتر نەخۆشکەوتم و لەش بەبار بووم، ئینجا کەگەڕامەوە بۆ ماڵ، پێغەمبەر ﷺ وەك جاری پێشوو سەلامێکی کردو جۆرە هەواڵپرسییەکی لێکردم ! منیش گوتم: مۆڵەتم بدە دەچمەوە بۆ لای دایكوباوکم – ویستم ئەو هەواڵە لای ئەوان هەڵسەنگێنم – پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی دامو چوومەوە، ئینجا بەدایکم گوت: ئەو هەواڵە چیە کەوتۆتە دەمی خەڵك ؟ گوتی: کچۆڵەکەم ! ئەوقسەیە زۆر بەکەم سەیر بکە، سوێندم بەخوا کەم ڕێکدەویٚ ئافرەتێکی جوانی هەوێدارو خۆشەویست لای مێردەکەی قسەی هەمەجۆرەی لەسەرنەکرێت، گوتم: سبحان اللە ! هەر بەڕاستی مەردم ئەو بوختانە باس دەکەن؟ خاتوو عایشە دەڵیٚ: ئەو شەوە تا بەیانی فرمێسك لەچاوم نەوەستاو، خەویش لەچاوم نەچوو، جا بۆ بەیانیەکەی پێغەمبەر ﷺ (عەلی کوڕی ئەبوتالیب)و (ئوسامەی کوڕی زەید)ی بانگکردو داوای لیٚ کردن چی بکریٚ باشە؟ چونکە ئەوماوە (وەحی) نەهات،(ئوسامە) گوتی: سوێند بەخوا خێروچاکە نەبیٚ بەرامبەر بەخێزانت شتێکی تر نازانم ئەی پێغەمبەری خوا !. (عەلی)یش گوتی: خۆ خودا دەرگای لیٚ دانەخستوویت ئەی پێغەمبەر ! ژنانی تر زۆرن. (ئیمامی نەوەوی دەڵێت: ئەم قسەیە، بۆ پێغەمبەر ﷺ پڕبوو لە خێرو بەرژەوەندی، چونکە زۆر لە قۆناغەکە بێتاقەت بوو، ویستی لەو قەلەقە ڕزگاری بکات، ئەگینە لەدلاّ دەیزانی کە خاتوو (عایشە) زۆر پاکە). وە لەجاریەکەی بەردەستیشی بپرسە، چونکە ئەو هەموو شتێك دەزانیٚ، پێغەمبەریش ﷺ (بەریرە)ی کەنیزەکی بانگکردو فەرمووی: ئایاتا ئێستا تۆ شتێکت

له عايشه ديتووه بتخاته گومانه‌وه؟ (به‌ريره) گوتی: نه‌خێر، سوێند به‌وه‌ی تۆی كردووه به پێغه‌مبه‌ر ﷺ تا ئێستا شتێكم لێ نه‌ديتووه له‌نگ‌و نه‌نگ بێت، ئه‌ونده نه‌بێ كه كيژۆڵه‌يه‌كی منداڵه، له‌كاتی نان كردندا خه‌وی لێده‌كه‌وێ‌و مه‌ڕو ماڵات دێن هه‌ويره‌كه‌ی ده‌خۆن، واته: هيچ عه‌يب‌و ناته‌واوييه‌كی تێدا نيه، ئه‌مه نه‌بێ، ئه‌گه‌ر به‌عه‌يب دابنرێت. ئينجا پێغه‌مبه‌ر ﷺ هه‌ر ئه‌و رۆژه داوای له موسڵمانان كرد كه: له ده‌م وزمانی (عه‌بدالله‌ی كوڕی سه‌لوول) رزگاری بكه‌ن، وه فه‌رمووی: كێ عوزرم قبوولْ ده‌كات به‌رامبه‌ر به‌كه‌سێك كه‌ئه‌و ئازارو بێزاره‌ی دام ده‌رباره‌ی خێزانه‌كه‌م؟ واته: ئه‌گه‌ر تۆڵه درا، كه‌سێك لۆمه‌م نه‌كات، به‌خوا سوێند، خێرو چاكه نه‌بێ، شتێكم نه‌زانيوه به‌رامبه‌ر خێزانم، باسی پياوێك ده‌كه‌ن، سوێند به‌خوا، خێر نه‌بێ هيچم لێ نه‌ديتووه، وه‌له‌گه‌ڵ خۆم نه‌بێ نه‌هاتۆته ماڵم. (سه‌عدی كوڕی موعاز) هه‌ڵساو گوتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ! سوێند به‌خوا من عوزرت قه‌بوولْ ده‌كه‌م. ئه‌گه‌ر ئه‌مر بكه‌يت تۆڵه‌ی ده‌ده‌ين، ئه‌ر له (ئه‌وس) بێت له گه‌ردنی ده‌ده‌ين، ئه‌گه‌ر له برايانی (خه‌زره‌ج)يشمان بێت، بفه‌رموو فه‌رمانت جێبه‌جێ ده‌كه‌ين، ئه‌و رۆژه فرمێسك له چاوم نه‌وه‌ستاو، خه‌ويش له‌چاوم نه‌چوو، باوك‌و دايكيشم هه‌ر له‌لام بوون به‌جێيان نه‌هێشتم، ئه‌و شه‌ووڕۆژه ئه‌وه‌نده گريام گوتم جه‌رگم له‌ت بووه. له‌م ده‌مه‌دا ژنێكی (ئه‌نصار)يش مۆڵه‌تی خواست‌و هاته ژووره‌وه ئه‌ويش له‌گه‌ڵم ده‌ستی كرده گريان، پاشان پێغه‌مبه‌ر ﷺ هاته ژووره‌وه‌و دانيشت – كه به‌ڕاستی له‌و رۆژه‌وه ئه‌و ده‌نگ‌و باسه سه‌ری هه‌ڵدابوو، دانه‌نيشتبوو له‌لام، مانگێكيش تێپه‌ڕی هيچ (وه‌حی)يه‌ك له‌باره‌ی منه‌وه نه‌هات، پێغه‌مبه‌ر ﷺ پاش (الحمد لله‌و شايه‌تی به‌تاك‌و ته‌نيايی خوا) فه‌رمووی: عائيشه ! خۆ ده‌زانی ئه‌و قسه‌وباسه‌م پێگه‌يشتووه، جائه‌گه‌ر پاك بيت، خوا پاكانت بۆ ده‌كات، وه‌ئه‌گه‌ر تاوانێكت كردبێت، له‌خواداوا بكه لێت خۆش ببێت، چونكه ئه‌گه‌ر به‌نده ئيعتيراف به‌تاوانی خۆی بكاو ته‌وبه بكات، خوا لێی ده‌پۆشێ. جاكه پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌قسه‌كه‌ی بوويه‌وه – ئه‌وه‌ند سه‌خت بوو له‌لام – فرمێسك به‌چاومه‌وه قه‌تيسما، ئينجا به‌باوكم گوت: تۆ وه‌ڵامی پێغه‌مبه‌ر ﷺ بده‌وه، ئه‌ويش گوتی: سوێند به‌خوا منيش زياد له‌وه ئێوه ده‌يزانن – نازانم چی پێ بڵێم. به‌دايكم گوت: ده‌سا تۆ له باتی من وه‌ڵامی پێغه‌مبه‌ر ﷺ بده‌وه، گوتی: سوێند به‌خوا نازانم چی وه‌ڵام بده‌مه‌وه. ده‌ڵێ گوتم: خۆ من كيژێكی لاوی ته‌مه‌ن كه‌مم‌و ئه‌وه‌ند قورئانم له‌به‌رنيه... سوێند به‌خوا بێ، بێگومان ده‌زانم كه‌ئه‌و قسه‌و باسه‌يه‌تان بيستووه له‌ده‌م خه‌ڵكدايه‌و ده‌شزانم له دڵتاندا ئوقره‌ی گرتووه‌و باوه‌ڕتان كردووه، خۆ ئێستا ئه‌گه‌ر بڵێم دڵنيا بن من به‌ريم – كه‌خواش چاك ده‌زانێ به‌ريم – ئێوه باوه‌ڕم پێناكه‌ن ! خۆ ئه‌گه‌ر

ئیعتراف بەشتێ بکەم – کە خوا دەزانێ بەریم لێی – باوەڕ دەکەن ! سوێند بەخوا منیش هەر قسەکەی باوکی یوسف (یەعقووب) دەڵێم: ((فصبر جمیل والله المستعان علی ماتصفون) (یوسف: ١٨) پاشان لەسەر نوێنەکەم وەرچەرخام و لەخوام دەخواست تەبریئەم بکات، بەڵام هەرگیز باوەڕم نەدەکرد خوا بۆ پاکانەی من وەحی بنێرێت، چونکە خۆم زۆر بەکەمتر لەوە دادەنا قورئان لەشانی مندا بێتە خوارێ، بەڵام هیوام بوو پێغەمبەر ﷺ لەخەوا تەبریئەی منی نیشان بدرێت. سوێند بەخوا پێغەمبەر ﷺ لەو شوێنەی هەڵنەساو، هیچ کەسێکیش لەوماڵەدا لەجێی خۆی نەچوویەدەر، تا وەحی دابەزیە سەر پێغەمبەرو تووشی سەختی وەحیەکە بوو، وەك جاران کەوەحی بۆ دەهات ناڕەحەت دەبوو. تەنانەتی لە ڕۆژێکی سەختی زستاندا دڵۆپە عارەق – وەکو مرواری بێگەرد – لەناو چاویا دەڕژایە خوارێ.

ئینجا کە ئەو بێتاقەتی وناڕەحەتییەی پێغەمبەر ﷺ نەماوکەوتە کەنین و یەکەم قسە کردی، پێی گوتم، ئەی عایشە ! سوپاسی خوا بکە، ئەوا تەبریئەی کردیت، ئینجا دایکم پێی گوتم: هەستە سوپاسی پێغەمبەر بکە، گوتم: سوێند بەخوا هەڵناسم و جگە لەخواش سوپاسی کەس ناکەم. ئەوسا خوا فەرمووی: ﴿إن الذین جاؤوا بالإفك عصبة منکم...﴾ (نوور: ١١) جا کە خوا ئەم پاکانەیەی بۆ کردم، باوکم (ئەبووبەکر –خ –) کەجاران (میستەحی بەخێو دەکرد – سوێندی خوارد: ئیتر دوای ئەو قسەیە کە هەڵیبەست بۆ عایشە، بەخێوی ناکەم، ئەوجا خوا فەرمووی: ﴿ولایأتل أولوا الفضل منکم والسعة أن یؤتوا....﴾ تا ﴿غفور رحیم﴾. ئەبووبەکر گوتی: بەڵێ... سوێند بەخوا حەزدەکەم لێم ببووریت، ئیتر گەڕایەوە سەرباری پێشووی بۆ بەخێوکردنی (میستەح).

پێغەمبەر ﷺ لە (زەینەب)یشی پرسیار دەکرد: ئاخۆ شتێکی بیستووە، یان دیتووە ؟ زەینەبیش دەیگووت: ئەی پێغەمبەری خوا ! گوێ و چاوم دەپارێزم، واتە هیچم نەبیستووەو، هیچیشم نەدیتووە. عایشە گوتی: خۆ ئەگەر بڵێ: زەینەب کاتی خۆی شانی لەشانم دەداو خۆی هەڵدەکێشا بە جوانیەکەی، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا خوا پاراستی و خۆی نەخستە ناو ئەو هەواو گوناحانەوە، بەڵام (حەمنە)ی خوشکی زەینەب خۆی خستە ناو ئەو داوەوەو بەهیلاك چوو.

ئەمە کۆتایی ئەو داستانەبوو، بۆ خاتوو عایشە چنراو هەڵبەسترا. (دەتوانی تەماشای ئەم سەرچاوانە بکەیت: (مسند احمد/١٩٤-١٩٧، فتح الباری: کتاب الشهادات ٢٦٦١/٥. ومسلم: کتاب التوبە:٤/ و سیرە إبن هشام).

ئیمامی (نەواویی) دەڵێت: تەبریئەی خاتوو (عایشە) بەدەقی قورئانی پیرۆز کراوە، بۆیە

ئەگەر کەسێك گومانی لەو مەسەلەدا هەبێ – پەنا بەخوا – بەکۆی دەنگی موسڵمانان.کافر دەبێ‌و بەمورتەد دادەنرێ.(ئیبن عەباس)و چەند زانایەکی تر دەڵێن: (لم تزن امرأة نبیّ من الأنبیاء صلوات الله وسلام علیهم أجمعین). واتە: ژنی هیچ پێغەمبەرێك زیناکار نەبووە.

**خوێنەری هێژا** ! لەهەموو سەردەمێکدا کۆمەڵە مرۆڤێکی نەفس نزم، سەری ژەهراوییان بەرز دەکەنەوە، بەخەیاڵی خاوی خۆیان دەیانەوێ ئەو ماڵە ڕەوش بەرزە ناشیرین‌و لیخن بکەن، دەیانەوێ قەڵای قییەم‌و ئەخلاق بڕوخێنن ! بۆیە لەم دواییەشدا کۆمەڵە قەڵەمێکی ژەهراوی خۆفرۆش‌و، دوور لە هەموو ڕەوشتێکی مرۆڤایەتی، هێرشێکی بێ وێنەیان کردە سەر تەواوی ئیسلام‌و بەها پیرۆزەکانی ئیسلام‌و پێغەمبەران‌و خێزان‌و هاوسەرەکانیان‌و – بەداخەوە – لەلایەنی حکومەتی هەرێمی کوردستانیشەوە خەڵاتی نووسەرەکەی کرا ! خوای کارجوان‌و کارزان دەفەرمووێ ﴿إن الذین یرمون المحصنات الغافلات المؤمنات لعنوا فی الدنیا والآخرة ولهم عذاب عظیم﴾ ٢٣/٢٤ واتە: ئەوکەسانە بۆ ژنانی داوێنپاکی بێ ئاگای ئیماندار بوختان دەکەن، لە دنیاو لە قیامەت نەحلەت لێکراون، جەزرەبەشیان ئێجگار گەورەو دژوارە. دیارە ئەم دیفاع‌و بەرەوانیە بۆ گشت ئەو ژنانەیە ئەو صیفەتەیان هەبێت، بەتایبەتی خاتوو (عایشە – خ) کەهۆکاری هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە بوو. (ئیبن کەسیر) دەڵێت: (وقد أجمع العلماء – رحمهم الله – قاطبة علی أن من سبّها بعد هذا ورماها بما رماها بعد هذا الذی ذکر فی هذه الآیة، فإنه کافر، لأنه معاند للقرآن، وکذا الحکم فی جمیع أمهات المؤمنین). پێغەمبەریشمان محمد ﷺ دەفەرمووێ: ((إجتنبوا السبع الموبقات)) واتە: لەو حەوت شتە بەهیلاك بەرانەوە دوور بن. پێیانگوت ئەوانە چین؟ ئەی پێغەمبەری خوا ! فەرمووی: ((الشرك بالله، والسحرُ، وقتل النفس التی حرّم الله إلا بالحق، وأکلُ الربا، وأکلُ مال الیتیم، والتولّی یوم الزحف، وقذف المحصنات الغافلات المؤمنات)) متفق علیه. واتە شەریك دانان بۆ خوا، جادوو، کوشتنی مرۆڤ بەناحەق،سوود خواردن، خواردنی ماڵی هەتیو، هەڵهاتن ڕۆژی هێرشی کافران، بوختان بۆ ژنانی ئیمانداری داوێنپاکی دوورەئاگا. مرۆڤی پاك – ژن، یان پیاو – لای ئیسلام بەڕێزو خاوەن حورمەتە، هەربەیەکیش شیاون ژن‌ومێردی بکەن، ژن‌وپیاوی داوێن تەڕیش هەر بۆ یەك شایەستن، دیارە خاتوو (عایشە– خ) پاکە، بۆیە لای پێغەمبەرەﷺ. واتە (عایشە) خاوێن نەبووبا، بۆ پێغەمبەر ﷺ نەدەشیا، کەوابوو پاك‌و بێ عەیبە بۆیە لای پێغەمبەرە ﷺ.

## جل و بەرگی باڵا پۆش ( حیجاب )

پاراستنی ئەخلاق و قییەمی کۆمەڵگەی خاوەن ئەخلاق، یەکێکە لەو شتە زۆر گرنگانە کە دیـنی ئیـسلام زۆر بایـەخی دەداتـێ، تەنانـەتی خـوای میهرەبـان هـەموو صـیفەتەکانی پێغەمبـەرمان (محمـد ــ ﷺ) کورت دەکاتـەوە لـەم ئایەتـەداو دەفـەرمووێ: ﴿وإنـك لعلـى خلـق عظيم﴾ واتە: بێگومان تۆ ئەی پێغەمبەر! خلوق و ڕەوشتت گەورەو مەزنە، لەمامەڵەو کڕین و فرۆشتندا، لەئاشتیی و لە جەنگدا، لەپەیداکردنی ماڵ و ساماندا، لەپەیمان و پەیماننامەدا، لەگەڵ دۆست و دوژمندا، لەگەڵ دیندارو بێ دیندا، لەگەڵ خێزان و هاوسەردا.

ئیسلام زۆر لە لای مەبەستە کە (نێرومێ)ی ژن و پیاو، لەکاتی خۆیدا بەیەك بگەیەنرێن، پـێش ئـەوە (فاسـید) بـبن، پـێش ئـەوە کۆمەڵگـە پـیس ببـێ، بڕیاریـداوە کـە هـەر کچ وکوڕێك بەکەڵك بێـت پێکـەوە بـژین، نـابێ لەلایـەن بـاوك و دایـك و بـراو کـەس وکاریانـەوە ڕێیـان لـێ بگـیردرێ، هـەر لـە بـەر ئەوەیـشە فەرمانـدەدا کـە پێغەمبـەر ﷺ بـە ئیمانـداران بفـەرموێ: ﴿قـل للمؤمنين يغضوا من أبصارهم ويحفظوا فروجهم ذلك أزكى لهم إن الله خبير بما يصنعون﴾ ٣٠/٢٤. دەبێ چاویان لە ئاستی ژنانی نامەحرەم دابخەن، تەماشایان نەکەن و عەورەتیشیان لە ئاستی هەموو شتێکی حەرام بپارێزن، کاری ئاوا مایەی پاك و خاوێنیە بۆیان، ئەوە پاکترە بۆیـان (هـەتا چـاو چنۆکی و چـاولەوەڕاندن بەسـەر کچان و ژنـانی نامەحرەمـەوە، مـرۆڤ وەکـو ئاژەڵ بێ سنوور نیە، بۆیە لە هەموو جیهاندا یاسای بۆ دیاریکراوە) بەڕاستی خـوا بەئاگایـە بەوەی ئەوان دەیکەن.

تەماشای ژنانی نامەحرەم بەهەموو شێوەیەك کارێکی یاساغ وحەرامە، مەگەر کتـوپڕ، بـێ نییەت و نیاز بێت، ئەویش دەبێ خێرا چاوی لێ کلا بکـات. چونکە سـەرەنجام سـەر دەکێشێ بۆ گوناحی زۆر گەورەی دزێوو ناشیرین، هەزار ڕەحمەت لە شاعیری گەورەی کـورد (ئەحمـەد شەوقی) کە لەو بارەوە دەڵێ:

(نظرة، فابتسامة، فسلام، فكلام، فموعد، فلقاء)

یان شاعیرێکی تر دەڵێت:

(كل الحوادث مبدأها من النظر ، ومعظم النار من مستصغر الشرر).

(جـەریری کـوڕی عەبـدوڵڵا – وەکـو ئیمـامی موسـلیم ڕیوایـەتی کـردووە – دەڵـێ: لـە پێغەمبەرم پرسی: لە حوکمی چاوکەوتن بەژنان کتوپڕ؟ فەرمانی پێکـردم کە: بەپەلـە چاوت هەڵبڕەو تەماشای مەکە. لەبوخاریدا هاتووە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إيـاكم والجلـوس علـى الطرقات)) وریابن لەسـەرە ڕێگاکانـدا دامەنیشن ! گوتیـان: جێگـەی ترمـان نیـە تیادانیـشین و

قسەوباسی خۆمـانی تێدا بکـەین، فـەرمووی ((إن أبیـتم فـأعطوا الطریـق حقـە)) ئەگـەر هـەر دانیـشتن، وریـابن مـافی ڕێگاکـە بـدەن. گوتیـان: مـافی ڕێگـا چـیە ئـەی پێغەمبـەری خـوا ؟! فەرمووی: ((غضّ البصر، وکف الأذی، وردّ السلام، والأمر بالمعروف، والنهی عن المنکر)) چاوداخستن لـە حـەرام، ئازارنـەدانی مـەردم، وەڵامـی (سـەڵاو)، فـەرمان بـە چاکە، ڕیگـرتن لـە خراپە. فـەرمووده لـەمبارەوه زۆر زۆرە، بۆ ڕوونـەدانی (زینـا)و شـەڕواڵ پیسی، چونکە هـەر ڕوانینو تەماشا کردنـە ژنوپیـاو لەیـەك نزیك دەکاتـەوە، ئەوسـایش تووشـی ئـەوکارە دژوارە دەبـن، بۆیـە فـەرمان بەچاو داخستن دەکـات لـە ئاسـت نامـەحرەم، وەبـەژنانیش دەفـەرمووێ:

﴿وقل للمؤمنات یغضضن من أبصارهن ویحفظن فروجهن ولایبدین زینتهن إلا ما ظهرمنها ولیضربن بخمرهن علی جیوبهن ولایبدین زینتهن إلا لبعولتهن أو آبائهن أو آباء بعولتهن أو أبنائهن أو أبناء بعولتهن أو إخوانهن أو بنی إخوانهن أو بنی أخواتهن أو نسائهن أو ماملکت أیمانهن أو التابعین غیر أولی الإربة من الرجال أو الطفل الذین لم یظهروا علی عورات النساء ولایضربن بأرجلهن لیعلم مایخفین من رینتهن وتوبوا إلی الله جمیعا أیها المؤمنون لعلکم تفلحون)٣١/٢٤. واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ! بەژنە ئیماندارەکان بڵێ: چاویان لەئاست نامەحرەم قەدەغـە بکـەن، عەورەتیـشیان لەهـەر کـارێکی حـەرام بپـارێزن، (زینـەت)یـشیان: گـوارەی گوێیانو، ملوانکەی ملیانو، سینگ و برۆکیانو بازنەو خڵخالی قاچ و دەستیان دەرنەخەن، مەگەر ئەوشتانە کەبەپێی باوونەریت بۆ خۆی دەردەکەوێت (وەك دەم و چاوو هـەردوو پـێ) وەدەبـێ بـە لەچك وسەرپۆشـەکەیان – سـەرەڕای سـەروملیان – گـەردنو سینگیشیانو ئـەو زێڕزیـوو خـشڵەش پێوەیـەتی داپۆشـنو دەری نەخـەن، لای ئەمانـە نـەبێ: مێـردو بـاب و خـەزوورو کـوڕی خۆیـان، یـان زڕ کوڕیـان، وە لای بـراو بـرازاو خوشـکەزا، یـان لای ژنـانی موسـڵمانان – وەك خۆیـان – جاریـەو کـەنیزەکیانو ئەوانـەی مشەخۆرنو ئاوەزی ژنـان نیـە، وەئەو منداڵانەش هێشتا – لەبەر گچکەییان – عـەورەتی ژنو شـتی تـر لێکناکەنـەوە (چـونکە منـداڵ) بـێ ئاوەزن (لای ئەمانـە دەرخستنی سینگـو لاقو سـەرو ملو گـەردن) قەیـدی نیـە، وەنـابێ ژنـان پێیـان بەزەویـدا بـدەن بۆئـەوەی زڕەی خڵخاڵەکـەی قاچـیان بـێو خـەڵکانی نامـەحرەم بـەئاگا بکەنـەوە لـە خۆیـان، دەسـا هـەموو – بـەژنو بـەپیاوەوە – تەوبـە بکـەنو بگەڕێنەوە بۆلای خوای گوناهپۆش ئەی ئیمانداران ! بەشکو سەرفرازبن.

بۆ هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە (جابیری کوڕی عبداللەی ئەنصاریی) دەڵێت: (ئـەسمای کـچی مرشـیدە) باخـە خورمایـەکی هـەبوو، جـا بەوبۆنـەوە ژنـان لێیکۆدەبوونـەوەو جلوبەرگەکانیشیان ئەوند درێژو ڕەسا نەبوو قاچیان داپۆشێو خەڵخاڵەکانیان دەرنەکەوێت

! لەگـەڵ ئەوەشـدا سـینگ‌و قـژو پەلکـەکانیان بـەدەرەوەبوو، (ئـەسما) گـوتی: ئـای ئەمـە چ کارێکی خراپ‌و ناشیرینە؟! ئیتر ئایەتی (وقل للمؤمنات....) دابەزی.

زۆرینـەی زاناکـان دەڵـێن: نـابێ ئـافرەت، نەبـەئارەزوو، نەبەغـەیری ئـارەزوو تەماشـای پیـاوی نامەحرەم بکات، بەبەڵگەی ئەم فەرموودە (ئەبووداود)و(ترمذی) ڕیوایەتیان کردووە: (ئوم سـەلەمە) و(مەیموونـە)ی دایکـی موسـڵمانان – خ – لەخزمـەت پێغەمبـەردا بـوون، (عبـدالله ئـوم مـەکتوم)ی نابیناش – دوای دابەزینی ئایەتی (حیجاب) – هات، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: خۆتان داپۆشن لێی! (ئوم سەلەمە) دەڵێ گوتم: ئەی مەگەر ئەو نابیناو کوێر نیە؟! پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: ئەی مەگەر ئێوەش کوێرو نابینان؟ ئایا ئێوە ئەونابینن؟. دەستەیەکیش لەزاناکان دەڵێن: ژنان دەتوانن بێ ئارەزوو تەماشای پیاوانی نامەحرەم بکەن. بەڵگەشیان ئەو ڕۆژەیە کە پێغەمبـەر ﷺ تەماشـای (حەبەشـیە)کـانی دەکـرد کـەرۆژی جـەژن لەمزگەوتـدا یارییـان بـەتیری ڕمـەکانیان دەکـرد، خـاتوو (عایشە)یشەش لەپشت سەریەوە سەیری دەکردن. فتح الباری/١/٤٥٤.

زینەت‌و زێڕو زیوو خشڵ‌و خۆڕازاندنەوە بۆ خودی ژنان حەڵاڵ‌و ڕێگا پێدراوە، چونکە بە (فیطرە ت) و سروشت وا دروستکراوە حەزی لەو شـتانە بـێ، کـەوابوو دەبـێ بۆیـشی حـەڵاڵ بکرێـت، وەك وەڵامدانەوەیـەکی (فیطـرە ت). بـەڵێ هـەموو مێینەیـەك حـەزی بـەجوانی‌و خۆڕازاندنەوەیـە، حـەزیش دەکـات ئـەو جوانیـەی دەرکـەوێت‌و پیـاوانیش ببیـنن، دیـارە زینەتیش ئەمڕۆ بۆ سەردەمێکی دی دەگۆڕدرێ، بەڵام لەبنەڕەتدا، بۆ جوانی‌و دەرخستنی بـۆ پیاوان یەك شت دەگرێتەوە.

جا ئیسلام لـەڕێی ئـەو داخوازیـە (فیطـرە)یـەدا ناوەسـتێ‌و لەمپـەڕی بـۆ دروسـت ناکـات، بـەڵکو ڕێکـی دەخـات‌و دەیـەوێ تـەنها بـۆ یـەك پیاوبـەکار بێـت ودەرخرێـت – کـە ئـەویش شـەریك‌و هاوبەشـی ژینیـەتی – دەیـەوێ یـەك کـەس زینـەت‌و جوانیەکـەی ببـینێ، ئـەویش مێردو پیاویەتی، ئیسلام ڕێنادات کەژنان هەرکات‌و ساتێك بەدەست یەکێکەوە بن، لەباخەڵی کەسێکدا ببینرێنەوە، چونکە سروشتی مرۆڤ و ئاژەڵ لەیەك جیاوازن.

ژنانی ئیماندار – کاتێ کەخوا فەرمانی دا بەچارشێوەکانیان سەرو مل‌و سێنگ‌و جوانیان داپۆشن – بوونە ئەو ژنانە خاتوو (عایشە) /خ) دەفـەرموێ: ((خـوا ڕوحـم بەژنـە کۆچکردووە بـەرایی یـەکان بکـات، هەرکـە خـوا ئایـەتی ﴿ولیـضربن بخمـرهن علـى جیـوبهن....﴾ دابەزانـد، لـەخوارەوە جل‌وبەرگـەکانیان دەدڕان‌و لەسـەرەوە سەروسـینگیان پـێ دادەپۆشـی. (بوخـاری) ڕیوایەتی دەکات: ((یرحم الله نساء المهاجرات الأول، لما أنـزل الله: (ولیـضربن بخمـرهن علـى جیوبهن)، شققن مروطهن (إزارهن) فاختمرن به) فتح الباری /تفسیر سورة النور ٨/٤٧٥٨.

ژنــانى ســەردەمى جاهيليــەت سەرپۆشــەكانيان لەپــشتەوە بەردەدايــەوە، ئەوســا خــوا فەرمانيدا كە – لەباتى ئەوە – گەردن و سێنگيانى پێداپۆشن.

ئەمەيـە شـێوەو سەروسـيماى ژنـانى موسـڵمان و ئيمانـدارى ڕاسـتەقينە، بـەڵام بەداخـەوە دەبينـى ژنـانى بـێ ئيمـان و بـێ بـاوەڕى ئـەورووپا لەسـەر شاشـەى تەلەفزيۆنـەكانى ميدياكانى جيهان و ڕۆژنامەكان، چۆن خۆيـان بـەڕووت و قووتى نيشان دەدەن!، بەتايبـەتى چۆن سـەرو گـەردن و سـينگيان ڕووت دەكـەن، هـەر ئـاوايش خانمـەكانى لاى خۆمـان لەسـەر شاشـەى تەلەفزيۆنى كوردە عەلمانيـەكان،خۆيان نمايش دەكەن! لەوانەيشە زۆربەيان موسڵمان بن ! هيوادارم ئەو خانمە بەڕێزانە كارێ نەكەن لەسنوورى ئيمـان و ئيسلام دەرچێت، كاتى خـۆى ژنە لەشفرۆشەكانيش ئاوا وەك ئەمان خۆيان نمايش دەكرد، خـواى ميهرەبـان فەرمانيـدا ژنـە داوێن پاكەكان، دەبێ خۆيان لەوان جيا بكەنـەوەو بەپێچەوانەى ئەوانـەوە بـن:﴿ياأيُها النبـى قل لأزواجـك وبناتـك ونـساء المـؤمنين يـدنين علـيهن مـن جـلا بيـبهن ذلـك أدنـى أن يعـرفن فـلا يؤذين وكان اللهُ غفوراً رحيماً﴾ الأحـزاب/٥٩. واتـە: ئـەى پێغەمبـەر ﷺ ژنـەكانت و كـچەكانت و خێزانى ئيمانداران تێ بگەيەنە، بابە چارشێوەكانيان خۆيان داپۆشن، كارى وا باشتر دەبێتـە هۆى بەچاك ناسينيان و ئازارنەدانيان، خواش – هەميشە – خەتا پۆش و دلۆڤان

## غەريزەى جنسيى بە سەرجێيى شەرعيى چارەسەر دەكرێ

تـەنها چارەســەرێك بـۆ پـاك ڕاگـرتنى كۆمەڵگـە، لـەكارى دزێـوو ناپەســەند، (زەواج)و يەكخستنى (نێرومێ)يە بە شێوەيەكى شەرعيى، وەلەسەردەوڵەت و باوك و بـراو خـزم و كـەس و كار پێويستە ئاسانكارييان بۆ بكەن و، گرێ و گۆتاڵيان بۆ دروست نەكەن، تا ناچار نـەبن هەڵسن بەكارى دزێوو ناشيرين، تا ناچار نەبن ڕێگاى لەشفرۆشى هەڵبـژێرن بـۆ خۆيـان – كـە بەداخەوە – ئەمڕۆ بۆتە باوونەريت وڕێگاى پەيداكردنى نـان وخـۆراك لاى هەنـدێ لـەژنان، بـە شێوەيەك زۆر بە ئاسان و بە نرخێكى هەرزان دەست دەكەوێ! هەر لەبەر ئەوەيـە ئايـەتى جل وبەرگى بالاّ پۆش و، فەرمان بە چاونوقاندن لـە ئاست نامەحرەمدا هات، هـەر لەبـەر ئەوەيـە داوا لە كۆمەڵى موسڵمان دەكات، هاوكـارى ژن و پيـاو، كچ وكوڕ بكـەن، ڕێگـەيان بـۆ ئاسـان بكەن، نەبوونى((ماڵ وسامان)) نەبێتە هۆكارى دواكەوتنى (زەواج)يان، لەبـەر ئەوەيـە زانايـان دەڵێن: لە سەر حكومەتى سەردەم پێويستە لەحاڵى كۆمەڵايـەتى (نێرومـێ) بپرسـێتەوە، ژنـى بێ مێرد، پياوى بێ ژن نەهێڵێتـەوە، بـەڕاى منـيش ئەگـەر وەزارەتێك پێك بهێنرێت تـەنها بـۆ كاروبــارى لاوان و ژنــانى بــێ مێــردو، پيــاوانى بــێ ژن، كــارێكى واجبــى ئيــسلاميى

جێبەجێکراوە،جا ئەو وەزارەتەش لەهەر شارێکدا چەند بەڕێوەبەرێتێك و چەند دەزگایەك دروست بکات، ئەوانیش لەهەر گەڕەکێك، چەند کەسێکی زاناو دڵسۆز بەمەسەلەی لاوانەوە هەڵبـژێرن، پاشـان دەوڵـەت بوودجەیـەکی تایبـەتی بـۆ دابنێـت، ئەگەرچـی لـە بوودجـەی وەزارەتـی گەشـت و گـەڕ و ئـاوەدان کردنـەوەو خانووبـەرەو وەزارەتـەکانی تربێـت. بۆیـە خـوا دەفەرمووێ: ﴿وأنكحوا الأيامى منكم والصالحين من عبادكم وإمائكم إن يكونوا فقراء يغنهم الله من من فضلهِ والله واسع عليم﴾ ٣٢/٢٤. واتـە:ژنـی بـێ مێرد و، پیـاوی بـێ ژنتـان جووت بکەن، ژنەکە بەمێردی بدەن و، پیاوەکەش هاوسەری بۆ پەیدا بکەن،وە عەقەباتی ڕێگەیان مـەهێڵن، بـە تایبـەتی ئەگـەر ئـەو گرێیـە دارایـی بـوو، بـە لێنـی خـوای میهرەبانـە کـە ئەگـەر دەسکورت بوون کیفایەتیان بدات. (ئەبوبەکری صدیق) خوا لێـی ڕازی بێت فـەرمووی: ئیوە فەرمانەکـەی خـوا ئـەنجام بـدەن، خـواش بـەڵێنی خـۆی جێبـەجێ دەکـات. پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووێ: هاوکـاری سـێکەس لەسـەر خـوا هەقـە: ژن هاوەرێـك، مەبەسـتی پاراسـتنی (عـەورەت)ی بێـت، بەندەیـەکی نامـە بـۆ کـراو بـۆ ئـازادبوون، مەبەسـتی بێـت بیداتـەوە، جیهادکەرێك لـە پێنـاو سەرخستنی دینی خوا دا تێبکۆشێت. (ئەحمەد، ترمزی، نەسایی، ئـیبن ماجـە). ((ثلاثـة حـق علـى الله عـونهم: النـاكح يريـد العفـاف، والمكاتـب يريـد الأداء، والغازي في سبيل الله)).

لەفەرموودەیـەکی تـردا هاتووەکـە پێغەمبـەر ﷺ لاوەکـان – کـچ وکـوڕ – هەڵـدەنێ بـەپێی توانـاو گونجـان زەواج بکـەن، چـونکە هـەم چـاویان لەئاسـت حەرامـەکان دەنـووقێ، هـەم عەورەتیـشیان دەپـارێزرێ، خـۆ ئەگـەر توانـایش نـەبوو، بـا بـچن ڕۆژو بگـرن، چـونکە ڕۆژوو دەبێتە قەڵغان لـە ڕووی تـاوان و کـارە گونـاح هێنەرەکانـدا: ((يامعشر الشباب ! من استطاع منكم الباءة فليتزوج، فإنهُ أغض للبصر، وأحصن للفرج، ومن لم يستطع فعليه بالصوم، فإنـه لَهُ وجاء)) متفق عليه.

لـە فەرموودەیـەکی تـردا دەفـەرمووێ: جـووت بـبن (ئـەی نێرومـێ!) تـا نـەوەو نەسلتان بـبێ، چونکە نەسل ونەوەی ئێوە — تەنانەتی منداڵێکی لەبارچووش — بۆ من مایەی شانازیە لـە ڕۆژی قیامەتدا: ((تزوجوا توالدوا تناسلوا، فإني مباه بكم الأمم يوم القيامة))ئەبووداود، نەسایی.

ئیـسلام زۆر بـە لێبڕاوانـە هـەوڵ دەدات بـۆ ڕاگـرتنی کۆمەڵگەکـە بـەپاك و خـاوێنی و، سووکایەتی نەکردن بەژنان و ڕێگرتن لـە لەشفرۆشـی بـە ژنـان، بۆیـە بەتایبـەتی دەفـەرمووێ: ((ولاتكرهـوا فتيـاتكم علـى البغـاء إن أردن تحـصنا لتبتغـوا عـرض الحيـاة الـدنيا...))٣٣/٢٤. (سوددی) دەڵێت: کوڕەکەی سەلوول (عەبدوڵڵا) کەنیزەیەکی هـەبوو، هەرکـە میـوانی هاتبـا —

بـۆ ڕێزگـرتن لـه میوانه‌كـه – ده‌ینـارده‌لای بـۆ جـووت بـوون !، ڕۆژێـك ئـه‌و كـه‌نیزه هاتـه‌لای (ئه‌بووبـه‌كر) خـوا لێـی ڕازی بێـت سـكالای لـه (عه‌بـدوڵلا) كـرد، ئـه‌ویش بـۆ پێغه‌مبـه‌ری ﷺ گێڕایه‌وه، پێغه‌مبه‌ریش بڕیاریدا نه‌هێڵن بگه‌ڕێته‌وه لای (سه‌لوول)، سه‌لوولیش كردیه هـه‌راو داوای لـه خـه‌ڵك كـرد نـه‌هێڵن موحه‌ممـه‌د ئـه‌و زوڵمـه‌ی لـیٚ بكـات ! ئه‌وسـا ئـه‌و ئایه‌تـه هـات فه‌رمووی: له‌شفرۆشی مه‌كه‌ن به ژنانه‌وه – چ ئازادو چ كه‌نیزه.

بـه‌ڵام به‌داخـه‌وه دیـسان كۆمه‌ڵگـه‌ی ئـه‌وروپا – له‌وانیـشه‌وه ناوچـه‌كانی خۆمـان بـۆ جاهیلیه‌تی كۆن گه‌ڕایه‌وه، بگره خراپتریش، ده‌توانین بڵێین هـه‌موو كـون وقـوژبنێكی دنیایـان پڕكرد له فه‌سادو ! فرمێسكی (تیمساح)یش ده‌ڕێژن بۆ ژنان.

## ژنانی پیرو به‌ساڵا چوو

له‌پێـشه‌وه گوتمـان:پێویـسته ژنـانی لاوو تـازه هـه‌ڵهاتوو، (زینـه‌ت)و شـوێنه ئـاره‌زوو بزوێنه‌ره‌كانیان له خه‌ڵكانی نامه‌حره‌م بشارنه‌وه، ئینجا له‌م شوێنه‌دا باسی ئه‌و ژنانه دێت، كه كاتیٚ شوویان به‌سه‌رچووه‌و چونه‌ته ساڵه‌وه، بۆیه ده‌فه‌رموویٚ: ﴿والقواعد من النساء اللاتـی لایرجـون نكاحـا فلـیس علـیهن جنـاح أن یـضعن ثیـابهن غـیر متبرجـات بزینـة وأن یـستعففن خـیر لهـن والله سمیـع علـیم﴾٢٤/٦٠. واتـه: ئـه‌و ژنانـه‌ی وه‌ختی شـوویان نـه‌ماوه، تاوانێكیـان له‌سـه‌ر نیـه كـه جل‌وبـه‌رگی ده‌ره‌وه‌یـان فڕێده‌ن، به‌مـه‌رجیٚ (عـه‌وره‌ت)و زینـه‌تیان ده‌رنه‌كه‌ویٚ، ئه‌گه‌رچی بۆ ئه‌وانیش وا باشتره پاك‌و شـه‌رمێن بمێنن (واتـه: وه‌كو ژنانی لاو خۆیان داپۆشـن). خـواش ژنـه‌واو زانایـه. بۆ ڕوونكردنـه‌وه‌ی مانـای ﴿فلیس علیهن جنـاح أن یضعن ثیابهن..﴾ چه‌ند ته‌فسیرێك هه‌یه: (ئیبن مه‌سعوود) ده‌ڵیٚ: واتـه: لـه‌دانانی عه‌باكه‌یانـدا گوناحبـار نـابن. (ئـه‌بوو صـالح) ده‌ڵـیٚ: عـه‌با دابنـێن‌و به‌بـه‌رده‌م پیاوانیـشدا بـێن‌و بـچن، گووناحیان له‌سه‌ر نیه.

### تێبینی:

قسه‌وراوبۆچوونی په‌سه‌ندو باوه‌ڕ پێكراو سه‌باره‌ت به (ته‌وقه) له‌گه‌ڵ ژنانـدا ئه‌مه‌یه كه: به هیچ شێوه‌یه‌ك بۆ ته‌وقه‌ی ژن‌وپیاو له‌گه‌ڵ یه‌كتردا ڕێگا نییه، چ ژنه‌كه ده‌ست ڕابكێشیٚ، چ پیاوه‌كـه ده‌سـت پێـشخه‌ر بێـت، هـه‌ردوولایان لاوبـن، یـان هـه‌ردوو پـیر بـن، یـان یـه‌كێكیان لاوبیٚ‌و، ئه‌ویان پیر له (بوخاری)یدا هاتووه: خاتوو (عایشه خ) ده‌ڵێت: ئه‌و ژنانـه‌ی كۆچیان ده‌كرد، پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌م ئایه‌تی: ﴿یاأیها النبی إذا جاءكَ المؤمنات یبایعنك﴾ هـه‌تا ﴿غفور رحـیم﴾ تاقییده‌كردنـه‌وه، هـه‌ر ژنـیٚ ئیقـراری بـه‌مانای ئـه‌م ئایه‌تـه كردبـا، پێغه‌مبـه‌ر ﷺ

پێیدەیفـەرموو: ((قـد بايعتـك كلامـا..)) واتـە: تـەنها بەقسە بەيعـەتی لێـوەردەگرتن، نـەك بـە دەست لەناو دەستنان وتەوقە. خاتوو عایشە دەڵێت: (ولا والله مامست يده يد امرأة قط فی المبايعة، مايبايعهن إلا بقوله: قد بايعتك على ذلك)) ژمارەی فەرمووده: ٤٨٩١. واتـە: بـەخوا سوێند بێت، پێغەمبـەر ﷺ قـەت دەستی لەدەستی ژنـان نەكـەوتووە لـە (بەيعـەت) وەرگرتنـدا، بەڵكو پێیدەیفەرموو: بەيعەتم لیێ وەرگرتیت لەسەر ئەوە خوا فەرمانی پێكردووە. سـەيرێكی (المفصل) بـەرگی ٣/ل٢٣٩ بكـە. خـۆ ئەگـەر پێچەوانەكەی دەسـتكەوت وصـەحیحیش بـوو، دەبیێ تەئويل بكرێت. سەیرێكی (الجهاد والقتال فی السياسة الشرعية – دكتۆر محمد خير هيكل/بەرگی ٢ لاپەڕە:١٠٤٥ بكە).

## هاوسەرەكانی پێغەمبەر ﷺ و خۆشگوزەرانی !

دەبیێ ژنـان لەگـەڵ مێردیانـدا بـە هـەموو شـتێكی كـەمو پـاكو حـەڵاڵ ڕازی بـن، بەتايبـەتی ژنانی صاڵحو چاكيان، بەتايبەتی تر ژنانی پێغەمبەر ﷺ، چونكە پلەی ئەوان لـە پلـەی ژنـانی تر بەرزترە، وەنموونەن بۆ قەناعەتو صەبرو خۆڕاگريی، وەلە هەموو گيروگرفتەكانی ژياندا، دەبـیێ وانـەی دەروون بـەرزی بـنو هـەرگيز ئـەم دنيايـە فريويـان نـەدات، دەبـیێ هاوشـانی پێغەمبـەر ﷺ ئـەخلاقو قييـەم بـڵاو بكەنـەوە، ئەگەرچـی ئـەوانيش هـەر مـرۆڤنو حـەزيان لـە دنيايە، بەڵام نابیێ وەك ژنەكانی (كيسرا)و (قەيصەر) خۆيان بۆ دنيا يەكلا بكەنەوە، ئەو كاتە خەريك بوو هەڵێدێرێنو ويستيان وەك ئەوان دنيايان بۆ بێتو داوايـان لـە پێغەمبـەر ﷺ كـرد نەفەقـەيان – باشـتر بكـات – خـۆ بێگومـان ئەگـەر بووبـا، پێغەمبـەر ﷺ درێغـی ناكـات – جـا لەمـەوە كێـشەيەكی خێزانـی بـۆ پێغەمبـەر ﷺ سـەری هەڵـدا، ناچـار (ئەبووبـەكر)ی بـاوكی خـاتوو(عايـشە)و (عومـەر)ی بـاوكی خـاتوو(حەفـصە) خوالـە هـەموويان ڕازی بێـت، هاتنـە ناوەمسـەلەكەوەو توانييـان بەهەمووويانـەوە قەناعـەتيان پـیێ بكـەنو ڕازی بـبن بـەوەی خـوا داويـەتی، چونكە ئـەم نـاتوانیێ وەكـو (كيسرا)و (قەيـصەر) ئـاڵ ووێـڵ (تەصـەروف) لـە (بيت المال)دا بكات تابتوانیێ بۆيان برِێژێ، جا بۆ چارەسەری ئەو كێشەيە خوا فەرمووی: ﴿ياأيُها النبی قل لأزواجك إن كنتن تردن الحياة الدنيا وزينتها فتعالين أمتعكن وأسّرحكن سراحا جميلا. وإن كنتن تردن الله ورسولهُ والدارالآخرة فإن الله أعد للمحسنات منكن أجرا عظيماً﴾ ٣٢/٢٨–٢٩. واتە: ئەی پێغەمبەر! ﷺ بەژنەكانت بڵیێ: ئەگەر ئێوە ژيانی ئەم دنياو زينـەتو زيبايتيان دەویێ، دەسا وەرن هەقی خۆتانتان بدەمیێو بەخۆشی بەڕێتان بكەم.

ئەگـەريش خـواو پێغەمبـەرو مـاڵی دوارۆژتـان دەویێ، خـوا بـۆ كـارە چاكەكانتان پاداشـتی

گەورەی داناوە. پیغەمبەر ﷺ بەرامبەر بە هیچ کەسێك ستەم وناهەقیی نەکردووە، بەتایبەتی بەرامبەر بەژنەکانی خۆی، سەرەڕای ئەوەیش سەرپشکیان دەکاکە: ئەگەر بەم ژیانە ڕازیبن، ئەگینە وەرنە پێش هەر هەقێکیان هەیە دەیانداتیٚ و بەخۆشی دەستیان لێهەڵدەگرێت.

(سەید قوتب) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی و بۆ خاوخێزانی ژیانێکی خودکەفایی هەڵبژاردبوو، وەك کەسێك بیەوێ جوامێرانەو پێغەمبەرانە بژی، دڵی بەزەوی و دنیاوەپەیوەس نەبیٚ، وەکو کەسێك خۆی بەرزتر بگرێت لە ژیانی ئەم دنیایەو بیەوێ بەرز هەڵفریٚ بۆ لای خواو، پاداشتی هەوڵەکانی لەماڵەکەی تردا وەرگریٚ، ئەگینە هەر لە ژیاندا بوو، (فتووحات)ێکی زۆر کراو (غەنیمەت)و دەسکەوتی جەنگی باڵی ڕاکێشا بەسەر ناوچەکەداو، ئەوی نەیبوو ماڵی پەیدا کرد ! لەگەڵ ئەوەیشدا مانگ تێدەپەڕیٚ ئاگر لە هیچ ماڵێکیدا نەدەکرایەوە ! کەهەمیشەیش لەو دیاریی و صەدەقانە دەهاتنە بەردەستی.... خەریکی بەخشین بوو بەخەڵکانی تر، ژیانی ئاوای بۆ خۆی هەڵبژارد، نەك لەبەر ئەوەبێت کە بیروباوەڕو دین و شەریعەتەکەی بڕیاری لەسەر دابێت نەخێر، چونکە ژیانی خۆش و گوزەرانی خۆش لەدین و شەریعەتی ئەودا حەرام نەکراو، تەکلیفی لە ئوممەتەکەیشی نەکرد، ئەوانیش وەك ئەو بژین، نا، مەگەر کەسێك ئەویش بەئارەزووی خۆی ژیانی ئاوا هەڵبژێریٚ بۆ خۆیی و ماڵ و منداڵی، هەتا بەپاك و خاوێنی بژی و دنیا نەیخنکێنی و بۆ دوا ڕۆژیش گیرۆدەی لای خوا نەبیٚ.

بەلاٚم خۆ ژنانی پێغەمبەریش ﷺ، وەکو ژنانی تر ئادەمزادن و حەزیان لەدنیاو زینەت وزیبا هەیە، ئەگەرچی لەماڵی پێغەمبەریشدا بژین، بۆیە هەردیتیان خێرو خێراتێکی زۆر بەسەر پێغەمبەرو موسڵماناندا ڕژا، هاتن داوای نەفەقەی زیاتریان کرد، بەلاٚم پێغەمبەر ﷺ حەزی نەکرد وەکو دەوروبەری خۆی بژین و بۆ خۆی و بۆ ئەوانی بڕێژیٚ ! بۆیە لەوەوە تووشی جۆرە هەراو کێشەیەکی خێزانی بوو و، ماوەیەکیش لەخەم و خەفەتدا نەدەچوویە ناو هاوەلاٚنی، ئەوەیش لای ئەوان زۆر قورس و سەخت بوو، هەندیٚ جار دەهاتن بیبینن، ڕێی پیٚ نەدەدان، تەنانەتی لەسەرەتاوە مۆڵەتی (ئەبوو بەکر)و (عومەر)یشی نەدا بێنە لای، بەلاٚم هەرجۆر بوو هاتن و دەرەنجام هاوکارییان کرد بۆچارەسەری کێشەکە. (ئەمە بەدرێژە ئیمامی موسلیم و ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتیان کردووە).

ئیسلام (قییەم)ـە ئەساسیەکان بۆ ژیان بەتایبەتی لە (بيت النبوة)دا دیاری دەکات تا ببێتە (مەنارە)و هەردەم تەماشا بکرێن.

کە ئەو دوو ئایەتەی (تەخییر/سەرپشککردن)ـە هاتن ڕێگای بۆ دیاریکردن: یان دنیاو

زینـەتی دنیـا، یـان خـواو پێغەمبـەرو مـاڵی دوا ڕۆژ هەڵبـژێرن، دەبـێ یـەکێ لەمانـە بێـت، دڵ هەریـەکێکیان دەگـرێ، هـیچ کەسـێك دوودڵـی نیـە. بۆیـە ژنـەکانی پێغەمبـەر ﷺ سـوێندیان خوارد: لەمڕۆ بەدواوە لە پێغەمبەر ﷺ داوای شتێ نەکەن نەیبێت. جا بۆ ئەوە ئەو مەسەلەیە بچەسپێنێ لـە ژیـانی موسڵمانانـدا قورئـان هـات، کەوابوومەسـەکە، مەسـەلەی بوون و نـەبوون نییە، بەڵکو مەسەلەی هەڵبژاردنی خوداو پێغەمبەرو دوا ڕۆژە، بۆیە دەبێ هەموو ئادەمزادێك – بەژن و بەپیاوەوە – بگەنە ئەو ئاسۆیەو خۆیان لە دنیا گەلێ بەرزتر نیشان بدەن.

پاش دیاریکردنی (قییـەم) بـۆ هەڵبـژاردنی خـواو پێغەمبـەر ﷺ، یـان بـۆ هەڵبـژاردنی زیبـاو زەنبـەری دنیـا، لـە هـەردوو حاڵەتەکـەدا، خـودای کـارزان پاداشـتی دووبەرامبـەر، یـان تۆڵـەی دووقاتیـان بـۆ ئامـادە دەکـاو دەفـەرمووێ: ﴿یانسـاء النبـی مـن یـأت مـنکن بفاحـشة مبیّنـة یضاعف لها العذاب ضعفین وکان ذلك علی الله یسیرا. ومن یقنت منکن لله ورسوله وتعمل صالحاً نؤتها أجرها مرّتین وأعتدنا لها رزقا کریما﴾ ٣٢/٣٠-٣١. واتە: ئەی ژنانی پێغەمبەر! هەرکامێکتان ناچیزە بێت، دوو بەرامبـەر جەزرەبـەی دەدرێ (چونکە لـەماڵی پێغەمبەردایـە و هەقە صالح و چاك بن) وەئەوەش بۆ خوا ئاسانە. هەرکامێکیشتان ملکەچی خـواو پێغەمبـەر بـێ، کـاروکرداری چـاك بکـات، ئێمـەش دوو ئەونـدە پاداشـتی دەدەینـەوە، وەلەبەهەشـتدا ڕۆزییـەکی پـاك و چاکمان بـۆ ئامـادە کـردووە، ئینجـا لـەم چـەند ئایەتـەی تـردا تایبەتمەنـدی ژنانی پێغەمبەر ﷺ (أمهات المؤمنین) بـەیان دەکـا، تێیـان دەگەیـەنێت کـە ئـەرك و واجیباتیـان، لەبارەی مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا، لەخواپەرستیدا، لـەنێو مـاڵی خۆیانـدا لـە ژنـانی تـر جیـاوازە، هەر بۆیە خواش حیمایەتی تایبەتیان دەکات.

دەیـەوێ پـاك و خـاوێن ڕایانگرێـت، نەبنـە جێگـەی قسـەو تـوانجی تـوانجگران. دەیـەوێ بەرزیان بکاتەوە بۆ ئەو ئاستە بۆیان دانراوە، دەیـەوێ کۆمەڵگە ئاگـادار بکـات کـە پەیوەنـدی ژن و پیاو، پەیوەندیـەك نیـە تـەنها بـۆ تێرکردنـی جەسـتەیی، یـان بـۆ کوژاندنـەوەی هەڵچوونی گۆشت و خوێن بێت، یـان.. یـان... بەڵکو پەیوەنـدی ژن و پیـاو، پـەیوەنی دوو مرۆڤـە لـە تـەنها (نەفس)ێك دا. خۆشەویستیی و سۆزیان لەنێواندایە، حەوانەوەو ئیسراحەتی تێدایە بۆیان.

﴿یانساء النبی لستن کأحد من النساء إن اتقیتن فلا تخضعن بالقول فیطمع الذی فی قلبه مرض وقلن قولاً معروفا. وقرن فی بیوتکن ولاتبرجن تبرج الجاهلیة الأولی وأقمن الصلاة وآتین الزکاة وأطعن الله ورسوله إنما یرید الله لیذهب عنکم الرجس أهل البیت ویطهرکم تطهیرا. واذکرن مایتلی علیکن فی بیوتکن من آیات الله والحکمة إن الله کان لطیفاً خبیرا﴾ ٣٢/٣٢-٣٤. واتە ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر ! ئێوە وەکو ژنانی تـر نین، ئەگـەر خۆتـان بپـارێزن (هـیچ

ژنێك ناتانگاتیٚ لەپلەوپایەدا) دەسا لەگەڵ پیاواندا بەنەرمیی وخاوی قسە مەکەن، هەتا ئەوی نەخۆشـی لەدڵیدایـە قرمـی خـۆش کـا، وەهەمیشە لەئاخاوتنـدا پەسـەندانە بێـژن. ماڵ بـەجیٚ مەهێڵن و خۆ دەرمەخەن وەك دەورانی زەمانی پێشوو، واتـە: بـۆ کـاری پێویست نـەبیٚ، وەکـو ئـەو شـتانە بـەتۆ نـەبیٚ نـەکریٚ، یـان بـۆ مزگـەوت و شـوێنە پەیوەنـدی دارەکـان بەمزگەوتـەوە) لەوەشـدا خـشڵ و زەمبـەرتان بـۆ خـەڵکانی نامـەحرەم دەرمەخـەن، نوێـژ بکـەن و زەکـات بـدەن، وەلەفەرمانی خواو پێغەمبەر دەرمەچن، خوا دەیـەویٚ – ئێوە کە سـەر بـەم ماڵـەن چەپەڵیتان لەسەر لاباو پاك و خاوێن ڕاتانگریٚ. ، (ئیبن کەسیر) دەڵیٚ: ئـەم ئـاداب و وێڵـە، خـودا(بەپلـەی یەکـەم) دەیـدا بـەگوێی هاوسـەرەکانی پێغەمبـەردا ﷺ ئەوسـاش بـەگوێی تـەواوی ژنـانی ئیمانداراندا، چونکە بیٚ شك ژنی پیاوی ئیماندار، وەکو ژنی خەڵکانی تر نییە –چ جای ئەوە کـە ژنـی پێغەمبـەریش بێـت ﷺ– ئـەمان مەکانـەتی تایبـەتی خۆیانیـان هەیـە، هـیچ کەسـێك ناتوانیٚ بیانگاتیٚ،بەمەرجیٚ ((تەقوا))یان هـەبیٚ و لـەخودا شـەرم بکـەن، واتـە: ئەوپلـە بەرزەیـە تەنها بەژنبوونی پێغەمبەر ﷺ بەدەست نایە، هەربەوە لەماڵی ئەودایـەو هاوسـەری ئـەوبیٚ،یان بڵـێین کـچی ئـەو بێـت، خـۆ ((یافاطمـة ابنـة محمـد، یاصـفیة ابنـة عبـدالمطلب، یـابنی عبـد المطلب، لا أملك لكم من الله شیئا...)) هاتووەو بیستووتانە!.

خوای کارزان بۆ یەکەمجار بەخێزانەکانی پێغەمبەرو ژنـی هـەموو ئیمانـدارەکان فـەرمان دەدا کــە هــەتا کــارێکی زۆر پێویــست و زەرووڕەت نــەبیٚ لــەماڵ دەرنەچــن،خۆ ئەگــەر زەرووڕەت پەیدابووو ئێوەیش چوون بەدوایدا، وەکو ژنانی زەمـانی پێشوو سـەرو مـل و سـینگ و جوانی و زەمبەرتان دەرمەخەن، وەجل وبەرگیٚ لەبەر مەکەن، دەغزدارەکان دواتـان بکـەون، وەلـە ئاخاوتنـا – ئەگـەر پێویـست بـوو – بـەنازو نـووزەوە قسە مەکـەن، تامـەرخیان نەچێتە سـەرتان و قرمیـان خۆش نەکەن، پێغەمبەر هەر لەدانانی بەردی بناغەی یەکـەمی ئـەم دینـەدا، خیتـابی زۆر گرنگـی سیاسیی و کۆمەلایەتی و دینی بۆ ژنان دەدا، بەر لەهەموو کەسێك ژنانی و ماڵەکەی خۆی.

بـەڵیٚ هـەرگیز ژنـان لـەهیچ کاروبارێکـدا – ئـەوی بـۆ ئـەوان دەسـت بـدات – پـشتگویٚ نـەخراون، ئەوەتـە هـەر ئـەو ڕۆژە خـوا داوای یەکخواپەرسـتیی دەکـات، بڕیـاری ئـەو ئـاداب و ئەحکامانانـەش بـۆ ژنـان دەدات – وەك ئامـاژەیـەکیش بـەگرنگی هـەردوو نەوعەکـەی مـرۆڤ (نێرومیٚ) –.

ئیسلامی پیرۆز کە بەژنان دەڵیٚ لەماڵەوە بن و دەرمەچن، مەبەستی ئەوەیە کـە: یەکـەم – بـیٚ ئیش وکـاری پێویـست، لـەماڵ نەچـێتە دەر. دووەم – ئەگـەر پێویـست بـوو و دەرچـوو، بەحیـشمەتەوە دەرچـیٚ، تـا دەغـەڵ و دەغزدارەکـان تەمـەحی تێنەکـەن. لەمـە زیـاتر هـیچ

سانسۆرێکی لەسەر ژنان دانەناوە، ئیتر نازانین بۆچی هەواوئارەزوو پەرستەکان – زیاتر لەژنان خۆیان – شینیان بۆ دەکەن؟! حەز دەکەن هەمیشە بازاڕەکان جووڵەی بێت لەژنانو ئەوانیش هەمیشە بۆ چاولەوەڕاندنو ئارەزوو تێرکردن لەناویاندابن،، خۆ دڵنیایشم ئەوانە – ئەو شینە دەکەنو کتێب لەو بارەوە دەنووسنو لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان وتار دەدەنو لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکان ئیشغاڵ دەکەن، لەو دەستو تاقمە ڕووخاوەی ناو کۆمەڵگەن، لەوانەن لە ئەخلاقدا ئیفلاسیان کردووە، لەوانەن جیهەتێك بەکرێیان دەگرێت بۆ بڵاو کردنەوەی ئەو دەیەوێ ! لەوانەن توانای پێکهێنانو بەڕێوەبردنی ژنومالی شەرعییان نییە، لەوانەن (رەجوولیەت)یان نەماوە، لەوانەن بوونەتە جنسی سێیەم (نەپیاون، تاصیفاتی پیاویەتیی هەڵگرن، نەژنیشن، تا صیفاتی ژنان هەڵگرن، بەڵکو لەصیفاتو خووی ئاژەڵو (بەهیمەت)ـەوە نزیکترن، هەرکەسێك توانای ژنومێردی ببیّو، بتوانیّ ماڵ بەڕێوەبەریّ، ئیسلام داوای لیّ دەکات هاوسەر پیادە بکات – ژن بیّ یان پیاو – ((یامعشر الشباب ! من استطاع منکم الباءة فلیتزوج...)).

ژنان لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دەردەچوون بۆ مزگەوتەکان، هیچ ڕێیان لیّ نەدەگیرا، ئەگەرچی ئەو سەردەمەو ئەمڕۆ – لەڕووی پاکیی و ئەخلاقییەوە – ئاسمانو ڕێسمان فەرقیانە. ئەو سەردەمە ژنان بەسەرو ملو سینگ داپۆشراوەوە دەردەچوونو (زینەت)ی خۆیانیان دەرنەدەخست، لەگەڵ ئەوەشدا، دوای کۆچی پێغەمبەر ﷺ خاتوو (عایشە – خ) بەچاکی نەدەزانی ژنان بچنە مزگەوت: ((قالت عایشة رضی الله عنها –: کان نساء المؤمنین یشهدن الفجر مع رسول الله ﷺ ثم یرجعن متلفعات بمروطهن ما یعرفن من الغلس) متفق علیه. وەهەروەها دەلیّ: ((لو أدرك رسول الله ﷺ ما أحدث النساء لمنعهن من المساجد، کما منعت نساء بنی إسرائیل)). ئاخۆ ئەگەرخاتوو (عایشە – خ) کەوتبایەتە ئەمرۆژگارەوە ئێمەی تێکەوتووە، چی گوتبایە؟!.

ئینجا بۆ پێناسەی خۆدەرخستن لەزەمانی پێشوودا (التبرج فی الجاهلیة الأولی) موجاهید دەڵیّ: ژن لە نێوان پیاواندا دەهاتو دەچوو، ئەوەبە (تبرج) دادەنرا. (قەتادە) دەڵیّ: ژنان جۆرە لەنجەو لارێکیان دەکرد، خوا ڕێی لێگرتن! چونکە بە (تبرج) دادەنرا.

(موقاتیل) دەڵیّ: ژنان لەماڵ دەردەچوون، سەرپۆشیان لەمل شتەك نەدەدا، ملوانکەو گەردنو گوارەیان دەردەکەوت، بە (تەبەروج) دادەنرا !. ئەگەر ئەمڕۆ لەگەڵ ئەو سەردەمەدا بەراورد بکەین، دەبینین لە تاریکستاندا دەژین، کەوتووینەتە (أسفل سافلین)ی جاهیلیەت، کەوتووینەتە ئەو چەپەڵییە، کە خوا بە خێزانەکانی پێغەمبەری فەرموو: ﴿إنما یرید الله لیذهب عنکم الرجس أهل البیت ویطهرکم تطهیرا﴾.

## عیففەت و پاکژیی لە ئەستۆی ژن و پیاودایە

پـاك و خـاوێنی و ڕەوشـت بـەرزیی کۆمەڵگـە، بەژن وبـە پیـاو، دەپارێزرێـت، بۆیـە خـوا دەفەرمووێ: ﴿إن المسلمين والمسلمات والمؤمنين والمؤمنات والقانتين والقانتات والصادقين والـصادقات والـصابرين والـصابرات والخاشـعين والخاشـعات والمتـصدقين والمتـصدقات والصائمين والصائمات والحافظين فروجهم والحافظات والذاكرين الله كثيرا والذاكرات أعد الله لهم مغفرة وأجرا عظيماً﴾٣٤/٣٢. واتە: پیاوان و ژنانی موسڵمان و ئیماندار، پیاوان و ژنانی فەرمانبەرو ملکەچ، پیاووژنی قسەڕاست و ڕاستگۆ، پیـاووژنی خـۆڕاگرو بەصـەبر، پیـاووژنی خۆ بەکەمزان و بێ فیـز، پیـاووژنی بەخـشەرو صـەدەقەدەر، پیـاووژنی ڕۆچـەوان، پیـاووژنی ناموسپارێز، ژن و پیاوێ کە زۆر یادی خوا دەکەن... بۆ هەریەکەیان لـەخواوە لێخۆشبوون و پاداشتێکی گەورەیان بۆ دانراوە.

ئابەوشێوەیە قورئانی پیرۆز، ژن وپیاوی خستە پاڵ یەك، دوای ئەوە ژنان زۆر هێنرابوونە خـوارەوە لەپایـەوڕێزدا، پیـاوانی تێگەیانـد کـە لەگـەڵ ئـەوانیش ژنـان هـەن، لـە ئێـوە هیـچیان کـەمتر نییـە و لـە هـەموو ئـەو کارانـەدا هاوبەشـن، وەکـو یـەك لای خـوا پاداشـتیان هەیـە، هـەر کامێکتان لابدەن –ژن یان پیاو– بێ جیاوازی تۆڵەی هەیە، ئەمەیە: ﴿ولهن مثل الذی علیهن بالمعروف﴾. واتە: بەپێی عورفی پەسەندی کۆمەڵگەی پەسەند، هەر هەقێ لەسەر ژنان بێت بۆ پیاوان، هەمان هەقیش لەسەر پیاوانە بۆ ژنان.

## ژن و پیاو لە فەرمانی خودا نابێ کلا بن

کاتێ دینی ئیسلام هات، کۆمەڵگە پڕبوو لەداب ونەریتی سەیروسەمەرە! بۆنموونە: مـرۆڤ بەکۆیلـە کـردن و، زۆربەکـەمنرخ تەماشـاکردنی، تەنانـەتی نانیـان لەگـەڵ نـەدەخوارد، ژنیـان نەدەدایە ! لەبازاڕەکاندا – وەکو ئاژەڵ – دەفرۆشرا ! یان ژنی تەڵاقدراوی بەکوڕکراو (دعـیّ)، وەکـو ژنـی کـوڕی (نەسـەب)یـی دادەنـرا، واتـە: هەرچـۆنێ بـووك پـاش تەڵاقیـشی، نـابێ مـارە بکرێت، ئەمیش نـەدەبوو مارەبکرێ ! دیـارە گێڕانـەوەی ئـەم دووخاڵـە بـۆ سـەرباری ئاسـایی شەرعیی خۆیان، بەپێغەمبەرێك نەبێ ناکرێ، بۆیـە خـوا ئـەو تەکلیفـە لـە پێغەمبـەر ﷺ دەکـات بـۆ شـکاندنی ئـەو فـەرق و جیاوازیـە دروسـتکرابوو لـەنێو مرۆڤەکانـدا، دەسـت بکـات بەشـکاندنی و، ئـەو کۆمەڵگەیـە تێگەیـەنێت کـە: مـرۆڤ لای خـوای میهرەبـان هـەموو یەکسانە، مەگەر بەتەقوا (ئەمیش لەقیامەتدا جیادەکرێتەوە) بۆیە هەڵدەسێت بەڕێکخستنی (زەینەب)ی پـوورزای قوڕەیـشی (بـەنی هاشـم)، دەسـەڵاتدارو سـەرکردەی ئـەو ڕۆژە بـۆ (زەیـد)ی کۆیلـەی

بەکوڕکراوی خۆی، تا – بەفەرمانی خوا هەردوو ڕەوشتە جاهیلیەتەکە هەڵوەشێنێتەوە –، بۆ ئەمە (ئیبن عەباس – خ) دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ خوازبێنی (زەینەب)ی (ئەسەدیی) کرد بۆ (زەید)ی غولامیی (خوا لە هەردوو ڕازی بێت) ئەویش گوتی: مێردی لەگەڵ ناکەم ! پێغەمبەر ﷺ داوای لێکرد: مێردی لەگەڵ بکات، گوتی: با لەگەڵ خۆمدا مەشوەرەتیێ بکەم (بزانم چۆن دەبیێ؟)، لەو قسەوباسانەدا بوون، خوای کارزان فەرمووی: ﴿وماكان لمؤمن ولا مؤمنة إذا قضى الله ورسوله أمرا أن يكون لهم الخيرة من أمرهم ومن يعص الله ورسوله فقد ضلّ ضلالا مبينا﴾ ٣٦/٣٢. واتە: کەخوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ بڕیاری کارێکیاندا، ئیتر بۆ هیچ ژنوپیاوێکی موسڵمان ڕەوانیە بڕیارێکی تر بۆ خۆیان هەڵبژێرن، ئەوی سەرپێچی لەخواو لە پێغەمبەرەکەی بکات، بەڕاستی بەئاشکرا گومڕایە. (زەینەب)یش گوتی: باشە ! تۆ قەبووڵتە (زەید) مێردم بێت؟ فەرمووی بەڵیێ. ئەویش گوتی: دەسا سەرپێچی لە پێغەمبەری خوا ناکەم، ئەوا بەمێرد قبووڵم کرد. (تەبەریی) لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵیێ: بەلەنگو نەنگی دەزانی مێردی پیێ بکات، بۆیە گوتی: من لەو باشترم ! –بەسروشت بۆ خۆیشی تووڕەبوو – تا خوا ئەو ئایەتەی نارد، ئەویش تەسلیم بوو ملی ڕاکێشا.

لە (مەسنەد)ی ئیمام (ئەحمەد) ٤٢٢/٤ هاتووە، پێشەوا (موسلیم) لە (كتاب الفضائل/١٩١٨/٤–١٩١٩) لە (ئەبوو بەرزەی ئەسلەمیەوە هێناویەتی: کە (جولەیبیب) ناوێك هەمیشە حەزی بەناو ژنان دەکرد، (ئەبوو بەرزە) دەڵیێ: بەخێزانەکەمم گوت: ئەمڕۆ ڕیێ بە (جولەیبیب) نەدەن بێتە ناوتان، ئەگینە خۆم دەزانم چیتان پیێ دەکەم ! (ئەنصار)ـەکانیش هەرکە ژنێکیان بەمێرد دەدا، لەپێشەوە مەشوەرەتیان بە پێغەمبەر ﷺ دەکرد، بۆیە ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ بەپیاوێکیانی گوت: کچەکەتم بدەریێ، ئەویش واتێگەیشت بۆ خۆی داوای دەکات، بۆیە بەپێخۆشحاڵیەوە خێرا پیرۆزبایی لێکرد ! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆ خۆمم نەخواست، بۆ (جولەیبیب)م دەویێ! باوکی کچەکە گوتی: دەسا بامەشوەرەت بە دایکی بکەم، ئەویش گەڕایەوەو مەسەلەکەی گوت بەدایکی کچە، دایکەش وای زانی کە پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی خواستوویەتی، بۆیە خێرا بەخۆشحاڵیەوە پیرۆزبایی کرد، باوکی کچەکە گوتی: بۆ خۆی نیە، بەڵکو بۆ (جولەیبیب)ـە ! ئەویش لەبەر بێزاری گوتی: بەخوا سوێند، نابیێ لیێی مارە بکەیت. جا بەرلەوە هەڵسیێو قسەکە بێنێتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، کچەکە – دیار بوو گوێی لەو ڕاگۆڕینەوەی باوك‌و دایکی بوو – گوتی بەدایکی: پێغەمبەر ﷺ بۆ کیێی خواستووم؟ دایکی تێیگەیاند. کچەکە گوتی: جا دەکریێ ئێوە قسەی پێغەمبەر ﷺ بشکێنن؟ من دڵنیام کە پێغەمبەر ﷺ شتی خراپی بۆ من ناویێ. باوکی وەڵامەکەی بردەوە بۆ پێغەمبەر، ئەویش لە (جولەیبیب)ی مارەکرد.

پاشـان خەزایـەك هاتـە پـێش، پێغەمبـەر ﷺ چـووە خەزاكـەوە، (جولـەیبیب)یـش لەگـەڵیا ڕۆشـت، پـاش سـەركەوتن بەهاوەڵـەكانی فـەرموو. كەسـێك هەیـە دیـار نـەبێ ؟ گوتیـان بـەڵێ (چەند ناوێكیان هەڵدا) دیسان فەرمووی: بگەڕێن، كێی تر دیار نییە ؟ گوتیـان: ئیتر كەسێك نییە دیار نەبێ ! فەرمووی: من (جولـەیبیب) نـابینم ! بـچن لـەناو كوژراوەكانـدا بـۆی بگـەڕێن، ئەوانیش چوون تەماشا دەكەن لە جێگایەكدا شەهید بووەو حەوت لـە دوژمنـانی ئیـسلامیش لەلایـدا كـوژراون ! ئـەوانیش هەواڵەكـەیان بـۆ پێغەمبـەر ﷺ بـردەوە گوتیـان: حـەوت كەسـی لەنـەیارانی ئیـسلام كووشـتووەو بـۆ خـۆشـی شـەهید بـووە، ئەوسـا پێغەمبـەر ﷺ چـووە لای جەنازەكەیو وەستاو فەرمووی: حەوتی كوشتووەو كوشتوویانە ! (هذا منی وأنا منه) سـێ جار فەرمووی: جولەیبیب لەمنـەو، منـیش لـەوم! پاشـان لەسـەر هـەردوو باسـكی خـۆی دانـاو گـۆڕیان بۆ هەڵكەندو خستیانە گـۆڕەوە. بـۆ دواییش پێغەمبـەر ﷺ دوعـای بـۆ ئـەو كـچە كـردو فەرمووی: ((اللهم صبّ علیها الخیر صبّاً، ولا تجعل عیشها كدّا)) واتە: خوایـە ! خێرێكـی زۆر بڕێـژی بەسـەریا و، سـەختی نەیەتـە ژیانیـەوە. (ئـەبوو بـەرزە) دەڵـێ: ئـیتر لـەناو (ئەنـصار)دا ژنێكی تر نەبوو، وەكو ئەو گوزەرانی خۆش بێت.

كە ئیسلام دێت، خـووە نالـەبارەكانی سـەردەمی جاهیلیـەت، زۆرنو، هـەركامێكیان لەگـەڵ ئینـسانیەتی ئینـسانەكاندا نـەگونجێت، هەڵیدەوەشـێنێتەوەو مرۆڤـەكان گـشت یەكـسان دەكاتەوەو دەڵێ: مرۆڤ هەر مرۆڤە، كەس لەكەس گەورەترو مەزنتر نییە، هەموو كچو كوڕێك شـایەنی یـەكترن، هـیچ هۆزێـك لـە هـۆزێكی تـر بـالاتر نییـە، بـەڵێ ئایەتەكـە هـات بـۆ تەسـلیم بوونو شكاندنی ئەو هەموو ئەستەمو لەمپەڕانە كۆمەڵگە فەراهەمی هێناونو كردوونیە یاسا بۆ كاروباری خۆی، بڕیار هەر بڕیاری خوایـە، (زەینـەب)ی (ئەسـەدیی)یـش لـە(زەیـد)ی كۆیلـە مەزنتر نییە، ژنی بەكوڕ كراویش نابێتە بووكو پاش تەڵاقدانی نیكاحی ڕەوایە.

## ژنانی پێش سەرجێیی تەڵاقدراو

لەپێشەوە – لە سوورەتی (بەقەرە)دا – باسـی ئـەو ژنانـە كـرا كـە پـێش چوونەلایان تـەڵاق دەدرێن فەرمووی: ﴿لا جناح علیكم إن طلقتم النساء ما لم تمسوهن أو تفرضوا لهن فریضة﴾ ئنجـا لێـرەدا باسـی ئـەوە دەكـات ئـاخۆ عیـدەیان لەسـەرە، ئەگـەر دوای مـارە بـڕینو، پـێش گواستنەوە تەڵاق بدرێن..؟! ﴿یاأیُها الذین آمنوا إذا نكحتم المؤمنات ثم طلقتموهن من قبل تمسّوهن فما لكم علیهن من عدّة تعتدونها فمتعوهن وسرحوهن سراحاً جمیلا﴾٤٩/٣٢. واتـە: ئەی ئیمانداران ! كاتێ ژنانی باوەڕدار مارە دەكەن، پاشـان – پـێش سـەرجێیی لەگـەڵكردن –

تەلاقتان دان، ئێوە هەقی هیچ عیدەیەکتان بەسەریانەوە نییە بەسەری بەرن، کەوابوو هەقی خۆیانیان بدەنێ (ئەگەر مارەیییان هەبوو نیوەیان دەکەوێت، ئەگەر نەیشیان بوو، بەگوێرەی دەسەلات باربوو بکرێن) پاشان بەشێوەیەکی جوانو پەسەند بەرێیان بکەن (بێ ئەزیەتو ئازارو دڵ ئێشانیان).

**فەلسەفەی عیددە:** بۆ دەرکەوتنی خاڵیبوونی (رەحەم)ی ژنانە لەمنداڵ، تا (نەسل)و (نەسەب) تێکەڵ نەبن، منداڵی ئەم تێکەڵ بەهی ئەوی دیکە نەبێ، دیارە ئەو ژنەی سەرجێیی لەگەڵ نەکرابێ، (رەحەم)ی شتێکی تێدا نییە تا تێکەڵ بەهی کەسێکی تر ببێت پاش مێردکردنەوە، کەوابوو عیدەشیان لەسەر نیە.

## عیدەی شەرعیی

عیددە ماوەو زەمەنێکە، لە شەریعەتی ئیسلامدا دادەنرێ بۆ چاوەنۆڕی ژنان پاش تەڵاق، یان پاش مردنی مێردیان،بۆ ئەوە دەرکەوێ (حەمل)ی هەیە یانا؟، یان بۆ دەربڕینی ناڕەحەتیی ودەرخستنی وەفایەك بۆ مێردە مردووەکەیان، یان هەر لە بەر فەرمانی خودای میهرەبان و(تعبد).

**عیدە دەبێتە چەند بەشێکەوە:**

١- هەرجیابوونەوەیەك بەر لە سەرجێیی بێت عیدەی نییە(مێرد مردوو نەبێ).

٢- هەر ژنێك مێردی مردو دوو گیان نەبوو، دەبێ چوار مانگ ودەرۆژ دانیشێ.

## باسێکی دی ژنەکانی پێغەمبەر ﷺ

کاتێ ئایەتەکەی سوورەتی (نساء): ﴿فانکحوا ماطاب لکم من النساء مثنى وثلاث ورباع....﴾ هاتو چوار ژن زیاتری قەدەغەکرد، لەو دەمەدا پێغەمبەر ﷺ لەبەر هێندێ هۆکار بەدین وئاقیدەکەیەوە - ئەم (٩) ژنە لە خوارەوە ناویان دێت لە ژێر رکێفیا بوو: خاتوو(عایشە) و (حەفصە) کچانی (ئەبووبەکر) و (عومەر - خوا لێیان رازیی بێت) بەمەبەستی پتەوکردنی پەیوەندی لەگەڵ ئەو دوو پیاوە بەڕێزە ئازاو دڵسۆزوناودارانەدا. (ئوم حەبیبە، ئوم سەلەمە، سەودە، زەینەبی کچی خوزەیمە) چونکە لەلایەکەوە کۆچیان کردبوو، لەلایەکی دیکەشەوە مێردەکانیان لەخەزاکاندا لەدەستدابوو، ئەوسا لەبەر ڕێزلێنان لێیان - چونکە نەجوانو نەلا و بوون - پێغەمبەر ﷺ مارەیکردن. (زەینەب) ی کچی (جەحش) کە لەمارە کردنەکەیدا کارێکی زۆر گرنگی پێ ئەنجام دا: ئەویش: ئەوە بوو عەرەبەکان ژنی بە کوڕکراویان بەبووك دادەنا و پاش تەڵاقدانیشی ڕێیان بە مارەکردنی نەدەدا، پێغەمبەر زەینەبی مارە کرد تائەو کارە بێ

بنەمايــە ھەڵوەشــێنێتەوە، ئەگەرچــى نــەيارو ناحــەزەكانى درۆو دەلەســەيەكى زۆريــان بــۆ ھەڵبەست لە مارەكردنى (زەينەب)دا! خاتوو (جووەيريە) لەھۆزى (بنى المصطلق). (صەفيە) كچى (حەى بن أخطب) مارەكردنى ئەم دوانەش بۆ زيادبوونى پەيوەندى بەخێڵەكانەوە بوو.... بەپێى دەقى قورئانى پيرۆز كە دەفەرموێ: ﴿وأزواجه أمهاتهم....﴾ ئەو ژنانە ھەموو بوونە دايكى موسڵمانانو، كاتێكيش ئايەتى (تەخيير) ھات، لە باتى دنياخواو پێغەمبەريان ھەڵبـژارد، ئينجا كە ئايەتى دياريكردنى ژمارەى ژنان (تا چوار) ھات، زۆر لايان قورسو سەخت بوو كە لە پێغەمبەر ﷺ جياببنەوە، جا لەبەر ئەوە خوا بەچاوى بەزەييەوە تەماشـايكردنو، پێغەمبــەرى ﷺ لــەو حــوكمو بڕيــارە ھــەڵاواردو مۆڵــەتى ھێــشتنەوەى ھەموويانيدا، پاش ئەوەيش – ھێمان ھەرلەبەر خاترى ئەوان رێى لێگرت كە ھيچ كامێكيان تەلاق بدات، يان ژنى تريان بەسەربێنێ.

جا بۆ چەسپاندنى ئەو مەبەستانە ئەم ئايەتانەى خوارەوە ھات و ئێمەش لەخزمەتياندا دەبين كە دەفەرموون: ﴿ياأيها النبى إنا أحللنا لك أزواجك اللاتى آتيت أجورهن وماملكت يمينك مما أفاء الله عليك وبنات عمك وبنات عماتك وبنات خالك وبنات خالاتك اللاتى هاجرن معك وامرأة مؤمنة إن وهبت نفسها للنبى إن أراد النبى أن يستنكحها خالصة لك من دون المؤمنين قد علمنا مافرضنا عليهم فى أزواجهم وماملكت أيمانكم لكيلا يكون عليك حرج وكان الله غفورا رحيما﴾٣٢/٥٠. واتە: ئەى پێغەمبەر ﷺ ! بێگومان ئێمە ئەم ژنانەمان بۆ حەڵاڵ كردويت، ئەگەرچى لەچواريش پتربن: ئەوانە مارەييت پێداون. ئەوانەى لەجەنگدا بوويتە خاوەنيان، وەكو خاتوو (صەفيە)و خاتوو(جووەيريە) كە ھەردووكيانى ئازاد كردووپاشان مارەيكردن، وەخاتوو (ريحانە) و (ماريە)خان. وەكچەمامو كچەپوورى (ھەردوولا)و كچەخاڵ، ئەوانەيان لەگەڵ تۆدا كۆچيان كرد، بۆ ڕێزلێنانيان. وەھەر ژنێكى ئيمانداريش خۆى ببەخشێ پێت، دەتوانى مارەى بكەيت (بێ مارەيىو بێ وەليى و بێ شايەت) تێبينى: سەبارەت بەو ژنانە كە خۆيان بە پێغەمبەر بەخشى ڕيوايەت گەلێك ھەن، ئاخۆ وەك ئەوان خۆيان پێ بەخشيى، ئەميش مارەيكردن، يا نا؟ قسەى پەسەند وراست ئەوەيە كە:ھەر كەسێك داواى كردبێت مارەى بكات، لەيەكێ لەھاوەڵانى مارەيكردووە، نەك لە خۆى). بۆيە خوا ئەو بڕيارەيدا، تا پێغەمبەر ﷺ لە ھێشتنەوەى خێزانەكانيدا نيگەران نەبێت.

سەبارەت بەخواستنى ئەو ژنانەش خۆ دەبەخشن بە پێغەمبەر ﷺ، دەيتوانى قەبووڵيان بكاو، دەيشيتوانى بياندات ە دواوەو، دەيشيتوانى پاش ماوەيەكى تر، ھەر كامێكيانى قەبوڵ بێ مارەى بكات وبيكاتە ھاوسەرى خۆى، واتە: لەبەر ئەركەكانى سەرشانى، واجيب

نـەبوو وەریـان گـرێ، بـەڵكو دەیتـوانی كامیـان لەگـەڵ كاروباریـا دەگـونجێ وەری گـرێو، كامیشیان ناگونجێت وەری نەگرێت: ﴿ترجی من تشاء منهن وتؤوی إلیك من تشاء ومن ابتغیت ممن عزلت فلا جناح علیك ذلك أدنی أن تقرّ أعینهن ولا یحزن ویرضین بما آتیتهن كلهن والله یعلم ما فی قلوبكم وكان الله علیما حلیماً﴾٥١. واتـە: تـۆ هـەر كامێكیـان دوا بخـەیتو هـەركامێكیان بگریتـە لای خـۆت كـەیفی خـۆتـە (دەتـوانی) ژنـی كەنارلێگیراویـشت ئاشـت بكەیتـەوە، بـۆ ئەمـە گوناهێكـت نایەتـە سـەر، ئـەم كـارە باشـترە دەبێتـە مایـەی دڵخۆشبوونو خەم نەخواردنیان و هەمووش ڕازی بن بەوەی پێتداون. هەرچیش بەدڵتانا بێت خوا دەزانێ. وەزاناو لەسەر خۆیە.

**بۆ مانای ئەم ئایەتە دوو تەفسیر هەیە :**

یەكـەم: هـەركامێك لـەو ژنانـە خـۆ دەبەخـشن پێـت، كەیفتـە وەریـان گـری، یـان وەریـان نەگریت، دیسان بۆ دواتریش ئەوانەی وەرت نەگرتن، هەر دەتوانی وەریان گریت.

دووەم: سەبارەت بەخێزانەكانت – ئەی پێغەمبەر! ڕێت هەیە لە (قەسم)و دابەشكردنی كات بەسەریاندا لایان بمێنیتەوە، لەوەشدا كامیان پێش دەخەیت، كامیان دوا دەخەیت سەرپشكبە. زانایان دەڵێن: لەبەر زۆری ئەركەكانی دانانی (قەسم) لەسەر شانی ئەوگران و سەخت بوو، جا لەبەرئەوە قەسمی لە سەر واجیب نەكرابوو، ئەگەرچی ئەو پێغەمبەر ﷺ ستەمو ناهەقی لەهیچ كامێكیـان نـەدەكرد، نەلـەڕێ وشـوێندا، نـە لـە خـواردن و جل و بەرگـدا، نـە لەسـەرجێیدا. ئـەو تەفسیرە هـەركامێكیان بێـت، بـۆ پێغەمبـەر ﷺ پـڕ بەواقیعەكەیـەتی، كـێ ی بەچـاك زانـیو بەرژەوەندی ئیسلامی تێدابوو، دەیكاتە هاوسەری خۆی، لەگەڵ كێشدا بەرژەوەندی نەبینی دەیداتـە دواوە. سـەبارەت بـە (قەسـم)یـش دەعـوەو بانگەوازەكـەی وا هەڵـدەگرێ كـە لـەو جـۆرە شتانەدا نەبەسترێ بە جێگایەكەوە، ئەگەرچی بۆ خۆی هەموویانی ڕازیكردووە.

ئینجا بەدەر لـەو ژنانـەی بـەر لـەهاتنی ئایـەتی ﴿فانكحوا ماطاب لكم من النساء مثنی وثلاث وربـاع...﴾هـەیبوون، خـوا ژنـانی تـری لەسـەر حـەرامكرد، مارەیـان بكـات، یـان بییانگۆڕێو تەڵاقیان بدات، وەكو دەفەرموێ: ﴿لا یحل لك النساء من بعد ولا أن تبدل بهن من أزواج ولو أعجبك حسنهن إلا ماملكت یمینك وكان الله علی كل شیء رقیباً﴾٥٢/٣٢. واتە: دوای ئـەو ژنانـەی هاوسـەرتن، هـیچ ژنێكـی تـرت بـۆ حـەڵاڵ نییـەو، ناشـتوانی بیـانگۆڕی بەهاوسـەرانی تـر، ئەگـەر چـی جوانیەكـەیان سەرسـامت بكـات، مەگەركەنەنیزەیـەك ببیتـە خاوەنی، خواش بەسەر هەموو شتێكدا چاودێرە.

زانا گەلێك (ئیبن عەباس، موجاهید، زەحاك، قەتادە، ئیبن زەید، ئیبن جەریر...) دەڵێن:

خوا پاداشتی ژنەکانی پێغەمبەری ﷺ بەم حوکمو بڕیارەدایەوە کە هەرگیز پێغەمبەر نەتوانێ ژنی تر بێنێ، یان تەڵاقیان بدات، ئەمەیش پاداشتی ئەوەبوو، کاتێ پێغەمبەر ﷺ سەرپشکی کردن لەنێوان هەڵبژاردنی دنیاو خواو پێغەمبەردا، خواو پێغەمبەریان هەڵبژارد.

خاتوو (عایشە – خ) دەڵێت: بەر لەکۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ، ئەو حوکمە هەڵوەشایەوە، بەڵام پێغەمبەر وەکو خۆی مایەوە، واتە: نەژنی تری هێناو، نەهیچ کامێکیانی تەڵاقداو گۆڕی.

## کات لە یەکتر مەگرن

(بوخاریی) لە (ئەنەس)ی کوڕی (مالیك)ـەوە دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ بۆ گواستنەوەی (زەینەب)ی کچی (جحش) زەماوەندی کرد خەڵکێکی دەورو بەری دەعوەتکرد، جاپاش نانخواردن، لەباتی هەڵسانو چۆڵکردنی ماڵەکە، دانیشتن و کەوتنە ڕازو نیازی خۆیان ! پێغەمبەریش ﷺ خۆی ئامادە کردبوو هەڵسێ، کەچی ئەوان هەڵنەسان ! ئینجا کەدیتیان وا پێغەمبەر ﷺ هەڵسایەوە، هێندێکیان هەڵسانو، سێ کەسیان هەڵنەسان ومانەوە ! جاپاشان کە دیتیان وا پێغەمبەر ﷺ هەڵساوە، ئیتر ئەوانیش هەڵسان، ئەنەس دەڵێ منیش چووم بە پێغەمبەرم گوت وا هەڵساون، ئەویش هاتو چوویە ژوورەوە، پاشان خوا فەرمووی: ﴿یاأیها الذین آمنوا لاتدخلوا بیوت النبی إلا أن یؤذن لکم إلی طعام غیر ناظرین إناه ولکن إذا دعیتم فادخلوا فإذا طعمتم فانتشروا ولا مستأنسین لحدیث ذلکم کان یؤذی النبی فیستحی منکم والله لایستحی من الحق وإذا سألتموهن متاعا فاسألوهن من وراء حجاب ذلکم أطهر لقلوبکم وقلوبهن وماکان لکم أن تؤذوا رسول الله ولا أن تنکحوا أزواجا من بعده أبدا إن ذلکم کان عند الله عظیما. إن تبدوا شیئا أو تخفوه فإن الله کان بکل شیء علیما﴾ ٣٣/٥٣-٥٤. واتە: ئەی ئیمانداران ! مەچنە ژوورەوەی ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ، مەگین بۆ خواردن بانگ کرابن، ئەویش وەختی وامەچن خواردنەکە ئامادە نەبووبێت، جا هەر خواردنەکەشتان خوارد، بڵاوە بکەنو خۆ بەقسەوە خەریك مەکەن، چونکە کاری وا پێغەمبەری ئازار دەدا، پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئێوە شەرم دەکات دەنگتان بدات، خۆ خودا لە قسەی ڕاستگوتن شەرم ناکات، هەر کاتێکیش داوای شتێك لەژنەکانی دەکەن، چاویان تێمەبڕن، بەڵکو دەبێ لەپشت پەردەوە بیخوازن، ئەم کارەیە بۆ دڵپاکی هەردوولاتان باشترو نزیکترە. نابێ پێغەمبەری خوا لە ئێوەوە ئازار ببینێ، وە ڕەواش نییە دوای خۆی – بەهەتا هەتایی – ژنەکانی بخوازنو مارە بکەن، کەکارێکی وا لای خوا کارێکی گەورەیە. هەرچیش دەرخەن، یان بیشارنەوە خوا پێی دەزانێت.

لەم ئایەتەدا خودای کارزان شێوەی هاتووچۆی موسڵمانان بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺ

ڕێكدەخات، ياساو ڕێسايەكى بۆ دادەنێت، بەتايبەتى لەودەمەدا كە خەڵكانێكى خراپ و درۆزن و دووڕوو هەبوون و، هەميشە بۆ درۆودەلەسەيە دەگەڕان، كە شعوورو هەستى پێغەمبەر و ماڵەكەى بڕووكێنىّ.

لەسەردەمى جاهيليەتدا ئەدەب و وێڵى شێوەى زيارەت و سەردانى يەكتر ريعايەت نەدەكرا ! هەر بۆيە كە دەچوونە ماڵى پێغەمبەريش ﷺ گەلىّ جار زۆر دادەنيشتن و خۆى و ماڵەوەى تەنگەتاو دەبوون و وەخت و بێوەختيان بەلاوە نەبوو، خوداى پەروەردگار بۆ پەرژينێك لەماڵە بەرێزەكەى و سەرقاڵ نەكردنى پێغەمبەر ﷺ بەشتى لاوەكيەوە بەچەند ئايەتێك و بە چەند قۆناغێك هاتووچۆو سەرقاڵكردنەكەى كەمكردەوە، جارىّ لە سوورەتى(موجاديلە)دا فەرمووى: ئەوانەى دەيانەوىّ بچنە لاى پێغەمبەر ﷺ، دەبىّ پێش ئەوە صەدەقەيەك بكەن، جارىّ تر – لێرە– فەرمووى: كە چوونە ماڵەكانيەوە – ئەر بانگكرابوون بۆ خواردن – كاتىّ بچن خواردنەكە ئامادە بووبێت، هەركە خوارديشتان هەڵسن، مەمێننەوە و خۆ بە قسەوە خەريك بكەن، بێگومان بەو چەند ئامۆژگاريانە كاتى زيارەت و سەردانى پێغەمبەر ﷺ چوويە قۆناغێكى ترەوە.

سەبارەت بەو قەڵەباڵغيى و هاتووچۆيە بۆ ماڵى پێغەمبەر، بێگومان هەموو جۆرە مرۆڤێك – چاك و خراپ – دەچێت، ئەوەيش قابيلى هەموو قسەيەكى خراپە بكەوێتە دواى خێزانەكانى، بۆيە – وەكو (عومەرى كوڕى خەتتاب)يش پێشنيازى كرد – ئايەت هات و فەرمووى: هەركە داواى شتێكتان لىّ كردن، با لەپشت پەردەوە داوايان لىّ بكەن. ئيمامى (بوخاريى) لە (ئەنەس)ـەوە دەگێڕێتەوە دەڵىّ: ((قال عمر بن الخطاب: يارسول الله: يدخل عليك البر والفاجر، فلو أمرت أمهات المؤمنين بالحجاب: فانزل الله آية الحجاب...)). واتە: (عومەر – خ) گوتى: ئەى پێغەمبەرى خودا ! چاك و خراپ دێتە ماڵتان، خۆزگە فەرمانت بەدايكى موسڵمانان (واتە خێزانەكانت) دەدا بە حيجاب ! ئيتر ئايەتى حيجاب هات.

(قورتوبى) دەڵىّ: (ويدخل فى ذلك جميع النساء بالمعنى، وبما تضمنته أصول الشريعة من أن المرأة كلها عورة (بدنها وصوتها، فلا يجوز كشف ذلك إلا لحاجة) واتە:تەواوى ژنان لەو حوكم و بڕيارەدا وەكو ژنەكانى پێغەمبەرن –، دەبىّ هەردوولايان هيچ جێگايەكيان نامەحرەم نەيبينىّ، كاتى زەروورەت و پێويست نەبێت.

ئەمە ئەدەب و وێڵى دينى ئيسلامە سەبارەت بەژنان و پياوانى نامەحرەم، چونكە مرۆڤ تەنها بەو جۆرە لەدڵەڕاوكىّ و بەدگومانى دەپارێزرێت، خودا خۆى باشتر دەزانێت، كەبەغەيرى ئەو ئەحكامانە خۆى بڕيارى داون، پاكى و خاوێنى بەدەست نايەت، نابىّ

کەسێك بڵێت دڵ حسێبە، یان وەکو خوشکم سەیری ئەو ژنە دەکەم، یان بڵێت: ئەگەر ئینسانەکان (کچ‌وکوڕیان) هەر لەسەرەتاوە لە قوتابخانەو شوێنە گشتییەکاندا تێکەڵ بکرێن، ئیتر ئەو حەساسیەتەیان نامێنێ‌و بەدوای یەکدا ناگەڕێن‌و کەسێك دڵی پیس نابێت بەرامبەر کەسێکی تر ! ئەمە ئاشکرایە کە قسەی وا ناڕاست و درۆیە، چونکە خوای گەورە ئینسانی وا دروستکردووە خاوەنی (غەریزە)ی جنسیەو، بەیەکگەیشتن نەبێت دانا مرکێتەوە، ئەو کچ‌وکوڕانەش کە شەوو ڕۆژ بەیەکەون، دیارە ئەوەی مەبەست بیت ئەنجامی دەدەن لەو جێگایانەدا بۆیان دەست دەدات، ئیتر پێوست ناکات لەناو قەڵەباڵغیدا دەستبازی و شتی وا بکەن، بۆیە ئەگەر بمانەوێ کۆمەڵگە بەپاکی بمێنێتەوە، چار هەر ئەو حوکم‌و بڕیارەیە خوای دلۆڤان‌و میهرەبان داویەتی.

کاتێ ئایەتی (حیجاب) هات، بەلای موسڵمانانەوە جێبەجێکردنی زۆر سەخت بوو بەتایبەتی لەگەڵ خزمانی نزیکیان، بۆیە خوای کارزان فەرمووی: ﴿لا جناح عليهن في آبائهن ولا أبنائهن ولا إخوانهن ولا أبناء إخوانهن ولا أبناء أخواتهن ولا نسائهن ولا ماملكت أيمانهن واتقين الله إن الله كان على كل شيء شهيدا﴾٥٥/٣٥. واتە: سەبارەت بە تێکەڵی ئەو خزمانە (بێ پەردەدانان لە نێواندا) ژنان هیچ گوناحێکیان ناگات: باب‌و کوڕان و براو برازاو، خوشکەزاو ژنانی موسڵمان‌و ئەو کۆیلانە بوونەتە خاوەنیان یەکتر ببینن، وەدەبێ – بەپەنهایی‌و بەئاشکرا – لە خوا بترسن، چونکە خوا هەمیشە چاودێرە بەسەر هەموو شتێکەوە.

(سەید قوتب) دەڵێ: ناتوانم مێژووی هاتنی ئەم ئایەتەی ئێرە کە تایبەتە بەژنەکانی پێغەمبەر ﷺ، لەگەڵ ئایەتەکەی سوورەتی (نوور)دا کە گشتگیرەو سەرجەم ژنانی ئیمانداردەگرێتەوە، دیاری بکەم وبڵێم: کامیان لە پێشەوە هاتووە...؟ بەڵام قسەی پەسەند ئەوەیە کە ئەمەی سوورەتی (ئەحزاب) تایبەتە بە خێزانەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ، پاشان بڕیارەکە هەموو ژنانی گرتەوە.

جا بۆئەوە کە هیچ دوودڵیەك نەمێنێ سەبارەت بە (حیجاب) بۆ تەواوی ژنانی ئیماندارو کەسێك نەڵێت، (حیجاب) تەنها بۆ ژنانی پێغەمبەر ﷺهاتووە، خودای میهرەبان بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿ياأيها النبي قل لأزواجك وبناتك ونساء المؤمنين يدنين عليهن من جلابيبهن ذلك أدنى أن يعرفن فلا يؤذين وكان الله غفورا رحيما﴾٥٩/٣٢. واتە: ئەی پێغەمبەر ! بەژن‌و کچەکانت،و بەژنانی ئیمانداران بڵێ: بە (جیلباب = عەبا)کەیان تەواو جەستەیان داپۆشن (دەم‌و چاو هەموو جەستەیان) تالە ژنانی خراپ جیاببنەوەو دووڕووەکان ڕێیان لێ نەگرن، وەکو دەفەرمووێ: ئەوە نزیکترە بناسرێنەوەو ئازار نەدرێن. خوایش هەمیشە گوناه پۆشە، میهرەبانە.

کتێبی (روائع البیان/صابونی) دەڵێت: (جلابیب) جمع جلباب، وهو الثوب الذی یستر جمیع البدن. قال الشهاب: هو إزار یلتحف به، وقیل هو الملحفة وکل یغطی سائر البدن. قال فی لسان العرب: الجلباب: ثوب أوسع من الخمار دون الرداء، تغطّی به المرأة رأسها وصدرها. وقیل هو الملحفة) واتە:جەلابیب: بەو پارچە قوماشە دەڵێن:کە تەواوی جەستە داپۆشێ. بەدەم (ئیبن عەباس)ـەوە دەڵێن تەنها چاوێکی نەبێ !.بەڵێ ئەوەی ئەمڕۆ پێیدەڵێن (عەبا) لەگەڵ ئەو تەفسیرانەدا دەگونجێت و شتێکی شەرعیی و پەسەندە، دەمێنێتەوە سەر ئەوە ئاخۆ داپۆشینی دەم و چاو واجیب بێت؟. قورئان دەفەرمووێ: ﴿ولا یبدین زینتهن إلا بعولتهن أو آبائهن...﴾ نابێ ژنان زینەت و جوانیان بۆ مەحرەمیان نەبێ دەربخەن، دیارەکە دەم وچاو بنچینەو بناغەی جوانی ژنانە، وە هەمووکات لەوێوە تەماشای جوانی ژنان دەکرێت کەوابوو داپۆشینی واجیبە مەگەر کاتێ بزانرێ کەسێك نیە تەماشای بکات و سەرنجی ڕابکێشێ.

## حیجابی شەرعیی و پەسەند، چەند مەرجێکی هەیە

١) تەواوی جەستەی ژنان داپۆشێ.

٢) ناسك و تەنکێك نەبێ جەستەی لێوە دیار بێت.

٣) خۆی بۆ خۆی قوماشێکی سەرنج ڕاکێشەر نەبێت، خۆ ئەگەر پارچەیەکی وابوو، سەرنجی خەڵکانی بۆ خۆی ڕادەکێشا، ئەوەبە (حیجاب) دانانرێ وحەرامە پۆشینی.

٤) نابێ تەسك و ترووسك بێت و جەستەی بگووشێ وحیکایەت لە جەستەی بکات.

٥) جل وبەرگێکی خۆشبۆ (معطر) نەبێ، پیاوان بەخەبەرکات لە خۆی!

٦) جل و بەرگێك نەبێ پیاوانیش لەبەری بکەن.

کەوابوو هەرشتێك کرا بە (حیجاب)و صیفەتێك لەوانەی ناتەواو بوو، ئەوە حیجاب نییەو دەبێ ڕێ بەلەبەرکردنی نەدرێت.

ئەمەش ئەو دەقانەن کە لە قورئاندا دەربارەی حیجابی ژنان هاتوون:

١) ﴿وقرن فی بیوتکن ولاتبرجن تبرج الجاهلیة الأولی﴾.

٢) ﴿وإذا سألتموهن متاعاً فاسئلوهن من وراء حجاب....﴾.

٣) ﴿یاأیُها النبی قل لأزواجك وبناتك ونساء المؤمنین یدنین علیهن من جلابیبهن ذلك أدنی أن یعرفن فلا یؤذین...﴾.

٤) ﴿وقل للمؤمنات یغضضن من أبصارهن ویحفظن فروجهن ولا یبدین زینتهن إلا ماظهر

منها وليضربن بخمرهن على جيوبهن...﴾.

هیوادارم هەموو خوشکانی بەڕێزم، ڕیعایەتی حیجابی شەرعیی بکەن و بەقسەی خەڵکانی ناحەز و نەیاری ئیسلام فریو نەخۆن، چونکە حیجاب مەزنترین شتێکە کە مرۆڤ و ئاژەڵ لێك جیادەکاتەوە: ﴿يابني آدم قد أنزلنا عليكم لباسا يواري سوآتكم وريشا ولباس التقوى ذلك خير...﴾. جل و بەرگی جوان و خۆئارایشدان، نیشانەی شارستانیەتبوونی مرۆڤە، ڕووتیی و خۆداماڵینیش هێمای گەڕانەوەیە بۆ سەردەم ودەورەی ئاژەڵی و ژیانی بیدائیی.

## یازده ژن داستانی مێردەکانیان دەگێڕنەوە

کۆتایی ئەم بەشە دێنم بەو فەرموودە (متفق علیه)یە کە پێغەمبەر ﷺ بۆ خاتوو (عایشه)ی گێڕایەوە. بۆ هۆکاری گەڕانەوەکەیشی ڕیوایەتگەلێ هەیە (بەڵام هەر خوا چاك دەزانێ هۆکارەکەی چیبێ). یەکێ لەو ڕیوایەتانە دەڵێ: خاتوو (عایشه) – وەك باوونەریتی ژنان، کە هەمیشە خۆیان هەڵدەکێشن بەو صیفەتانەی لەباب و کەس وکاریاندا هەن – ویستی هێندێ لەسەروەتەکەی بابی و کەسێتی و ناوداریی بابی بگێڕێتەوە و بیکاتە (مەفخەرە)یەك بەسەر ژنەکانی تردا ! ئەوجا پێغەمبەر ﷺ پێیفەرموو: من و تۆ بۆیەکتر وەکو (ئەبوو زەرع) و (ئوم زەرع) واینە. واتە: هەر چۆنێ (ئەبوو زەرع) بۆ (ئوم زەرع)ی خێزانی زۆر چاك بوو، وە(ئوم زەرع)یش هەرکە باسی (ئەبووزەرع)ی مێردی کردبا، زۆر بە جوامێرو چاك ڕەفتار وەصفی دەکرد، جا خاتوو (عایشه) داوای لە پێغەمبەر ﷺ کرد: ئەو بەسەرهاتە چۆن بووە، ئاوا بۆی بگێڕێتەوە، ئەویش فەرمووی: لە گوندێکدا (١١) ژن کۆدەبنەوەو پەیمان بە یەك دەدەن کە هەرکەسەیان – بێ کەم و زیاد – وەسفی مێردەکەی بکا و هیچ شتێکی لێ کەم نەکات، چاك یان خراپ !پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

* یەکەم گوتی: ((زوجي لَحْمُ جمل غثٌ على رأسِ جبلٍ لا سَهْلٍ فَيُرْتَقى ولا سمينٍ فيُنْتَقَلُ)) واتە: مێردەکەم دەڵێی: گۆشتی وشترێکی لەڕوو لاوازی بێزراوەو، بەسەر شاخێکەوەبێ و ئاسانیش نەبێت بۆی سەرکەوی، قەڵەویش نەبێت بگوێزرێتەوە بۆ جێگایەکی تر. واتە: مێردەکەی دەڵێیت پارچە گۆشتێکی لەڕولاوازە، کەبەسەر شاخێکەوە بێ و دەست نەیگاتێ تاوەربگیردرێ، قەڵەویش نە بێ، تا لە پێناوپێگەییشتنیدا قبووڵی ماندوو بوونی بۆ بکرێ. مەبەستی ئەوەیە ئەوەند بەدڕەوشتە بەکەڵکی هیچ شتێك نایەت !.

* دووەم گوتی: ((زوجي لا أبث خبره. إني أخاف أن لا أذره، إن أذكره أذكر عُجَرَهُ وبُجَرَهُ)) واتە: من نامەوێ دەنگ وباسەکانی بەتەواوی بڵاوبکەمەوە، چونکە ئەوەند قسەکان زۆرن،

دەترسم درێـژە بکێشیّ، بـەڵکو کەباسی بکـەم، باسـی گـریّو گوتاڵـەکانی دەرەوەو نـاوەوەی دەکەم. واتە: دەرەوەو ناوەوەی خاوەن نەنگ وعەیبدارە !.

*سـێیەم گـوتی: ((زوجـی العَـشَنّقُ، إن أنطـق أطلَّـقْ، وإن أسـكُتْ أعَلَّـقْ)). مێردەکـەم: سەروسـیمایەکی ناشـیرینی هەیـە، ناشـوێرم قـسە بکـەم، چـونکە ئەگـەر قـسە بکـەم، تـەڵاق دەدرێم، ئەگەر بیّ دەنگیشبم، هەڵپەسێراو دەبم. واتە نەوەك ژنی خاوەن مێرد مامەڵەم لەگەڵ دەکات، نەبەتەواوی وازیشم لێدەهێنێت.

* چوارەم گـوتی: ((زوجـي كَلَيْـلِ تِهامَـةَ، لا حـرَّ ولا قـرٌ، ولا نَحافَـةَ ولا سـآمَةَ)) مێردەکـەم دەڵێـی شـەوە سـازگارەکانی (تیهامـە)ی وڵاتـی(یەمـەن)ـە، گەرچـی گـەرمیش بێـت، بـیّ زەرەرو زیانە، واتە: مێردەکەم ئـەخلاق جوانـەو ژیـانو هاوسـەری لەگـەڵیا خـۆشو بـیّ ترسـەو کـەس ناڕەحەت نابێت.

*پێنجەم گوتی: ((زوجـی إن دَخَـلَ فَهِـدَ، وإن خَـرَجَ أسِـدَ، ولا يَـسْأَلُ عمَّـا عَهِـدَ)) مێردەکـەم کەدێتـە ژوورەوە – لەشـەرمو بـیّ زیانیـدا – دەڵێیـت یـۆزە (فەهـد)، کەدەڕواتـە دەریـشەوە – لەئازاییدا شێرە.، ئەوەندش بەسەخاوەتە لـەماڵو سـامان ناپرسـێتەوە. واتـە: ڕەوشـت بـەرزو جوامێرە.

* شەشەم گوتی: ((زوجی إن أكَلَ لَفَّ، وإنْ شَرِبَ إشْتَقَّ، وإن اضطَجَعَ التَفَّ، ولا يـولجُ الكَفَ لِيَعْلَمَ البَثَّ)) مێردەکەم ئاوونـان زۆر خـۆرە، هەرکـە خـەوت بەتـەنها خـۆی دەپێـچێتەوە، دەسـت نابات بزانیّ چ باسە. واتە: کە خـەوت ناچـیّ بەلایاو سـەرجێیی لەگـەڵ ناکات. حەوتـەم گـوتی: ((زوجـی غَيابـاء. أو عَيابـاءُ، طَباقـاءُ، كل داء لـة داء شـجَّك او قَلَّـك أوجع كُـلاً لـك)) مێردەکـەم: شتێکی وا نیە، کەم ئاوەزە، پیشەی لێدانە، یان سەرت، یان جەستەت، یان هەردووکیان زامـدار دەکات. هەشـتەمیان گـوتی: ((زوجـی المَـسُّ مَـسُّ أرنَـبٍ، والـريحُ ريـح زَرْنَـبٍ)) مێردەکـەم: وەك کەروێشك نەرمو نۆڵە، بۆنی لەبۆنی گیای بۆنخۆشە. نۆیەم گوتی: ((زوجي رفيعُ العِمـادِ، طويـل النَّجـاد، عَظيمُ الرَّمـادِ، قريـبُ البَيْـتِ مـن النـاد)) مێردەکـەم: خانووبـەرەی بەبەرزاییەوەیـە (وەك بـاوی پیـاوانی هەڵکەوتـەو دەسـەڵاتدار) هەمیشە شـیری پێیـە (واتـە: ئـازاو لێهـاتووە) سـەخیو خـاوەن بەخشیـشە، ماڵەکـەی لەناوەڕاسـتیدایە (هـەتا خـەڵك بەئاسـانی بیبیـنن). دەیـەم گـوتی: ((زوجـی مالـك ومـا مالـكُ؟ مالـكٌ خيرٌ مـن ذلـك، لـه إبل كثيرات المبـارك، قليلات المسَارِحِ، وإذا سَمِعْنَ صـوتَ المزْمـارِ أيقنّ أنهـن هوالِـكُ) مێردەکـەم: وشـترێکی زۆری هەیـە، کـەم دەردەچـن بـۆ لەوەرگـە (هـەر لەماڵـەوەن، چـاوەڕوانی میـوان دەکـریّ سـەربڕێن بـۆی) کـاتیّ دەنگـی (عـوود)و گۆرانی دەبیسن، دەزانن تیادەچن (میوان هـاتووەو سـەردەبڕدرێن) یازدەهـەم گـوتی: ((زوجـی

أبـو زَرْعٍ، فما أبـو زَرْعٍ؟ أنـاسَ مـن حُلِـيٍّ أذنَـيَّ، ومَـلأ مـن شَـحْمٍ عُـضدَيَّ، وبَجَّـحَني فَبَجَّـحت الـيَّ نَفْسي، وَجَدَني في أهل غُنَيْمةٍ بِشِقٍ، فَجَعَلَني في أهل صَهيلٍ وأطيطٍ ودئيسٍ ومُنَقٍّ، فعنْدَه أقول فـلا أقـبح، وأرقُدُ فأتَـصَبَّح وأشْـرَبُ فـأتَقَمَّحُ)) مێردەکـەی مـن (ئـەبوو زەرع)ە، چ پیاوێکـە ئـەبوو زەرع؟ گـوێی پـڕ کـردوم لـە زێڕوزیـو، جەسـتەی پـڕ کـردووم لـە گۆشـت (ئەوەنـد سـەخییە) !بـە قسەی خـۆش، خۆشـحاڵی کـردووم، لـەناو مـەڕوماڵاتی کـەم مانـدوو بـووم، بردمیـە نـاو ڕەوگـەو گەلـە وشـتر، خـاوەن گـەنمو دانەوێڵـەی پاکیزەیـە (دەوڵەمەنـدو نـازدارە) هـەرگیز قسە ناداتـەوە بەڕوومدا ! هـەتا خـۆری چێشتنگا دەخـەوم (خزمـەتکاری بـۆ گرتـووم) لەهـەموو خواردنەوەیـەك (شیرو غەیری شیر) دەخۆمەوە (جۆرەها خواردنەوەی هەیە) (أم أبي زَرْع، فما أبي زَرْعٍ؟ عُكُومُها رِداحٌ، وبَيْتُها فَساحٌ). دایکـی (ئـەبوو زەرع)یـش چ ژنێکـە؟ جانتاکـەی پـڕو قورسـە، ماڵەکـەی گەورەو فراوانە، واتە: دایکی مێردەکەم دەوڵەمەندەو خاوەن حاڵو ماڵێکی چاکە دیارە ژنێکی ئاوا، کوڕەکەیشی هێشتا لاووگەنجە، کەوابوو مێردەکەم هێمان لاوە. (ابن أبي زَرْع، فما ابن ابي زَرْعٍ؟ مَـضْجَعَهُ كَمَـسَلّ شَـطْبَةٍ، ويُـشْبِعُهُ ذِراعُ الجُفْـرَةِ) کوڕەکیـشی، چ کوڕێـك بـوو؟ هـەر بەقـەد کێلانـی شمـشێرێك جێگـەی دەگـرت کـە دەخـەوت، بەدەسـتی کارژەلەیـەکی چـوار مـانگ تێـر دەبـوو، واتـە: کـوڕێکی زۆر ئێسك سووكو ئـەرك سـووك بـوو، بەئاسـانی دەخـەوت، بەکـەم تێـر دەبوو. (بنت ابي زَرْع، فما بنت أبي زَرْعٍ؟ طَوعُ أبيها وطَوْعُ أمّها ومِلْءُ كِسائها وغَيْظُ جارتِها) کچەکەیشی، چ کچێك بوو؟ گوێ ڕایـەڵی باوكو دایکی. جوانو بەلـەشو قـەوارە بـوو، هـەوێی توڕە دەکرد، واتە: حەسادەتو ئێرەیی پێ دەبرد. (جارية أبي زَرْع فما جارية أبي زَرعٍ؟ لا تَبُثُّ حـديثنا، ولا تُنَقِثُ ميراتَنا تَنْقيثا، ولا تملأ بيتنـا تَقْثيثا) کەنیزەکەیـشی، چ کەنیزەیـەك بـوو؟ قسەو باسمانی نەدەبردە دەری ماڵ، لە زەخیرەی ماڵمان گزی نـەدەکرد، بەرژەوەنـدی ماڵـەوەی دەپاراستو، چاودێری بوو.

ئوم زەرع گوتی: ((خَرَجَ أبو زَرْع والأوطابُ تمْخَضُ، فَلَقى امرأة معها ولدانِ كالفَهْدَيْنِ، يَلْقيـان مـن تَحت خصْرها بُرمَّانتينِ، فَطلَّقنى ونكَحَها، فَنَكَحتُ بعدها رجُلا سَرياً ركب شَرياً، وأخَذَ خَطيّاً، وأراح عَلَيَّ نَعماً ثَرياً، وأعطانى من كل رائحَةٍ زوجاً، وقال: كُلي امَّ زَرْعٍ وحيري أهْلَكِ) ئەبوو زەرع – کاتی مەشکە کیزان – لـەماڵ دەرچـوو، دەگـا بـەژنێك دوو منـداڵی شێرە خـۆرەی – وەك یـۆز– لەگـەڵ دەبێـت (واتـە: منـداڵو تەمـەن کـەم) یـاری دەکـەن لـە کۆشـی دایکیانـدا، مـنی تەڵاقداو ئـەوی مـارەکرد، منـیش شـووم بەپیاوێکی ماقووڵی ئەسپ سواری چاکی ڕم بەدەست کـرد، نیعمـەتو خۆشـیەکی زۆری بـۆ ڕشـتم، وەلەهـەموو حـەیوانو ئـاژەڵێکی پێـدام (واتـە: بەخششی زۆر بوو)و گوتی: ئوم زەرع! بخۆو بۆ خزمانیش ببە. ئوم زەرع گوتی: (فلـو جَمَعْتُ

كلَّ شَيْءٍ أعْطانيه ما بَلَغَ أصْغَرَ آنيةٍ أبي زرع) ئەگەر ئەوی پێیدام كۆمكردبايەتەوە، ئەوەند نەبوو هەميشە لە مەنجەڵەكەی (ئەبوو زەرع) دا لێدەنرا. خاتوو (عايشە – ر.خ) گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەمووی: (كُنْتُ لكِ كأبي زَرْعٍ) عايشە ! من بۆ تۆ وەكو ئەبوو زەرعم. لەڕيوايەتێكی تردا هاتووە: فەرمووی: ئەبوو زەرع (ئوم زەرع)ی تەڵاقدا، بەڵام من هەرگيز تەڵاقی تۆ نادەم. (نەسايی) دەڵێت: لەوەڵامی پێغەمبەردا ﷺ فەرمووی: (من وەكو ئەبوو زەرعم بۆ تۆم) خاتوو (عايشە) گوتی: (بل أنت خير من أبی زرع) نەخێر، تۆ چاكتری لە ئەبوو زەرع. لە (فتح الباری)بەرگی٩، باب حسن المعاشرة، ژمارەی فەرمووده:٥١٨٩.وە (فقه السنة)كەڵكم وەرگرتووە.

## گرێبەستی ژن و مێردیی / زەواج

زەواج: بريتيە لەو گرێبەستە كە جوتبوونی ژن وپياو حەڵاڵ دەكات.

بەڕێز (محمد أبي زهرة) لە كتێبی (عقد الزواج وآثاره) دەڵیٚ: ((الزواج عقد يفيد حل العشرة بين الرجل والمرأة بما يحقق ما يتقاضاه الطبع الإنساني وتعاونهما مدى الحياة ويحدد ما لكليهما من حقوق وما عليه من واجبات).

خودای خاوەن دەسەڵات لە هەموو بوونەوەردا – لەگەڵ جۆری جياوازيانـدا – نێرومێيـی فەراهەم هێناوە بۆ (تەلقيح)و متوربەكردنی يەكتر: ﴿ومن كل شئ خلقنا زوجين﴾. بۆ زەواج و ژيانی ژن ومێرديی، ئيسلام چەندين ياسا و ئەحكامی داناوە، تا باشتر توكمەو پايەدار ببیٚ و بەرگەی هەمووكات و ساتێكی خۆش و ناخۆش بگریٚو، هيچ شتێك نەتوانیٚ قەڵای ژيانيان بڕوخێنیٚ.

زەواج: بۆ پاراستنی كۆمەڵگەيە، بۆ بەختەوەری خێزانە، بۆ بڵاوبوونەوەی (فەضيلەت)و پاراستنی ئەخلاق و مانەوەی جۆری ئينسانە، خودا بە ئەمری خۆی دەفەرمووێ: ﴿فانكحوا ما طاب لكم من النساء..﴾٣/٤. يان دەفەرمووێ: ﴿وأنكحوا الأيامي منكم والصالحين من عبادكم وإمائكم..﴾ نوور: ٣٢. پێغەمبەريش ﷺ بۆ خۆی دەفەرمووێ: ((يامعشر الشباب! من استطاع منكم الباءة فليتزوج، فإنه أغض للبصر وأحصن للفرج...)) بوخاری / كتاب النكاح، ژمارەی فەرمووده: ٤٧٧٩. وە بۆ شيرينكردنی ژنان و بەرزڕاگرتنی قەدرو حورمەتيانە كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((الدنيا متاع، وخير متاع الدنيا المرأة الصالحة)) موسليم: كتاب الرضاع. يان دەفەرمووێ: ((أربع من سنن المرسلين: الحياة والتعطر، السواك، والنكاح))ترمذي: كتاب النكاح.

## حیكمەتی نیكاح

زاناكانی ئیسلام هەریەكەیان بە بۆچوونی خۆی شتێكی لەحیكمەت و فەلسەفەی نیكاح نووسـیوە، نایـەوێ لێـرە درێـژەی بـدەینێ، بـەلاّم ئـەم چـەندە خالـە كـە (الفقـه المنهجـی) نووسیویەتی، ئاماژەی پێدەكەین:

١-بۆ وەلاّمدانەوەی داخوازییەكانی (غەریزە) و (فیطرەت)ی ئینسانەكانە.

ئەمەیە كە پێغەمبەر ﷺ رێ لە ژیانی زوگردیو رەبەنی دەگرێ. (سمرە) دەڵێ: ((أن الـنبی ﷺ نهی عن التبتل)).

٢-درێژەدان بەكاروانی مرۆڤایەتی، لە رێگەی نەسلی ئایندەی شەرعییەوە، فەرموودەی ((تزوجوا الولود الودود..))بۆ ئاماژەی ئەو راستیەیە.

٣-پێكهێنانی ئارامیی و سوكنایی دڵودەروونو نەفەسو روح.

بۆیە كە ئەوەند(ژنومێردێك) دڵئاسوودەیی و (سەكینە)ی نەفسیان پێكەوە دەبێ، هـەرگیز كوڕوكچێكی رەبەن نایاندەبێ.. ئەمەیـە كـە خـودا دەفـەرمووێ: ((ومـن آیاتـه أن خلـق لكـم مـن أنفسكم أزواجا لتسكنوا إليها وجعل بينكم مودة ورحمة...)).

٤- بۆ راگرتنی ئەخلاقو قییەمە لە پەستییو دابەزین:

بێگومان ئەگەر مرۆڤ لـە رێـی پەسـەندەوە رێـی نـەدرێت ئارەزووی جنسیی تێـر بكـات، هـەوڵ دەدات لە رێگا چەوتو درێوەكانـەوە خـۆی دامركێنێت، جا لـەو حاڵەتەشـدا مەگـەر خـودا بزانـێ چی روودەدات لە كۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا ! ئەمەیە كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((إذا جـاءكم مـن ترضون دينه وخلقه فانكحوه، إلا تفعلوا تكن فتنة في الأرض وفساد)) ترمذي / كتاب النكاح.

٥- لەبەر پاراستنی جۆری مرۆڤەكانە لەهەر نەخۆشییو پەتایەك، بۆیە خودای میهرەبـان تـەنها لـە رێی پەسـەندو شـەرعییەوە رێگـە دەدات نێرومێـی بگەنـە یـەك، ئەگینـە ئـەو كۆمەڵگـەی مرۆڤایەتییـە دەبێتـە كانگـەی هـەموو جـۆرە بەدبـەختیو نەخۆشـییەك، دەبێتـە جێگـەی وەبـەرهێنانی فەسـادوكاری درێـوو ئـاژەڵیو بەربوونـە گیـانی یـەكتر، ئەمەیـە كـە دەفەرمووێ: ﴿إن الله بالناس لرؤوف رحيم﴾ (البقرة: ١٤٣).

٦- لەبەر فراوانبوونی رێگەی نزیكبوونەوەی مرۆڤەكان بەیەكدی و هاوكارییان.

بێگوومانە كە زەواجی شەرعیی باشترین هۆكارە بۆ پەیوەندی خێزانو عەشیرەتو هـۆزو خێڵو تیرەكان، هەر لەو رێیەوەیە یەكێ لە بنەماكانی رشتەو رەچەڵەكو (موصاهەرە) و ژنو ژنخواستن پەیدا دەبێ، خزمایەتی لەوێوە دروست دەبێ، وە ((التكافل والضمان الإجتماعي)) بەهێز دەبێ، هەردوولا مندالّ پێدەگەیەنن... هتد.

**(المفصل)یش چەند خاڵگەلێکی هێناوە، یەکێ لەوانە:**

یەکەم: زۆر بوونی ئوممەتی ئیسلامییەو لەپاڵ ئەوەیشدا بە هێزبوونیەتی، ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((خیر نسائکم الولود الودود)).

دووەم: لە ڕێی ژن و مێردیی شەرعییەوە ژن و پیاو بۆ یەکدی قۆرخ دەبن و هەریەکەیان هەموو هەست و نەستێکی دەبێتە ئەویکەیان و پاڵپشت دەبن بۆ یەکتر.

زەواج: هەندێ جار واجیبە، واتە: لە پلەی (ندب) و (مباح) سەردەکەوێ و دەچێتە پلەی (واجب)ەوە، بەو مانایە ئەگەر هەوڵی بۆ نەدەیت گوناحبار دەبی.

زەواج: هەندێ جار پێش دەخرێ لە (حەج)ی ماڵی خودا، بەتایبەتی ئەگەر ئینسانێکی (شەهوانیی) و خاوەن ئارەزووی وا بێت کە ئەگەر ژن نەهێنێت وەیان شوو نەکات، تووشی شەرواڵ پیسی و کاری درێو دەبێت.

زەواج: بۆ ئەو جۆرە کەسانە – هەقەو ڕێگەش بەقەرزکردن دەدات، بۆ تەواوکردنی ئەو کارەیە.

زەواج: وایش دەبێ (حەرام)ە. واتە: ئەگەر پیاوێك بزانێت توانای ژن و مێردی نییەو ناتوانێ ژنەکەی ڕازی بکات، وەیان ژنێك جەستەو قەوارەی ژن و مێردی نییە، لە حاڵەتی ئاوادا نابێ هیچ لایەکیان نزیکی (زەواج ببنەوەو یەکتر دەسخەڕۆ بکەن. یان ئەگەر بزانن تووڕەو ئەشقین و مافەکانی نێوان ژن و مێردی ناپارێزن، دیسان هەقنییە هیچیان نزیکی (زەواج) ببنەوە.

زەواج: ئەمڕۆ – پتر لە ڕابردوو – دەبێ هەوڵی بۆ بدرێ، چ لە لایەن دەوڵەتەوە، چ لەلایەن کچان و کوڕان (خۆیانەوە)، چونکە سەردەم و زەمانی ئێستا چڕوپڕترە لە (فەساد) و لە هۆکارەکانی بزووتنی هێزی سێکسیی لە مرۆڤدا،ئەوروپا بە تەواوی لە ڕووی کەناڵە ئاسمانیەکانیەوە لەو مەسەلەدا هیچی نەهێشتووە نەیکاو نەیڵێت، وە لە هەموو ماڵێکیشدا هەیە ! سەرەڕای ئەمانەش نیکاح سووننەتی پێغەمبەرانە – علیهم السلام)–.

(ئیبن تەیمیە) چەند جوان دەڵێت: ((الإعراض عن الأهل والأولاد ليس مما يحبه الله ورسوله، ولا هو دين الأنبياء، قال تعالى: ﴿ولقد أرسلنا رسلا من قبلك وجعلنا لهم أزواجا وذرية..﴾. بۆیە دەبێ هەوڵی جددی بدرێت بۆ وەدەستخستنی هاوسەر، ئەگەرچی لە ڕێیگۆڕینی سیستمی خوێندنیشەوە بێت بۆ کچان، چونکە شیاو و گونجاو نیە کە نێرو مێ هەردوویەك سیستمی خوێندنیان هەبێت، کچ نزیکەی (٣٠)ساڵ خۆ خەریك بکات بە قۆناغەکانی خوێندنەوە، لەو کەش و هەوا لەبارە بۆ فەساد و گوشاری هێزی سێکسیی و جنسیی، کە بێگومان تووشی زۆر شتی نادروست و ناڕەوا دەبێت، هەقە چاوێ بە سیستمی

خوێندندا بگێڕنـەوە، تـا لاوەکـان بتـوانن هـەم بخـوێنن‌و هـەم (زەواج)یـش بکـەن، بەتایبـەتی جیهـانی ئیـسلامەتیی – بەپلـەی یەکـەم – بەرپرسـە لـە خوێنـدن‌و هێـزی سێکـسی لاوەکـان، هەقە دەوڵەت هەڵیان نێت بۆ (زەواج) ئەگەرچی قۆناغەکانی خوێندنیشان تـەواو نـەکردبێت، بـەڵام لەگـەڵ دابینکردنـی ڕێ‌و شـوێنی حەوانـەوەو ئیـسراحەت‌و خـەوو خـواردن بۆیـان، تـا کۆمەڵگە هەم بە پاکی بمێنێتـەوە، هـەم لـە خوێنـدنی دنیـای ئـەمڕۆش دوانەکـەوێت، هەقە بـۆ ئەوە یەك وەزارەت تەرخان بکرێت، هەر لە خوێندن‌و مەنهەجەوە تا دەگاتـە مەسـەلەی زەواج، من بە ڕاستی نازانم مەنهەجێکی نزیکەی (٢٥) سـاڵی دابنرێـت بـۆ قوتـابی‌و خوێنـدکار، بـەڵام بەهیچ شێوەیەك بیر لە هێزی سێکسیان نەکرێتـەوە، وەك پێیـان بڵـێن چـۆن خۆتـان تێردەکـەن لەو مەسەلەیە، ئازادبن !.

* ئوسـرەو خێـزان لـە ئیـسلامدا خـشتی بنـەڕەتی کۆمەڵگەیـە، تـاك بەشـێکیەتی ﴿ذريـة بعضها من بعض﴾. (آل عمـران: ٣٤). پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووێ: ((مـامن مولـود إلا يولـد علـى الفطرة، فأبواه يهودانه، وينيصرانه، ويمجسانه، كما تنتج البهيمـة بهيمـة جمعـاء، هـل تجـدون فيها من جدعاء))موسليم: كتاب القدر.

کەوابوو تاك بە شێکە لە خێزان، خێزانیش بەشێکە لە کۆمەڵگـە، جـا ئەگـەر خێـزان چاك‌و صـاڵح‌و بـاش بـوو، بێـشك تـاکیش صـاڵح دەبـێ، ئەوسـایش کۆمەڵگـە هـەموو سـازو سـازگار دەبێت.

بۆیـە ئیـسلام بـەر لـە هـەموو شـتێك فـەرمان بـە پێکـەوەنانی خێـزان دەدات، گرنگـی خـۆی دەداتیّ‌و بەشێکی بەرچاوی قورئان‌و سوننەت بـاس لـە خێـزان دەکـەن‌و ڕێگـە نـادەن لـە ڕێـی خێزانی شەرعیی نەبێ تێکەڵی ژن‌و پیاوی بکرێت: ﴿ولا تقربوا الزنى إنه كـان فاحشة وسـاء سبيلا﴾ الإسراء: ٣٢. دیـارە هەرسـەرجێیکردنێك لـە ڕێـی ژن‌و مێـردی شـەرعییەوە نـەبێت بـە (زینـا) و (سـەفاح) دادەنرێـت، خـۆ جوتبـوونی ئـاوایش قەدەغـەو حەرامـە: ﴿محـصنين غـير مسافحين ولا متخذي أخذان..﴾ (المائدة:٥) ڕێگرتنە لەو کارە دزێوو فاحیشەو هـەر دۆسـت‌و دەسگیرانێك بە ناشەرعیی بێت، گشت ئەمانە بۆ پاراستنی زنجیرەی خێزانە.

## دەبێ کچ وکوڕ هاوسەری شیاو هەڵبژێرن

* لە شەریعەتی ئیسلامدا داوا لە کچ‌و کوڕ دەکرێت کە هەر کامێکیان هاوسەرێکی بـاش‌و صـاڵح‌و شـیاو بـۆ خـۆی هەڵبـژێرێت، تـا لـە دوا ڕۆژدا باشـتر بتـوانن پێکـەوە بـژین‌و ماڵـداری خۆیان بکەن، ئەوەیە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وآله وسلم) دەفـەرمووێ: ((تخيروا لـنطفكم والأكفاء وأنكحوا إليهم))ئیبن ماجە.

**بۆ ئەو هەڵبژاردنەش ئەم چەند ڕێنمایانە ڕەچاو کراون:**

**١- د یندارو صاڵح بێت:**

ئیمامی (بوخاریی (شرح العسقلانی: ج ٩ ص ١٣٢) ئەم فەرموودەیە هێناوە: ((تنكح المرأة لأربع: لمالها ولحسبها وجمالها ولدينها، فاظفر بذات الدين تربت يداك)) واتە: ژن کە هەڵدەبژێردرێت لەبەر یەکێ لەم چوار خەصڵەتانەیە: دارایی، شەرەفداریی و حەسەب ورشتەی، جوانیی وشۆخ وشەنگیی، موسڵمانەتیی و دینداریی، جا تۆ لەبەر هەر کامێکیان بێت، دەتوانی بیکەیتە هاوسەرت، بەڵام بەدوای دینداردا بگەڕە، تا سەرکەوتوو و بەختیار بیت.

دەبێ هەر جۆرێك بێت مەسەلەی ((دین)) پشتگوێ نەخرێت، ئەگینە خەصڵەتەکانی تر بە تەنها ڕۆڵ‌و دۆزی سەلبی دەبینن‌و زۆر کەم زەواجی وا سەرکەتوو دەبێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((لا تزوجوا النساء لحسنهن، فعسى حسنهن أن يرديهن، ولا تزوجوهن لأموالهن فعسى أموالهن أن تطغيهن، ولكن تزوجوهن على الدين، ولأمة خرماء سوداء ذات دين أفضل)). واتە: لەبەر جوانی ژنان مارە مەکەن، چونکە نزیکە بە جوانییەکەیان خۆ هەڵەبکەن‌و بکەونە ناو عوجب‌و کیبرەوە. وە لەبەر ماڵەکەشیان مارەیان مەکەن، لەوانەیە بەو بۆنەوە یاخیی ببن لێتان، بەڵام لەبەر دینداری مارەیان بکەن، بێگومان کەنیزەیەکی گوێ‌و لووت بڕاوی ڕەشپێستی دیندار باشترو شیاوترە بۆ هاوسەری، لەو ژنانەی دی.

بێگومان ژنی صاڵح‌و چاك، دەتوانێ مێردەکەشی صاڵح‌و چاك بکاو، بەرەو قیامەت ئامادەی بکات، هاوکاری بێت بۆ پیاوەتی‌و جوامێریی ناو کۆمەڵگە، سەرەڕای ئەمانەیش مایەی ئیسراحەت‌و حەوانەوەی ماڵە بۆ پیاو، هۆی سەقامگیریی‌و دڵئاسوودەیی مێردە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((إنما الدنيا متاع، وليس من متاع الدنيا أفضل من المرأة الصالحة))ئیبن ماجە.

ژنی صاڵح‌و باش – دوای تەقوای خودا – لە هەموو شتێك باشترە، ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ما استفاد المؤمن – بعد تقوى الله – خيرا له من زوجة صالحة إن أمرها أطاعته، وإن نظر إليها سرته، وإن أقسم عليها أبرته، وإن غاب عنها نصحته في نفسها ومالها)) ئیبن ماجە. ژنی صالح‌و سازاو بۆ خودا، مێردیش دەسازێنێ بۆ خودا، هەردوو پێکەوە بەرەو خودا دەڕۆن، هەردوو پێکەوە بۆ خودا کار دەکەن، لە فەرموودەیەکدا هاتووە: ((ليتخذ أحدكم قلبا شاكرا، ولسانا ذاكرا، وزوجة مؤمنة تعين أحدكم على أمر الآخرة))ئیبن ماجە.

**٢- جوان‌و شۆخ‌و شەنگ بێت:**

پێشتر گوتمان تا دەکرێت، باژنێکی بە تەقواو صاڵح بکرێتە هاوسەر، ئەگەرچی جوانیش

نەبیٚ، جا ئەو قسەیەش ئەوە ناگەیەنیٚت کە بەلای ژنی جوانو شۆخدا نەچن، بە پیٚچەوانەوە ئەگەر بگونجیٚت دیندارو شۆخو شەنگیش بیٚت، بیٚگومان باشتر دلٚ دادەمەزریٚت، باشتر بیانووەکانی نەفسو ئارەزوو دەبڕیٚت، باشتر پیٚکەوە دەژینو خۆشەویستیو ئولفەتیان زیاد دەکات، بۆیە سەرجەم زاناکان بەڕاشکاوی دەلٚیٚن: هاوسەر تادەکریٚ بەجەمالو جوان بیٚت، لەبەر ئەوەیە ڕیٚنمایانکردووە: کچو کوڕ بەر لەوە یەکتر بخوازن، دەبیٚ یەکتر ببینن، لە پیٚغەمبەر ﷺ دەپرسن: لە ژنان کام ژن باشترە بخوازریٚت؟ فەرمووی: ((التي تسره إذا نظر اليها، وتطيعه إذا أمر، ولا تخالفه في نفسه ولا في ماله بما يكره)) ئەحمەد نەسایی. یان دەفەرمووێ: ((خير فائدة أفادها المرء المسلم – بعد إسلامه – إمرأة جميلة تسره إذا نظر إليها، وتطيعه إذا أمرها وتحفظه في غيبته في ماله ونفسها)).

**٣- کچ بیٚت:**

واتە: ئەو کەسەی دەیەوێ خیٚزان پیٚکەوە بنیٚت، تا بۆی دەکریٚت، هەولٚ بدات کچ مارە بکات، چونکە کچ بە هەموو شتیٚك ڕازی دەبیٚو، لەگەلٚ میٚردا دلۆڤانترە، پتر توانای وەبەر هیٚنانی مندالٚو نەوەی هەیە، پیٚشتر هیچ جۆرە مالٚو حالٚو دارایيو ژیانیٚکی دی نەدیتووە، ئیستاش چۆن ڕابهینریٚت، وا ئولفەت دەگریٚو دلٚی بەو حالەتەی خۆشە لە مالٚی میٚرد دەیبینیٚ و تیٚیدایە، ئەوەیە کە پیٚغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((عليكم بالأبكار، فإنهن أعذب أفواها، وأنتق رحما، وأرضي باليسير))ئیبن ماجە. بەلاٚم لەگەلٚ ئەوەیشدا مارەکردنی بیٚوەژن، هەندیٚ جار باشترە لە کچ، بۆ نموونە: ئەو کچانەی دەست دەکەون، دینداریٚکی وانین، بەلاٚم بیٚوەژنیکی دینداری باش هەیە، لەوکاتەدا مارەکردنی بیٚوەژنەکە پەسەندترە، یان کابرایەکی مندالٚ دارەو، لەبەر مندالٚەکانی هیٚنانی بیٚوەژنیٚك بۆ ئەو کەسە باشترە، چونکە خزمەتی خۆیو مندالٚەکانی، یان خوشكو براکانی دەکات.

ئیمامی (بوخاری–شرح العسقلانی ج٩ ص ٥١٣) لە (جابر عبدالله)وە دەگیٚڕیٚتەوەو دەلٚیٚ: باوکم مرد، (٧) یان (٩) کچی بەجیٚهیٚشت، منیش چووم بیٚوەژنیٚکم مارەکرد، دوایی پیٚغەمبەر ﷺ فەرمووێ: جابر ژنت مارەکرد؟ گوتم: بەلٚیٚ. فەرمووی: کچ یان بیٚوەژن؟ گوتم: بیٚوەژن. فەرمووی: ((فهلا جارية تلاعبها وتلاعبك، وتضاحكها وتضاحكك ؟)). دەبۆ کچیٚکت مارە نەکرد، تا یاری لەگەلٚ بکەیتو یاریت لەگەلٚ بکات، بیهیٚنیتە پیٚکەنینو بتهیٚنیٚتە پیٚکەنین؟. جابر گوتی: عبدالله ی بابم کۆچی دواییکردووەو ئەو کچانەی بە جیٚهیٚشتووە، نەدەکرا وەك ئەوان بهیٚنم بۆ ناویان، بیٚوەژنیٚکم مارە کرد، تا چاودیٚری و خزمەتییان بکات، ئینجا پیٚغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بارك الله لك)).یان مارەکردنی بیٚوەژنیٚکی هەژارو بیٚکەس،

یـان خـزم، یـان خـاوەن جیهـادو هیجـرەت، لەبـەر هەریـەك ئـەو صـیفەتانە باشـترە لـە كـچ مارەكردن، بۆیە موسڵمانان گەلیٚ جار بێوەژنەكانیان مارەدەكرد.

٤- **خاوەن سكو زا بێت:**

مارەكردنی هەر ژنێك سكو زا بكات، لەو ژنانە باشترە سكو زا ناكەن، ئەگەرچی كچیش بن ! چونكە دەبێتـە هۆكـار بـۆ وەبـەرهێنانی (نەسل)و نـەوەی ئاینـدە. (ئـەبوو داود) لـە (معقل بـن یسار)ەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: پیاوێك بە پێغەمبەر ﷺ ی گوت: ژنێكی جوانو حەسبدار هەیە بەڵام منداڵی نابیٚ، ئایا مارەی بكەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر. جارێكی تر هاتەوە بۆ هەمان مەبەست، پێغەمبەر ﷺ هەر ڕیٚی نەدا. جاری سێیەم هاتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((تزوجوا الودود الولود فإني مكاثر بكم الأمم)). ئەو ژنە مارە بكەن كە مێردیان خۆش دەویٚو سكوزاش دەكەن، چونكە من بە زۆری ئێوە شانازی دەكم بەسەر ئومەتانی دیكەدا.

٥- **بنچینە پاك بێت:**

مـارەكردنی ژنێكـی بنـچینە پـاكی دیـار - بـۆ ئـەوە نـەوەكانیش چـاك بـن - كـارێكی شـەرعیی و پەسـەندە، بـەڵكو دەبیٚ خـۆ مانـدو بكرێـت بـە دوایـدا: ((فـاظفر بـذات الـدین تربـت یداك)). یان ((تخیروا لنطفكم..)) بۆ دنەی ئەوەیە.

٦ - **منداڵی خۆشبوێت:**

بەر لەمارەكردنی ژنان، بۆ پیاو واباشە لەهەر ڕێگەیەكەوە بێت، بزانێت ئەو ژنەكە دەیـەوێت مـارەی بكـات، لەگـەڵ منـداڵان دلۆڤـانو میهرەبانـە، دەزانـیٚ بـاش پـەروەردەو خزمـەتیان بكـات، دڵسۆزە بـەماڵو حـاڵی مێـرد، ئەوەیەكـە ئیمـامی (بوخـاری - شـرح العسقلانی ج ٩ ص ١٢٥ - ١٢٦) لـە (ئـەبوو هـورەیرە)وە دەگێڕێتـەوەو دەڵێـت: پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ((خـیر نسـاء ركـبن الإبل، صالح نساء قریش: أحناه على ولده في صغره، وأرعاه على زوج في ذات یده)).

٧- **لە خانەوادەیەكی دیندارو صاڵح بێت:**

سوونەتە هەوڵ بدرێت، ئافرەتێك بخوازرێـت لـە خێـزانو بنەماڵەیـەكی خواناسو دینـدار بێت، خاوەن سومعەو ناووشۆرەتێكی پاكو بەرز بێت، بە ئەخلاقو دیندار بێت، تا باشتر لەگـەڵ هاوسـەردا ژیـان بەرنـە سـەرو پێكـەوە لەسـەر بنـچینەیەكی خواناسـی زاروو نەوەكانیشیان پیٚ بگەیـەنن، ئەوەیـە كـە پێغەمبـەر ﷺ دەسـتە دامێنیـان دەبێـت كـە لـە ژنـانی خراپو ڕیٚو شوێن خراپ نزیك نەبنەوە: ((إیاكم وخضراء الدّمن، فقیل: وما خضراء الدمن؟ قال: ألمرأة الحسناء في المنبت السوء)) دارەقوطني.

**٨- خزمی تەواو نزیك نەبێت:**

زاناکـان وا بەچـاك دەزانـن، مـرۆڤ خزمـی زۆر نزیکـی خـۆی نـەخوازێ، نـەوەك بـۆ دوایـی پێکەوە نەسازێن و هەراو کێشەی لێ پەیدا ببێ و، پاشانیش تەڵاق بێتەکایەوە، ئینجا لـەوەوە پەیوەندی خزمایەتیشیان نەمێنێ، یان بۆ ئەوە کە مرۆڤ لەباتی ئەوە لە خزمان ژن بخوازێت، بچێت لە عەشیرەت و خێڵەکانی دی بخوازێ، تا پەیوەندی لەگەڵ ئەوانیشدا پەیدا بکات، ئیتر ئـەم قسەیە کـە دەڵـێ: ئەگـەر لـە خزمـانی نزیکـی خـۆی ژن بخوازێـت منـداڵیان لاواز دەبـێ، پەسەند ناکرێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ خاتوو (فاطمە)ی لە (عەلی) ئامۆزای مارە کرد، کـە زۆر بەیەك نزیـك بـوون. ئـەم فـەرموودەش: ((اغتربـوا لاتـضووا...)) واتـە: ژنـانی غـەریب و دوور لـە خۆتـان بخـوازن... هـەر ئـەوەی لـێ وەردەگیردرێـت کـە لـە خـەڵکانی دوور ژنـان مـارە بکـرێن، تاپەیوەندی نێوان ئینسانەکان پتر بێت.

**تێبینی:**

بەرژەوەندی لە کوێدا دەبینرایەوە ئەوە ڕەچاو بکرێ باشـترە لـەوەی کەهـەر بگـوترێ: ژنـی دوور لـەخۆتان مـارە بکـەن، چـونکە وا دەبـێ بەرژەوەنـدی لـە ژنـی دووردایـە، وایـش دەبـێ لـە ژنانی خزم و پشتدایە.

**٩- دەبێ ژنانیش خاڵگەلێك لە دڵخوازەکەیاندا ڕەچاو بکەن:**

ئەو خاڵانەی سەرەوە بۆ هەڵبژاردن و مارەکردنی ژنـان بـوو، هەقە ژنانیش کـاتێ دەیانـەوێ مێـرد بکـەن، کۆمـەڵێ خـاڵ بـۆ خۆیـان ڕەچـاو بکـەن، هـەوڵ بـدەن لـە ڕێـی خۆشەویـست و دۆسـتیانەوە بگـەڕێن بۆپیاوێـك خـاوەنی ئەوصـیفاتانە بێـت، تـا تووشـی پیـاوێکی ئەشـقیی و لاسارو تووڕەنـەبن و گیرۆدە بـن و بـۆ دواییـش بەئاسـان بۆیـان چارەسـەر نـەکرێت. ئیمـامی (بوخاری / شرح العسقلانی ج٩ ص ١٧٤) دەگێڕێتەوە کە: (ثابت بن البنـاني) لای پێغەمبـەر ﷺ دەبێ و ژنێك دێتـە لای پێغەمبـەر ﷺ دەدات بە گوێیدا کەدەیـەوێ شـووی پـێ بکـات؟ کچەکەی (ئەنـەس)یـش کەلـەوێ دەبـێ دەڵـێ: وای چ کـەم شـەرمە، وای لـەو ئابڕووچـوونە؟! ئەنـەس بەکچەکەی دەڵێت: ئەو ژنە گەلێ لە تۆ باشترە، چونکە پێغەمبەری خۆش دەوێ و داوای لێدەکا مـارەی بکـات. (ئـیبن حەجـەر) دەڵـێ: بـە پێـی ئەمـەو ڕووداوی تـر لـەو وێنەیـە، ژنـان دەتـوانن هـەوڵی خۆیـان بـدەن و بەهـەر شێوەیەك شیاوی کۆمەڵگەکە بێت بدەن بەگوێی هـەر پیاوێکدا دەیانـەوێ مێـردی لەگـەڵ بکـەن، وەلـە ڕووی شـەریعەتی ئیسلامەوە هـیچ شـتێکی تێـدا نییـە، بەڵکو تـەواوی زاناکـان بـە سوونەتی دادەنێن، بـەڵام دەبـێ مەسـەلەی دینـداریی و صـەلاحەت و

خواناسى لەو پياوەدا لە بير نەچێت.. هەڵبژاردنى پياويش، وادەبىٚ ژنەكە بۆ خۆى پێيدەڵىٚ، وايشدەبىٚ كەسێكى شياو بۆ ئەو كارە دەنێرێتە لاى، جا ئەگەر وەڵامى دايەوەو قبوڵى كرد، يان قبوڵى نەكرد، نابىٚ لەو نێوانەدا لێك نزيك ببنەوەو تووشى كارى ناشەرعيى ببن.

## خوازبێنى

خوازبێنى – چ لە باوكو دايكو كەسو كار بكرێت، يان ڕاستەوخۆ ژن لەگەڵ پياوو، پياو لەگەڵ ژن مۆڵەتێكە –بەر لە گرێبەستەكە –بە ژنو پياو دەدرێت كە لەو ماوەيەدا حاڵو ئەحواڵى يەكتر شارەزابن، بچن پێش وەڵامدانەوە لەيەكترى بپرسن، بزانن ئەو صيفەتانەى تێدايە بۆ ژن ومێرديىو بەهاوسەربوون پێويستن، چونكە ئەمە يەكەم هەنگاويانە بۆ پێكەوەنانى ماڵو خێزانو ببنە باوكو دايكى مندالآن،جالەبەرئەوە زۆر زۆر پێويستە بۆ هەردوولا – ژنو پياوەكە – لەيەكەم هەنگاودا تووشى هەڵە نەبن، ژنەكە پياوێكى وا هەڵبژێرێت، سبەينىٚ ئابرووى نەبات، پياوەكەش هەوڵ بدات ژنێكى شياوو دامەزراو پەيدا بكات دوو بەيانى ژيانى لىٚ تێك نەدات. دەشكرىٚ بەر لە خوازبێنى هەر كامێكيان لە حاڵى ئەويان بپرسێت، هەر كەسێك بەشياوى مەشۆرەت دێت بۆ ئەوكارە، ژنەكە يان پياوەكە بچن مەشۆرەتى پىٚ بكەن، ئينجا ئەويش لەوبارەوە هەرچى بزانىٚ دەبىٚ بەڕاشكاوى بەو ژنە، يان بەو پياوەى بڵێت، خۆ ئەگەر لەبەر خزمايەتى، يان لەبەر هەر هۆيەك هەندىٚ صيفەتى خراپى لێشاردنەوە، دەبێتە خەيانەتو گزى لەو ئينسانە مەشۆرەتى پێكردووە..لە فەرموودەدا هاتووە: ((الدين النصيحة)).

(فاطمەى كچى قيس)، (معاويەى كوڕى أبى سفيان)و (ئەبوو جەهم) ناوێك خوازبێنيان كردبوو، جا پێش ئەوە بۆ هيچ كامێكيان ئەرىٚ بكات، هات مەشۆرەتى بەپێغەمبەر ﷺ كرد: ئاخۆ ئەو دوانە بەكەڵكى ئەوە دێن، ئەگەر ئەرىٚ بۆ يەكێكيان بكات ؟ پێغەمبەر ﷺ بەڕاشكاوى فەرمووى: ((أما أبوجهم: فلا يضع عصاه عن عاتقه، وأما معاوية فصعلوك لامال له، أنكحي أسامة بن زيد)) واتە: ئەبوو جەهم: دار دەستەكەى هەميشە وا بەشانيەوە، واتە: لەگەڵ ژنان بەدرەفتارو خراپە، (معاويە)ش پياوێكى نەدارو هەژارە، تواناى ژن بەخێوكردنى نييە (واتە: شوو بەهيچ كامێكيان مەكە) بچۆ شووبە (ئوسامەى كوڕى زەيد) بكە. كەوابوو هەر كەسێك مەشۆرەتى پێكرديت لەبارەى ئەو كەسەوە دەيەوىٚ بيخوازێت،يان دەيەوىٚ شووى پىٚ بكات، دەبىٚ هەرچى تێدا بێت لەو بارەوە بەڕاشكاوانە باسبكرێت، وە شەريعەتى ئيسلام كە غەيبەتى حەرامكردووە، لەبەر زەروورەت ڕێى بەوەداوە بە غەيبەتى دانانىٚ.

ژنانو پیاوانی پێشوو ئەوەند گرنگییان بەو مەسەلەیە دەدا، دەچوون (ئیستیخارە)یان بۆدەكردو لەخودا دەپاڕانەوە كە ئەگەر باش وڕێك وپێك بێت، بۆیان ئاسان بكات، ئەگینە ڕێك نەكەوێت !.

## ئەو ژنانە بۆ خواستن دەشێن

١- ئەو ژنانە دەخوازرێن، نابێ بە خوازیارەكە مەحرەم بن (وەك دایكو خوشكو پوور — لەهەردوو سەرەوە — برازاو خوشكەزاو خوشكی شیریی و دایكو پووری شیریی، وە لە ژێر نیكاحی كەسێكی تردا نەبێ، وە خوشكو دایكو پووری ژنەكەی نەبێو لە عیددەی كەسێكی تردا نەبێت) هەر نیكاحو گرێبەستێك لەگەڵ هەر كامێك لەوانەدا بكرێ حەرامەو كاری پێناكرێت.

٢- خوازراوی كەسێكی تر نەبێت، واتە: ئەگەر ژنێك لەلایەن كەسێكەوە خوازرا بوو، تا ئەو كەسە نەگەڕێتە دواوە، یان ژنەكەو كەسوكاری ژنەكە نەگەڕێنە دواوە، نابێ بچێتە خوازبێنی، ئەگینە حەرامەو گوناحبار دەبێ، هەرچەند ئەگەر كاری وا كراو نیكاح كرا، گرێبەستەكە دادەمەزرێت.

٣- ژنو پیاوەكە یەكتر ببینن: بۆ هەردوولا (موباح)ە، بگرە (سووننەت)ە تەماشای یەكتر بكەن.. ئەوەبوو (موغیرەی كوڕی شوعبە) كاتێ ویستی خوازبێنی ژنێك بكات، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((إذهب فانظر إليها فإنه أحرى أن يؤدم بينكما)). بچۆ بیبینە، چونكە بینین هۆكاری تۆكمە بوونی كاری نێوانتانە. بێگومان ژنیش هەقیەتی ئەو پیاوە ببینێ دەیەوێ بیخوازێ، چونكە وەكو پیاوان حەزیان لەسەرو سیمای جوانو قەشەنگە، ژنانیش حەزیان لێیەتی، بۆیە (عومەری كوڕی خەتتاب) بەباوكو كەسو كاری ژنان دەڵێ: ((لا تزوجوا بناتكم الرجل الدميم)). كچەكانتان لەپیاوی سەروسیما ناشیرین مارە مەكەن ((فإنهن يعجبهن منهم ما يعجبه منها)) (المذهب وشرحه). چونكە پیاوان حەزیان لەهەرچی ببێ ژنانیش حەزی لێ دەكەن. سەرەڕای ئەوەیش لای تەواوی زاناكان تەماشا كردنی ژنو پیاو بۆیەكتر، كارێكی پێویستو پەسەندەو دەبێ ئەنجام بدرێت.

**چیەیەك:**

١- هەتا بكرێت — بۆ تەماشا كردنەكە — هیچ كامێكیان ئاگادار نەبن باشە، تا داوودەرمانو هۆكاری خۆ جوانكرن بەكارنەهێننو یەكتر چەواشە بكەن.

٢- پێكەوە — دوو بە دوو — نابێ كۆببنەوەو یەكتر ببینن و كەسێكی سێیەم لە نێواندا

نـەبێت، ئەگینـە حـەرامو مایـەی گونـاحو تاوانـە، ئەوەیـە کـە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووی: ((لا يخلون أحدكم بامرأة إلا مع ذي محرم)) یان دەفەرمووێ: ((لا يخلون رجل بامرأة فإن ثالثهما الشيطان)).

پێغەمبـەر ﷺ ئەوەنـد گرنگـی بـەو چاوپێکەوتنو دیـتنی (کچو کوڕان)ـە – دەیانـەوێ ببنـە هاوسـەر بـۆ یەکـدی – داوە، بـۆ خۆیـشی کـاتێ ویـستی ژنێـك مـارە بکـات، هەڵـسا ژنێکـی ناردەلای و پێیگوت: ((شَمّي عوارضَها، وانظري إلى عرقوبها)) بەیهەقی.

٣– پاش خوازبێنیو سەرگرتنی خوازبێنییەکە، هەردوولا بۆیـان هەیـە بگەڕێنـە دواوە، لەبـەر هەر هۆیەك ڕەچاوی دەکەن لەیەکتردا، پاشان هـەرکامێکیان لـەو مـاوەدا زەرەری کردبوو، یـان هەدیەو بەخششێکی بردبوو – کـە ئەمـە بـۆ زاوا دەگەڕێتـەوە – ئەگـەر ئـەو هەدیـەو بەخششە مابوو و تیانەچوو بوو، دەبێ بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

## پایەکانی گرێبەستی/ زەواج

بـۆ دامەزرانـدنی (زەواج) لـە نێـوان ژنوپیـاودا، سـەرەڕای بـوونی ژنوپیاوەکە، (ئیجـاب)و (قبوولْ) پێویستە، واتە: ژنەکە بڵـێ: ئەوا مێردم پێکردیت، پیاوەکەش بڵـێ: قبـوڵم کـرد، یـان پیاوەکە بڵێ: ئەوا کردیتم بە ژنی خۆم، ژنەکەش بڵێ: قبوڵم کرد.

(ئیبن تـەیمییـە–خ) دەڵێت: ((وينعقد النكـاح بمـا عـده النـاس نكـاحـا بـأي لغـة ولفظ كـان ومثلـه كـل عقـد)). الإختيـارات الفقهيـة ص١١٩. واتـە: عـورفو بـاوی ئـەو خەڵکـە – لـەو ناوچـەیەدا – هـەر وشـەو بێژەیـەك بـە مارەکردنو نیکـاح دابنـێن، بەوەدادەمـەزرێو دروسـتە، ئیتر بە عەرەبی بێت، یان بەشێوەی عەجەمی بێت؟

ئەگـەر هـەر کامێکیـشیان لاڵ بـوو، ئـەوە بەئیـشارەو ئامـاژە دادمـەزرێت. زاناکـان دەڵـێن: ((وينعقد النكاح بالإشارة من الأخرس إذا كانت إشارته معلومة)). خـۆ ئەگـەر ئـەو کەڕولاڵانـە دەیانزانی بنووسن، نووسینەکە باشترە، ئەگینە ئاماژە بەسە بۆ دامەزراندنی زەواجەکە.

ئەگەر ژنو پیاوەکە، یان بڵێین کچو کوڕەکە هەردوو لەیـەك دوور و (غایـب) بـوون، دەکـرێ بەنووسین کارەکەیان ئەنجام بدەن، بەمەرجێ یەکتر بناسنو هیچ ڕێگرێکی تر نەبێت، وە هـەر کـات نامەکـە گەیـشت دەبـێ ژنەکـە یـان پیاوەکـە دووشـایەت ئامـادە بکـەنو لـە ڕووی ئەوانـدا بیخوێننەوەو هەر لەڕووی ئەوانیشدا (ئیجاب) و (قبولْ)ەکە ئەنجام بدەن.

بەتەلـەفۆنیش (ئیجـاب)و(قبـولْ) دروسـتەو نیکـاحی پێـدا دەمـەزرێت، بەمـەرجێ پایـەکانی تری نیکاح دروستبنو هیچ ڕێگرێکی تر پەیدا نەبێتو، لەو کاتەشدا دوو شایەت ئاگـادار بـن

و گوێیـان لـێ بێـت. هـەروەها دەکـرێ هـەر کامێکیـان یـان هـەردووکیان، بریکـار بـۆ خـۆی دا بنێـت. (ئیجـاب)و(قبـوڵ) وادەبـێ (منجـز)ــە، وەك ئـەوە کـچەکە، یـان (وەلـی)ــەکەی، یـان بریکارەکەی ڕاستەوخۆ بە لایەنی میرد بڵێ: شووم پێکردیت، کچەکەمم لێمارەکردیت، ئینجا پیاوەکەش، یـان بریکارەکـەی بڵـێ: قبـوڵم کـرد. مـارەکردن و نیکـاح بەوشـێوەیە لای تـەواوی فوقەها شەرعیی و پەسەندە.

وایشدەبێ (معلّق)ـە وەکو ئەوە کچەکە بەپیاوەکە بڵـێ: ئەگەر ئەمساڵ لە تاقیکردنەوەکاندا دەرچوویت شووت پێدەکەم، ئەوە گرێبەستی ئاوا دانامـەزرێ و هیچ ئاسـەوارێکی شـەرعیی لێ پەیدا نابێ و تەواوی زاناکان لەمەدا یەکدەنگن، ئەگەرچی (إبن القیم) دەڵێ: ((ونص الإمام أحمد علی جواز تعلیق النکاح بشرط)).

## ئایا ژنان دەتوانن خۆمارە بکەن؟

* **شافیعیەکان دەڵێن**: ((لا تزوج المرأة نفسها..)) بە هیچ شێوەیەك ژن ناتوانێ دەخالەت لە خۆمارەکردندا بکات، نە لە (ئیجاب) دا، نە لە (قبووڵ)دا. واتە: بۆی نییـە نـەخۆی مارەبکات، نە قبووڵیشی بکات، ئەگەرچی (وەلی)ـەکەشی مۆڵەتی بدات.

* **مالیکییەکان**: ئافرەتان چ کچ چ ژن نـابێ بـە هـیچ شـێوەیەك لـە خۆمارەکردنـدا دەسـتیان هەبێ، خۆ ئەگەر خۆیـان لـە کەسـێك مـارەکرد، وەلییەکـەی مۆڵـەتی هـەبێ، یانـەی بێـت، پـاش گواسـتنەوە بێـت، یـان دوای گواسـتنەوە، ئـەو نیکاحـە هەڵدەوەشـێنرێتەوە، تەنانـەت ئەگـەر منداڵیشی هەبێ.

* **حەنبەلییەکان**: ژنان دەسەڵاتی خۆمارەکردنیان نییەو، ناشتوانن (وەکیل) بـۆ ئـەو کـارە بگرن،ئەگەرچی ئیمامی (ئەحمەد) بۆ خۆی دەڵێت: ژن دەتوانێ کچی خۆی مـارە بکـات لەهـەر کەسێك لەسەری ڕێکدەکەون.

* **حەنەفییەکان**: ژنی باڵغ و ئاقڵ دەتوانێ خۆی و غەیری خۆی نیکـاح بکـا بـۆ هـەر کەسـێك خۆی ڕازیە ئەگەرچی پێچەوانەکەی پەسەندو(مستحب)ـە.

* **جەعفەریـەکان**: ئیجـاب و قبـوڵ لەلایـەن هـەر کەسـێکەوە بێـت لـە ژنەکـەوە بێـت، یـان لـە وەلییەکەیـەوە، یـان لـە لایـەن بریکارەکەیـەوە بێـت، دادەمزرێـت و بەئەنجامەکەی کاردەکرێـت، هەریـەك لـەو زانایانـەش بـۆ ڕاوبۆچـوونەکانیان بەڵگـەی خۆیانیـان هەیـە، ئیـشەڵڵا دواتـر ئـەم باسە ڕوونتر دەکەینەوە.

## مەرجەکانی گرێبەستی/زەواج

یەکەم: کچ و کوڕەکە دەبێ هەردووژیرو بەفامبن، ئەگەرچی ژیریشیان لە پلەی منداڵێکی خاوەن تەمییز دا بێ، بۆیە کوڕوکچی شێت، نیکاحیان دانامەزرێت، بەڵام باڵغبوون مەرج نییە، ئەگەرچی کاتێ ئەقڵی تەواویان گرت، دەتوانن رای خۆیان دەربڕن بەرامبەر بە نیکاحەکە، هەڵوەشێننەوە، یان پیادەی بکەن.

* نیکاح چ لەناخەوە بێت، یان بە گاڵتەو (مەسخەرە)وە بێت دادەمەزرێت، واتە: ئەگەر کچێك بەگاڵتەوە بە کوڕێکی گوت: شوم پێکردیت، ئەویش گوتی: قبوڵمە، ئەو نیکاحە دادەمەزرێت و کاری لەسەر دەکرێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ثلاث جدهن جد، وهزلهن جد: النكاح، والطلاق، الرجعة)) (ترمذي و ئەبووداود). بەڵام ئەگەر پێش وەڵامدانەوە لەلایەن بەرامبەرەکەوە، ئەم پەشیمان بوویەوە کاری پێدەکرێ و نیکاحەکە دانامەزرێت، هەروەها ئەگەر بەرامبەرەکە (ئەهلیەت)ی نەما، دیسان هیچ ئاسەوارێکی لێ پەیدا نابێت.

**تێبینی:**

ئەو (ئیجاب) و (قبوڵ)ـە دەبێ لەیەك (مەجلیس)دا بێت و (فاصلە)یەکی وا نەکەوێتە نێوانیانەوە، بەڵام ئەگەر قبوڵەکە ئەندازەیەك دواکەوت و لەو نێوانەدا شتێك پەیدا نەبوو مانای نارەزایی و پشتگوێ خستنبوو و لە مەجلیسەکەیش هەڵنەسابوون، پاشان قبوڵی کرد، دادەمەزرێت و قەیدی نییە، هەروەك مەرجە (ئیجاب) و (قبول) بەرامبەربن و جیاوازیان نەبێت، بۆ نموونە: ئەگەر (وەلی) گوتی: (فاتمە)م لێمارە کردیت، دەبێ ئەویش قبووڵی نیکاحی فاتمە بکات.

دووەم: ژنەکە دەست بدات بۆ مارەکردن: واتە حەرامی ئەو کەسە نەبێت دەیخوازێت: ((وەکو دایك و خوشکی نەسەبیی و شیریی و خەسوو خوشك و دایکی خەسوو...))

هەروەها زاناکان دەڵێن: ژن وپیاو (زوج، زوجه) لەکاتی گرێبەستەکەدا نابێ لەجل و بەرگی (ئیحرام) دابن، ئەگەرچی (حەنەفیە)کان دەڵێن: بۆ (زەوج، زەوجە) تەنانەتی (وەلی) گرێبەست دادەمەزرێت، هەرچەند لە (ئیحرام)یشدا بن، بەڵگەیشیان مارەکردنی خاتوو (مەیمونە)بوو لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ کە لە ئیحرامیشدا بوو، ئەو فەرموودەیش کە دەڵێ: ((لا ينكح المحرم ولا ينكح)) مەبەست ئەوەیە کە موحریم نابێ تێکەڵی لەگەڵ ژنەکەیدا بکات لەکاتی ئیحرامەکەدا، نەك مارەکردن.

سێیەم: نابێ بۆ کاتێکی دیاریکراو بێت (نكاح مؤقت): هەر نیکاحێك ماوەی بۆ دیاری بکرێت، بە کۆی دەنگی زاناکان – جگە لە شیعە – دانامەزرێ و بە حەرام دادەنرێت.. بەڵکو

دواتر بتوانین پتر تاوتوّی ئەم باسە بکەین.

چوارەم: پیاوەکە هاوکووف و هاوشانی ژنەکە بێت:

أ-بەلای حەنەفییەکانەوە - ئەبوو حەنیفە خۆیی و ئەبوو یوسف - ئەگەر ئافرەتێکی باڵغی ژیرو بەفام، خۆی لە غەیرە کووفێك مارە کرد، دانامەزرێت، چونکە سووکایەتی ڕوودەکاتە (وەلی)و بنەماڵەکەی، کاری ئاوایش - بۆ دوایی - بە ئاسانی ڕزگاریان نابێت لێی. بەڵام (محمد بن الحسن الشيباني) هاوڕێی ئەبوو حەنیفە دەڵێ: هاوکووفیی مەرج نییە بۆ دامەزرانی نیکاحەکە، بەڵکو مەرجی پیادە کردنیەتی، واتە: ئەگەر ژنێك لە پیاوێکی غەیرە کووف خۆی مارە کرد، تەماشا دەکرێ ئەگەر (وەلی)یەکەی ڕەزایەتی لەسەردا، دادەمەزرێت، ئەگینە هەڵیدەوەشێنێتەوە.

ب-شافعیەکان دەڵێن: ئەگەر باوك، یان تەنها مامێك کچێکی لە غەیرە کووفێك مارەکردو کچەکە بۆ خۆی ڕەزا بوو، وەیان چەند براو ئامۆزایەك - لەسەر ڕەزایەتی کچەکە - لە غەیرە کووفێکیان مارەکرد، ئەو نیکاحە دروستەو دادەمەزرێت، بەڵام ئەگەر یەکێ لە براکانی، یان لە ئامۆزاکانی - لەسەر ڕەزایەتی کچەکە لە غەیرە کووفێك مارەکردو، براو ئامۆزاکانی تری ڕەزایەتیان نەبوو، ئەو نیکاحە دانامەزرێت، ئەگەرچی لە قسەیەکی شافیعیەکاندا هاتووە: ((يصح العقد ولهم الفسخ)).

ج-حەنبەلیەکان: هاوکووفیی کچ و کوڕ بۆ دامەزرانی نیکاح مەرج نییە، ئەگەرچی هەندێکیان بەمەرجی دادەنێن.

د-مالیکیەکان دەڵێن: ئەوی لە ژن و پیاودا پێویستە هەبێ، دووشتە:

یەکەم: مێرد دیندار بێت، واتە مێرد فاسق و بێدین نەبێ.

دووەم: سەلامەت بێت لەو ناتەواویانەی دەبنە هۆی (فەسخ)و هەڵوەشانەوەی نیکاح، ئەگەر ژنەکە ویستی لە هەڵوەشانەوە هەبوو.. خۆ ئەگەر ژنەکە، یان (وەلی)یەکەی بە پیاوێکی فاسق ڕازی بوون دەتوانن ئەو نیکاحە بکەن و گوێ بە هاوکووفیی نەدەن.

پێنجەم: شایەت ئامادە بکرێت:

ئامادە بوونی شایەت بۆ نیکاح و مارەکردن مەرجە بۆ دامەزرانی، ئیمامی (ترمذي) ئەم فەرموودەیەی هێناوە: ((البغايا: اللاتي ينكحن أنفسهن بغير بينة)) لە سەردەمی پێغەمبەرو هاوەڵان و پاشینانیشدا، بەبێ شایەت نیکاح نەکراوە. ئیمامی (بەیهەقی) لە خاتوو (عايشه/خ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر- صلى الله عليه وآله وسلم - فەرمووی: ((لا نكاح إلا بولي و شاهدي عدل، فإن تشاجروا - وفي رواية اشتجروا فالسلطان ولي من لا ولي له))

پێشەوا (ئەحمەد)یش ئەم ڕیوایەتەی هێناوە: ((لا نكاح إلا بولي وشاهدي عدل)). ئەم چەن فەرموودە و فەرموودەگەلێكی تر بەڕاشكاوی ئەوە دەگەینن كە لە نیكاحدا شایەت مەرجەو هەر دەبێ ببێ. (ترمذي)یش دەڵێ: ((والعمل على هذا عند أهل العلم من أصحاب النبي ﷺ ومن بعدهم من التابعين وغيرهم، قالوا: لانكاح إلا بشهود)).

**سەبارەت بە بوون ونەبوونی شایەت لە نیكاحدا ئەم بۆ چونانە هاتووە:**

یەكەم – (يشترط لصحة النكاح الإشهاد عليه، وإلا كان فاسدا، روى ذلك عن عمر بن الخطاب، على بن أبي طالب، وهو قول ابن عباس وسعيد بن المسيب، والحسن، والنخعى، وقتادة، والثورى، والأوزاعي، وهو قول جمهور الفقهاء من الشافعية، والحنفية، والحنابلة، والزيدية)).

دووەم – يصح النكاح بغير شهود، فعله ابن عمر، والحسن بن على، وابن الزبير، وسالم وحمزه ابنا عبدالله بن عمر. وبه قال عبدالرحمن بن مهدي، ويزيد بن هارون، والفبري، وأبو ثور، وابن المنذر وهو قول الإمام الزهري، وهو مذهب الجعفرية).

سێیەم – (الإشهاد على النكاح ليس شرطا لصحته، ولكن الإشهاد شرط عند الدخول بالزوجة، وهذا مذهب المالكية).

پوختەی مەسەلەی ئامادەكردنی شایەت بۆ نیكاح بەم شێوەیە: جەماوەری زاناكان یەكدەنگن لە سەربوونی شایەت لە گرێبەستی نیكاحدا، خۆ ئەگەر ئامادە نەبوون، ئەو نیكاحە بە (فاسد) و دانەمەزراو دادەنێن.

## ژمارەی شایەت

دەبێ شایەت لە دوو پیاو كەمتر نەبن، خۆ ئەگەر زیاد لەوە كۆمەڵە خەڵكێكی باش‌وچاك كۆكرایەوە رێك‌و پێكترە.. قسەی ڕاست ئەوەیە كە بە پیاوێك‌و دووژن ئەو گرێبەستە دادەمەزرێت، جگە لەمەیش (ظاهريه)كان دەڵێن: بە ئامادە بوونی چوار ژنیش بە تەنها لە گرێبەستەكەدا دادەمەزرێ و كاری پێدەكرێت.

## عەدالەتی شایەت

هەندێ دەڵێن: شایەتەكان پێویستە خاوەن عەدالەت بن‌و فاسق نەبن. هەندێ تر عەداڵەت بەمەرج دانانێن، بەڵكو بە ئامادەبوونی دوو (فاسق)یش دادەمەزرێت، ئەمەیش مەزەبی حەنەفییەكانە. بێگومان هەتا دەست بدات پیاوی صاڵح‌و چاك ئامادە بكرێ بۆ شایەتی، خۆ ئەگەر دەست نەكەوت، دەچێتە حاڵەتی زەرووت‌و ناچاری.

هەروەها مەرجە شایەتەکان موسڵمان بن، بە بەڵگەی ((لا نكاح إلا بولي وشاهدي عادل)).
بەڵام حەنەفیەکان لێرەدا دەڵێن: ((يجوز نكاح المسلم ذمية بشهادة ذميين على هذا النكاح)).
هەروەها دەبێ باڵغو فامیدە بنو کەڕو تێنەگەیشتوو نەبن، خۆ ئەگەر بیناشبن باشترە.

## مەرجدانان لە گرێبەستەکەدا

ئەو شتانە پێچەوانەو دژ نابنەوە لەگەڵ ئامانجو مەبەستی نیکاحدا، یان حەرامێك حەڵاڵ ناکەن، یان بە پێچەوانەوە، ڕەوایە بە مەرج بگیردرێنو کاریشیان پێ بکرێت، ئیمامی (بوخاری) ئەم فەرموودەیە هێناوە: ((إن أحق ما أوفيتم من الشروط أن توفوا به ما استحللتم به الفروج)) شرح العسقلاني ج ٢١٧/٩. بۆ نموونە: ژنەکە گوتی بە پیاوەکە: بە مەرجێ شووی پێ دەکات، چاكو ڕێك پێك بێت لەگەڵیاو نەفەقە و جلوبەرگو مەسکەنی بۆ فراهەم بهێنێت.. بەڵام ئەو مەرجانە کە لەگەڵ بنەڕەتو ئامانجی نیکاحدا دژ دەوەستنەوە، بۆ نموونە: ژنەکە بە پیاوەکەی بڵێ نابێ نەفەقم بکێشیت، نابێ لەگەڵ خۆت بمبەی بۆ سەفەر،ئەم جۆرە مەرجانە کاریان پێناکرێتو گرێبەستەکەش دادەمەزرێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((كل شرط ليس في كتاب الله فهو باطل)).

بەڵام ئیمامی (ئەحمەد)و کۆمەڵێك لە زانایا دەڵێن: پێویستە کار بە گشت مەرجێك لە گرێبەستەکەدا بکرێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((إن أحق الشروط بالوفاء...)).

(ترمذي)یش دەڵێت: ((والعمل على هذا عند بعض أهل العلم من أصحاب النبي ﷺ، منهم: عمر بن الخطاب)). کەوابوو ئەگەر ژنێك گوتی: بەمەرجێ شووت پێدەکەم کە لە ماڵی باوکم دوورم نەخەیتەوە، دەبێ دووری نەخاتەوە.

**بەکورتی**: هەر مەرجێك لە گرێبەستەکەدا ژنوپیاوەکە لە سەر یەکتری دادەنێن، پێویستە لە ئایندەدا کاری پێ بکەنو نابێ پێچەوانەی ڕەفتار بکەن.

## ئەو مەرجانەی لە گرێبەستەکەدا دادەنرێن

هەندێ مەرج هەیە، قازانجەکەی تەنها بۆ ژنان دەگەڕێتەوە، لەوانە: بەمەرجێ شووی پێدەکات کە لەو ماڵە، یان لەو شارە، نەیباتە دەر، یان نەیبا بۆ سەفەری دوور وەڵات، یان ژن نەهێنێ بەسەریا، بەلای ئەم زانا بەڕێزانەوە: (عومەری کوڕی خەتتاب، سەعدی ئەبوو وەقاص، موعاویە، عەمری بن عاص، بۆ دوای ئەوانیش، شورەیح، عمر بن عبد العزيز، جابر بن زید، طاووس، ئەوزاعی، ئیسحاق) دەبێ بە پێی ئەو مەرجانە بجووڵێتەوە لەگەڵیا، ئەگینە دەتوانێ نیکاحەکە هەڵوەشێنێتەوە، ئەگەرچی دەستەیەك زانا: (زوهری، قەتادە، هیشام،

عوروه، مالك، لەیس، سەوری، شافعی، إبن المنذر..) دەڵێن: ئەو مەرجانە کاریان پێناکرێت، چونکە لە قورئاندا نین، هەرچیش لەوێ نەبێ کاری پێناکرێت.. هەر ئەمەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((کل شرط لیس في کتاب الله فهو باطل وإن کان مائة شرط)) کەوابوو نیکاحەکە دادەمەزرێت.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((المسلمون علی شروطهم، إلا شرطا أحل حراما أو حرم حلالا)). واتە: موسڵمانان لەسەرمەرجی خۆیان دەبن، مەگەر شتێك حەرام حەڵاڵ بکات، یان حەرامێك حەڵاڵ بکات، خۆ ژنی دووەمو سێیەم بەپێی قورئان و مەرجەکانی – حەڵاڵە، کەوابوو ئەگەر ژنێك گوتی: بەمەرجێك شووت پێدەکەم، کە ژن نەهێنیت بەسەرما، ئەوە ئەو مەرجە پوچەڵەو کاری پێناکرێتو دەتوانێ ژنی تر مارە بکات بەسەریا.

یان ئەگەر ژنێك گوتی: بەومەرجە مێردی لەگەڵ دەکات، تەڵاق بەدەستی ئەو بێت، دیارە بەلای ئەوانەوە، کە ئەو مەرجانە بەڕەواو دروست دەزانن – وەك حنبەلییو حەنەفییەکان – کاری پێدەکرێ و ژنەکە هەرکات ویستی جیا ببێتەوە دەتوانێ.

ئەگەر ژنێك گوتی: بەمەرجێ ئەو نیکاحەی قەبووڵە، کە ئەوژنەی ئێستا هەتە، تەڵاقی بدەیت، ئەویش قبوڵی کرد، هەندێ زانا – لەوانە – حەنبەلییەکان – بەدروستی دەزانن‌و کاری پێدەکەن، واتە: دەبێ پیاوەکە مەرجەکەی بۆ جێبەجێ بکات، ئەگینە هەقی (فەسخ)ی هەیە.

## مەرجگرتنی (صیفەت)ێك لە پیاوەکەدا، یان لە ژنەکەدا

بۆ ئاوا مەرجێك (شافیعیەکان) پتر لە مەزەبەکانی تر بۆچوونیان گونجاوترە، وە دووقسەیان تێدا کردووە:

یەکەم – ئەگەر پیاوەکە بەژنەکەی گوت: بەو مەرجە نیکاحی تۆم قەبووڵەکە: کچ بیت، یان لە نەخۆشی سەلامەت بێت... یان ژنەکە بە پیاوەکەی گوت: دەبێ ئازاو خاوەن شەهادە بیت، کەچی وادەرنەچوون ! ئەوە نیکاحی ئاوا دانامەزرێت، چونکە ژنەکە بەو(صیفەت)ەوە پیاوەکەی دەوێت، یان پیاوەکە بەو صیفەتەوە ژنەکەی قبووڵە کە بەژن‌وباڵای بەرز بێت.

حەنبەلیەکانیش دەڵێن: هەر یەکەیان سەرپشك دەخرێن: دەتوانن قەبووڵی بکەن، دەشتوانن (فەسخ)ی بکەنەوە.

دووەم – نیکاحەکە دادەمەزرێتو مەرجەکە پووچەڵەو کاری پێناکرێت، بەتایبەتی بۆ پیاوەکە، چونکە پیاو دەتوانێ – ئەگەر فەسخیش نەبێ – بەتەڵاق خۆی ڕزگار بکات لەو ژنە بەدڵی نییە، ئەمەشیان لەبەر گرنگی نیکاحەکە تا لەبەر هەر مەرجێکی سادە هەڵنەوەشێتەوەو کێشەو گرفت پەیدا نەبێ.

## ئەو شتانە لە نیکاحدا سووننەتن

یەکەم – کورتە گوتارێك – لەناو زاناکاندا پێی دەڵێن (خطبة الحاجة). بۆ ئەمە (عبدالله بن مسعود) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەم گوتارەی فێرکردین کەبەر لە مارە کردن بڵێین: ((إن الحمد لله نستعينه ونستغفره، ونعوذ به من شرور أنفسنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله. ﴿واتقوا الله الذي تساءلون به والأرحام إن الله كان عليكم رقيبا﴾، ﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولا تموتن إلا وأنتم مسلمون﴾، ﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله وقولوا قولاً سديدا يصلح لكم أعمالكم، ويغفر لكم ذنوبكم، ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما﴾ ئەبووداود.

ئـەم گوتـارەش یـەك کـەس دەیخوێنێتـەوە (وەلـی ژنەکـە، یـان خوازبێنیکـەر، یـان هـەر کەسێکی تر)، هەروەها هەوڵ بدرێت کۆمەڵێ پیاو باش و صاڵح کۆبکرێتـەوەو ئامادە بکرێن لە مەجلیسی گرێبەستەکەدا.

دووەم – لە مزگەوتدا گرێبەستەکە بکرێت:

ئیمامی (ترمذي) دەڵێ: خـاتوو (عایشە–خ) گوتی: پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: ((أعلنـوا هـذا النكـاح، واجعلـوه في المسـاجد، واضـربوا عليـه بالـدفوف)) نیکـاح ئاشـکرا بکـەن (واتـە: بـا خـەڵکێك لێـی بـەئاگا بـن، ئەگـەر ڕۆژی گواسـتنەوەش بێـت) وە دەفیـشی بـۆ بـەکاربهێنن. بەداخـەوە ئێـستا لـەباتی مزگـەوت بەچـاولێکەری خۆرئـاوا (هـۆڵ) داهێنـراوەو شـەرعییەتی خۆیشی وەرگرت ! کە بەڕاستی هـەقبوو موسڵمانان بـەجێ پێیانـدا نەچووبانو ئـەو تەقلیـدە کوێرانەیان قەبووڵ نەکردبا، ئەگەرچی چەند کەسێکی ئایینیش دەبـەنو گوتـاری تیا بـدەنو سیمایەکی ئیسلامیش وەرگرێ !.

سێ یەم – ڕۆژی هەینی گرێبەستەکە بکرێت:

کۆمەڵێ لە زاناکان ڕۆژی هەینیان هەڵبژاردووە بۆ ئەنجامدانی نیکاحەکە، چونکە ڕۆژێکی پیرۆزەو خودا لەو ڕۆژەدا (ئادەم) پێغەمبەری دروستکرد، سڵاوی لەسەر بێت.

چـوارەم – ئیمـامی (موسـلیم) لـە خـاتوو (عایـشە)وە دەگێڕێتـەوەو دەڵێـت: پێغەمبـەر ﷺ مـانگی شەشـەڵان مـارەیکردم، هـەر مـانگی شەشـەڵانیش بـوو گواسـتمیەوە. پێـشەوا نـەوەوی دەڵێت: کەوابوو ژن مارەکردنو بەشووودانیو گواستنەوە بخرێتە شەشەڵانەوە.

پێنجەم – دوعا بۆ زاواو بووکێ بکرێت:

(ئەبوو هورەیرە – خ)دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە پیرۆزبایی لەزاوا دەکرد: ((بارك الله لك، وبارك عليك، وجمع بينكما في خير)). (ئەبوو داوود، ئیبن ماجە).

له سه‌رده‌می جاهیلیه‌تدا به‌زاوایان ده‌گوت: ((بالرفاء والبنين)) واته: گوزه‌رانتان خۆش بیٚ‌و، كوڕتان زۆر بێت، به‌ڵام كه ئیسلام هات، ئه‌وه‌ی گۆڕی به (بارك الله لك، وبارك عليك، وجمع بينكما خير)).

شه‌شه‌م – گۆرانی‌و ده‌فلێدان:

بۆ ئه‌وه گرێبه‌ستی (زه‌واج) له‌كاری (سه‌فاح)و زینا جیا بكرێته‌وه، شه‌ریعه‌تی ئیسلام فه‌رمان ده‌دات ئاشكرا بكریٚ‌و گۆرانی‌و سروودی په‌سه‌ندو جوامێرانه‌ی تێدا بگوترێت‌و ده‌فیشی له‌گه‌ڵ بێت.

حه‌وته‌م – شه‌وی به‌یه‌كگه‌یشتن زاوا بڵێت:

هه‌ر ئه‌و شه‌وه زاواو بووك به‌یه‌ك ده‌گه‌ن، سووننه‌ته زاوا ئه‌م دوعایه بخوێنێت:

((بسم الله، اللهم جنبنا الشيطان، وجنب الشيطان مارزقتنا))بوخاري.

هه‌شته‌م – زه‌ماوه‌ند بكرێت:

ئه‌و كاته بووك ده‌گوێزرێته‌وه، سووننه‌ته خواردن دروست بكرێت‌و خه‌ڵكانی بۆ بانگ بكرێت، ئیمامی بوخاری ده‌ڵیٚ: كه (عبدالرحمن) ژنی هێنا، پێغه‌مبه‌ر ﷺ پێیگوت: ((أولم ولوبشاة)) واته: ئه‌گه‌ر به ته‌نها مه‌ڕێكیش بێت زه‌ماوه‌ند بكه. بۆئه‌وه خه‌ڵكی گونده‌كه، یان شاره‌كه، یان گه‌ڕه‌كه‌كه ئاگادارین‌و زاوا تۆمه‌تبار نه‌كه‌ن به زیناو جۆره حاڵه‌تێكه‌وه.

**تێبینی:**

له‌كاتی گرێبه‌سته‌كه‌یشدا ده‌كریٚ خواردن‌و هه‌ر شتێك بۆ ئاماده‌بوان ساز بكرێت، ئێستا بۆته باوو كراوه‌ته عاده‌ت، له‌كاتی گرێبه‌سته‌كه دا هه‌ندیٚ میوه‌و نوشابه ده‌دریٚ به‌ئاماده‌بوان، ئه‌مه‌یش كارێكی باشه، به‌ڵام پێویسته هه‌موو كه‌س له‌حه‌جم‌و قه‌باره‌ی خۆیدا بێت‌و زیاده ڕه‌وی تێدا نه‌كرێت.

نۆیه‌م – هه‌ر كه‌سێك بانگكرا پێویسته وه‌ڵام بداته‌وه‌و بچێت بۆ زه‌ماوه‌نده‌كه، ئه‌گینه گوناحبار ده‌بیٚ، مه‌گه‌ر (مونكه‌ر)و كاری ناشه‌رعیی تێدا ببینیٚ، ئه‌وكات پێویست ده‌كات نه‌چێت، مه‌گه‌ر له‌و كه‌سانه بێت كه ئه‌گه‌ر بچێته ئه‌ویٚ به بۆنه‌ی ئه‌وه‌وه زۆرێك له (مونكه‌ر)ـه‌كه نه‌مێنیٚ، ئه‌وسا ڕۆشتنه‌كه‌ی باشتره.

ئه‌مانه هه‌ندێك له‌و شتانه بوون بوونیان په‌سه‌ندو(مستحب)ـه له زه‌واجدا، هیوادارین بتوانین ڕیعایه‌تی كاروباری ئیسلامی بكه‌ین له زه‌ماوه‌ندو بۆنه‌كانی ترماندا، تا به‌ڵكو پیرۆز بین‌و خوایش له خۆمان ڕازی بكه‌ین.

## حوکمی زەواجی کاتیی ( مؤقت = متعة )

بنەمای دامەزراندنی ژن‌و مێردیی لە شەریعەتی ئیسلامدا، بە شێوەیەکی ئێجگارەکی‌و تۆکمەو مەحکەمە، واتە: نابێ کاتی بۆ دیاری بکرێ‌و ماوەی بۆ دابنرێت، بۆیە هەموو مارەکردنێکی لەو جۆرانە، بەناڕەوا دانراوە، لەوانە:

(زەواج المتعة)، واتە: مارەکردنی ژنان لەسەر مارەیەکی تایبەت‌و بۆ کاتێکی دیاریکراو (هەفتەیەك، مانگێك، ساڵێك...) تاد. ئەم نیکاح‌و مارەکردنە زاناکان بە کارێکی ناڕەواو حەرامی دادەنێن، ئەگەرچی (جعفر)یەکان ڕێیان پێداوەو بە حەڵاڵی دەزانن، (طوسي) مەزەب شیعیی دەڵێت: ((نكاح المتعة مباح في شريعة الإسلام). بەڵام غەیری ئەوان، ڕەتی دەکەنەوەو دەڵێن: ((وأما نكاح المتعة فجميع فقهاء الأمصار على تحريمها)). (عەلی کوڕی ئەبوو تالب) دەڵێ: ((أن رسول الله ﷺ نهى عن نكاح المتعة، وعن لحوم الحمر الإنسية)) متفق عليه. بێگومان پێغەمبەر ﷺ لە زەمانی (خەیبەر)دا ڕێی لە (نیکاح المتعە) و خواردنی گۆشتی کەری ماڵیی گرت و قەدەغەی کردن.

جەعفەری یەکانیش چەند بەڵگەیەکی خۆیانیان هەیەو زاناکانی (ئەهلی سوننەت)یەکە بە یەکیان ڕەتکردۆتەوە، ئێستا بە پێویستی نازانین بچینە ناوئەو هەراو کێشەوە، بەڵام بەکورتەیەك دەڵێین: بە کۆی دەنگی زانایانی ئەهلی سوننەت (نیکاح المتعە) حەرامەو دانامەزرێت‌و هەر کەسێکیش بیکات، دەبێ تۆێژینەوەی لەگەڵ بکرێت‌و بخرێتە ژێر (تەعزیر)و لۆمەوە.. چونکە موتعە نەلە بەرژەوەندی پیاودایە، نە لە بەرژەوەندی ژن دایە، سەرەڕای ئەوەیش بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك ژنان کچێتی خۆیان لەدەست دەدەن، کە هەمیشە کچێنی لای عورف‌و لای شەرع پەسەندترن، لەولایشەوە ژنان دەکرێنە کاڵایەك و پیاوان پێیان ڕادەبوێرن... بەڵکو بەرژەوەندی ژنان لەوەدایە کە بەهەتا هەتایی ببنە ژنی پیاوێکی جوامێرو مەردکارو بەئەخلاق و خاوەن قییەم‌و هەموو مەبەستی لەزەتێکی چەند کاتی نەبێ لە جەستەی ئەودا، بەڵکو (نەسل)و خۆشەویستی‌و دلۆڤانی و بە هەتا هەتا پێکەوە ژیان‌و ماڵداریی‌و داڵدەدانی منداڵان بەدرێژایی تەمەنیان‌و بەدایکبوونی ژنەکەیە.

من وادەزانم موتعە پێچەوانەی دروستکردنی خانەو لانەیە، چونکە ژنێك ئەگەر ژیانی خۆی بەوە بباتە سەر کە هەر چەند ڕۆژێك یان چەند کاتژمێرێك یان چەند مانگێك لەباوەش پیاوێکدا بێ، تاتەمەنی هەیە نابێتە خاوەن ماڵ‌و حاڵی خۆیی‌و کەپیریش بوو، نازانێ لە کوێ شەو بەو ڕۆژ بکاتەوە، نازانێ چۆن بژی، لەوانەیشە لەو ئاخرو ئۆخری تەمەنەیەوە موتعەچییەکان بەدوایدا نەگەڕێن.. ئەمە حاڵی ژنەکانە، خۆ بێگومان حاڵی پیاوە موتعەچی یەکانیش لە حاڵی

ئـەوان باشـتر نـابێ... پێغەمبـەر ﷺ كـە مۆڵـەتی دا بـە هـاوەڵان، لـە حاڵـەتێكی نائاسـاییدا بـوو و بەشاخ و كێوو دەشت و دەرەوە بوون، خەریكی جیهادو سەرخستنی دینی خودا بوون، بە چەند مانگ دەستیان نەدەگەیشتە ژنەكانیان، پێغەمبەریش ﷺ كە ڕێگەیدان بە شێوەیەكی كاتیی و تا گەڕانـەوە بـۆلای مـاڵ و حـاڵی خۆیـان. بـەڵام بـۆ دوایـی كـە ئـەو هۆكارانـە نـەمان و ئیـسراحەت گەڕایـەوەو ئـەمن و ئاسایـشی وڵات زۆر بـوو و هـاوەڵان ئەوەنـد سـەرقاڵ نـەبوون بـەجیهادەوە، موتعەی هەڵوەشانەوە، وەكو لە فەرموودەكاندا بە ڕاشكاوی باسكراوە.

ئەوكەسانەیش كە موتعـە بـە چارەسـەرێكی بـاش دادەنێن بـۆ كـوڕان و كـچانی گـەنج و لاو! پێیان دەڵێین: چارەسـەری ئـەو مەسـەلەی لاوانـە بـەوە ناكرێت، بـەڵكو بـەوە دەبـێ كـە ئـەوەی دەوڵەت سەرف دەكات بۆ گۆڕانی بێژان و سـەما كـەران و سـووڕدەران و شـوێنە گەشـتیارەكان، دەیـەكی ئـەوە خـەرج بكـات بـۆ ئاسـانكاری بۆیەكگەیـشتنی كـچان و كـوڕان و، هـەوڵ بـدات مەنهەجی ئیسلام لە كۆمەڵگەكەیدا پیادە بكات، تا مانای ئەخلاق و قییـەم و عیففـەت و فەزیلـە بگەڕێتەوە ناو كۆمەڵگە.

## سەرپەرستیاری (زەواج). (الولي في الزواج)

لە فیقهی ئیسلامیدا ئەو كەسە سەرپەرشتی نیكاحەكە دەكاو دەتـوانێ گرێبەسـتەكە بكـا، دەبێ ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

١- ژیرو فامیدە بێت:

ئەم مەرجە لەبەرژەوەندی مارەكراوەكەیە، یان مارە بـۆ كراوەكەیـە.. بـۆ ئەوەیـە بزانـێ ئـەو گرێبەسـتە چ قـازانج و بەرژەوەندییـەكی (مـولی علیـە)یەكـەی تێدایـە، لەبەرئەمەیـە كـە منـداڵی شێت و پیری خەڵەفاو و ئەقڵ تێكچوو، بۆیان نییە گرێبەست ئەنجام بدەن.

٢- باڵغ و پێگەشتوو بێت:

مـەرجی بـاڵغیش بـۆ كـامڵبوونی ئـەقڵی ئـەو ئینـسانەیە كـە دەیـەوێ ژنێك مـارە بكـات بـۆ كوڕەكەی، یان كچەكەی لەیـەكێك مـارە بكـات، بۆیـە منـداڵ و شـێت نـاتوانن سەرپەرسـتی ئـەو كارەیە بكەن، ئەگەرچی ئیمام (ئەحمەد) دەڵێت: (إذا بلغ الصبي عشر سنين، جـاز لـه الـزواج والتـزوج والطـلاق). بـەڵام لەگـەڵ ئەوەیـشدا باڵغبوونیـان بەمـەرج گرتـووە.. دیـسان ئەمـەیش لەبەرژەوەندی كچ و كوڕەكەیە و، بۆ باشتر تۆكمە بوونی گرێبەستەكەیە.

٣- دین و دینداریان یەك بێت:

بۆیە ئەگەر كچەكە، یان كوڕەكە موسڵمان بوون، بەڵام باوكەكەیان كـافرو خوانـەناس بـوو،

ناتوانیٚ دەخالـەت لـە گرێبەستەكەياندا بكـات، ئەمەيـە كـە زاناكـان بـە گشتيی دەڵـێن: ((فلا ولاية لكافر على مسلم أو مسلمة)). (إبن المنذر) ئەم ئايەتە دێنێتـەوە كـە دەفـەرمووێ: ﴿ولـن يجعل الله للكافرين على المؤمنين سبيلا﴾ يـان ئـەم فـەرموودە كـە دەڵێت: ((الإسـلام يعلـو ولا يعلى عليه)). خۆ ئەگەر هەردوو واتە: (باوكوكچ، يان باوكو كوڕ) غـەيرە ديـن بـوون دەتـوانن سەرپەرشتی كاروباری يەكتر بكەن، بۆ نموونـە: هـەردوو كـافر بـوون، يـان يـەكیٚ يـەهووديی، يەكیٚ نەصرانيی، دەتوانن دەست بخەنە كاری يـەكترەوە، بەبەڵگـەی: ﴿والـذين كفـروا بعضـهم أولياء بعض﴾. هـەروەها كەسێكی پاشگەزبووە لـە ئيسلام نـاتوانیٚ دەسـت بخاتـە كاروبـاری منداڵەكانيەوە، تەنانەتی ئەگـەر ئـەوانيش (مورتـەد) بـن، هـەر نـاتوانیٚو (ويلايـەت)ی نـامێنیٚ بەسەريانەوە.

٤- دادگەرو خاوەن عەدالەت بێت:

بەڵیٚ ئەو (وەلی)يـە كـە بۆی هەيـە دەسـت بخاتـە كاروبـاری منداڵەكانيـەوە، دەبـیٚ (عـادڵو دادپـــەروەر بێـــت) لـــەم ڕووەوەيـــە كـــە شـــافيعيەكان دەڵـــێن: ((لا ولايـــة لفاســـق)) بەبەڵگـــەی فەرموودەی: ((لا نكاح إلا بولی مرشد)). واتە: بە (وەلی عادل)نەبیٚ نيكاح نابێت.

حەنبەليەكان: دوو قسەيان هەيە، يەكێكيان عەدالەت مەرجە لـە (وەلـی)يـدا، ئەويديكـەيان دەڵیٚ: مەرج نييە، بەڵام يەكەميان هەڵبژێردراوەو كراوەتە مەزەبو پێڕەويان.

حەنەفيـەكان: دەڵـێن: عەدالـەت مـەرج نييـە لـە (وەلـی)يـدا، بۆيـە بـەلای ئەوانـەوە (فاسـق) دەتوانیٚ دەخالەت بكات لە كاروباری منداڵەكانيداو كچ بەشوو بداو، ژن مارە بكات بۆ كوڕی، ئەگەرچی نابالْغيش بن،.. بۆ ئـەم بۆچوونەشيان بەڵگـەيان هێناوەتـەوە لێـرە نـاكریٚ درێـژەی بدەينیٚ.

٥- نێرينە بێت:

بەلای جەماوەری فوقەهاكانەوە دەبیٚ (وەلی) نێرينە بێـت، چـونكە ژن نـاتوانیٚ خـۆی مـارە بكات، چ جای ئەوە بچێت غـەيری خـۆی مارە بكـات، شـافيعيەكان ئـەم فەرموودەيان كردۆتـە بەڵگە كە دەفەرمووێ: ((لا تزوج المرأة المرأة، ولا المرأة نفسها))ئيبن ماجه.

ئيمـام (ئـەبوو حەنيفـە) دەڵـیٚ (ويلايـەت) لەبەشـوودانـدا، بـۆ (ئولوالأرحـام)يـش دەبـیٚ، بەمـەرجی (عەصـەبە) نـەبیٚ. كـەوابوو دايـك، خوشـك، پـووری دايكيـی، دەتـوانن كـچان مـارە بكەن، ئەگەر ميرات لەيەك بەرنو عەصەبەی نێرينە نەبیٚ.

## ئەرکی سەرپەرستیاری ژنان

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((إذا خطب إليكم من ترضون دينه وخلقه فزوجوه، إلا تفعلوا تكن فتنة في الأرض وفساد عريض))ترمذی ڕیوایەتی دەکات. واتە: هەرکات کەسێکی بەدینو بەئەخلاق هاتە پێش بۆ کچەکەتان، ئێوە لێ مارە بکەن،ئەگەرنا، خراپەو فەسادیکی گەورە بە زەویدا سەر هەڵدەداو، ئەو کات زۆربەی پیاوان بێ ژنو، زۆربەی ژنان بێ پیاو دەمێننەوەو، فیتنەو خراپە پەرەدەسێنێو هەموو شوێنێ دەگرێتەوە. دەبینی زۆر کەس پیاوی دیندار، یان ژنی دیندار هەڵنابژێرێت.. کەچی بۆ دوایی ژیانیان پڕ دەبێ لە چەلەحانێو شەڕە دەم.. مەسەلەی دۆزینەوەی پیاوی بەدین بۆ کچان، ئەوەند گرنگە، پیاوە صاڵحەکان بۆ خۆیان گەڕاون بەدوای پیاوێکی باشداو، پاشانیش گوتویانە، وەرە ئەو کچەمت لێ مارە بکەم !

ئیمای بوخاری دەگێڕێتەوە لە (عبدالله بن عمر)ـەوە کە کاتێ (خاتوو حەفصە) بێوەژن دەکەویت، (عومەر – خ) گوتی: چوومە لای (عثمان بن عفان)و حەفصەم خستە بەرچاوی کە مارەی بکات! لەوەڵامدا گوتی: با بیرێکی لێ بکەمەوە! پاشان دوای چەند شەوێك پێیگەیشتمەوە گوتی: وا چاکە بۆم ئەمڕۆ ژن نەهێنم، عومەر دەڵێت: بە (ئەبوو بەکری صدیق) گەیشتمو حەفصەم خستە بەرچاوی مارەی بکات، پاشان ئەبووبەکر بێدەنگ بوو هیچ وەڵامێکی نەدامەوە! ئیتر دڵم لە هەردووکیان نیگەران بوو.. ئینجا پاش ماوەیەك پێغەمبەر ﷺ خواستیو لێم مارە کرد.. بۆ دوایی (ئەبووبەکر –خ) بە عومەری گوت: لەبەر ئەوەبوو من وڵامم نەدایتەوە، چونکم بیستبووم کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردووە، منیش حەزم نەکرد ئەو نهێنیەی پێغەمبەرە ﷺ بڵاوبکەمەوە، دڵنیا بە ئەگەر ئەوە نەبووایە قەبووڵم دەکرد.

بەڵێ هەروەکو (وەلی) لەسەریەتی پیاوێکی دیندارو بە ئەخلاق بدۆزێتەوە بۆ کچەکەی، بێگومان لەسەریشیەتی بە پیاوێکی سەروسیما جوانی بدات، وەکو لە (عومەری کوڕی خەتتاب – خ) دەگێڕنەوەو گوتوویەتی: (لا تنكحوا المرأة الرجل القبيح الذميم، فإنهن يحببن لأنفسهن ما تحبون لأنفسكم). أحكام النساء لابن الجوزي. ژنان لە پیاوی ناشیرینو سەروسیما تاڵ مارە مەکەن، چونکە هەر چۆنێك ئێوە حەزتان لە جوانو قەشەنگە،ئەوانیش حەزیان لە پیاوی شۆخو شەنگە. ئەم جوانیشە مانای ئەوە نییە وەك ژنان نەرمو ناسكو سپیکەلە بێت، بەڵکو ئەوەند پێویستە کە سەرو سیمای لا قەبووڵ بێت.

* هەوڵ بدات لە کەسێکی مارە بکات لە ساڵ و تەمەندا نزیکبن، واتە کچێکی لاوی تازە پێگەیشتوو، مارە نەکات لە پیاوێکی پیرو بەتەمەن، چونکە نەگوونجانیان نزیکترە، تا

پێکـەوە ژیانیـان، جگـە لـەوەیش لەوانەیـە ئـەو پیـاوە پـیرە توانـای ڕازی کردنـی ئـەو کـچەی نەمابێت، ئەوکات دوور نییە کچەکە تووشی کاری بێ شەرعیی ببێت.

ئیبن جەوزی چەند جوان دەڵێت: (إياك أن تـزوج البنـت بشيخ أو شـخص مكـروه، فربمـا حملها ذلك علـى مـالا ينبغـى) أحكام النسا.. واتـە: تكـات لـێ دەكـەم كـچ لـە پیـاوی پـیر مـارە مەكە، گەلێ جار تووشی كاری ناھەموارو ناڕەوای دەكات.

لـە كتـێبی (كـشاف القنـاع)ی (حەنبەلیـە) كانـدا ھـاتووە: (ومـن التغفيـل أن يتـزوج الـشيخ الصبية) یان ھاتووە دەڵێ: (ومـن التغفيـل تـزويج شيخ بصبية). واتـە: كـچۆڵە مـارەكردن لـە پیاوی پیر، یان بەشوودانی لە پیاوی پیر، خۆ گێل كردنە لە ئەنجامەكەی.

نەھامەتییەكانی مارە كردنی كچی لاو لـە پیـاوی پـیر گـەلێ زۆرن، لەوانـە: كـچەكە بـە پێـی سروشـت حـەزی لـەیاریی و دەسـتبازیی و ئـەم دیـوو ئـەو دیـو كردنـە، لەوانەیـە كـچەكە تـا بەرەبەیان ماندو نەبێ و چاوەكانی نزیكی خەو نەبنـەوە... تـاد. بـەڵام پیاوەكـە دەكـرێ لەوانـە نیشتبێتەوەو ھـەر ئێوارەیـەكی زوو خـەو بیباتـەوە.. و.. و...، سـەرەڕای ئەوانـەیش – بـەپێی تەمەن و مردن – ئەو كچۆڵە پاش چەند ساڵێكی تر بێوەژن دەكـەوێ و تووشـی گیروگرفتێكـی زۆر دەبێ، ھەر لە مەسەلەی خۆیەوە تا ژیانی، تا بەخێوكردنی منداڵی وردی...

جـا لەبەرئـەوە (بەنـدە)یـش تكـا دەكـەم بـا ئەوەنـد كـاری نابـەجێ و ناھـەموار بەرامبـەر بـە كۆمەڵگە نەكەین بـە نـاوی ئیسلامەوەو، ئیسلام لای خـەڵكی نـوێ و تـازە پێگەیـشتوو بێـزراو نەكەین، بەتایبەتی لای خوشكانی بەڕێز. ھەقە مامۆستایانی بەڕێزیش ھەرگیز ڕێ بەو جۆرە مارە كردنانە نەدەن و، سوڵتەیش وریا بكرێتەوە لێی.

ئەگەر لە ڕابردوویشدا – لەبەر ھەر بەژەوندیەك – جارێ یان چەند جارێك كرا بێـت، نـابێ ئیتر تا قیامەت ئەوە بكرێتە بیانوو ڕەخنە لـە ڕابـردوو، چونكە نەپیاوان و ژنانی ئـەمڕۆ وەك ژنان و پیاوانی ئەو سەردەمەن، نە زەمان و مەكانی ئەمڕۆش وەكو سەردەمی ڕابردووە.

## كچ و كوڕ ھەر پێگەیشتن بەیەكیان بگەیەنن

لە قورئانی پیرۆزدا ھاتووە: ﴿وأنكحوا الأيامي مـنكم والـصالحين مـن عبـادكم وإمـائكم، إن يكونوا فقراء يغنيهم الله من فضله والله واسع علـيم﴾سوورەتـی نـوور\٣٢. واتـە:مێیینـەی بـێ مێردتان بە شوو بدەن، وە نێرینـەی بـێ ژنتـان ژنـی بـۆ سـاز بكەن،عەبدو كـەنیزی ھیژاشتان ھەروا، ئەگەر ھەژاریش بن خودا بە دلۆڤانی خۆی ھەموولا بێ نیاز دەكات.

لـە فەرموودەكانـدا زۆر ھـاتووە داوا دەكـات كـە بـە زوویـی كـچان بـە شـوو بـدرێن و كـوڕان

ژنيـان بـۆ بهێنرێـت، ئەمـەيش بـۆ پاراسـتنى خۆيـان و كۆمەڵگەيـە لـەكارى دزێـوو فاحيـشە، لەوانە:

* ((إذا جاءكم من ترضون دينه وخلقه فانكحوه، إلا تفعلوا تكن فتنة في الأرض وفساد عريض)).

كـەوابوو دواخـستنى كـچان و كـوڕان لـە كـاتى بەيەكگەيانـدنى خۆيـان، گـەلێ خراپـە، وە چەندين خراپەكاريى و فيتنەى دين و دنياى لێ دەوەشێتەوە، وەكو بە ئاشكرا دەبينرێ.

* پێغەمبەر ﷺ بە (على كوڕى ئەبوو تالب)ى فەرموو: ((يا علي! ثلاث لا تؤخرها: الصلاة إذا أتت، والجنازة إذا حضرت، والأيم إذا وجدت لها كفوا))ئيمامى ترمذى. واتە: سێ شتى گرنگ هەن، دەبێ دوايان نەخەن ئەى عەلى! نوێژ هەركاتى هات، مردوو هەركات ئامادەبوو، ژنى بێ مێرد، هەركات هاوكوفت بۆ دۆزيەوە.

خستنە پاڵ يەكى ئەو سێ شتە، مانـاى گرنگيدانـە بـە مەسـەلەى (زەواج)، ژنـى بـێ مێـرد، پياوى بێ ژن، هەركات شياوو گونجاويان بۆ دەسكەوت، نابێ پشتگوێ بخرێن، هەر چۆن نوێژ دوا ناخرێت ! يان جەنازە نابێ دوا بخرێت لە ناشتن..

## دواكەوتنى كوڕان و كچان لە بەيەكگەيشتن دەكەوێتە ئەستۆى ( وەلى )يەكانيان

بەڵێ.. هەركات هۆكارى شەرعيى نەبوو بۆ دواخستنى بەشوودانى ژنانى بێ مێردو، ژن هێنان بۆ پياوانى بێ ژن، باوك و براو هەر كەسێكى تر دەستى تێدا هەبێت، گوناحبار دەبن، وە ئەو كچ و كوڕە چەندە تاوان بكەن، ئەوەند (ولى)ـەكەيان گوناحى دەگات، بەمەرجێ ئەو هۆكار بێت بۆ دواخستنيان.

دەبێ كێ بەرپرس بێت لەمانەوەى ئەو هەموو كچانەدا لە ماڵى باوكياندا كە دەكرێ لەملاو لەولاوە داوا كارێكى زۆريان هاتبێ و ڕێيان لێگرتبن..؟ بەو بيانووەوە: خانووى نييەو، يان سەيارەى نييە، يان شەهادەى زانكۆى نييە... يان فلان شتى نييە.. تاد.دەبينـى لـە ئەنجامى ئەوەوە ئێستا گەشتوونەتە تەمەنى بە عەرەبى (عەنووس)ـە، بە كورديش (قەيرە كچ)، نە ئەوانەى پێشوو دەگەڕێنەوە داوايان بكەن، نە كوڕو كاڵى تازە پێگەيشتوويش دەچنە پێش بۆيـان، ئـەوانيش بـە ژيـانێكى پـڕ لـە ناسـۆرو خـەم و خەفـەت و كەسـەرەوە، بەناچـارى بۆيدانيشتوون وچاوەڕوانى مردن دەكەن، تا بەڵكو ڕزگاريان ببێ لە خت وبۆڵەى براو براژن وباوك وباوەژن و..تاد، ئيتر خۆ دووريش نييە هەريەكەيان گرفتێكى كۆمەڵايەتيشى بۆ پێش هـاتبێ: بێكەسـى و لێنەپرسـينەوەى كـەس لێـى، بـراو براژنێكـى خـراپ و دژوار... يـان بـاب و

بابەژنێکی نەگریس.. یان.. یان..

گـەلێك لـە کـچان بـە دەسـتهێنانی شـەهادەی زانکـۆو بـاڵاتر دوایـان دەخـاو بـەرەنجام لـە خۆشەویستی مێردو، دلۆڤانی دایکایەتی بێ بەش دەبن و بۆ خۆیـان پـیر دەبن و لەگـەڵ ژیـان دەکەونـە جـەنگ ! گـەلێکیان دەبنـە دکتـۆرەو ئەنـدازیارو مامۆسـتاو وەزیـرو بەڕێوەبـەر لـە جێگایەکـداو دەبنـە خـاوەنی خـانوو و سـەیارەو پـارەو ئیمکانیـاتێکی زۆرو لـە تەلارێکـدا بەماندوویی دەژیی و ئەوەی شکی ببات ئەو شۆفێرەیە سەیارەکەی بۆلێدەخوڕێ — سـەرەڕای ئـەوە نامەحرەمیـشە پێـی — دەکـرێ گـەلێ لاساریـشی لەگـەڵ بکـات.. یـان لەوانەیـە — وەکـو دەرەوەی وڵات — پشیلەیەك یان سەگێکی ڕاگرتبێ و لە ژوورەکەی خۆیـدا بیخـەوێنێ.. وهـیچ هیوایەکی بە مێرد کردن نەماوەو لەو هەموو ماناو مەبەستانە — لە زەواج دا هەیە — خۆی بێ بەشـکردووە.. بێگومـان هۆکـاری ئـەو هـەموو هەڵانـە، لادانـە لـە (فیطـرەت)ی یاسـای خـودای گەورە کە دایناوە بۆ ئەم دوو ڕەگەزە لەم بوونەوەرەدا کاری پێ بکەن تا بەختەوەربن، ئەگینـە سەرلێشێواوی دنیاو قیامەت دەبن.

(عومـەری کـوڕی خـەتتاب) (خـودای لـێ ڕازی بێـت) چـەند جـوان دەفـەرمووێت: ((زوجـوا أولادكم إذا بلغوا، لا تحملوا آثامهم)) أحكام النساء لابن الجوزی. واتە: منداڵەکانتان — کچ بن یان کوڕ — هەرکە پێگەیشتن کچەکان بە مێرد بدەن و، کوڕەکـانیش ژنیـان بـۆ بێنن، ئیتر ئێوە گوناحەکانیان هەڵمەگرن.. بەدواخستنیان لە (زەواج) و بەرەنجام تووشی گوناحیان بکەن.

بۆیە ئەگەر پیاوێکی دیندارو بە ئەخلاق، هاتە پێش و داوای کچێك بکەن و بـاوك و کـەس و کارەکەی نەیدەن و ڕێی لێبگرن، دەسەڵاتەکەی لێدەسێنرێتەوە.

## بەشوودانی کچی نابالغ و مارەکردنی ژن بۆ کوڕی غەیرە بالغ

لەم مەسەلەیەدا زاناکان بوونەتە سێ دەستەوە:

یەکـەم — (ئیبن شـبرمە) و (أبـوبکر بن الأصـم) بۆئـەوە چـوون کـە هـیچ کەسـێك نـاتوانێ نـە کـچی غـەیرە بـالغ مـارە بکـات، نـە ژنـیش بـۆ کـوڕی نابـالغ مـارە بکـات، چـونکە هـیچ پێویستییەکیان بە (زەواج) نییە، واتە: نەهێزی سێکسیی و نە مەسەلەی (نەسل) — کـە دوو هۆکاری سەرەکین بۆ زەواج — ئێستا لەواندا نییە، کـەوابوو دەبـێ حیکمـەت و فەلسەفەی ئـەو زەواجە چی بێت ؟. ئەو دوو زانا بەڕێزە دەڵێن: نـابێ نیکـاحی خـاتوو (عایـشە) لـە پێغەمبـەر ﷺ بە منداڵیی بکرێتە چاولێگەری وبیانوو، چونکە ئەوە تەنها بۆ ئـەو دەبـێ و لـە (خـصائص) وتایبەتمەندی ئەوە.

دووەم – (ئيبن حەزم) دەلىٚ: باوك دەتوانىٚ كچى نابالٌغى خۆى مارە بكاو دواييش كچەكە بۆى نيە ڕەخنە بگرىٚ، كاتىٚ بالٌغ بوو، بەلاٌم كچى بچووكى نابالٌغى بىٚ باوك، تا بالٌغ نەبىٚ، كەسيٚك بۆى نييە مارەى بكات، ئەگەرچى زەروورەتيش بيٚت.

سيٚيەم – كە بەڕاى جەماوەرى زانايان دانراوە، دەلٌيٚت: هەم كچى نابالٌغ بە شوو دەدريٚت، هەم كوڕى غەيرە بالٌغيش ژنى بۆ مارە دەكريٚت.

هەندىٚ بەلٌگەش بۆ پشتگيرى لە ڕاوبۆچوونەكەيان دەهيٚنن، بە پيٚويستى نازانم – بۆ ئەمڕۆ – بيانهيٚنم، شياوى باسە بەڕيٚز (عبدالكريم زەيدان)يش ئەم ڕايە پەسەند دەكاو دەلىٚ: بىٚ شك باوك هەرگيز خەيانەت لە مندالٌى خۆى ناكات، هەلٌسىٚ بىٚ هيچ بەرژەوەندييەك مارەى بكات، يان ژنى بۆ مارە بكات، دەشلٌيٚت لەوانەيە ئەمڕۆ هەندىٚ صيفەت ڕەچاو بكريٚت، كە ئەگەر گەورە بىن، ئەوصيفەتانەى لەدەست دەرچيٚت بۆيان، بەلاٌم لەگەلٌ ئەوەيشدا دەلٌيٚت: هەتا بەڕوونى بەرژەوەندييەك لە پيٚش چاو نەبىٚ، هەق نييە ئەو كارە بكات، سەرەڕاى ئەوەيش ئەوانە لەو كاتەدا هيچ ماف و ئەركيٚكى ژن و ميٚردى نازانن، بۆيە شافيعى/خ هەرگيز ڕىٚ نادات كچۆلٌەيەكى بەفامى نابالٌغ بەشوو بدريٚت تا بالٌغ دەبىٚ و ڕەزامەندى وەردەگريٚت.

بەندەش – بەپيٚى عەدالەت و دادگەرى و دادپەروەريى و ئازادى مرۆڤ و ماڤى مرۆڤ لە ئيسلامدا – دەلٌيٚم: ئەوەى لەو سىٚ ڕاو بۆچوونەى سەرەوە، لەگەلٌ ڕۆحى ئيسلامدا بگونجيٚت، ڕاوبۆچوونى يەكەمە كەدەلىٚ: هيچ كەسيٚك ناتوانىٚ كچى غەيرە بالٌغ بەميٚرد بدات، يان ژن لە كوڕى نابالٌغ مارە بكات.. ڕاستە ئەوەى خاتوو (عايشە) لە (خصائص)ى پيٚغەمبەرەو ئەو تيٚكەلٌبوونە لەگەلٌ (ئەبووبەكردا/خ) بۆ تۆكمە كردنى ئيسلام و بانگەوازەكەى ئيسلام – بەهۆى ئەبووبەكرەوە – زەروورەت و پيٚويست بوو و، پڕ بوو لەبەرژەوەندى ئيسلام و موسلٌمانان، بەلاٌم ئيٚستا عەدالەت زۆر كەم بۆتەوەو، باوكان ئەوەند بەرژەوەندى خۆيان ڕەچاو دەكەن، ئەوەند هى كچەكانيان ڕەچاو ناكەن... جا لەبەر ئەوە بە پيٚويستى دەزانم ڕيٚى لىٚ بگيردرىٚ و هەرگيز شتى وانەكريٚت، ئەگەر كرايش كچەكە سەرپشك بكريٚت: حەز دەكات بە هاوسەريٚتى لەگەلٌيا بژى، يان حەز بەجيابوونەوە دەكات ؟.

### بەميٚرد دانى كچيى ژيرو بالٌغ

يەكەم – ئەمانە نيشانەى بالٌغ بوونن ؟

أ–كەوتنە بىٚ نويٚژى.. واتە: بەبىٚ نەخۆشيى خويٚن لەوجيٚگەى خۆيەوە بيٚتە دەر، چونكە هەرگيز ئەو خويٚنە نابينن تا بالٌغ نەبن، كەوابوو ئەو خويٚنە دەبيٚتە نيشانەى بالٌغبوون.

ب-دەرچوونی (مەنی) لە زەكەری كوڕانەوەو لە پێشی كچانەوە، لەخەودا، یان لە حاڵەتی بەخەبەربوون.. شتی وا كە دەبێتە نیشانەی باڵغبوون، لەناو زاناكاندا بێ كێشەیەو هەموو یەكدەنگن لەسەری.

ج-سكبوون.. سكبوونی ژنان دەبێتە نیشانەی باڵغبوون، چونكە بەڵگەی دەرچوونی (مەنی)یە، خۆ دیارە منداڵ لە (مەنی) ژن‌و پیاو پەیدا دەبێ.

د-سەبارەت بە ڕوانی ((موو)) لەدەوروبەری زەكەری نێرینەو پێشی كچانەوە.. گەلێ ڕاوبۆچوونی تێدایە: كە ئاخۆ ڕوانی ((موو)) دەبێتە نیشانەی باڵغبوون، یا نابێت ؟ لە كتێبە فیقهییەكاندا باسكراوە.

ه-ئەگەر شتێك لەو چوار نیشانە لە كچان‌و كوڕاندا دەست نەكەوت، ئینجا بەساڵ دەگەڕێین بۆ باڵغبوون، بۆئەمەیش (حەنەفیەكان) دەڵێن: كوڕان دەبێ بگەنە (١٩)ساڵ، كچانیش (١٧)ساڵ. بەڵام (ئەبوو یووسف) و (محمد)ی فەقێیانی ئیمام ئەبووحەنیفە دەڵێن: كچ‌و كوڕ بگەنە (١٥)ساڵ، مانای باڵغبوونە.

(حەنبەلی) و (شافعی)یەكانیش (١٥) ساڵ دەكەنە نیشانەی باڵغبوون بۆ هەردووكیان، ئەگەرچی قسەیەكی تری (حەنبەلی)یەكان دەڵێت: كچ لە (٩)ساڵەدا بەباڵغ دادەنرێت. (مالكیەكان) (١٨)ساڵ بڕیار دەدەن. جەعفەریش: بۆ كوڕ (١٥)ساڵ، بۆ كچیش (٩)ساڵ، شیاوی باسە هەریەك لەم چوار ڕاوبۆچوونانە بەڵگەو دەلیلی خۆیانیان هەیەو لەشوێنی خۆیدا باسیان كردووە.

شەرعزان‌و یاساناسەكان دەتوانن كۆببنەوە – لەهەر وڵاتێكدا بن – هەركام لەو بۆچوونانە گونجاوە بۆیان هەڵیبژێرن و كاری پێ بكەن لە دادگاو ناوچەكانیاندا، چونكە مەسەلەی باڵغبوون‌و باڵغنەبوون، لە ناوچەیەك بۆ ناوچەیەكی دی دەگۆڕێ...

كچ بەوانە دەڵێن: كە پەردەی كچێنی (غشاء البكارة)یان بەهۆی چوونە لای شەرعییەوە لانەچووبێت.. كەوابوو ئەوانەی پەردەی كچێنیان بەهۆی بازبردنەوە، یان بە هۆی تیژی خوێنی (حەیز)ـەوە، یان بەهۆی زۆرمانەوەو قەیرەبوونیانەوە، یان لەبەر زاییەكەوە دەكەونە خوارەوە، یان لێیان دەدرێت، یان بە پەنجە، یان بەهەر هۆكارێكی ترەوە – ئەگەر بە (زینا)یش بێت – نامێنێت، یان بەبێ پەردەی كچێنی لەدایك بوونە، لەناو زانایاندا ئەمانە هەر بە كچ دادەنرێن‌و مامەڵەی كچیان لەگەڵ دەكرێت.

## بەشووداني كچ وبێوەژنی باڵغ و ژیر

حەنەفییەكان دەڵێن: سەرپەرستیاری ئافرەت – باوك بێت یان نا – بۆی نییە زۆر لە هیچ كچێكی باڵغی ئاقڵ بكات بۆ شووكردن، چونكە تا منداڵ و نەفامبوو دەیتوانی دەخالەت بكات لە بەشوودانیا، بەڵام كە گەورە بوو فامیكردۆتەوەو، بۆ خۆی سەرپەرستیاری كاری خۆی دەكاو كەسێك بۆی نییە بە زۆر بەشووی بدات. كەوابوو لە حاڵەتی ئاوایشدا دەتوانێ سەرووكاری خۆی بكاو، بچێت بۆ خۆی مێرد بكات بێ ئیزن و مۆڵەتی (وەلی)، ئیتر مێرد هاوكووف بێت یان هاوكووف نەبێ، بە (مهر المثل) بێت یانا، چونكە دەسەڵاتی تەواوی هەیە كە بۆ خۆی بڕیاری ئایندەی خۆی بدات.. بەڵام ئەوەند هەیە ئەگەر مێردەكەی هاوكووف نەبوو، یان مارەیەكەی شایەنی خۆی نەبوو، (وەلی)یەكەی دەتوانێ ڕەخنە بگرێ‌و سكاڵا نامە بداتە دادوەرو داوای هەڵوەشانەوەی نیكاحەكەی بكات.

**جابۆ دەسەڵاتداریێتی كچی باڵغو ئاقڵ، حەنەفیەكان بەڵگە گەلێك دێننەوە، لەوانە:**

یەكەم – ئایەتی: ﴿فإن طلقها فلا تحل له من بعد حتى تنكح زوجا غيره..﴾.(سوورەتی: البقرة: ٢٣٠).

دووەم – ئیبن عەباس / خ دەڵێت: كچێك هاتە لای پێغەمبەر – صلى الله عليه وآله وسلم – گوتی: باوكم بەزۆر بە مێردی داوم! پێغەمبەریش ﷺ سەرپشكی كرد: كەدەتوانێ لای مێردەكەی بمێنێتەوە، یان نیكاحەكە هەڵوەشێنێتەوە؟.

كچی باڵغی ئاقڵ، ئەگەرچی دەسەڵاتی خۆ مارەكردنی هەبێ، بەڵام وا پەسەندو (مستحب)ە كە نیكاحەكەی بداتە دەستی (وەلی)ەكەی‌و ئەو مارەی بكات لە مێردەكەی.

ئەگەر كەسێكیش هات داوای ئەو كچەی كرد لە (وەلی)یەكەی، دەبێ (وەلی)یەكەی مۆڵەت وەرگرێت‌و بزانێ ئاخۆ ئەو كچە ڕازیە بەو كەسە داوای دەكات؟. جا ئەگەر وەلی بێ ئیزن وەرگرتن، مارەیكرد لە كابرایەك، پاشان بە كچەكەی ڕاگەیاند، كچەكە دەتوانێ هەڵیوەشێنێتەوە، دەشتوانێ قبوڵی بكات.

شافیعیەكان دەڵێن: ژنان بە هیچ شێوەیەك ناتوانن سەرپەرستی نیكاح بكەن، واتە: نە دەتوانن خۆیان مارە بكەن بۆ ئەوەی دەیانەوێت، نە دەشتوانن گرێبەست بۆ ژنێكی دی بكەن، تەنانەتی بە شێوازی بریكاریش هەر ناكرێت. بۆ ئەمەیش چەندین بەڵگە دێننەوە، لەوانە: ئەم ئایەتە كە دەفەرمووێ: ﴿فلا تعضلوهن أن ينكحن أزواجهن..﴾ واتە: ئەی (ئەولیا)ی ژنان! ئەو ژنانە تەڵاق دەدرێن‌و پاشان دەیانەوێ لەگەڵ مێردەكانیان ڕێك ببنەوە، ئێوە ڕێیان لێمەگرن.. كەوابوو بە پێی ئەم ئایەتە (وەلی) بۆ نیكاحی ژنان پێویستە، ئەگینە

ڕێگرتنەکـە یـان چ دەورێـك دەبـینێ..؟. پێغەمبـەریش ﷺ دەفـەرمووێ: ((لا نكـاح إلا بـولی)).. یان دەفەرمووێ: ((أيما امرأة أنكحت نفسها بغير إذن وليها فنطاحها باطل، فنكاحها باطل)). سـەرەڕای ئەمانـەیش عـورف وایکـردووە – لەبـەر ئـەدەبو شـەرمی ژنـان – دەخالـەت لـە گرێبەسـتدا نەکەن.. مەگەر زۆر ناچارو پێویست بێت، بۆ نموونە: ژنێك حەزی لە مێردە، نـەبابو کـەسو کـاری هەیـە، نـەدادوەریش هەیـە گرێبەسـتەکەی بـۆ بکـات. لـەو حاڵەتـەدا دەتوانێ زانایەکی (موجتەهید) یان پیاوێکی عادل بکاتە (حەکەم) مارەی بکات لەو پیاوە حەزی لێ دەکات: ((لو عدم الولي والحاكم فولت مع خاطبها أمرها رجلا مجتهدا ليزوجها منه صح، لأنه محكم والمحكم كالحاكم وكذا لو ولت خاطبهاعدلا ليزوجها منه صح على المختار، وإن لم يكـن مجتهـدا لـشدة الحاجـة إلى ذلـك)) نهايـة المحتـاج/ج ٦ ص ٢١٩–٢٢٠، مغنـي المحتاج – ج٣ /١٤٧.

بـۆ دەسـەڵاتی (ولـی) بەسـەر ژنانـەوە، شـافیعیی – خ ئـەم چـەند مەرجـەی دانـاوە، ئەگینـە نیکاحەکە دانامەزرێ:

١– أن لا يكون بينه وبنيها عداوة ظاهرة / نابێ کچەکەو وەلیەکەی دژو نەیاربن بەیەك.

٢– أن يزوجها من كفوء /دەبێ لە هاوکووفو هاوشانی خۆی مارەی بکات.

٣– أن يزوجهـا بمهـر مثلـها وبنقـد البلـد/دەبـێ وەك ژنێکـی هاوشـانی خـۆی مـارەیی بۆدابنرێت وبە پارەی ئەو وڵاتەش بێت.

٤–أن لايكن الزوج معسرا بالمهر/ دەبێ مێرد بە مارەییی نەدارا نەبێت.

٥– أن لا يزوجها بمن تتضرر بمعاشرته../ دەبێ لە کەسێکی مارە نەکات،بە ژیـان لەگـەڵیا زەرەر مەند ببێت.. بۆ نموونە: مـارەی بکـات لـە پیـاوێکی پـیرو بەتەمـەن، یـان لـە نەخۆشـێکی وا، ژنان ناتوانن لەگەڵیا بژین، یان هێزی سێکسیی لاوازبێ‌ونەتوانێ ژنەکە ڕازی بکـات، یـان ڕووتاڵو ئەشقییو ئازارو بێزاری ژنان زۆر بدات.. یان..یان..

**تێبینی:**

جگە لە باوكو باپیرە هیچ کەسێکی دی بۆی نییە کچی باڵغی ئاقڵ بێ ڕەزامەندی کچەکە بەمێرد بدات خۆ ئەگەر کردی ئەو کچە دەتوانێ ڕایگرێو کاری پێ نەکات، (عبد الله بن عمر) کچە خاڵێکی خۆی (عثمـان بـن مظعـون) مـارە کـرد، پاشـان دایکەکەی چووەلای پێغەمبـەر – صـلى الله عليـه وآلـه وسـلم – گـوتی: کچەکەم حـەزی لێناکـات! پێغەمبـەریش ﷺ فـەرمانی بـە (عبدالله) دا دەستی لێهەڵگرێت.

رای (حەنبـەلی) و (مـالکی)یـەکانیش لـە ڕاوبۆچـوونی (شـافیعیەکان)ەوە نزیکـە و دەڵـێن:

((لاتزوج المرأه نفسها..)) بەبەڵگەو دەلیلی فەرموودەی: ((لا نكاح إلا بولي)).

(ئیبن حەزم) دەڵێ: ((وإذا بلغت البكر والثيب لم يجز للأب ولا لغيره أن يزوجها إلا بإذنها، فإن وقع فهو مفسوخ أبدا..)). جەعفەریـەكانیش وەك ئـەمان دەڵـێن تەنانـەتی لـە كتـێبی (الأحكام الجعفرية في الأحوال الشخصية))دا هاتووە: ((وللحرة المكلفة – أي البالغة العاقلة – أيضا أن تزوج نفسها بلا ولي بكرا كانت أو ثيبا ويصح وينفذ زواجها إذا باشرت عقده بنفسها وبدون وليها، وسواء رضى أو كره، وسواء كان بمهر المثل أو غيره، وسواء كان الزوج كفؤاً أو غير كفؤ)).

## پوختەی ئەم باسە

یەكەم – هیچ كەسێك ناتوانێ كچی باڵغو ئاقڵ – بێ ڕەزامەندی كچەكە – بە شوو بدات.

دووەم – ئەگەر بێ ڕەزامەندیو مۆڵەتی كچەكە مارە كرا، ئەوە ئەگەر قەبووڵی نەكات، (فەسخ)ـەو هەڵدەوەشێتەوە.

سێیەم – ئەگەر (وەلی) بەشووی نەداو مۆڵەتیشی نەدا بۆ خۆی بەهاوكووفێك مێرد بكات، سكاڵا دەداتە دادوەر بۆ چارەسەری كێشەكەی لەگەڵ باوكو كەسوكاری.

ئیمامی بوخاریی دەروازەیەكی داناوە بۆ ئەم باسە دەڵێ: ((باب: لا ينكح الأب وغيره البكر والثيب الإبرضاهما)) پاشان ئەم فەرموودەیە دێنێ: ((لاتنكح الأيم حتى تستأمر،ولاتنكح البكر حتى تستأذن)). واتە: بێوەژن تا قسەو ڕەزامەندی وەرنەگیردرێ، بە مێرد نادرێت، كچیش تا مۆڵەتی وەرنەگیردرێ، بە مێرد نادرێت، لە پێغەمبەریان – صلى الله عليه وآله وسلم – پرسی: مۆڵەت وەرگرتن لە كچان چۆنە ؟ فەرمووی: بێدەنگ بوونیانە. (ئیبن حجر العسقلاني) لەشەرحی فەرموودەكەدا دەڵێت:: ((والحديث دال على أنه لا إجبار عليها – أي البكر إذا بلغت)).

(ئیبن عباس) – لە موسلیمدا هاتووە – دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((الثيب أحق بنفسها من وليّها، والبكر يستأذنها أبوها في نفسها وإذنها صماتها)). ئەم فەرموودەیە – ئەوەند بەهێزە (ئیمامی: بوخاریی، موسلیم، أصحاب السنن: ئەبوو داود ترمذی، نەسایی، ئیبن ماجە) هەروەكو (دارەمی، بەیهەقی) ڕیوایەتیان كردووە. ئیمامی (شەوكانی) لە (نيل الأوطار)دا دەڵێ: ((وظاهر الأحاديث: أن البكر البالغة إذا زوجت بغير إذنها لم يصح العقد)). كەوابوو (وەلی) ژنان ناتوانن بێ مۆڵەتو ڕەزامەندی كچانی باڵغ بەمێردیان بدەن، گریمان بە مێردیان دان گرێبەستەكە كاری پێ ناكرێتو هەڵدەوەشێتەوە، (ئەبوو داود) لە (ئیبن عەباس)ـەوە دەڵێ: ((أن جارية بكرا أتت النبي – صلى الله عليه وآله وسلم – فذكرت أن أباها زوجها وهي كارهة فخيرها النبي ﷺ)).

خاوەنی (سبل السلام) دەڵێت: ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسـەر ئەوە کە حەرامـە بۆ بـاوك – دیـارە غەیری باوك چاکتر – مارە بڕینی کچی خۆیان بیّ ڕەزامەندییان. ئیمامی(نەسایی) لە خاتوو (عایشە)وە دەڵێت: کچە لاوێك هاتە لای گوتی: ((إن أبي زوجني إبن أخيه ليرفع بي خسيسته وأنا كارهة)) باوکم بەزۆر لە برازایەکی پەستی خۆی مارەیکردووم.. دەبیّ چارەم چی بێت؟ ئەویش لای خـۆی داینـا تـا پێغەمبـەر ﷺ هاتـەوەو مەسـەلەکەی بـۆ گێڕایـەوە، پێغەمبـەریش ﷺ نـاردی بەدووی باوکیا – پاش لۆمەو سەرزەنشت – کچەکەی سەرپشك کرد: دادەنیشی بەلایەوە، یان نیکاحەکەی هەڵدەوەشێنێتەوە. ئینجا کچەکە – پاش ئەوە کە لە ماڧ خۆی حاڵی بوو – گوتی: ئەوە پیادە دەکەم کە باوکم کردوویەتی ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەو سکالاّیەشم هەر بۆ ئەوە بوو کە ژنان لە ماڧ خۆیان ئاگاردار بکەم.

ڕاڤەکەرانی فەرموودەکان لەسەر مەسەلەی بەشوودانی کچان – بەبێوەژنیشەوە – باڵغ بن، یـا نـا، گـەلێك ڕوونکردنـەوەیان داوەو پاشـان ئەمـە هەڵدەبـژێرن کـە: بـیّ ڕەزامەنـدی کـچان، نیکاح دانامەزریّ، ئەگەر نابالّغیش بن، نابیّ بە شوو بدرێن تا پێدەگەن و خۆیان چارەنووسی خۆیان دیاری دەکەن، هیـوادارم ئیـستایش – لـەم سـەدەی بیـست و یەکەمـەدا – باشتر هـەوڵ بـدرێت بـۆ کـارکردن بـە فـەرموودەکان و مـاڧ مـرۆڤ – بەژنانیـشەوە – بگەڕێتـەوە بـۆی، تـا خوایش بەزەیی پێماندا بێتەوە.

## (ظیهار): کەسێك بە ژنی خۆی بڵیّ تۆ دایکمی

ژنـان لەسـەردەمی جاهیلییەتـدا، هەمیـشە گـیرۆدەی دەسـتی پیـاوان بـوون، ئـەوەبوو لـە باسـەکانی پێـشوودا هەنـدیّ لـەو دەردو گـیرو گرفتانـەمان باسـکردن، لـەم بابەتەشـدا خـوو کردارێکـی نالـەباری تـری جاهیلییـەت بـاس دەکـەین، دیـسان کـە چـۆن ژنـان ئەسـیری ببـوون وپێـوەی دەتلانـەوەو پیـاوان یارییـان بـە چارەنووسـیان دەکرد،ئیـسلامی پـیرۆز دێـت خـووە پیسەکەیان دەخاتە روو و شەرمەزاریان دەکاو بە کارێکی ناڕەواو درۆو دەلەسەی دادەنیّ.

لە سەر دەمی جاهیلیەتدا هەر کە پیاو لە ژنەکەی تووڕە دەبوو پێیدەگوت: تۆ دایکمی! واتـە: هـەر چـۆن دایکـم حەرامـە لـێم، تـۆیش هـەروا، ئـیتر بـەو رسـتەیە لێـی حـەرام دەبـوو و تەلاّقیشی نەدەکەوت تا بچێت بۆ خۆی رزگار ببیّ و، بەئازادانە چی دەکات بیکات! ئەمـەش بەشێکی تر بوو لە نەهامەتیەکانی ژنان بەر لە ئیسلام.. ئینجا کە ئیسلام هات و ئەو حاڵەتـە لـە خـاتوو (خەولـە) روویـدا، بـۆ وە لاّمـی چارەسـەری ئـەو کێـشەیە سـەرەتای سـوورەتی (موجادیلـە) هـات. ئیمـامی(ئەحمـەد) لـە خـاتوو (خەولـە) خۆیـەوە دەگێڕێتـەوەو دەڵێـت: سـوێندبیّ بـە خـوا سـەرەتای سـوورەتی (موجادیلـە) لـە بـەر چـارە سـەری کێـشەکەی مـن

و(ئەوس) ی مێردم هات. من ژنی ئەوس بووم، ئەوسیش پیاوێکی پیری بەدکار بوو! رۆژێك – وەکو باوی ژن وپیاو لە یەك تووڕە دەبن – لێم تووڕە بوو و گوتی: تۆ دایکمی! پاشان هەڵساو بەجێیهێشتم، جا کاتێ گەڕایەوە داوای تێکەڵی لێکردم، منیش وتم سوێندم بەوەی گیانی (خەولە)ی بەدەستە، دەستت لێم ناکەوێ هەتا خواو پێغەمبەرەکەی بڕیار نەدەن لەم کێشەدا، پاشان (ئەوس) ویستی ئازارم بدات، بەلاّم لە بەر پیری دەرەقەتم نەهات، ئیتر هەڵسام چوم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بە سەر هاتەکەمم بۆ گێڕایەوەو فەرمووی: خوەیلە! ئامۆزاکەت پیاوێکی پیری بە سالاّچووە، لە بەرامبەریا لە خوا بترسە! خەولە دەڵێ سوێند بەخوا لەوێ هەڵسام و خوا وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ کردو ناردی بەدوومداو فەرمووی: خوەیلە! بێگومان خوا دەربارەی تۆو مێردەکەت قورئانی دابەزاندە خوارێ ! ئیترئەوەبوو سەرەتای سوورەتی (قد سمع الله) هەتا (وللكافرين عذاب أليم) بۆ خوێندەمەو دوایی فەرمووی: بە مێردەکەت بڵێ: لە کەفارەت وبارتەقای ئەو بێژەی(تۆ دایکمی) کۆیلەیەك ئازاد بکات، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! توانای نییە کۆیلەیەك بکڕێ و ئازادی بکات ! فەرمووی: دە پێی بڵێ دوو مانگ بەدوای یەکدا بە ڕۆژوو بێت، گوتم: بەخوا پیرێکی بەسالاّ چووە ناتوانێ ڕۆژوویش بگرێت ! فەرمووی: دەبا (وەسق)ێ خورما – کە دەکاتە شەست مەن – بە شەست کەسی بێ نەواو مسکین بدات، گوتم بە خوا سوێند بێ ئەوەشی نییە ! فەرمووی: دەسا ئێمە خۆمان شەست مەن خورمای دەدەینێ بیدا بە کەفارەتەکەدا، (خویلە) دەڵێ: گوتم: منیش مەنێکی دەدەمێ، فەرمووی: کارێکی باشت ئەنجامدا، دەبچۆ لەباتی ئەو بیدە بە هەژاران و بۆ دواییش لەگەڵ ئامۆزاکەتدا چاك بە، منیش چووم وەسیەتەکەی پێغەمبەرم ﷺ جێبەجێ کرد.

ئەدی ئایا ئەمە گرنگیدان بە ژنان و کاروباری ژنان نییە ؟ کە لەبەر ژنێکی گیرخواردوو بە دەست باوو نەریتی جاهیلیەتەوە خودا وەحیی بنێرێت بۆ پێغەمبەرەکەی و بفەرموێ: ﴿قد سمع الله قول التی تجادلك فی زوجها..﴾ مەگەر لەمە زیاتر بەرزکردنەوەی پلەی ژنان ؟ کە خوا بۆ خۆی وەحیی بکاو پێغەمبەرەکەشی بەدەم کاروباری ئەو ژنەوە خۆ خەریك بکات ؟.

(بوخاریی) لە خاتوو عائیشەوە خوای لێ رازی بێ، دەڵێ: «الحمدلله الذی وسع سمعه الأصوات لقد جاءت المجادلة (خولة) إلى رسول الله فی جانب البيت ما أسمع ما تقول. فأنزل الله عزوجل: ﴿قد سمع الله قول التی تجادلك فی زوجها وتشتكی إلى الله﴾ واتە: سوپاس هەر بۆ ئەو خوایە کە دەنگی سکالاّی خەولەی بیست، لەکاتێکدا من لەلایەکی ماڵەکەدا بووم سکالاّکەییم نەبیست !. بەراستیی هەقە ژنان زۆر گوێرایەڵ و فەرمانبەردار بن، شوکرانە بژێر

بن، لەبەرامبەر وەڵامەكەی خوای كارجوانەوە كە لەسەرووی ئاسمانەوە دەنگیان دەبیسیٚ و بۆ چارەسەری كێشەكانیان قورئان دەنێریٚ، هەرچۆنیٚ بۆ نوێژو رۆژوو حەج و زەكات و باقی بابەتەكانی تر قورئان دەنێریٚ. هەقە ئێمەیش وەكو موسڵمان بۆ چارەسەری گشت كێشەكانمان تەنها لەپەیامەكەی خوا چاوەروان بكەین و، هەربۆ لای ئەو بگەرێینەوە، هەروەكو خاتوو (خەولە) كێشەكەی خۆی بردە لای پێغەمبەر ﷺ تا دەرەنجام خوا بە هانایەوە هات و وەڵامی دایەوە. هیوادارم خوشكانمان بە فات و فیتی ئەملاو ئەولا فریو نەخۆن و تەنها بە خوا خۆ تەسلیم بكەن، بەشكو ئەوەند بە ناوی پیاوسالارییەوە لە خشتە نەبرێن !.

بەڵیٚ خوا فەرمووی: ﴿قد سمع الله قول التى تجادلك فى زوجها وتشتكى إلى الله والله يسمع تحاوركما إن الله سميع بصير * الذين يظاهرون منكم من نسائهم ما هن أمهاتهم إن أمهاتهم إلا الئى ولدنهم وإنهم ليقولون منكرا من القول وزورا وإن الله لعفو غفور * والذين يظاهرون من نسائهم ثم يعودون لما قالوا فتحرير رقبة من قبل أن يتماسا ذلكم توعظون به و الله بما تعملون خبير * فمن لم يجد فصيام شهرين متتابعين من قبل أن يتماسا فمن لم يستطع فإطعام ستين مسكينا ذلك لتؤمنوا بالله و رسوله و تلك حدودالله و للكافرين عذاب أليم﴾ ٥٨ / ١ – ٤. واتە:خوا قسەی ئەو ژنەی بیست كە دەربارەی مێردەكەی لە گەڵ تۆ – ئەی پێغەمبەر!– گلەیی وگازندەی لای خوا دەكرد، خوا دەیبیست كە ئێوە وتوو وێژتان بوو، خواش بیسەرو بینایە. ئەو كەسانەشتان بە ژنی خۆیان دەڵێن: ((تۆ دایكمی))، بەو قسەیە ژنەكانیان نابنە دایكیان، دایكیان هەر ئەوانەن دیویانن، ئەوان قسەی خراپ دەكەن وبوختان هەڵدەبەسن، خوا لە گوناح دەبووریٚ وخەتا پۆشە.جا ئەوانەی بە هاوجووتی خۆیان دەڵێن: ((تۆدایكمی)) پاشان پەشیمان دەبنەوە، دەبیٚ بەر لەوە پێكەوە بنوون،كۆیلەیەك ئازاد بكەن، خوا ئاوا ئامۆژگاریتان دەكات، هەر كارێكیش دەكەن خوا لێی بە ئاگایە. هەر كەس نەیبوو كۆیلەیەك ئازاد بكات، با دوو مانگی یەك لە دوای یەك، بەرۆژوو بیٚ، پێش ئەوە بە یەك بگەن، كەسێك ئەوەشی نەتوانی، خۆراك بە شەصت هەژار بدات، هەتا باوەڕتان بە خواو بە پێغەمبەری هەبیٚ و ئەمە سنووری خوایە، بۆ كافرانیش ئازارێكی بە ئێش و بە ژان هەیە. (لە ((فى ظلال القرآن)) و((ابن كثير)) سوودم وەرگرتووە).

## چەند تێبینیەك:

یەكەم– (ئەبوو زەید) دەڵیٚ:جاریٚ عومەر لە گەڵ خەڵكێك بۆ كارێك دەچوو، لەو دەمەدا بەژنێك –خاتوو (خەولە) – گەییشت و عومەر لە بەر رێز لێنانی وەستا!پاشان لێی نزیكبوویەوەو سەری بۆ بردە پێش و گوێی بۆ قسەكانی گرت و بۆدوایی رۆیشت، ئینجا

پیاویك به عومەری گوت: ئەدی (أمیر المؤمنین)! چۆن لە بەر پیرە ژنێك پیاوانی قورەیشت ماتڵکرد؟! وتی: ئەی هاوار بۆتۆ !مەگەر نازانی ئەو ژنە کێبوو ؟ ئەمە ئەو ژنەیە کە لە سەرووی حەوت ئاسمانەکەوە خوا گلەیی و گازندەکەی بیست و وەڵامی دایەوە، ئەوە خاتوو خەولەیە! بە خوا سوێند ئەگەر تاشەویش وەستابا، منیش دەوەستام لە گەڵی،مەگەر بۆ نوێژ چووبام، پاشانیش هەر دەهاتمەوە بەلایەوە. (لە ابن کثیر)وە (روائع البیان) ی صابوونی کەڵك وەرگیراوە.

دووەم- رستەی ((تۆ دایکمی)) - وەك (ابن القیم) دەڵێ - بەر لە هاتنی ئیسلام تەڵاق بوو، بگرە حیسابی گرنگتریشی بۆ دەکرا، پاشان ئیسلام هات ئەو باوو نەریت و یاساو رێسایەی هەڵوەشاندەوەو بە کارو رەفتارێکی حەرام و یاساغی دانا، برِیاریشیدا تاکەفارەتی نەدرێت،نابێ ئەو مێردە ئەوەی وتووە نزیکی ئەو ژنەی ببێتەوە. کەوابوو ئەگەر پیاوێك بەژنەکەی وت ((تۆ دایکمی))و مەبەستیشی پێی تەڵاق بوو، بە (ظیهار) دادەنرێ، وە ئەگەر تەڵاقی داو، مەبەستی (ظیهار) بوو، هەر بە تەڵاق دادەنرێت.

سێیەم- هەر کەسێك بە ژنەکەی گوت ((تۆ دایکمی)) دوو شت دێتە پێش:

أ - تا کەفارەت دەدات، نابێ سەر جێیی لە گەڵ بکات.

ب- کەفارەت بە یەکێ لەم سێ شتە ئەنجام دەدرێ:

- کۆیلەیەك ئازاد بکات.

- ئەگەر ئەوەی پێنەکرا، دەبێ دوو مانگ - یەك لە دوای یەك - بە رۆژوو بێت.

- ئەگەر ئەوەشی بۆ هەڵ نەسووڕا، دەبێ خۆراك بە (٦٠) کەسی هەژار بدات.

خوێنەری هێژا ! ئەمەی باسکرا، یەکێك بوو لە سەدان گروفتی ژنانی ئەو سەردەمە، ئیسلامی پیرۆز هات و رزگاری کردن لێی. دڵنیاشبن بێ هیچ جیاوازییەك لە نێوان رەگەزی نێرو مێدا، ستەم و ناهەقیی بەرامبەر هیچ لایەکیان قبووڵ ناکات.

## جیابوونەوەی ژن و پیاو (تەڵاق)

تەڵاق و جیابوونەوەی ژن و پیاو بەلای دینی ئیسلامەوە خاڵێکی زۆر گەورەو گرنگە، چونکە تێکچوونی ماڵ و حاڵی بەدوادا دێت، گەلێ جار منداڵان سەرلێشێواو دەبن و دەفەوتێن، گەلێ جار کەس و کاری هەر دوولا لەیەك هەڵدەسن و دەبێتە ئاژاوەی نێوانیان و، دووریش نییە خەڵکێکیان لێبکوژرێ، هەر لەم روانگەوەیە بە (أبغض الحلال) دادەنرێت!، هەر لەبەرئەمەیە کە خودای میهرەبان بەر لەوە ئاراستەی موسڵمانان بکات، ئاراستەی پێغەمبەر

ﷺ دەکاو دەفەرمویٚ: ﴿یاأیها النبی إذا طلقتم النساء فطلقوهن لعدتهن..﴾. هەر لەبەر گرنگی و سامناکی تەلاٚقە کە خودا لـە نێوان ئەحکامـەکانی تەلاٚقدا – جار لـەدوای جار – وشـەی (تەقوا) و (حدود الله) دێنێتە نێوان و دەفەرمویٚ: ﴿واتقوا الله ربکم﴾.. ﴿وتلك حدودالله ومن یتعد حدود الله فقد ظلم نفسه..﴾.. ﴿لاتدری لعل الله یحدث بعدذلك أمرا..﴾.. ﴿وأشهدوا ذوی عدل منکم وأقیموا الشهادة لله..﴾ هەر بەو جۆرە بەیناو بەین بێژەی (تـەقوا) دێنێت، تا کۆتـایی سـوورەتی (تـەلاٚق) دێـت. جـا بـۆ ئـەوە خـەڵکان هـەروا بـە ئاسـانی نزیکـی کـاری وانەبنەوە، ئەو هەموو ترسەیان وە بەردەنێت.

– تەلاٚق بۆ هێور کردنەوەی باری نائاسایی نێوان ژن و پیاوە، بۆ کوژانەوەی ئەو توڕەیی و حاڵەتە سەخت و ناهەموارەیە لە نێوان دوو مرۆڤدا پەیدا بووە، هەوڵێکە بۆکوژانـەوەی ئـەو ئاگرو جەحەننەمەیـە بۆیـان کلدراوە، پـاش پێچانەوەی ئـەو هـەموو خۆشەویستیی و سۆزو دلۆڤانییـە، کـە خـودا لـە بارەیـەوە دەفـەرمویٚ: ﴿و من آیاته أن خلق لکم من أنفسکم أزواجا لتسکنوا إلیها و جعل بینکم مودة ورحمة..﴾.

– تەلاٚق بۆ چارەسەری کێشەی ئەو دوو ئینسانەیە کە تا دوێنیٚ جل وبەرگ وکاڵاٚ یـەکبوون و، لە هەموو نەنگ و لەنگێك یەکتریان دادەپۆشی: ﴿هن لباس لکم وأنتم لباس لهن..﴾.

– تـەلاٚق بـۆ کۆتـایی هێنانـە بـە نـاکۆکی ئـەو دوو مرۆڤەیـە کەچـاوەروانی وەبـەرهێنانی وەچەو نەوەی ئایەندەیان لێدەکریٚ: ﴿نساؤکم حرث لکم..﴾.

– تـەلاٚق کۆتـا هەوڵـە لـە هەوڵـەکانی ئیـسلام، بـۆ کۆژانـدنـەوەی بڵێـسەی غـەزەبی دوو ئینسانی ماندوو بە دەست یەکترەوە، بەو هیوایە نێوانیـان لـەو حاڵەتـە خراپتر نـەبیٚ، بەشکو دواتر بتوانریٚ یەك بخرێنەوە، واتە: دەبیٚ هەموو چارەسەرەکان بگێردرێنە بەر، ئـەوجا بیر لـە جیابوونـەوە بکـریٚ، بـۆ نموونـە: یەکـەم جـار، یـەك تـەلاٚقی بـدات.. جـا ئەگـەر لـەو ماوەیـەدا هەردوولا لە ئەنجامی وێران کردنـی خانـەو لانەکـەیان عیبرەتیـان وەرگـرت و هەسـتیان کردکـە ئێستا لـە دەرگـای ئـەم و ئـەودان و منـدالاٚن سەرلێشێواون و بـۆ خۆیـشیان پەشیمانن، ئـەوا دووبـارە رێیـان پێدەدرێتـەوە یـەك بگرنـەوە، ئـەنجا ئەگـەر پـاش ئـەو یکگرتنەوەیـە، دیـسان تێکچوونەوە و بە تەلاٚق نەبیٚ، کێشەکەیان چارەسەر نابێ، با تـەلاٚقێکی تـری بدات و دیسان ماوەیەك هەردوولا دوور لە ماڵ و حاڵی جارانیان بژین، بەڵکو بیر بکەنـەوەو ئیتر ژیـر ببن و، کۆتایی بە کێشەکانیان بێنن، جا ئەگەر هـەردوو گەڕانـەوە سـەر مێـزی دانووستن و دەرەنجـام هاتنە سەر ئەوە یەك بگرنـەوە، ئـەمجارەش شـەریعەتی ئیسلام بۆ جاری دووەم رێـی پێداون چارەسـەری کێشەکەیان بکـەن و دەست بکەنـەوە بە ژیـان.. ئینجا ئەگـەر پـاش ئـەم دووجـار

چاکسازیی و یەکگرتنـەوە، دیسان ناکۆکبوونـەوە، دەبـیٚ ئـەمجارەیان دوو حەکـەم – یـەکیٚ خزمی پیاوەکەو یەکیٚ خزمی ژنەکە – بچنە نێوانیانەوەو بە وردیی لە کێشەکەیان بکۆڵنەوە، جا ئەگەر توانیـان کێشەکە بدۆزنـەوەو بۆیان روون بوویـە لـەلای کامیانـەوە سـەری هەڵداوە، ئـەوا هـەوڵی خۆیـان دەخەنـە گـەڕ بـۆ چـاککردنی نێوانیـان، جـا ئەگـەر لـە هەوڵەکانیانـدا سـەرکەوتوو بـوون ئـەوە کـارێکی پەسـەندو باشـیان کـردووە، خۆئەگـەر گەیـشتبوونە ئـەو قەناعەتـە کـە ژیانیـان پێکـەوە نـاگونجیٚ، ئـەوجا دەبـیٚ لەیـەك جیـا بکرێنـەوە و، نـابیٚ هـیچ کامێکیـان سـتەم لـەوی دیکـە بکـات (وەك لـە سـوورەتی بەقـەرەو سـوورەتی نیـساو دا ئـەم مەسەلە باسکرا). بەڵیٚ ئەمە مەسەلەی شێوەی ئەو تەلاٌقە بوو لە ئیسلامدا رێی پێدراوە، ئیتر تەلاٌق ئەوە نییە بابایەك بە ئارەزووی خۆی نان و ئاوی بکات بە تـەلاٌق و ! هەرچی بـە دڵـی نەبوو تەلاٌقێکی پیا بکێشیٚ.

سـەرەرای ئەمانـەیش، لـەکاتی تـەلاٌق دانەکـەدا، دەبـیٚ رەچاوی ئـەم خالاٌنـەی لای خـوارەوە بکـریٚ، وەکـو لـە سـوورەتی (تـەلاٌق) دا دەفـەرمویٚ: ﴿یـا أیهـا النبـی إذا طلقـتم النـساء فطلقـوهن لعـدتهن و أحـصوا العـدة و اتقـواالله ربکـم لا تخرجـوهن مـن بیـوتهن و لا یخـرجن إلا أن یـأتین بفاحشة مبینة و تلك حدودالله و من یتعد حدودالله فقد ظلم نفسه لاتدری لعل الله یحدث بعد ذلك أمرا﴾ ٦٥ /١، واتە: ئەی پێغەمبـەر! هـەرکات ویـستان ژنەکانتان تـەلاٌق بـدەن، لەکاتی عیـدە ژماردنیاندا تەلاٌقیان بدەن و ماوەکە بەوردیی ئامار بکەن، لە خودای پـەروەردگارتان شـەرم بکـەن و لەماڵ خۆیان دەریـان مەکـەن و بـۆ خۆشیان دەرنەچن لـەو مـاوەی عیـددەدا، مەگـەر بـە ئاشـکرا کـارێکی دزێـوو شـوورەیی بکـەن، ئەمـە سـنووری خودایـە و لـە سـنووری خـودا بـەولاوە چـی تـر، ستەمی لەخۆی کردووە، تۆ چووزانی لەوانەیە دوای ئەوە خودا کاریٚ تر وەدی بێنیٚ.

ئیـسلام خێـرا هـەر لەگـەڵ سـەرهەڵدانی کێـشەیەك پەلـە ناکـات بـۆ بـچراندنی زنجـیرەی خێزان، بەڵکو زۆر بە توند ئەو مەسەلە دەگرێت وە هەتا قابیلی چارەسەر بێت چارەسەری بۆ دادەنێت، بۆ نموونـە: خـودا دەفـەرمویٚ: ﴿و عاشـروهن بـالمعروف فإن کرهتمـوهن فعـسی أن تکرهوا شیئا و یجعل الله فیه خیرا کثیرا﴾. واتـە: ئێـوە ئـەی مێـردان! بـە جوامێرانـەو پەسـەند مامەڵە لە گەڵ ژنەکانتاندا بکەن، خۆئەگەر رکیشتان لێیان بوویەوە بەهۆی کارێکـەوە حـەزتان نەبوو لێی، هەرددان بە خۆتاندا بگرن و تەلاٌقیان مەدەن، چونکە دەکریٚ ئێوە رکتان لە شـتێك بێتەوەو حەزی پیٚ نەکەن، کەچی خودا قازانجی فرەی تێدانابێت بۆتان.

بـەرێز دکتـۆر (مـصطفی الزلمـی) لـە کتێبـی (الطـلاق) دا دەڵـیٚ: لەبەرئـەوە ئیـسلام زۆری مەبەستە کە ژیانی ژن و مێرد هەڵنەوەشێتەوەو هەمیشە بەردەوام بێت، بۆ بەرهەڵستکردن و

ڕێگرتن لێی هاتووە چەند خاڵێکی داناوە، لەوانە:

یەکەم – پەندو ئامۆژگاریی ژنەکان بکەن: (فعظوهن).

جا لەو حاڵەتەدا کە ژنەکە دانامرکیَ و مل نادات بە مێرد، قورئان داوا لە پیاوان دەکات کە بەهەر شێوەیەك کەڵك بەخش دەبێت، ئامۆژگاری ژنەکانیان بکەن، بەڵکو ئەو تووڕەیی و هەڵچوونەیەیان دابەزیَ.

دووەم – جێگەی نووستنیان لێ جیا بکەنەوە: ﴿واهجروهن فی المضاجع﴾.

بەو واتایە کە ئەگەر ژنەکە – لەبەر هەر هۆیەك بوو – بە ئامۆژگاری دانەمرکاو لەو حاڵەتە دانەبەزی، ئەوا قورئانی پیرۆز لەوە دەگوێزێتەوە بۆ عیلاج و چارەسەرێکی (نەفسیی)، ئەویش دوورکەوتنەوەیە لێیان لەکاتی خەودا، بێگومان ئەوە حاڵەتێکە ژنی بەویژدان دەزانیَ چەندە ئاسەواری هەیە لەسەر دلَ و دەروون، بەلاَم دەبیَ ڕیعایەتی ئەم خالاَنەی لای خوارەوە بکریَ:

أ- دەبیَ دوورکەوتنەوەکە تەنها لەکاتی نووستندا بێت.

ب- منداڵەکانیان – ئەگەر هەبوون – پێیان نەزانن، تا ئاسەواری خراپی لێنەکەوێتەوە بۆ ئەوانیش.

ج- لەبەردەم خەڵکانی غەریب و نەیار بەو خێزانە، ئاسەواری دەرنەکەوێت.

د- ئەگەر ئەم چارەسەرە بیَ کەڵك بوو، ئینجا چارەسەرێکی تر دێتە پێش.

سێیەم – سووکە لێدانێکی بیَ زەرەروو زیان بکرێن: (فاضربوهن).

بێگومان هەموو دەردێك دەرمانێکی هەیە، بۆیە شەریعەتی ئیسلام سیَ (خەیار)ی لەبەردەم پیاودا دانا بۆکوژانەوەی ئەو تووڕە بوون و ململانێیە، هەرکامێکیان بگریت زۆر ئاسانتر و بچوکترە لە (تەلاَق) و جیابوونەوەکەیان.

گەلیَ کەس بۆ ئەم لێدانە تەفسیری خراپ دەکاتەوە و بە کەم و سووکایەتی دەزانیَ بۆ شانی ژنان، بەلاَم هەر چۆنێك بێت لە تەلاَقدانەکە زۆر کەمترو ئاسانترە، سەرەرای ئەمەیش کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویَ: ((لا یجلد أحدکم امرأته جلد العبد ثم یجامعها فی آخر الیوم)) فتح الباری/ باب ما یکره من ضرب النساء، ح / ٥٢٠٤. نابیَ کەسێکتان لێدانی ژنەکەی بکات، وەك چۆن لە بەندە دەدات! پاشانیش بچیَ سەرجێیی لەگەلَ بکات!. خۆئەگەر وەکو چارەسەرێك بۆ روونەدانی تەلاَق لێدان کرا دەبیَ هیچ شوێنێکی بریندار نەکریَ و تووشی ئازارو بێزار نەبیَ.

پێغەمبەر ﷺ بەوکەسانە لە ژنان دەدەن دەفەرمویَ: ((و لا تجدون أولئك خیارکم))

(شەوکانی) نیل الأوطار ٢٣٨/٦. ئەوانەتان لە ژنان دەدەن، مرۆڤی چاك نین، واتە: ئەوانە چاکن کە لە ژنان نادەن. وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: ((و لا یضرب إلا شرارکم)) الطبقات الکبری ١٤٨/٧. واتە: مەگەر هەر مرۆڤە خراپەکانتان لە ژنان بدەن!.

پیاوچاکانی پێشوو باش لە ماناو مەبەستی ئەو لێدانە گەیشتن، بۆیە (قازی شورەیح) کە (عومەری کوڕی خەتتاب) کردبوویە قازیی (بەصرە) و (٦٣) ساڵ تەمەنی تەواو کردبوو، ئەگەر لە خاتوو (زەینەب)ی ژنی تووڕە بوو با، بە سیواکەکەی ئاماژەیەکی بۆ دەکرد و ئەم شیعرەی دەخوێندەوە:

رأیت رجالا یضربون نساءهم * فشلت یمینی حین أضرب زینبا

کەوابوو ئەو لێدانە قورئان ڕێگەی پێداوە، غەیری ئەو لێدانەیە خەڵکانی نەزان لێی تێگەیشتوون و تەفسیری دەکەنەوە. (سەید قوتب) دەڵێ: ئەوی کەمێ لە حیکمەتی ئەم چارەسەرە ورد بێتەوە، دەزانێ کە مەبەست ئەزیەت و ئازاری ژنان نییە، زۆر کردن نییە لێیان، تا بە ماڵ و حاڵێ رازی بن، حەزیان لێ نەبێ. (فی ظلال القرآن)، ٦٤/٥.

<u>چوارەم</u> – ئەگەر ئەشقیبوونەکە لە پیاوەکەوە بوو، قورئان روو لە هەردوو ژن و پیاوەکە دەکات کە هەوڵ بدەن نێوانیان ڕێك بخەنەوە و صوڵح و سازش بکەن، واتە: بیر لە تەڵاق نەکەنەوە، بەڵکو بیر لە چارەسەر بکەنەوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿و إن امرأة خافت من بعلها نشوزاً أو إعراضاً فلا جناح علیهما أن یصلحا بینهما و الصلح خیر..﴾ سورة النساء /١٢٨. واتە: هەر چۆنێك ڕێك دەکەون و ئەو ئاڵۆزییە ریشەکەن دەکەن، بە زیادکردنی مارەیی بێ بۆ ژنەکە لەلایەن مێردەوە، یان ژنەکە واز لە هەندێ مافی خۆی بێنێ، یان بەهەر شێوەیەکی دی، گرنگ ڕێکەوتنیانە، خۆ بێگومان ئەو ڕێکەوتنە زۆر باشترو قازانجترە لە تەڵاق و جیابوونەوەیان.

<u>پێنجەم</u> – ئەگەر هەریەکەیان هەراو کێشەکەی دەخستە سەر ئەوی دیکەیان، ئەوا (تەحکیم) بەکاربهێنرێ، وەکو قورئان دەفەرموێ: ﴿فابعثوا حکما من أهله و حکما من أهلها..﴾ پێویستە بۆ دوو حەکەمەکانی نێوانیان، ئەم خاڵانەیان تیا ڕەچاو بکرێ:

أ– هەر کام لە ژن و لە پیاوەکە بەحەکەمی خۆیان رازی بن.

ب– هەردوو حەکەمەکە خاوەن عەدالەت بن و، لە کاروباری هەراو کێشەی خێزان شارەزاو لێزان بن.

ج– تا بکرێ خزمی ژن و پیاوەکە بن، خۆئەگەر لەوان دەستی نەدا، با لە دراوسێکانیان بن، چونکە لەوانەیە ئەوان لە بەشێ لە کێشەکەیان ئاگاداربن.

د– هەردوو وەکو کەسێکی بیٚ تەرەف کار بکەن، واتە: خزمایەتی بەکارنەهێنن، بەڵکو تەنها مەبەستیان ڕێکخستنەوەی نێوان ئەو ژن و پیاوە بێت.

هـ– دوای لێکۆڵینەوە راپۆرتێك بنووسن، چۆن کێشەکەیان دیت و چۆن سەیری دەکەن؟ لە سوورەتی (نیساء)دا دەسەلاٚت و توانای ئەم دوو حەکەمە باسکراوە، دەتوانی بگەڕێیتەوە لای.

پاشان ئەگەر پیاوەکە هاتە سەر بڕیاری تەلاٚقدان، دەبیٚ ئەم خالاٚنەی لای خوارەوە پێش چاو بگرێت:

١) ژنەکە لەحەیزو بێنوێژیدا نەبێت.

٢) لەپاکییەکدا نەبیٚ، تێیدا سەرجێیی لەگەڵ کرابێت، ئەم تەلاٚقە لە شەریعەتی ئیسلامدا پێی دەڵێن: (الطلاق السنی ) واتە: تەلاٚقی وا تەلاٚقی شەرع پەسەندەو ئیسلام ددانی پیا دەنێت.

بێگومـان ڕەچـاوکردنی ئـەم خالاٚنـە بـۆ هێورکردنـەوەی گڕوکڵپـەی رك و کینـەی ژن و پیاوەکەیە، تا بەشکو پاش ئەوە کە پیاوەکە زانی ژنەکە لە بێنوێژیدایە، یان لە حەیز پاکەوە بووە، بەلاٚم لەو پاکییەدا سەرجێیی لەگەڵکردووە، ئەوسا بەپێی شەریعەتی ئیسلام دەزانیٚ لەکاتی ئاوادا دەرفەتی تەلاٚقدانی نییە – کەهەقە موسوڵمان لەهەموو کارێکدا شەرعڕەوو سوونەتیی بێت، بیٚ گومان لە کاتی ئاوادا دوور نییە بیرۆکەی تەلاٚقەکەش لە مێشکیا نەمێنیٚ.

لەولایشەوە ئەگەر لە بیٚ نوێژیدا بیٚ، بۆ دوایی ژنەکە عیددەکەی ماتڵ دەبیٚو درەنگ تر دەتوانیٚ – ئەگەر بیەویٚ– مێرد بکاتەوە، پاشانیش ئەگەر تەلاٚق بەدەمیا هاتو کەوت، دەبیٚ ژنەکە سیٚ (قروء – واتە: سیٚ پاکیی ببینیٚ (ئەگەر خاوەن سك وزا بیٚ) یان سیٚ مانگ دانیشیٚ وبمێنێتەوە (ئەگەر بچووكو نەزۆك بوو)، یان ئەگەر (حامل)ـە بوو، سکەکەی دابنێت.. لەم ماوەشدا هێمان ژنوپیاوەکە دەتوانن یەك بگرنەوەو بچنەوە سەر خانەو لانەی خۆیان.

بەڵیٚ ئەم هەموو ئاگربەسە بەدەور تەلاٚقدا، هەر لە بەر ئەوەیە کە هەتا تروسکاییەك بەدی بکریٚ لە نێوانیاند تەلاٚق نەکەوێت.. بێگومان هەر کەسێك لەم شتانە ورد ببێتەوە دەزانیٚ کە هەموو دەگەڕێتەوە بۆ ڕزگارکردنی ژنان لە عاداتو باوی سەردەمی جاهیلیەت، چونکە ژنان لەو سەردەمەدا هەمیشە وەکو کۆیلەو کووتاڵ سەیر دەکران، مێرد چۆن تەلاٚقی دەدا؟ کەیدەیویست تەلاٚقی بدا، بیٚ سنوور بوو،بەلاٚم ئیسلام هات ئەو هەموو بیٚ سەروبەرییەی لە ڕیشە هێناو ژنانی بەرز ڕاگرتو هەقو مافی بۆ دیاری کردن وپێیگوتن: هەر لەدایك بوو نابیٚ زیندە بەچاڵ بکریٚو سووکایەتی پیٚ بکرێت... بەشوو دەدریٚ – کچ بیٚ یان بێوەژن – دەبیٚ ئیزنی لیٚ وەربگیردریٚ، ژنی خاوەن مێردە دەبیٚ گشت مافەکانی ڕەچاو بکرێن،کاتیٚ تەلاٚق دەدرێت ستەمی لیٚ نەکرێت، تەلاٚقدان لە ئیسلامدا ڕێساو یاسای خۆی هەیە، وەکو لەم سوورەتەو لە سوورەتی (بەقەرە)دا گەلێکیان باس کران.

بیّ سۆ دانانی ئەم هەموو ئەحکامو یاسایانە بۆ ژنان.. لەبەر ئەوە نەبووە کە ژنان داوایان کرد بێت، یان پیاوان ویژدانێکیان بوو بێت بەرامبەریان، یان یەکێتی ژنانی جیهانیی، یان ژنانی ناوچەکە بەوکارە هەڵسابیّ، یان ژنان خۆیان چووبنە ئەنجوومەنی پەرلەمان و داوایان تۆمار کرد بێت ؟! نەخێر، نا، تەنها تەلەفۆنێکیش لە هیچ لایەکەوە نەکرا بۆ دابین کردنی هەریەك لەو مافانە، بەڵکو تەنها خودای میهرەبان خۆی ویستی ئەو ستەمو ناهەقیانە لەسەر ژنان نەمێنیّو ژنان بگەڕێنەوە جێگای گونجاوو شیاوی خۆیان، ئەو جێگایە قورئان بۆی دیارییکردوون. خودا دەفەرمویّ: ((یا أیها النبي إذا طلقتم النساء فطلقوهن لعدّتهن..)) ئەی پێغەمبەر! کە دەتانەویّ ژنەکانتان تەڵاق بدەن، با کاتی بێت شیاوی خۆی بێت، واتە: کاتیّ بێت ژنەکە خێرا دەست بکات بە ئەژماردنی عیددەی خۆی، تابەڵکو ئەوەند ماتڵ نەبێت، ئەگەر بیەویّ مێردبکاتەوە. بۆیە بۆ تەفسیری ئەم ئایەتە پێشەوا (بوخاری) لە کتێبەکەیدا ئەم فەرموودەیە دێنیّ کە دەڵیّ: ((عەبدوڵڵای کوڕی عومەر–خ) ژنەکەی لە (حەیز)دا تەڵاق دا! پاشان (عومەر) دەچیّ بۆ پێغەرمبەری دەگێڕێتەوە، ئەویش – لەبەرئەوەکە ژنەکە لەحەیزدا تەڵاق دراوە – تووڕە بوو و فەرمووی: ((لیرجعها ثم یمسکها حتی تطهر، ثم تحیض فتطهر، فإن بدا لهُ أن یطلقها فلیطلقها طاهرا قبل أن یمسها، فتلك العدة کما أمره الله)).واتە: بابیهێنێتەوە لای خۆی رایگریّ، تا لە حەیز پاك دەبێتەوە، پاشان دیسان دەکەوێتەوە حەیزەوەو پاك دەبێتەوە، جا ئەگەر پاش ئەوە بۆی دەرکەوت تەڵاقی بدات، باکاتێك بیّ پاك بیّ (لە حەیز)و سەرجێییشی لەگەڵ نەکرد بێت، ئەمەیە مەبەستی خودا دەفەرمووێ: لە کاتی عیددەیاندا تەڵاقیان بدەن.

پێشەوا (موسلم)یش بەم جۆرە ئەو مەسەلە یە دەهێنیّ و دەڵێت: ((فتلك العدة التی أمر الله أن یطلق لها النساء)). (ئیبن عەباس– خ) لە تەفسیری ئایەتی ﴿فطلقوهن لعدتهن﴾ دەڵیّ: (أی لا یطلقها وهي حائض ولا في طهر قد جامعها فیه، ولکن یترکها حتی إذا حاضت وطهرت طلقها تطلیقة) واتە: لەحەیزدا، یان لە پاکییەکدا چووبێتە لای، نابیّ تەڵاقی بدات، بەڵکو دەبیّ لێیگەڕیّ تابۆ جارێکی تر بیّ نوێژ دەبێتەوەو هەمیسان پاك دەبێتەوە، ئەوسادەتوانیّ یەك تەڵاقی بدات. کەوابوو تەڵاقدان لە ئیسلامدا کاتی بۆ دیارییکراوەو، نابیّ مێرد هەر کات ویستی وئارەزووی بوو تەڵاقی بدات.. بەڵکو دەبیّ ژنەکە:

یەکەم– لە کاتی بیّ نوێژیدا بیّ

دووەم– لە ماوەی پاکیشیدا مێرد نەچووبێتە لای.

سێیەم– زاناکان دەڵێن: دەرکەوتبیّ سکی پڕە. حیکمەت لە دیارییکردنی کاتو ماوەبۆ

تەڵاقدان، تەمەح خستنە بەر مێردەکە تا بەڵکو لەو ماوەی چاوەڕوانیەدا هەردوولا پەشیمان ببنەوەو سەر لەنوێ ژنومێردیی دەست پێ بکەنەوە.

(ئیبن کەسیر) دەڵێ: فەقیهەکان تەڵاقیان کردووە بەسێ بەشەوە:

یەکەم: پێی دەڵێن تەڵاقی سوننی (الطلاق السنی). مەبەست لەم تەڵاقە، ئەو تەڵاقەیە کە قورئان دەفەرمووێ: ﴿يا أيها النبي إذا طلقتم النساء فطلقوهن لعدّتهن..﴾ واتە: ژنەکە دەبێ پاك بێ و، بێ نوێژ نەبێت و سەرجێشی لەگەڵ نەکرا بێ. ئەم تەفسیرەش رای (ئیبن عەباس)و (ئیبن مەسعود)ـە. هەر لەبەر ئەمەیە کە زاناکان بۆ کەوتنی تەڵاق سێ خاڵیان دیارییکردووە:

یەکەم- دەڵێن (أن يكون الطلاق طلقة واحدة). واتە: دەبێ یەك تەڵاقی بدات.

دووەم- أن يكون في طهر لم يخالط الزوج فيه زوجته) واتە: تەڵاقەکە دەبێ لەو پاکییەدابێ کە ژنو پیاوەکە پێکەوە سەرجێیان نەکردبێ.

سێیەم- أن تكون هناك ضرورة تقتضي الطلاق، أو سبب يدعو إليه) واتە: دەبێ کارێکی پێویستو زەروور هەبێت لە تەڵاقدانەکەدا. جا ئەگەر ئەم مەرجانە ڕەچاو کران و تەڵاقدرا، دیارە ئەو تەڵاقە حەڵاڵەو دەبێتە (تەڵاقی سوننی)، خۆ ئەگەر یەکێ لەو خاڵانە جێبەجێ نەبوو وتەڵاقیشدرا، بێ شك ئەو تەڵاقدانە حەرامو قەدەغەیە.

ئینجا تەڵاقی سوننی دەبێتە دووبەشەوە:(أحسن)و(حسن).

تەڵاقی (ئەحسەن) ئەوەیە: کە مێرد یەك تەڵاقی ژنەکەی بداو، ژنەکەش لە سووڕی مانگانەیدا نەبێو سەرجێیشی لەگەڵ نەکردبێت، واتە: ئەمە باشترین و پەسەندتریی جۆرەکانی شێوەی تەڵاقدانە. چونکە هاوەڵان - خودایان لێ ڕازی بێت - هەمیشە ئەوەیان لا پەسەند بووە کە ژنان یەك تەڵاق بدرێن، ئەو کات لەبەردەم ژنو پیاوەکەدا فوورسەت هەیە و دەتوانن پەشیمان ببنەوەو بۆ جارێکی تر ژنو مێردی دەست پێ بکەنەوە.

تەڵاقی (حسن)یش ئەوەیە کە مێرد بە سێ جارانو لە سێ (طهر)داو هەر جارەی تەڵاقێکی ژنەکە ی بدات، ئەگەرچی پێشەوا (مالیك) ئەمەش بە(بیدعە) دادەنێ، چونکە ئەو دەڵێ تەڵاقدان دەبێ هەر بەیەك تەڵاق بێت.

دووەم: تەڵاقی بیدعیی: تەڵاقی بیدعیش ئەوەیە کە بەیەکجار هەر سێ تەڵاقەکەی بدات. بێگومان تەڵاق لەو حاڵەتەدا،یان لە حاڵتی (حەیز)دا، یان لە حاڵتی (طهر)ێکدا مێرد سەرجێی لەگەڵ کردبێت، کارێکی حەرام و قەدەغە کراوە.. چونکە بە پێغەمبەریان ﷺ ڕاگەیاند کە فلانەکەس هەر سێ تەڵاقەی ژنەکەی داوە! ئەوسا ئەویش تووڕە بوو و هەڵسایەوەو فەرمووی:

((أيلعب بكتاب الله وأنا بين أظهركم)) ئايا ئەوە مەسخەرە بە قورئان دەكرێ، كە هێشتا من ماوم و نەمردووم؟! پیاوێك لە ئامادەبووان هەڵساوەو گوتی: ئەی پێغەمبەر! ئەرێ نەچم لە باتی ئەو گوناحەی بیكوژم؟. ئیتر زاناكانیش لەمەوە دەكەونە كێشەوەو دەڵێن: ئاخۆ ئەو تەلاقە بكەوێ، یا نەكەوێ ؟ هەر لەمەیشەوە بوونەتە سێ دەستەوە:

دەستەی یەكەم- كە (شیعەی ئیمامیش) لەم دەستەیەن- دەڵێ: هیچ تەلاقێكی پێناكەوێت.

دەستەی دووەم- كە هەر چوار پێشەواكە لەم دەستەیەن - دەڵێ: هەر سێ تەلاقەكە دەكەوێ.

دەستەی سێیەم- (كە لەسەردەمی پێغەمبەرو خیلافەتی ئەبووبەكرو سێ ساڵ لەخیلافەتی عومەر كاری پێكراوەو ئێستاش زۆرینەی شیعەی ئیمامی رایان وایە) دەڵێ: یەك تەلاقی (رەجعیی) پێدەكەوێت. سەرەڕای (ئیبن تەیمیە)و(ئیبن قەییم)ی شاگردیی. بێ گومان هەر یەكەش لەم سێ ڕایە بەڵگەی خۆیانیان هەیەو لە جێگەی خۆیدا باسیانكردووە، بەڵام ئێمە لەبەر ئەوە باسەكەمان درێژتر نەبێ كورتمان كردەوە. لەناو زاناكاندا كێشەیەك نییە كە هەر كەسێك بە شێوەی (سوننی) تەلاق نەدات بە گوناحبار دەژمێردرێ، بەڵكو كێشە لە كەوتن و نەكەوتنی تەلاقەكاندایە. هەر چوار مەزەبەكە (حەنەفیی، مالیكیی، حەنبەلیی، شافیعیی) دەڵێن هەر چەند تەلاقەكە بیدعیش بێت، هەر دەكەوێ. جەماوەری شیعەی ئیمامی و (ئیبن حەزم) و (ئیبن تەیمیە)و قوتابخانەكەی ئیبن تەیمییە دەڵێن: یەك تەلاقی رەجعیی پێدەكەوێ، هەر كەسیش لەجێگەی خۆیدا، درێژەی بە بەڵگەی خۆی داوە.

(المُفصل في أحكام المرأة...) دەڵێ: (ئیمامی طحاوی) دەڵێ: دەستەیەك پێیان وایە كە ئەگەر پیاوێك بەیەكجار سێ تەلاقەی خێزانەكەی بدات، یەك تەلاقی دەكەوێت، بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن: هەر سێ تەلاقەكەی دەكەوێت).

(ئیبن تەیمییە) دەڵێ: (وإن طلقها ثلاثا في طهر واحد بكلمة واحدة او كلمات مثل أن يقول: أنت طالق وطالق وطالق. فهذه للعلماء - من السلف والخلف - فيه ثلاثة أقوال، سواء كانت مدخولا بها أو غير مدخول بها... وهذهِ الأقوال هيَ:

الأول - أنه طلاق مباح لازم، وهو قول الشافعي وأحمد في الرواية القديمة منه، إختارها الإمام الخرقي الحنبلي.

الثاني - أنه طلاق مباح لازم، وهو قول مالك وأبي حنيفة وأحمد في الرواية المتأخرة عنه، وهو منقول عن كثير من السلف من الصحابة والتابعين.

الثالث – أنه طلاق محرم، ولا يلزم منه إلا طلقة واحدة. وهذا القول منقول عن طائفة من السلف والخلف من أصحاب رسول الله ﷺ مثل الزبيرين العوام، وعبدالرحمن بن عوف. ويروي القولان عن علي وإبن مسعود وإبن عباس. وهو قول كثير من التابعين ومن بعدهم مثل طاوس ومحمد بن إسحاق، وهو قول داود – صاحب المذهب الظاهري – وأكثر أصحابه، وهو قول بعض أصحاب أبي حنيفة ومالك وأحمد بن حنبل. ويروي ذلك عن أبي جعفر محمد بن علي بن الحسين، وابنهُ جعفر بن محمد، ولهذا ذهب إلى ذلك من ذهب من الشيعة.

الرابع – وأما القول الذي قاله بعض المعتزلة والشيعة، وهو أنه لا يلزمه شيء. فهذا لا يعرف عن أحد من السلف. (مجموعة الفتاوي شيخ الاسلام ابن تيمية/المجلد:٣٣ص٨-٩.

کورتەی بۆچوونی (ئیبن تەیمیە) ئەمەیە کەدەڵێ: ئەگەر ژنێك – سەرجێی لەگەڵ کرابێ، یا نا – مێردەکەی لە (طهر)ێکدا سێ تەڵاقەی بدات بەیەك ڕستە، وەکو ئەوە بڵێ: (أنت طالق ثلاثا) یان بە هەر جۆرێکی تر،سەبارەت بەمە زانایانی (سەلەف) و (خەلەف) سێ قسەیان هەیە:

یەکەم – دەڵێن: تەلاقی وا موباحەو تەلاقەکەشی دەکەوێ. ئەوەش قسەی ئیمامی شافیعیی و ڕیوایەتێکی کۆنی ئیمامی ئەحمەدی حەنبەل.

دووەم– دەڵێ: ئەو تەلاقە حەرامەو لەگەڵ ئەوەشدا دەکەوێ. ئەمەشیان وتەی (ئیمامی مالك،ئیمام ئەبوو حەنیفە،ئیمام ئەحمەد) لە ڕیوایەتێکی ئەم دواییەیداو، زۆربەی (سەلەف)ی هاوەڵانو پاشینانیش پەسەندیان کردووە.

سێیەم – دەڵێ: تەلاق بەو شێوەیە حەرامە، بەلام یەك تەلاقی پێدەکەوێ. ئەم بۆ چوونەش لە تاقمێك لە هاوەڵانەوە وەرگیراوە، وەکو: (زوبەیرو عبدالرحمان). وە لە (عەلی کوڕی ئەبوو تالیب)و (ئیبن مەسعوود) و (ئیبن عەباس)یشەوە هەردوو بۆ چوونەکە هاتووە، کە ئەمەیش قسەی زۆربەی پاشینانو پاشینانیانە وەکو (تاووس، محمد ئیبن ئیسحاق، داودی (ظاهري) خۆی زۆرینەی هاوەڵانی.... وەلە هەندێ لە هاوەڵانی (ئەبوو حەنیفە)و(مالیك)و (ئەحمەدی حەنبەل)یشەوە ریوایەت کراوە، وە لە (ئەبوو جەعفەر– محمد بن علی بن الحسین – و (ئیبن جعفر بن محمد)یشەوە هاتووە، لەبەر ئەمەیشە کە برایانی شیعە هێندێکیان بۆچوونیان وایە.

چوارەم – ڕاوبۆچوونی هەندێ (موعتەزیلە) و (شیعە)یە کە دەڵێن بە ڕستەی (أنت طالق ثلاثا في مجلس واحد) هیچ ئاسەوارێکی لێناکەوێتەوە. واتە: تەلاقی پێناکەوێت،بەلام ئەم قسەیە لە هیچ کەسێك لە (سەلەف)ەوە نەکەوتۆتەوە.

(ئیبن قەییم)یش سەبارەت بە قسەیەکی ئاوا کەدەڵێ:(أنت طالق ثلاثا بكلمة واحدة) دەڵێ چوار قسە هەیە، ئەمیش لە ڕاوبۆچوونەکانی (ئیبن تەیمیە) دەچێ، ئەگەرچی

جیاوازییـەکیش هـەبێ. (المفصل) لەسـەر باسـەکەی دەچـێ و دەڵێـت: (قـول الجمهـور: وقـوع الطلاق ثلاثا بلفظ الثلاث).

لە کتێبە فیقهیەکاندا هاتووە: کە سێ تەلاقە، ئەگەرچی بەیـەك ڕسـتەش بێـت، وەکـو (أنـت طالق ثلاثا) بەلای ئیمامی شـافیعی وئیمامی مالیك و (ئیبن حـەزم)ـەوە دەکـەوێ و (بیدعـە)ش نییە، وە بەلای (حەنەفی) و(زەیدیی)یەکانیشەوە دەکەوێ، بەڵام بە (بیدعـە)ی دادەنێن. بـەلای (حەنبەلیە)کانیشەوە هەر سێ تەلاقەکە دەکەوێ، بەڵام لەڕیوایەتێکدا بـە (بیدعـە)ی دادەنێن، لـە ڕیوایـەتێکی تـردا بـە (بیدعـە)شـی نـازانن. (جەعفـەر)یـەکانیش هـەراو کێـشەیانە تێیـدا، ئەگەرچی زۆرینەیان دەڵێن: یەك تەلاق دەکەوێ.بەڕێز (عبد الکریم زەیدان) پێش ئەوە قسەی پەسەند لەو قسانە هەڵبژێرێ دەڵێ: ئەم مەسەلەیە، مەسـەلەیەکی ئیجتیهـادی خیلافیـە، کـەوا بوو دروست نییە تانەو تەشەر لە هیچ خاوەن قسەیەك – لەوانـە – بدرێـت، هـەر وەك ڕەوانیـە بەهیچ کامێکیان بڵێیت: (شاذ)ـە، یان هەندێ قسەی ناشیرینیان ئاڕاستە بکرێ.

وە دەتـوانرێ – بـەپێی هەڵبـژاردنیان – کـار بەهـەر یـەك لەوانـە بکـرێ، واتـە: ئـەوەیان کـە دەڵـێ: هـەر سـێ تەلاقەکـە دەکـەوێ، یـان ئـەوەیان کـە دەڵـێ: یـەك تـەلاق دەکـەوێ، چـونکە لەپێشەوە باسمان کرد کە هەر قسەیەکیان چەندین هاوەڵ و زانای پاشـینان خـاوەنینی و هـەر کەسیش بەڵگەی خۆی هێناوە.. ئەو قسەیە نەبێ کە دەڵێ: (أنت طـالق ثلاثـا) هـیچ تـەلاقێکی پێناکەوێ، چونکە هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نییە.

پاشان (زەیدان) دەڵی: (والذي أميل إلى الأخذ به من هذه الأقوال الـتي ذكرناهـا، هـو القـول بأن الطلاق الثلاث بلفظ واحد، أو بتكرير لفظ (أنت طـالق) ثـلاث مـرات في مجلـس واحـد، أن الطـلاق بهـاتين الـصيغتين يقـع واحـدة رجعيـة، وهـذا القـول أرفـق بعامـة المـسلمين وأقـرب إلى تحقيق المصلحة المشروعة للأسرة المسلمة، بالإضـافة إلى مالهـذا القـول مـن مـستند شـرعي قـوي). واتـە: لەبـەر بارسـووکی بـەکاروباری موسـڵمانان و ڕەچـاوکردنی بەرژەوەندییـەکانی خێزانـە موسڵمانەکان،من بـۆ خـۆم ئـەو قسە هەڵدەبـژێرم کـە دەڵـێ ئـەو ڕسـتەیە یـەك تـەلاقی ڕەجعیی پێ دەکەوێت.

بـەڕێز دکتـۆر (مـصطفی الزلمـي) دەڵـێ: الترجـيح: إنـني لـست مـن أهـل الترجـيح ولا أدعـى ذلـك، ولكـن ترجيحـي هـذا لـيس الا إعـادة مختـصرة لمـا قالـه الـسلف والخلـف بـصرد هـذه المـسئلة الخطـيرة في حيـاة الملايـين مـن المـسلمين...واتـضح لنـا مـن الإسـتعراض الـسابق أنهامسئلة خلافية منذ صدر الاسلام إلى يومنا هذا، وتبين لنا أن أدلة كل طرف هي أدلـة ظنيـة لا تدل على الحكم دلالة قطعية، إذن حكم المسألة متنازع فيه...) واتە: ئەگەرچی مـن خـۆم بـە

ئەهلی (تـەرجیح) نـازانم، بـەلاّم کورتەیـەکی ڕاوبۆچوونی زانایـانی (سـەلەف)و(خـەلـەف)م لـەم مەسەلەدا هێناوەودەڵێم: ئـەم مەسـەلە سامناكو گرنگـە لـە ژیـانی ملیۆنـەها موسـڵماندا... وە بەشـەن و کـەو کردنـی بەڵگـەی زاناکانـدا دەردەکـەوێت هـەر لەسـەرەتای هـاتنی ئیـسلامەوە تائێستا ئەم مەسەلەیە، مەسەلەیەکی (خیلافییە)، وەبەڵگەی هەر لایەکیشیان (ظنیة)و ناگاتە پلەی (قطعیي) و هەریەکەشیان هەڵدەگرێ ڕاست بێ و، هەڵیش دەگرێت (خـەطأ) بێـت.. جا ئەو بەڕێزە بۆ پشتگیری لـە بۆچوونەکەی پـتر لـە (١٤) بەڵگـە لـە کتێبەکەیـدا دێنێتـەوە، بـەلاّم لێرەدا دەرفەت نییە بییان هێنین.

## تێبینی:

منیش وەکو خەمخۆرێکی ئیسلام، داوا لە هەموو زاناو دانا بـەڕێزە ئیمانـدارەکان دەکـەم، بەچاوێکی حورمـەتو ڕێـزەوە تەماشـای هـەموو زانایـانی پێـشوو بکـەن، ئەوانـەیان هـەردەم لەبـەر ڕۆشـنایی ئایـەتو فەرموودەکانـدا، لـە هەوڵـدا بـوون بـۆ (اسـتنباط) و (اجتهـاد) بـۆ پێشهاتەکان، وەبە چاوی ئیعتیبارەوە سەیری ڕاوبۆچوونی موجتەهیدەکان بکرێ، بەتایبـەت ئەو مەسەلانە کە ئیجتیهادییو خیلافین، وە پێویستە بـە لێزانانـە مامەڵـە لەگـەڵ ڕاوبۆچوونە جیاوازەکان بکرێ، وە ڕای هەرکامێکیان بۆ جێگاو شوێنی خـۆی سوودی لـێ وەربگـیردرێ، وە با سەیری خاوەن کێشەکە بکرێ، بزانرێ ئەگـەر پیـاوێکی صـالْحو چاكو مندالْدارە، یـان پیـاوێکی خـراپو تـەلاّقخۆرو مەشـروبخۆرە، بـۆ هـەرکامێکیان فەتوایـەك هەڵبـژێردرێ پـڕ بەکالاّی! پێویستە ئێمـە ئیسلام زۆر بەڕێزترو گەورەتر لـە (مـەذاهیب)ـەکان تەماشـا بکـەین، وەسەیری جیهادو میحنەتو دڵسۆزییان بۆ شەریعەتی ئیسلام بکـەین، پێویستە (تعصّب)و دەمارگیریی مەزهەبی وەلا بنێین، پێویستە تەماشای بەهێزییو لاوازیی فەتواکە بکـەین، ئیتر خاوەنەکەی لەهەر مەزەبێك ببێ. پێویستە ئەمڕۆ بە لێزانانەتر بڕۆینـە گۆڕەپـانی ژیانـەوە، تـا بتوانین سوود لەو هـەموو قوتابخانـە فیقهییانـە وەربگـرین خۆیـان ماندو کـردووە بـۆ ئیسلام، چـونکە هـەموویان مـاڵی ئیـسلامنو، بـەپێی (إخـتلاف أمـتی رحمـة)یـش بێـت – ئەگـەرچـی لاوازیـشە – دەتـوانرێ بـۆ هـەر بوارێـك سـوود لـە فـەتوای یـەکێ لـەو بەڕێزانـە وەربگـیردرێ، بەتایبەتی لەبەر ئەمە کە هەر یەکەیان بەڵگەی هەیەو، مەسـەلەکەش خیلافییـەو بەڵگـەکانیش (ظەننی)ین، نەك (قەطیعیی).

## پوختەی ئەم باسە

پێویستە بۆ ئەوانە تەڵاقخۆرن، پێش ئەوە هەڵبکوتنە سەر تـەڵاقخواردن، ئـەم هەنگاوانـەی لای خوارەوە بنرێن:

١. ئامۆژگـاریی‌و ترسـی خوایـان وەبـەر بنـرێ، وە ماڵـکاولی‌و دەرەنجـامی تـەڵاق بخرێتـە پێش چاویان.

٢. جێینووستن جیابکەنەوە، کە بێگومان ڕۆڵ‌و دۆزی (نەفسیی)و دەروونی خۆی هەیە.

٣. هەڕەشەو لێدانێکی سووك (بە نیازی چارەسەر) نەك بۆ ئازارو بێزاری ژنەکە.

٤. ژن‌و پیاوەکە بکەونە صوڵح‌و سازش و هەوڵی ئاشتبوونەوە بدەن، وە بەهەر شێوەیەك دەتوانن ڕێك بکەون، ڕێ بگرنەبەر.

٥. (تـەحکیم)، واتـە: دووکەسـی عـادل‌و پـسپۆڕو دڵـسۆزو کارنـاس لـەبواری کاروبـاری خێزاندا بچنە نێوانیانەوە.

جائەگەر ئـەو خاڵانـەی سـەرەوە هـیچ کـەڵکیان نـەبوو، ئینجا بـەم شێوەیەی لای خـوارەوە بچنە سەر مەسەلەی تەڵاق‌و جیابوونەوە:

یەکەم – سـەرەتا یـەك تـەڵاقی بدات.. بـەڵکو تـا عیـددەی تـەواو دەبـێ، لەوماوەیـەدا پەشیمان ببنەوەو دیسانەوە بەنیکاحێکی تازە ژیان دەست پێ بکەنەوە،، ئەگـەر پـاش تـەواوبوونی عیـددە ڕێك کەوتنەوە، یان بەڕەجعەت‌و بێ نیکاحی تر، ئەگەر بەر لەتەواوبوونی عیددە یەکیانگرتەوە.

**تێبینی**: ئەگەر ئەوخاڵانەی سەرەوە بێ کەڵکوون وچار هەرتـەڵاقبوو، پێویستە ئـەم چـەند خاڵانەی خوارەوە لەلایەن تەڵاقدەرەوە ڕەچاوبکرێن:

أ– بزانێ کاتی عیددەی چ کاتێ دەست پێدەکات.. ئـەو کاتـە تـەڵاقی بـدات، چـونکە خـودا وا داوا دەکـات، بۆیـە دەفـەرموێ: ﴿..إذا طلقـتم النـساء فطلقـوهن لعـدتهن..﴾ واتـە: هـەرکات دەتانەوێ ژنان تەڵاق بدەن، لە کاتی خۆیاندا تەڵاقیان بدەن، (باپاك بن و (لەحەیزو نیفـاس)دا نەبن، وە لەوماوەی پاکییەشدا سەرجێییان لەگەڵ نەکرابێت.

ب– مـادەم تەڵاقەکـە ڕەجعیـی دەبـێ‌و، دەرفـەتی یەککەوتنـەوەی تێـدا دەمـێنێ، نـابێ لـەو جێگـەی تێیـدا بـووە (بـەر لەتەڵاقـدان) بکرێتـە دەر، سـەرەڕای ئـەوەش دەبـێ خـواردن‌و جل‌وبەرگ و پێویستیەکانی تریان بدرێتێ.

ج– جا ئەگەر – پاش ئەو ماوەیە – تەڵاقی دا، یان هێنایەوەو پێکهاتنـەوە، دەبـێ لـە هـەردوو حاڵەتەکەدا دوو شـایەت ئاگـادارین، ئـەم دوو شـایەتە ئەوەنـد گرنگییـان پێدراوە، هەنـدێ لـە زاناکان دەڵێن، ئەگەر ئامادەنەکران، تەڵاقەکە ناکەوێ.

د- ژنەكە تەنگەتاو نەكات بۆ ئەوە لە تەواوی مارەیی یەكەی ئازادی بكات، یان شتێكی بۆ بگێڕێتــەوە لــە بەرامبــەر تەڵاقەكــەوە، بــەڵام ئەگــەر ژنەكــە بــە ئــارەزووی خــۆی لەبەرامبــەر تەڵاقەكــەوە لەگــەڵ پیاوەكــە ڕێكــەوتن لەســەر هــەر چــەند، ئــەوە ڕەوایــەو پێیــدەڵێن (خولــع)، خولعیش لە شەریعەتی ئیسلامدا ڕێ پێدراوە، دواتر (إن شاءالله) پتر باسی دەكەین.

ئەگەر پاش ئەوە كە ژیانی ژن و مێردییان دەست پێكردەوە، دووبارە بۆ كەڕەتێكی تر تێكچوونەوەو پێكەوە نەدەژیان، دەبێ یەك تەڵاقی تری بدات، بەڵام لەگەڵ ڕەچاوكردنی ئەو خاڵانەی لە تەڵاقی یەكەمدا باسكران.

ئینجا ئەگەر هەمیسان پاش تەڵاقی دووەم پەشیمان بوونەوەو حەزیان كرد ژیان دەست پــێ بكەنــەوە..، ئــەوە ئــەمجارەش دەرفــەتیان لەبەردەســتا مــاوە، بــە نیكــاحێكی تــازە (ئەگــەر عیددەی تەواو ببوو) یان بە (ڕەجعەت) ئەگەر عیددەی تـەواو نـە بـوو بـوو. شیاوی ئاماژە بـۆ كردنــە دوو تــەڵاقیان لەدەســت داوەو ئێــستا لەســێ تــەڵاق یــەك تــەڵاقیان مــاوە، جا ئەگــەر بــەو تەڵاقە درێژەیان بە ژیان دا، ئەوە پیرۆزەو كارێكی باشە، خۆ ئەگەر بۆ جاری سێیەم دەستیان كردەووە بە هەراو كێشە، ئەوە سەرەی تەڵاقی سێیەم و كۆتایی دێتە پێش، جا ئەگـەر تـەڵاقی سێیەمیشیدا، ئەم چەند خاڵانە پەیدادەبن:

١-نابێ لەماڵی مێردەكەیدا بمێنێتەوە (وەكو ئەوە كە لـە حاڵـەتی یەكەم و دووەم دەمایـەوە)، چونكە بەتەواوی پەیوەندیان بچراوەو حەرامە لێی.

٢-بەهیچ شێوەیەك (نە بە نیكاحی تازە، نە بە ڕەجعەت) ناتوانێ بگەڕێتەوە لای مێردەكەی.

٣-هەر كە عیددەكەی تەواو كرد، دەتوانێ — ئەگەر بیەوێ — مێرد بكاتەوە بە كابرایەكی تر.

٤-دەتوانێ بگەڕێتەوە لای ئەم مێردە لەدەستچووەی، بەڵام بەم مەرجانەی خوارەوە:

أ-بێ دانانی هیچ مەرج و سانسۆڕێك شووبكاتەوە بە كابرایەكی تر.

ب-مێردی دووەم سەرجێیی لەگەڵ بكات.

ج-لەیەك جیاببنەوە (بەمردنی ئەم مێردی دووەمە، یان بە تەڵاق...)

د-عیددەی ئەو جیابوونەوەیە تەواو بكات.

ئینجا ئەگەر ئەو مەرجانە هاتنە جێ، ئەوا مێردی یەكـەم دەتـوانێ مـارەی بكاتـەوە (ئەگـەر حــەزیان لێبــوو)، چــونكە هــەموو قۆناغێكیــان بــڕی و گــەلێ ئــەزموون و تاقیكردنــەوەیان دی، دەگونجێ ئەم جارە بتوانن هەندێ لە كەم و كورتیەكانی یەكدی قەبووڵ بكەن.

## سەرنجێك:

بۆیە قورئانی پیرۆز ئەو ژنو مێردە بەو سێ قۆناغەدا تێدەپەڕێنێ، تا بەڵکو جار دوای جار بیرێك لە خۆیانو لە ماڵو حاڵیان بکەنەوە، جا ئەگەر پاش بڕینی ئەو هەموو قۆناغانە، هیچ کەڵکێکیان لێ نەبینی، دیارە ئیتر هەر چەندەی تریان لە گەڵ بکرێ، هەر دووبارە کردنەوەیەو تازە ئولفەتیان بەو هەراو کێشانەوە گرتووەو قابیلی پێکەوە ژیان نین، دەبێ بۆ هەتا هەتایی لێك جودا بکرێنەوە، ئەگەرچی بۆ دواییش پەشیمان بن، چونکە زیاد لەوە کە ئیسلام ئەم ڕێگایانەی بۆ دانانو نەیانتوانی سوودیان لێوەرگرن، ئیتر لەوەبەو لاوە چی تر بکات؟.

**خوێنەری هێژا** ! ئەمە ئەو یاساو ڕێسانەبوون کە ئیسلام ڕەچاوی کردوون بۆ تەڵاقدان – پاش ئەو هەموو هەوڵانە – ئەگەر هەر ڕوویدا.. چونکە ئیسلام ڕێگە نادات بە پیاو بە ئارەزووی خۆی چ کاتو ساتێ بە مێشکیا هات تەڵاقی ژن بدات.. بەڵام ئایا نێوان کۆمەڵگەی پێشکەوتووی ئێستا و ئەو یاساو ڕێسایانە ئیسلام دایناون، نێوان ئاسمانو ڕێسمان جیاوازی نییە؟.

## ( تەحلیل )ی شەرعییو پەسەند

تەحلیل دوای کەوتنی سێ تەڵاقە و، پاش شووکردنەوەی ژن بە مێردێکی تردەست پێدەکات، جا ئەگەر مێردی دووەم مرد، یان بە ئارەزوو ئەو ژنەی تەڵاقدا، ئەوا مێردی یەکەم دەتوانێ مارەی بکاتەوە...بەڵێ ئەمەیە ئەو تەحلیلەی لە قورئانی پیرۆزدا هاتووەو خودا دەفەرمووێ: ﴿فإن طلقها فلا تحل له من بعد حتى تنكح زوجاً غيره..﴾.

حەنەفییەکان لەو بارەوە دەڵێن: ئەگەر ژنێك بەو مەرجە نیکاح کرا لە کابرایەك – کە پاش سەرجێیی – تەڵاقی بدات، ئەوە مەرجەکە بەتاڵەو نیکاحەکە دادەمەزرێ و کاری پێدەکرێ، واتە: ناتوانن بە زۆر تەڵاقی پێبدەن، چونکە دەڵێن: (إن الشرط الفاسد لا يؤثر على صحة العقد المقترن به).

مالیکیەکانو پێشەوا (ئەحمەد)و (زەید)یەکانیش دەڵێن: نیکاحی وا بەتاڵەو دانامەزرێ، ئیتر لە عەقدەکەدا تەڵاقدان باس بکرێ، یا باس نەکرێ ؟ چونکە ئیعتیبار بە نیەتەو، دیارە نییەتیان بۆکاتێکی تایبەت ودیارییە.. پێغەمبەریش (صلى الله عليه وآله وسلم) لەو بارەوە دەفەرمووێ: ((لعن الله المحلل والمحلل له)).

دکتۆر (زەڵمی) دڵێ: (الراجح من وجهة نظري هو رأي من قال بفساد عقد التحليل مطلقاً).واتە: قسەی پەسەند ئەو قسەیەیە کە دەڵێ ئەو نیکاحە کە بەو مەرجانە دەکرێ، بەتاڵەو دەبێ ڕێی پێ نەدرێت، چونکە:

یەکەم – تەحلیلی ئاوا پێچەوانەی ڕەواڵەتی قورئانی پیرۆزە، چونکە قورئان دەفەرموێ: ﴿ولا تعزموا عقدة النكاح حتى يبلغ الكتاب أجله..﴾٢٣٥/٢. دیارە مێردی یەکەم بەر لە تەواوبوونی عیددەی پیاوی دووەم نیەتی تەواوی هێناوە کە ئەو ژنە مارە بکاتەوە، لەکاتێکدا ئایەتەکە دەفەرمووێ: تا عیددەی تەواو نەبێ ئێوە بیر لە مارەکردنی نەکەنەوە.

دووەم – ئەو عەقدەیە عەقدێکی کاتییەو، تەڵاقەکەش حەتمییەو هەر دەبێ ببێ، لەکاتێکدا (عەقد) لە ئیسلامدا بۆ دەوام وهەمەکاتییە، تەڵاقیش ئیحتیمالو ئەگەری تێدایە، نەك حەتمییەت.

سێیەم – پێچەوانەی سوونەتی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وآله وسلم)، بۆیە نەفرین لە هەردوولا (محلل، محلل له). یان دکاو بە (تەیس) و حەچەی خوازراو ناوی دەبات، بۆیە دفەرموێ: ((ألا أخبركم بالتيس المستعار؟ قالوا: بلى يارسول الله: قال: هوَ المحلل، لعن المحلل والمحلل له)). واتە: تگە وحەچەی خوازراوتان پێ نەڵێم کامەیە؟ گوتیان بەڵێ..ئنجا فەرمووی: حەڵاڵکەری ژنەکەیە (واتە:مێردی دووەم) دەسا نەفرینی خودا لە مێردی یەکەمو دووەم بێت.

چوارەم – پێچەوانەی کارو رەفتاری هاوەڵانە، چونکە:

أ-(عومەر- خ) دەڵێت: (لا أوتى بمحلل ولا محلل له إلا رجمتهما) واتە: مەگەر ئەو دووانە – مێردی یەکەمو دووەم – نەهێنرێنە لام، ئیللاو بیللا بەردبارانیان دەکەم!

ب-(عەلی کوڕی ئەبی تالیب- خ) دەڵێ: بەنیکاحێکی دڵخوازو ئارەزوومەندانە نەبێ، ئەو ژنە مەدەنەوە مێردی یەکەم، واتە: بەو فێڵو فەرەجە حەڵاڵ نابێ و،کاری وایش گاڵتەو مەسخەرەیە بە قورئان.

پێنجەم – پێچەوانەیە بۆ راوبۆچوونی پاشینان، لەوانە:

أ-(ئیبن جورەیج) دەڵێ بە (عەتا)م گوت: چی دەڵێیت دەر بارەی ئەو ژنەکە مێردی دووەم (واتە:محلل) تەڵاقی دەداو مێردی یەکەم دەیباتەوە؟ گوتی: دەبێ لێك جودا بکرێنەوە.

ب-(بەکر بن عبدالله المزنی) دەڵێ: (أولئك يسمون في الجاهلية التيس المستعار) واتە:ئەو جۆرە کەسانە – کاری وا دەکەن – بەر لەئیسلام پێیان دەگوتن: تگەی خوازراو!. پێشەوا (مالك) دەڵێ: دەبێ لێك جودابکرێنەوە!.

شەشەم – ئەو حیکمەتەی ئەو (تەحلیل)ـەی بۆ دانراوە – کەمانەوەی ژنەکەیە لای ئەو مێردە دووەمەو، پاشان بیرکردنەوەو پەشیمانی ژنەکە بۆ مێردو ماڵو منداڵی پێشووی – لەوساتو کاتە کەمەدا پەیدا نابێت، ئەوەش پێچەوانەی ئەو مەبەستو ئامانجەیە، کە ئەو (تەحلیل)ـە بۆی (تەشریع)کراوە.

حەوتەم – نیكاحێكی كاتییە،چونكە وا ئەنجام دەدرێ، كە پاش سەرجێیی خێرا تەلاق بدرێت!.

هەشتەم – نیكاحە بەمەرج: چونكە بەمەرجێ لە (محلل) مارەدەكرێ دوای سەرجێیی تەلاقی بدات!.

نۆیەم – ژنەكە زۆرجار ڕازی نییە بەو جۆرە مێردكردنە.. چونكە بۆ دوایی قەدروپایەو پلەی لەناو كۆمەڵگەدا دادەبەزێت، شیاوی ئاماژە بۆ كردنە كۆمەڵگەی كوردەواریی بەو جۆرە نیكاح و مارەكردنە دەڵێت: (جاشكردنەوە!).

دەیەم – قسەی (شافیعییەكان)و (ظاهر)یەكان، پێچەوانەی ئەو فەرموودەیە كە دەڵێ: ((إنما الأعمال بالنيات وإنما لكل امرئ مانوي..)). (ئیبن قەییم) دەڵێ: (ولا فرق عند أهل المدينة، وأهل الحديث وفقهائهم: بين إشتراط ذلك بالقول، او بالتواطوء والقصد فإن القصود معتبرة والأعمال بالنيات، والألفاظ لا تراد لعينها، بل للدلالة علي المعاني فتترتب عليها أحكامها. (زاد المعاد ٦/٤).

تا ئێستا لەو مەسەلانە دواین كە پیاو بەتەنها خۆی (وەكو ئەوەی كە تەلاقی بەدەستە) هەڵ ئەكوتێتە سەر تەلاق و، تەلاقی ژنەكە دەدات، جا بۆ ئەوە كە پیاوان ڕێساو یاسای تەلاق و جیابوونەوە نەشێوێنن، ئیسلامی پیرۆز ئەو كۆمەڵە یاسایەی داناو ئێمەیش بۆ ئێوەی بەڕێزمان نووسی جا ئیتر لەمەبەولاوە سەرەی ئەوەیە كە هەندێ تەلاق هەیە ئیرادەوخواستی هەردوو لە ژن و پیاوەكەی دەوێ، جا بۆ ئەوەش پیاوان لە ژنان ستەم نەكەن، خاڵگەلێكی بڕیار داوە لە جێبەجێبوونی ئەم جۆرە تەلاقەداو، ناوی ناوە (خولع)

## خولع لە شەریعەتی ئیسلامدا

بریتیە لە ڕێككەوتنی ژن و پیاو، یان بریكاریان، لەسەر كۆتایی هێنان بە پەیوەندی گرێبەستی ژن ومێردیی لەبەرامبەر (عیوەن)ێكەوە، ژنەكە بیدات بە پیاوەكە.

بەڵێ كە ژن و پیاو ئیرادەیان یەكیگرت و پێكهاتن بۆ كۆتایی هێنان بە پەیوەندی نێوانیان، ئینجا ژنەكە چووە ژێر (بەدیل)ـەكەیەوە، بێ شك لەحاڵەتی ئاوادا گومانێك نییە كە ئەو خولعە ڕەوایەو دادەمەزرێت، بەڵام ئەگەر لەبەر گوشاری پیاوەكە بوو، ژنەكە چووبووە ژێر ئەو بارەوە، دیارە كە ئەوە دانامەزرێ وكاری پێ ناكرێت.

باڕۆشنتر بڵێین: ئەگەر پێكهاتنەكەیان بۆ جودابوونەوە لەبەر ناڕێكی و لاساریی پیاوەكە نەبوو، بەڵكو ژنەكە بۆ خۆی ویستی لەو پیاوە جیاببێتەوە كە بە سروشت حەزی لێ

نەدەکرد، جا ئیتر لەبەر جیاوازی تەمەنیان بێ، یان لە بەر جیاوازی پلەی خوێندەواریی و ڕۆشنبیریان بێ، یان هەر شتێکی تر کە دەسەڵاتی پیاوەکەی تێدا نەبێ بۆ جودابوونەوەکە، بێ شك تەڵاقی ئاوا ڕەوایەو لێکجودادەکرێنەوە. خۆ ئەگەر لەبەر گوشاری پیاوەکە بووو ژنەکەش بە ناچاری قەبووڵی خولعەکەی دەکرد،بێ گومان لەحاڵەتی ئاوادا بەلای (حەنبەلیی)و (ظاهریی) و دەستەیەك لە (جەعفەر)یەکان و سەرجەم (زەید)یەکانەوە، تەڵاقی وا دانامەزرێ و نیکاحەکە وەکو خۆی دەمێنێتەوە.

ئینجا ژنەکەش: ئەگەر باڵغو ژیرو ئارەزوومەندو تەندروست بوو و ڕێی لێ نەگیرابوو لە ئاڵو وێڵدا لە بەر (سەفاهەت)، ئەوە بێگومانە ئەو خولعە دادەمەزرێ، خۆ ئەگەر نەخۆش وشێت و منداڵ و بێ ئارەزوو بوو، لەمەیشدا گوومان نیە کە دانامەزرێ... جا ئەگەر لەو حاڵەتەدا کە ژنەکە (ئەهلیەت)ی شەرعیی نەبوو بۆ قەبووڵکردنی خولع و، (وەلی)ـەکەی چووە ژێر خولع و عیوەزەکەیەوە، زاناکان ڕایان بەم شێوەیە:

یەکەم – حەنەفیەکان خولعی ئاوا بەڕەواو دامەزراو دادەنێن.

دووەم – شافیعیەکان دەڵێن: هەموو کەسێك – وەلی ئەو ژنە بێت، یا نا – دەتوانێ قبووڵی خولع بکات لە باتی هەموو جۆرە ژنێك:منداڵ و نابالغ و(سفیهە)، بە مەرجێ ئەو کەسە خۆی بچێتە ژێر (عیوەز)ەکەوە.

## بۆچی ڕێ بە خولع دراوە؟

ڕێ بە (خولع) دان.. بۆ ئەوەیە کە هەر کات ژن و مێرد زانییان ناتوانن لەمەسەلەی ژن ومێردیدا یاساو ڕێسای خودا بپارێزن و، ڕەفتاریان لەگەڵ یەك بە پێی قورئان و سوننەت بێ، ماف یەکدی پێشێل دەکەن. (ئیبن قدامە الحنبلی) لە کتێبی (المغنی)دا دەڵێ: (والخلع – أي شرع – لإزالة الضرر الذي يلحقها بسوء العشرة والمقام مع من تكرهه وتبغضه..)واتە: بۆ لادانی ئەو زیانەیە تووشی ژنان دەبێ لەلایەن مێردی خراپەوە.

لە (کشاف القناع)یشدا هاتووە: (وفائدته – أي فائدة الخلع – تخليصها من الزوج على وجه لا رجعة لە عليها إلا برضاها) واتە: کەڵکی خولع بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ خۆ ڕزگارکردنی ژنەکە لە دەست پیاوەکەی. کەوابوو حیکمەتی خولع.. ئەگەر قازانجی پیاوەکەشی تێدا بێت.. دەتوانی بڵێیت تەنها لەبەر خاتری ژنان داهێنراوەو ڕێی پێدراوە، چونکە پیاو – ئەگەر خولعیش نەبێ، بە ڕێگەیەکی تر دەتوانێ، لە لاساری ژنەکە خۆی ڕزگار بکات.

## یاسای عیراقیی چۆن دەڕوانێتە خولع ؟

لەماددەی (٤٦)ی یاسای باری کەسێتی عێراقیدا لەژێر سەردێری: (التفریق الإختیاری)دا هاتووە:

١- الخلع لإزالة قید الزواج بلفظ الخلع او ماڤي معناه، وینعقد بایجاب وقبول أمام القاضي، مع مراعاة المادة (٣٩) ونصها.

٢- على من أراد الطلاق أن یقیم الدّعوى ڤي المحكمة الشرعیة یطلب إیقاعه واستحصال حكم به فإذا تعذر علیه مراجعة المحكمة وجب علیه تسجیل الطلاق ڤي المحكمة خلال مدة العدة.

(٣) تبقى حجة الزواج معتبرة إلى حین إبطالها من المحكمة). واتە: خولع: لابردنی ئاسەواری هاوسەریەتیە بە وشەی (خولع) یان هەر وشەیەکی تر ئەو مانایە بگەیەنێت. ئەم خولعە بە گوتنی ئەو ڕستەیە دەبێ لەلایەن مێردەوەو، قبوول کردنی لەلایەن ژنەکەوەو لەبەردەم دادوەردا، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ماددەی (٣٩) کەتیایا هاتووە: ئەوی دەیەوێت تەڵاقی ژنەکەی بدات، دەبێ لە دادگای شەرعیدا داوا تۆمار بکات بۆ خستنی تەڵاقەکەی لە لایەن دادوەرەوە، ئەگەر ئەمەی بۆ نەکرا، دەبێ لەماوەی عیددەی شەرعیی ژنەکەدا تەڵاقەکەی لە دادگادا تۆمار بکات.. خۆ ئەگەر هەر گوێی نەدایەو سەردانی دادگای نەکرد، ئەو ژنە ئەگەرچی تەڵاقیشی دابێ، هەر بە ژنی ئەو حسێب دەکرێ، هەتا دەچێ هەڵیدەوەشێنێتەوە.

١- یشترط لصحة الخلع أن یكون الزوج أهلا لإیقاع الطلاق، وأن تكون الزوجة محلاله ویقع بالخلع طلاق بائن). بۆ ئەمەکە (خولع) دامەزرێت، دەبێ مێردەکە (ئەهل) بێت بۆ تەڵاقدان، هەروەك پێوستە ژنەکەش ژنی ئەو بێت. تەڵاقێکیش لە (خولع)ەوە بکەوێتەوە، جیابوونەوەی یەکجارەکییە، واتە: بینونة الكبرى)یە.

٢- للزوج أن یخالف زوجته على عوض أكثر أو أقل من مهرها). مێرد بۆی هەیە خولعی ژنەکەی بکات لەسەر بریتیەکەی، زۆرتر بێت یان کەمتر بێت لە مارەیی یەکەی.

## ئەو شتانە ڕێ بۆ ژنان خۆش دەکەن بۆ داوای تەڵاق

زاناکان دەڵێن: (كل ما یلحق الأذى أو الألم ببدن الزوجة أو نفسها أو یعرضها للهلاك) واتە: هەر شتێك عەزیەتو ئازار بەجەستە ودەروونی ژنان بگەیەنێ، یان بیانخاتە هیلاکەتەوە، لەهەموو ئەو حاڵەتانەدا دەتوانن داوای جیابوونەوە لە پیاوەکانیان بکەن، بێ گومان ئەمە لە کۆمەڵگەیەك بۆ کۆمەڵگەیەکی تر، یان لە ژنێکەوە بۆ ژنێکی تر دەگۆڕدرێ.

بـۆ نموونـه: قـسەی درێوناشـیرین، جنێـو، بـەخۆی یـان بـەباوك‌و دایكیـی، یـان رووی لێوەرچەرخێنیٚ وقسەی لەگەڵ نەكات، یان شەو – بیٚ هیچ هۆكارێكی شەرعیی – لەگەڵی نەخەوێت، یان ماوەیەك سەرجێیی لەگەڵ نەكات،یان ڕوو گرژو ڕوو تاڵ بێت لە گەڵیا، یان ناوچاو بدات بەیەكا، یان قسەی بەرزو نزمی لەگەڵ بكات، یان گویٚ بۆ قسەی نەگرێت. تاد.

هــەروەها لێـدانێكی – لەسـنوور دەرچـوو– بەدەسـت، یـان بەهــەر ئـامێرێكی تـر، یـان برینـداركردنیان، یـان شـكاندنی جێگایـەكیان، یـان بـە زسـتاندا لـە ریٚ و شـوێنێكی ساردا دابنرێت، یان بە هاویندا جێگاكەی گەرم بێت... بەكورتیی: هـەر شتێك لـە لایـەن پیاوەكەوە پەیـدابوو بەرامبـەر ژنەكـە، وەشـەریعەتی ئیـسلام ڕێـی پـیٚ نـەدابوو، ژن دەتـوانیٚ بیكاتـە بییانووی تەڵاق و جیابوونەوە. (مالیك)یەكان پتر لە زاناكانی تر ئەم دەرگایـەیان والاكـردووە لـە ژنـان بـۆ خـۆ رزگـاركردن لـە دەسـت پیـاوانی لارو لاسـار، بـۆ نموونـە دەڵـێن: (ولهـا – أي للزوجـة – التطليـق علـى الـزوج للـضرر، وهـو مـالا يجـوز شـرعاً كهجرهـا بـلا موجـب شـرعي، وضـربها كـذلك وسـبِّها وسـبَ أبيهـا نحـو: يـا بنـت الكلـب، يـا بنـت الكـافر، يابنـت الملعـون... ويـؤدب علـى ذلـك زيـادة علـى التطليـق). (ومـن الـضرر قطـع كلامـه عنهـا، وتحويـل وجهـه في الفراش عنها، وإيثار إمرأة عليها، وضـربها ضـرباً مؤلمـا) بەكورتیی: هـەر وشـەیەك، یـان هـەر كارێك لە مێردەوە ڕەنگ بداتەوە بۆ سەر كەسێتی ژن، دەتوانیٚ ئەوشتە بكاتە بەڵگە بۆ داوای تـەڵاق‌و جیابوونـەوە.... هـەروەها ئەگـەر مێـرد بـەهۆی خواپەرسـتیی‌و نوێـژو ڕۆژوو وشـەو نوێـژەوە سـەرجێیی لەگـەڵ نـەكرد، ئـەو پیـاوە بـانگ دەكـریٚ‌و پـیٚی ڕادەگەیـەنرێت كـە نـابیٚ كاری وابكات، ئنجا ئەگەر بەوە باش بوو، چاكە، ئەگینە دەبیٚ تەڵاقی بدات. (شیخ الإسلام – ابن تیمیه) دەڵیٚ: (وحصول الضرر للزوجة بترك الوطء مقتضى للفسخ بكل حـال، سـواء كـان بقـصد الـزوج أو بغـير قـصد، ولـو مـع قدرتـه وعجـزه كالنفقـة) الإختبـارات الفقهيـة للـشيخ ص٢٤٧). واتە: بە هەر شێوەیەك مێرد دوور بكەوێتـەوە لەسـەرجێیی لەگـەڵ ژنـدا، وە ژنەكـە بەوە ناڕەحەت ببێت، دەتوانیٚ داوای تەڵاق بكات.

<u>**تێبینی**</u>:

ئەگـەر هـەر یـەك لـەو شـتانە كـە دەبنـە بییـانووی داوای تـەڵاق، یـەك كـەڕەتیش لـەماوەی تەمەنـدا ڕوو بـدات بەسـە، وە ژن دەتـوانیٚ داوای جیابوونـەوەی پـیٚ بكـات. لـە كتێبەكـەی (دەردیر)دا هـاتووە: (ولها – أي للزوجة – التطليـق علـى الـزوج بالـضرر ولم تـشهد البينـة – الشهود – بتكرره) واتە: ژن دەتوانیٚ داوای تەڵاق بكات بە هـۆی ئـەو زیانـەوە لـەلای مێـردەوە تووشی دەبیٚ، ئەگەرچی تەنها جارێكیش بێت! (دسوقی) دەڵێت..(..بل شهدت بأنه حصل

لها مرة واحدة فلها التطليق بها على المشهور).

بۆ ئەم جیابوونەوەش ژنەکە دەچێتە لای (قاضي)و سکاڵا دەکات، ئەویش بانگی دەکاو فەرمانی پێدەدات تەڵاقی بدات، ئینجا ئەگەر گوتی تەڵاقی نادەم، قاضی بەزۆر پێی تەڵاق دەدات.

بەڵێ... بەڕاستی بۆچوونی (مالیك)یەکان لە ڕۆحی ئیسلامەوە زۆر نزیکە، چونکە فەلسەفەی ژن‌و مێردیی فەرەح و خۆشیی‌و، خۆشویستن و ئەنجامدانی حیکمەتی نیکاحە لەلایەن پیاوەکە، جا ئەگەر حیکمەتێك لە حیکمەتەکانی ژن‌و مێردیی ئیفلیج بوو، دەبێ لێکجودا بکرێنەوە.

## جیابوونەوە بەهۆی بێ سەرو شوێنبوونی مێردەوە

پیاوی بێ سەروشوێن (مفقود) بە کەسێك دەگوترێ لەشارو ناوچەی خۆی دیار نەبێ‌و هیچ کەسیش نەزانێ زیندووە یان مردووە؟ لە (فەتاوا)ی (الهندیە)دا هاتووە، یان دوژمن دیلی کرد بێ‌و ئێستا بێ سەرو شوێن بێ‌و نەزانرێ زیندووە یان مردوو، وە لەگەڵ ئەوەیشدا سەردەمێکی بەسەرچوو بێت.

لە حاڵەتی ئاوادا.. ئایا ژن دەتوانێ داوای جیابوونەوەو تەڵاق بکات لای قاضی...؟ بەڵێ ئەگەر سەیری حیکمەت‌و فەلسەفەی (نیکاح) بکرێ، دەزانرێ کە دیار نەبوونی مێرد ئاسەواری خراپی دەبێ لەسەر ژیانی ژن، بۆیە لای مرۆڤی بە ویژدان بێ بیرکردنەوە بڕیاری داوای جیابوونەوە دەدرێ‌و هەقیەتی بچێتە لای قاضی‌و قسەو سکاڵای خۆی بکات، ئەگەرچی زاناکانیش قسەیان یەك نییە لەم داوایەدا، بەڵام (شیخ الاسلام) (إبن تیمیە) دەڵێ: قسەی ڕاست‌و پەسەند سەبارەت بە ژنان، قسەی (عومەری کوڕی خەتتاب)ە – خ)و هاوەڵانی تر کە دەڵێن: ئەو ژنەی مێردی بێ سەروشوێن دەبێ، دەبێ چوار ساڵ چاوەڕوانی گەڕانەوەی بکات، پاشان ئەگەر دەنگی نەبوو،دەبێ عیددەی ژنی مێرد مردوو تەواو بکات، جابۆ دوایی – تەنانەتی بێ مۆڵەتی حاکمیش – دەتوانێ مێرد بکاتەوە.

خاوەنی (المفصل)یش دەڵێت: لە بنەما گرنگەکانی شەریعەتی ئیسلامە، دورخستنەوەی زیان‌و نەهێشتنی بۆ ڕوودانی زیان، هەر لەبەرئەوەیشە ئەحکامی (ایلاء)و (شیقاق)و نەتوانایی سەرجێییکردنی پیاو لەگەڵ ژندا هاتووەو کراوە بە یاساو کاری پێدەکرێ... هەموو ئەمانە بۆ دورخستنەوەی زیانە لە ژنان، دەخۆ ئاشکرایە ژنێك مێردەکەی بێسەروشوێن بکەوێت، قورستر نەبێ لەوە کەمتر نییە، کەوابوو پاش تێپەربوونی ئەو چوار

ساڵه كه خەليفه (عومەر) كارى پێكردووه، بڕيارى (تـەفريق) دەدرێ بۆ ژنەكەو دەچێ شوو دەكات، ئەگەر بيەوێت.

## ئايا ئەم ( تەفريق )ـە بڕيارى دادوەرى دەوێ..؟

ديـاره بـۆ ئـەم مەسـەلەيه لـەناو زاناكانـدا كێشه هەيـه...، بـەڵام دكتـۆر (زەيـدان) دەڵـێ: پێويسته ژنەكه (قاضى) به مەسەلەكەى ئاگادار بكا و پاشان عيددەى دەژمێردرێو دواييش ئەگەر ويستى مێرد دەكاتەوه.

ئاشكرايشه هەر ئەم قسه له ڕۆحى شەريعەتى ئيسلامەوه — كه حەز دەكات هەموو شتێك له ڕێگاى خۆيەوه بێ — نزيكتره، تا ئەو قسەيه كه دەڵێ: ژنەكه بۆى هەيه پاش تـەواوبوونى عيددەى — بێ ئاگادارى قاضى مێرد بكاتەوه!.. هەروەها دەڵێ: مادەم حيكمەت لـەو كارەدا دوور خستنەوەى زيانـه لـه ژنـان.. هـەر هەڵبـژاردنى ئـەو قسەيەش پەسـەنده كـه دەڵـێ: ژنـى مێردى بێ سەروشوێن، پاش چاوەنوارِى چوارساڵ دەتوانێ شووبكاتەوه.. وه ئەم قسەيەش لەهـەموو قسەو بۆچوونەكانى تـر باشـتره. چـونكه ئـەو ئەنـدازه بەسـه بـۆ گـەڕان بەدوايـداو سۆراخكردنى حاڵو ئەحواڵى، چوار ساڵەكەش لەو ڕۆژەوه هـەواڵ بـه قاضـى دەدرێ — پـاش هەوڵو گەڕان بەدوايداو مانەوەى بێ سۆراخ — حيساب دەكرێو ئەوسا پاش تـەواوكردنى شوودەكاتەوه.

## ئەگەر پاش بڕيارى ( تەفريق )، مێرده بێ سەرو شوێنەكه گەڕايەوه

يەكەم — ئەگەر له ماوەى چاوەنۆڕى ژنەكەدا بۆ تەواوكردنى ماوەى چوار ساڵەكه، يـان بـۆ تـەواوكردنى عيددەكەى، پياوەكه گەڕايـەوه... ئەوه لـه حاڵـەتى ئـاوادا ئـەو ژنـه هـەر بـه ژنـى ئەوپياوه دادەنرێو بێ هيچ عيـددەو نيكـاحێكى تـازه ژيـان دەسـت پـێ دەكەنـەوه، وەكـو لـه (المجموع في شرح المهذب)و له (المغني لا بن قدامة)دا هاتووه.

دووەم — چـاوەنۆڕى تـەواوكردووەو مـارەش كـراوه بـۆ كابرايـەكى تـر، بـەڵام سـەرجێيى لەگـەڵ نـەكراوه، ئينجـا دەگەڕێتـەوه — لـەم حاڵەتەيـشدا — وەكـو حاڵـەتى يەكـەم — بـێ هـيچ بڕيارو تێبينيەك ژنو مێردى دەست پێدەكەنەوه، ديسان له (المجموع)دا ئەم بڕياره هاتووه

سێيەم — كاتێ دێتەوه،دەبينێ ژنەكه مێردى كردۆتەوەو سەرجێيى لەگەڵ كراوه! بۆ ئەمەيان— وەكو حەنبەليەكان دەڵێن — ژنەكه سەرپشك دەخرێت له نێوان هەردوو پياوەكەدا: جا ئەگەر پياوى يەكەمى هەڵبژاردەوه، ئەوا ژنى يەكەمە، بەڵام دەبێ چاوەنۆڕ بێ هەتا عيددەى له پياوى دووەم تەواو دەكات... خۆ ئەگەر پياوى دووەمى بەدڵ بوو، ئەوا سەر لە نوێ مارەدەكرێتەوه بۆى. ئەمە كورتەو پوختەى ئەو باسه بوو، دەتوانى له (المفصل)دا پتر ئاگادار بيت.

## نادیار بوونی مێرد ( غيبة الزوج )

مەبەست ئەوەیە کابرایەك لە ژنەکەی خۆی ون دەکات.. جا ئایا کەسێکی ئاوا ژنەکەی دەتوانیٚ داوای (تەفریق) بکات؟

لە کتێبی (المغني لابن قدامة) دا هاتووە: بۆ ئەو پیاوە خۆی لە خێزانو هاوسەرەکەی نادیار دەکات، دوو حاڵەت هەیە:

یەکەم – ریٚ وشوێنی دەزانریٚو هەواڵو نامەشی دێت، بۆ ئەمەیان سەرجەم زانایان دەڵێن، ئەگەر بتوانیٚ نەفەقەی بدات، بۆی نییە داوای (تەفریق) بکات.

پوختەی ڕاوبۆچوونی (حەنبەلیە)کانیش دەڵیٚ: ئەگەر مێرد زیاد لە (٦) مانگ خۆی بزر کرد، ژنەکەی دەتوانیٚ سەردانی دادوەر بکا بۆ ئەوەی بۆی بگێڕێتەوە، جا ئەگەر نەهاتەوە، بەلاٚم پۆزشی شەرعیی هێنایەوە، ئەوا دادوەر داواکەی لیٚ وەردەگریٚو هەڵدەسێت بە (فەسخ) کردنەوەی نیکاحەکە.

مالیکیەکان دەڵێن: نادیار بوون پێنج حاڵەتی هەیە:

یەکەم – ئەوەیە کە هیچ ماڵو نەفەقەیەك بۆ ژنەکە بەجیٚ نەهێڵیٚو، لە نێوان ژنو پیاوەکەشدا بەمەرج نەگیرابیٚ کە هەرکات ئەو پیاوە نادیار کەوت، ژنەکە بتوانیٚ تەلاٚقی خۆی بدات، لەم حاڵەتەدا ئەگەر ژنەکە پێیخۆش بوو، ئەوا داوا بەرزبکاتەوە بۆی لای دادوەر بۆ (تەفریق) لەبەر نەبوونی (نەفەقە)و ژیان.

دووەم – هیچ نەفەقەو ماڵێکی بۆ بەجیٚ نەهێشتبیٚ، بەلاٚم مەرجییان لە نێواندایە کە ئەگەر خۆی بزر کرد، ژنەکە بتوانیٚ خۆی تەلاٚق بدات، لەم کاتەشدا ژنەکە خۆی سەرپشکە: دادەنیشیٚ، یان بە هۆی بیٚ نەفەقەیییەوە داوای (تەفریق) دەکات لای دادوەر.

سێیەم – نەفەقەی بۆ بە جێهێشتبیٚ و مەرجیشیان لە نێواندابیٚ کە ئەگەر دیار نەما خۆی تەلاٚق بدات، لە حاڵەتی ئاوایشدا لە بەرمەرجەکە دەتوانیٚ بچێت داوای (تەفریق) بکات، ئیتر جێگای بزانیٚ یا نەزانیٚ ؟.

چوارەم – نەفەقەو ئازووقەی بۆ بەجێهێشتبیٚ، بەلاٚم سەرجێییان نەبووە، لە هەمانکاتیشدا دەزانرا ریٚ وشوێنی لە کوێیە، لەکاتی ئاواشدا دادوەر بۆی دەنووسێت: یان بگەڕێتەوە، یان لەگەڵ خۆی بیبات، وە یان تەلاٚقی بدات، ئەگینە دادوەر بۆخۆی تەلاٚقی دەدات.

پێنجەم – ئەوەند ماڵو سامانی بۆ بەجێهێشتبیٚ پێیبژیو مەرجیش لە نێواندا نەبیٚ، بەلاٚم کەس نەزانیٚ شوێنی لە کو ێیە! ئەمە بە (مەفقوود) دادەنرێت.

بەڵێ.. لای (مالیك)یەکان ژن دەتوانێ لە مێردی نادیار (غائب) جیا ببێتەوە بەم مەرجانە:

یەکەم – دیار نەبوونەکەی زیاتر لە ماوەی ساڵێك بێت.

دووەم – بترسێ تووشی زینا و کاری دزێوو ناشیرین ببێت لەو ماوەیەدا.

سێیەم – نامە بۆ مێردەکەی بنووسێت، یان تەلەفۆنی لەگەڵ بکات – ئەگەر ئەیزانی لە کوێیە – یان بگەڕێتەوە، یان کاری بۆ بکات بیبات بۆلای خۆی،وە یان تەڵاقی بدات، خۆ ئەگەر هیچ یەك لەمانەی نەکرد، دادوەر بۆی تەڵاق دەدات.. ئەمە ئەو کاتەیە کە نەفەقەو ماڵی بۆ بەجێهێشتبێ، ئەگینە دادوەر لەبەر نەبوونی نەفەقە (تەفریق)یان دەکات. بەڵام (شافیعی) و (حەنەفی)و (ظاهری)و (جەعفەری)یەکان (غەیبەتی) مێرد – بەتەنها ناکەنە هۆکار بۆ (تەفریق)!! بەڵام ئەوی لەگەڵ سۆزو میهرەبانی ئیسلامدا بگونجێت رای (حەنبەلیە)کانە کە دەڵێن: دیار نەبوونی مێرد – بەبێ بیانووی شەرعیی – هۆکاری (تەفریق)ـە، ماوەی دیار نەبوونەکەشیان بڕیوەتەوە بە (٦) مانگ یان زیاتر! لەو ماوەیەدا ژنەکە دەچێتە دادگا، دادوەریش نامەیەك دەنووسێ بۆ کابرای مێرد کە: یان بگەڕێتەوە بۆ لای، یان بیبات، ئەگینە نیکاحەکە (فەسخ) دەکاتەوە. خۆ ئەگەر بیانووی پەسەندی هەبوو بۆ (غائب)بوونەکەی، دادوەر مۆڵەتی بۆ دیاری دەکات کە چارەسەری کێشەکەی بکات. بەڵام مادەم بیانووی هەیە لە (نادیاربوونەکەیدا) وەکو ئەوە کە بۆ خوێندن چووبێت، یان بۆ حەج، یان بۆ بازرگانی، کاتی گەڕانەوەی بۆ دیاری ناکەن. بەڵام بەڕێز (زەیدان) دەڵێ: چونکە ژنەکە زیانمەند دەبێ بە (غەیبەت)ی پیاوەکەی، ئیتر بیبیانووی شەرعیی هەبێ، یانەیبێ، هەر دەبێ دیاری بکرێت بۆی، ئەوەیش ئەو پەسەندی دەکات، نابێ چوار ساڵ زیاتری پێ بچێت ئەگەر بۆ هەر کارێ چووبێت.. هەروەها لەسەر باسەکەی دەڕواو دەڵێ: دانانی چوار ساڵ مانای ئەوە نییە لە چوار ساڵ کەمتر نابێ، بەڵکو دەخرێتە بەردەستی ئیجتیهادی دادوەر، ئەگەر دادوەر بەلایەوە وابوو کە ئەو ئیشە ئەو بۆی چووە، ساڵێ زیاتری ناوێ، دەتوانێ مۆڵەتی ساڵێکی بۆ دابنێ.

ئینجا مەسەلەی ئەو کەسانەش کە پتر لە چوار ساڵ زیندان دەکرێن بەم شێوەیە دەبێ:،ئەگەر ژنەکە داوای (تەفریق)ی کرد، دادوەر لە ڕۆژی بڕیاری حوکمەکەیەوە ساڵێکی بۆ دیاری دەکات چاوەڕوان بێت،جا پاش ساڵەکە بڕیاری (تەفریق) دەدات.

## ژنی پیاوی دیل و بەندکراو

(ئیبن تەیمیە) دەڵێ: (وحصول الضرر للزوجة بترك الوطء مقتض للفسخ بكل حال، سواء كان بقصد من الزوج أو بغير قصد، ولو مع قدرته وعجزه كالنفقة وأولى للفسخ بتعذره في الإيلاء

إجماعاً، وعلى هذا، فالقول في امراة الأسير والمحبوس ونحوهما ممن تعذر إنتفاع امرأته به اذا طلبت فرقته، كالقول في امرأة المفقود بالإجماع كما قاله أبو محمد المقدسي) به هەر شێوەیەك ژن تووشی ئازاری دەروونی ببێ بەهۆی دیلبوونی مێردەوە، یان بە هۆی زیندانكردنیەوە، ناتوانێ كەڵك لە مێردەكەی وەربگرێت، كەوابوو هەر كات داوای (تەفریق)ی كرد، چوار ساڵ چاوەنۆڕی بۆ دادەنرێ، جاپاش ئەوە دادوەر بڕیاری جیابوونەوەیان بۆ دەدات.

## ئاخۆ سەرجێیی نەكردن لەگەڵ ژناندا دەبێتە هۆكاری ( تەفریق )؟

ئەگەر لەبیرمابێت، كەمێك پێشتر ئەو قسەی (ئیبن تەیمیە)مان باسكرد كە دەڵێ: (وحصول الضرر للزوجة بترك الوطء مقتض للفسخ بكل حال، سواء كان بقصد من الزوج أو بغير قصد، ولو مع قدرته وعجزه كالنفقة وأولى أي أولى من الفسخ لتعذر النفقة لعجزه منها وذلك للفسخ بتعذر الوطء في الإيلاء) الإختيارات الفقهية ص٢٤٧. مەبەست ئەوەیە كە بەڵێ سەرجێیی نەكردن لەگەڵ ژندا هۆكارە بۆ هەڵوەشاندنەوەی نیكاحی ژن و مێرد، هەر وەكو نەبوونی (نەفەقە) دەبێتە هۆكار بۆ هەڵوەشانەوەی نیكاح، بگرە سەرجێیی نەكردن گرنگترەو باشتریش دەبێتە هۆكار.

پوختەی مەزەبی (مالیكی) و (حەنبەلی)یەكان بۆ ئەم مەسەلەیە بەم شێوەیە كە: نەخەوتن لەگەڵ ژندا دەبێتە هۆكاری ئەوە كە ژن بتوانێت داوای (تەفریق) بكات.

**تێبینی:**

جیابوونەوە لەبەر (غەیبەت)ی مێرد – هەركات دادوەر بڕیاریدا – بەلای (حەنبەلی)یەكانەوە دەبێتە (فسخ)، جیابوونەوەیەكیش بەهۆی نەچوونەلا بێت، بەلای (ئیبن تەیمیە)وە (فسخ)ە، بەڵام (مالیكی)یەكان دەڵێن: جیابوونەوە بەهۆی هەركامێكیانەوە بێت (تەڵاق)ە، نە: (فەسخ).

## تەڵاق لەبەر نەبوونی نەفەقەو ژیان

یەكەم – حەنەفییەكان دەڵێن: ژن و پیاو بەهۆی نەداریی و دەسكورتییەوە لێكجودا ناكرێنەوە، بۆ ئەم بۆچوون و ڕایەشیان (٧) بەڵگە دێننەوە (داخەكەم لێرەدا دەرفەت كەمە بۆ هێنانیان).

دووەم – جەعفەرییەكان: لە مەزەبە سەرەكییەكەیاندا دەڵێن بە هۆی نەبوونی (نەفەقە)وە ڕێ بە (تەفریق) نادرێ.

سێیەم – ظاهریەكانیش وەكو حەنەفییەكانن... بەڵام ئەمان بە تەنها ڕاوبۆچوونێكی

جیاوازیـان هەیـە، کـە بـەدەر لـەوان کـەس ئـەو قسـەیەی نـەکردووە، لـە (المحلـی، ج١٠ ص٩٢ هاتووە: (فإن عجز الـزوج عـن نفقة نفسه، وامرأتـه غنيـة كلفت النفقة عليه، ولا ترجع عليه بشيء من ذلك إن أيسر...).

(برهـان ذلـك قـول الله عزوجـل: ﴿وعلـى المولـود لـه رزقهـن وكسـوتهن بـالمعروف لا تكلـف نفس إلا وسعها لا تضار والدة بولدها ولا مولود لـه بولـده وعلى الـوارث مثل ذلك﴾. واتـه: نەفەقەی مێردی هەژارو دەستکورت، دەکەوێتە سەر هاوسەرە دەوڵەمەندەکەی.

(دکتۆر زەڵمی) دەڵێ: ئەم ڕاوبۆچوونە لەگەڵ شـەریعەتی ئیسلامدا زۆر لـەبارو گونجـاوە، داوا لـە یاسا نووسـەکانی جیهانی ئیسلامیی دەکـەم، لـەکاتی نووسـینەوەی یاسـادا تۆمـاری بکەنو کاری پێ بکەن.

<u>چوارەم</u> – (ابن القيم) دەڵێ: ئەوی بگونجێت لەگەڵ یاساکانی شەریعەتی ئیسلامیدا – لەم مەسـەلەدا – ئەمەیـە ئەگـەر کـاتی خـۆی مێردەکـە ژنەکـەی لـە خـشتە بردبـوو کـە خـاوەن دەسەلآتو سەروەتە، ئەوا ئێستا لەم کاتی هەژارییەدا – کە بە هیچ شێوەیەك دەستی ناگاتـە ژیان – هەقیەتی دادوەر نیکاحەکە هەڵوەشێنێتەوە، خۆ ئەگەر بۆ دوایی هەژار کەوتبێت، یان هەر لە سەرەتاوە ژنەکە دەیزانی مێردەکەی هەژارە،ئەوە لەم کاتانەدا هەقی (فەسخ)ی نییە.

<u>پێنجەم</u> – جـەماوەری زاناکـان – بـەدەر لـە ئـەبوو حەنیفـە – ڕێ بـە (تـەفریق) دەدەن لەبـەر نەبوونی نەفەقەونەبوونی ژیانی ئاسایی بۆ ژنان، چونکە خودا دەفـەرمووێ: ((ولا تمـسكوهن ضرارا لتعتدوا)) یان دەفەرمووێ: ((فإمساك بمعروف او تسريح بإحسان)) واتە: بە خۆشیو دوور لە زیانو ناڕەحەتی، ژنان ڕابگرن، دەسا ئەگەر مێـرد نـەبووبێو نـەتوانێ ژنەکـە بـژێنێ، ئایا ئەو بارە خۆشیو گوزەرانە کە خودا داوای دەکات بۆ ژنان کامەیە ؟.

(ئەبوو زەنـاد) دەڵـێ: لـە (سـەعید بن المسيب)م پرسـی: ئەگـەر پیاوێـك نـەتوانێ نەفەقـەی ژنەکەی بدات (تەفریق) دەکرێن؟ گوتی: بەڵێ.

دکتۆر (وەهبە زوحەیلی) دەڵێ: لەبەر بەهێزی بەڵگەکانی ڕای جەماوەری زاناکانو، لەبـەر لابردنــی زیــانو ناڕەحــەتی لەســەر شــانی ژنــان – بــە هــۆی نەبوونییــەوە – ڕای جــەماوەر پەسەندو ڕەوایە.

دکتۆر (زەیدان) دەڵێ: دیارە ئـەم مەسـەلەیە، مەسـەلەیەکی ئیجتیهادییـەو دەقێکـی وانییـە ببێتە بنەما بۆی. کەوابوو دەبێ بگەڕێین چ بارێك لەگەڵ ڕۆحـی شـەریعەتدا دەگونجێـت، ئـەوە هەڵبژێرینو کاری پێ بکەین.

خۆ بێگومان یە کێ لە بنەما بـەرزەکانی ئـەو شـەریعەتە دورخستنەوەی زیانـە لـە مـرۆڤ بـە

گشتیی: ((لا ضرر ولا ضرار)). لەو لایشەوە یەكێ لە مەبەستە زۆر گرنگەكان لە پێكەوەنانی هاوســەر و خێــزان لــە ئیــسلامدا، زۆربــوونی (نەســل)و نــەوەی ئایندەیــەو ڕاگــرتنی پەیوەندییـەكانی نێوان ژن‌و مێردە... هـەژارییش خـۆی بـۆ خـۆی هۆیـەك نییـە بێتـە مایـەی كەمكردنەوەی كەسێتی مرۆڤ لە تەرازووی ئیسلامدا، جا لەم سۆنگەیەوە دەركەوت:

یەكەم – (تەفریق) بەهۆی نەبوونی (نەفەقە)وە مۆڵەتێكەو واجیب نییە كاری پـێ بكرێت، شیاوی ئاماژە بۆ كردنە ئەم قسەیە زاناكان تێیدا یەك راو یەك دەنگن.

دووەم – شـەریعەتی ئیـسلام وای پـێ باشـە لـەو حاڵـەتی نـەبوونی نەفەقـەو دەسـكورتی مێـردەدا، ژنـان خـۆڕاگر بـن‌و شـان بەشـانی پیاوەكـەیان ڕێ بگرنەبـەر، تابـەڵكو لەلایەكـەوە دەرگای خێریان لێ بكرێتەوە، سەرەڕای ئەوەیش دەبێ دڵی پیاوەكەی بداتـەوەو هاوكـارێكی بـاش بێـت بـۆ ڕاگـرتنی پەیوەنـدی ژن‌و مێردیـی نێوانیـان. شـێخ حەسـەنی (بەصـری) دەڵـێ: هەقـە لـەو حاڵەتـەدا ژنەكـە دڵخۆشـی پیاوەكـەی زۆر بكات‌ولـە خـوا بترسـێ‌و خـۆڕاگر بـێ‌و پیاوەكەش چی لە توانایدایە بۆی بكات.

ئیمـامی (زەهـری)یـش دەڵـێ: ژنەكـە ئاسـانكار بـێ‌و تـەفریق نـەكرێن، بـۆ پـشتگیری ئـەو قـسەیەش ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە: ﴿لا یكلـف الله نفـسا إلا مـا آتاهـا، سـیجعل الله بعـد عسریسرا﴾ سوورەتی: الطلاق.

سـێیەم – ئەگـەر ژنەكـە نـەیتوانی ئـارام بگـرێ‌و قـەبووڵی ئـەو حاڵەتـەی پـێ نـەكرا، مێردەكەش بۆ خۆی ئامادە نەبوو تەڵاقی بدات دەتوانێ كێشەكەی بەرزبكاتەوە بۆ دادوەر بۆ (تەفریق).

(دكتۆر زەڵمی)یش دەڵێت: مادەم پەیوەندی ژن‌و مێردیی لەسەر بناغەی خۆشەویستی‌و (مەوەددەت)ـە، هەقە ژنان لە حاڵەتی نەبوونی‌و دەسكورتی مێرددا، بگرە لە هـەموو خۆشـی‌و ناخۆشییەكدا هاوبەشی پیاوان بن‌و بەشێك لە نەهامەتیەكانیان بۆ هـەڵگرن، فەقیریش نرخ‌و ڕێــزی مــرۆڤ لەژیانــدا كەمناكاتــەوە، ســەروەت‌و ســامان شــتێكە دێــت‌و دەڕوات، خــودا دەفەرموێ: ﴿فأما الزبد فیذهب جفاء وأماماینفع الناس فیمكث في الأرض..﴾ رەعد/١٧. بۆیـە ئەگـەر ژنەكـە دەسـەڵاتی هـەبوو پێویـستە خـەرجی بكـات بـۆ پیاوەكـەی‌و ماڵ‌و منـداڵی. خـۆ ئەگەر هەردووكیان نەدارا بوون، دەبێ دەوڵەت لە بوودجەی گشتیی ژیانیـان دابین بكـات. وە ئەگەر مێردەكە دەیتوانی كار بكات، لەسەر دەوڵەتە كارێكی شیاوی بۆ پەیدا بكات.

بـەڵێ.. كـە بـە بەڵگـەی شـەرعیی هـەژاری مێردەكـە چەسـپا، ژنەكـە دەتـوانێ داوای جیابوونـەوە بكـات، بـەڵام ئایـا دەسـت بـەجێ یـا نـا؟ ئایـا بـەر لەجیابوونەوەكـە دادوەر چـی دەكات...؟

بۆ وەڵامی ئەمە:

<u>یەکەم</u> – مالیکیەکان دەڵێن: هەر کات بێ توانایی مێرد – بەبەڵگەی شەرعیی، یان بە ئیقراری خۆی – دەرکەوت، دادوەر ماوەیەك – کە خۆی بە شیاوی بزانێت – دیاریی دەکات، جا ئەگەر لەو ماوەیەدا نەفەقەی بۆ پەیداکرا ئەوە باشەو گرفت نامێنێ، خۆ ئەگەر هیچی بۆ پەیدا نەبوو و ماوەکەش بەسەر چوو، دادوەر تەڵاقێکی رەجعیی دەدات. وە ئەگەر هەژاری مێرد دەرنەکەوت نەبە بەڵگەی شەرعیی، نە خۆی پێ لێنا، دادوەر پێیدەڵێ: یان نەفەقەی بۆ پەیدا بکە، یان تەڵاقی بدە. جا ئەگەر هیچیانی نەکرد، پێی تەڵاق دەدات.

<u>دووەم</u> – شافیعیەکان دەڵێن: هەر کات ماف هەڵوەشاندنەوەی نیکاح بۆ ژنەکە چەسپا، واتە: پیاوەکە نەبوو و دەستکورت بوو و ژنەکەش بڕیاریدا – بەو حاڵەشەوە – هەر لەگەڵی بژی، ئیتر دەبێ پیاوەکە وەکو مرۆڤێکی دەسکورت، خەرج و نەفەقەی بکێشێ، بەڵام هەر ڕۆژێك دەوڵەمەند بوو، ژنەکە دەتوانێ نەفەقەی ئەو ماوەیەی لێوەرگرێتەوە، جا ئەگەر – پاش هەژاری و نەبوونی، ژنەکە هەر مانەوەی بڕیاردا، لەسەری نییە خۆی بدات بەدەست پیاوەکەیەوە، دەشتوانێ لە ماڵ بچێتە دەر بۆ کردو کەسابەت، چونکە خۆ بەدەستەوە دان (تەمکین)و لەماڵ دەرنەچوون لە بەرامبەر نەفەقەوە دانراون، جا کە نەفەقەی نەبوو هەقیەتی هەوڵی خۆی بداو خۆشی تەسلیم نەکات، بەڵام ئەگەر دەرچوو بۆ کار، دەبێ بەشەوا بگەڕێتەوە چونکە شەو کاتی ئیش کردن نییە... سەرەڕای ئەمانەش هەرکات داوای (فەسخ) بکات، دەتوانێ داوای بکات.

<u>سێیەم</u> – زەیدییەکان دەڵێن: هەرکات مێرد هەژار کەوت، فەرمانی پێدەکرێ بچێ کار بکات، جا ئەگەر تەمەڵی کردو نەچوو، یان توانای کارکرنی نەبوو... زۆربەی (زەید)یەکان دەڵێن: هەرکات ژنەکە داوای (تەفریق)ی کرد، هەقی دەدرێتێ و دادوەر داواکەی وەردەگرێ و کاری لەسەر دەکات.

**تێبینی:**

لەم مەسەلەیەدا قسەی جەماوەری زاناکان کاری پێدەکرێ و رێ بە ژنەکە دەدرێ داوای جیابوونەوە بکات، هەتا تووشی زیان نەبێت.

## ئەگەر بەدەست ئەنقەست نەفەقەی نەدەکێشا..!

سەبارەت بەو جۆرە تەسەروفاتانە، زاناکان بەم جۆرە دەدوێن و دەڵێن:

یەکەم – مالیکیەکان: لەو حاڵەتەدا مێردەکە دەسەڵاتی هەیە، کەچی سەرفی ناکات بۆ ژنەکەو

ژنەکەش سکاڵاکەی بردە لای دادوەر، جائەگەر دارایی هەبوو، ئەوا دادوەر فەرمان دەکات بە مێرد نەفەقەی بکێشێ، ئەگەر حاڵەتی گۆڕاو چاك بوو، ئەوە باشە، ئەگینە پێی تەڵاق دەدات.

دووەم – حەنبەلیەکان: ئەگەر مێرد لەگەڵ بوون و دەسەڵاتدا نەفەقەی ژنەکەی نەداو، ژنەکەش سکاڵای بردە لای دادوەر، فەرمانی پێدەکات نەفەقەی بکێشێ،جا ئەگەر فەرمانەکەی‌نەی بیست، بەندی دەکات، ئنجائەگەر چووە بەندیخانەوەو هەر ملی ڕانەکێشا، دادوەر لە ماڵەکەی بەشێك وەردەگرێ و دەیکاتە نەفەقەی ژنەکە... ئەگەر ئەوەیش سەرکەوتوو نەبوو ئەوسا تەڵاقی دەدات.

کارکردن بە بۆچوونی (حەنبەلیە)کان پەسەنترە بۆ ئەوە بەڵکو وردە وردە پیاوەکە بگەڕێتەوە تەڵاق پەیدا نەبێت.

## نەبوونی نەفەقە لەبەر نادیاریی مێرد

وادەبێ مێرد نادیارەو هیچیشی بەجێ نە هێشتووە سەرف بکرێ بۆ ژنەکەی، ئایا لە حاڵەتی ئاوادا ژنەکە دەتوانێ داوای (تەفریق) بەرزبکاتەوە بۆ لای دادوەر لەبەرئەوە نادیارە؟ یان دەبێ چاوەڕوان بکات هەتا دەگەڕێتەوە..؟ بۆ ئەو وەڵامە دەڵێین:

یەکەم – مالیکیەکان دەڵێن:

ئەگەر دەرکەوت ئەو مێردە نادیارە نەدارایە... ژنەکەیش داوای بەرزکردۆتەوە بۆ دادوەر بۆ تەفریق، ئەوە دادوەر ماوەیەکی گونجاوو شیاوی بۆ دادەنێت، بەڵکو بگەڕێتەوە، وەیان نەفەقە پەیدا بکات بۆی، شیاوی باسە دادوەر کاتێ ماوەی گەڕانەوەی یان نەفەقەی بۆ دیاری دەکات ڕێ وشوێنی نەزانێت، یان بزانێت، بەڵام ئەندازەی دە ڕۆژ ڕێگا دوور بێت، خۆ ئەگەر نزیکتر بێت لەو ماوەیە، دادوەر نامەیەکی بۆ دەنێرێ: یان نەفەقەی بۆ بنێرێ، یان بۆ خۆی – دادوەر – تەڵاقی دەدات.

دووەم – شافیعیەکان: دەڵێن: هەرکات مێرد نادیار بوو، وە ڕێ وشوێنیشی نەدەزانراو ماڵێکی نەبوو سەرف بکرێت بۆ ژنەکە، لەو حاڵەتەدا بە هۆی نەبوونیەوە ماڤی فەسخ و هەڵوەشانەوەی نییە، چونکە هێمان دەرنەکەوتووە ئاخۆ وەکو نادیارە، لە هەمان کاتیشدا نەدارایە لە نەفەقە، ئەگەرچی قسەیەکی تریان هەیە دەڵێ: مادەم ئێستا ژنەکە نەفەقەی دەست ناکەوێت، ئیتر دارا بێت، یان نەدار، لەمەسەلەکە شتێ ناگۆڕێ و دەتوانێ نیکاحەکە فەسخ بکاتەوە (المهذب وشرحە).

سێیەم — حەنبەلیەکان:

ئەگەر مێردی نادیار شتێکی بە جێ نەهێشتبوو بۆ ژنەکە پێی بژی، وە هەروەکو بۆی نەدەنارد، لە هیچ لایەکیشەوە شتێك شك نەدەبرا قەرز بکرێ، لە حاڵەتی ئاوادا ئەگەر ڕێ وشوێنی دەزانرا، دادوەر ئاگاداری دەکات: یان بگەڕێتەوە، یان نەفەقەی بۆ بنێرێ، خۆ ئەگەر شوێنی نەدەزانرا، یان ناردی بە دوایدا نەهاتەوەو ماڵیشی نەنارد سەرف بکرێت بۆی، ژنەکەش سووربوو بۆ تەفریق، دادوەر بۆی فەسخ دەکاتەوە.

**تێبینی:**

١- پێویستە بەر لە بڕیاری (تەفریق)، دادوەر لە هەموو داوایەك بکۆڵێتەوە: ئا خۆ ڕاستە ئەو پیاوە نادیارە؟ ئاخۆ ماڵێکی بەجێ نە هێشتووە؟ ئاخۆ بریکارێکی دا نەناوە بۆ چاودێری نەفەقەی ژنەکەی؟ ئەوسا دەچێ بۆ تەفریق.

٢- ئەگەر پاش بڕیاری جیابوونەوەی دادوەر، دەرکەوت مێرد ماڵی هەیە، بڕیارەکەی دادوەر هەڵناوەشێتەوە، چونکە مادەم لەبەردەستا نەبووەو پێیان نەزانیوە وەکو نەبوو وایەو داوا لە ژنەکە ناکرێ خۆی ڕابگرێت.

٣- ئەگەر پاش بڕیاری جیابوونەوە، مێرد گەڕایەوەو چەسپاندی کە ماڵ و نەفەقەی بۆ ژنەکەی بەجێ هێشتووە یان بۆی ناردووە... تەماشا دەکرێت: ئەگەر پاش تەفریقەکە مێردی نەکردبێتەوە، هەقە بچێتەوە لای مێردەکەی، خۆ ئەگەر مێردی کردبوویەوە، ئەوە لای ئەو مێردە نوێیەی دەمێنێتەوەو ناگەڕێتەوە لای مێردی یەکەمی نادیارو گەڕاوەی.

٤- لەهەموو ئەو حاڵەتانەدا کە ژنەکە ماف تەفریقی هەیە، پێویستە داوا بەرز بکاتەوە بۆ دادوەر بۆ تێبینی و بڕیار.

٥- ئەگەر لەکاتی نادیاری مێردداو لەکاتی جێنەهێشتنی نەفەقە بۆ ژنەکە.. کەسێك — دۆست و خزمی مێردەکەی بێت یان نا — گوتی: من نەفەقەی دەدەمێ بە خۆڕایی، یان بەهەر ڕێگایەکی تر... ئەگەر ژنەکە قبووڵی بکا و ددان بەخۆیدا بگرێت — ئەگەرچی منەتێکیشی تێدا بێت — باشترە لە داوای (تەفریق) و جیابوونەوە. دەتوانی بۆ هەموو ئەم خاڵانە (المفصل)موتاڵە بکەیت.

٦- هەر جیابوونەوەیەك لەبەر نەبوونی (نەفەقە) سەرچاوە بگرێت، هەریەك لە مەزەبەکان بەم جۆرە دەدوێن لێی:

أ- شافیعیەکان لە قسەیەکیاندا دەڵێن: (لیست هذه الفرقة طلاقا، بل فسخ). مغني المحتاج ج٣ ص٤٤٢. واتە: جیابوونەوەی وا تەڵاق نییە، بەڵکو فەسخە.

ب- حەنبەلیەکان:

(إذا ثبت الفسخ بالعجز عن الوطء والضرر فيه أقل، لانه فقد لذة وشهوة يقوم البدن بدونه فلئن يثبت الفسخ بالعجز عن النفقة التي لا يقوم البدن إلا بها أولى/ المغني/٧/ج ص٥٧٦).
واتە: کە ڕێگە بدرێ بە هەڵوەشانەوەو (فەسخ) بە هۆی سەرجێیی نەکردن، بێ گومان لە کاتێ نەبوونی نەفەقە دا باشتر هەقە ڕێگە بدرێت.

ج- کە وابوو بە (فەسخ) ژمارەی تەڵاق کەم ناکات. واتە: ئەگەر بە نیکاحێکی تازە ژن و پیاوەکە یەکیان گرتەوە، دەبێتەوە خاوەنی سێ تەڵاق.. بەڵام ئەگەر بەر لە (فەسخ) یەك تەڵاقی خست، پاشان (فەسخ)یشی کردەوە، بۆ دواتر حەزیان لەیەك کردەوەو نیکاح کرایەوە لێی، پیاوەکە بەخاوەنی دوو تەڵاق دەبێ.. ئەمەیە جیاوازی نێوان ئەوەکە ئەگەر ئەو جیابوونەوە (تەڵاق) بێت، یان (فەسخ).

د- ئەگەر ئەو قسەیە هەڵبژێردرا کە دەڵێ: هەر جیابوونەوەیەك لەو جۆرە تەفریقەوە پەیدا ببێ، تەڵاقێکی ڕەجعیی پێ دەکەوێت، ئەوا بەر لەتەواوبوونی عیددەکە، ژنەکە دەتوانێ بچێتەوە لای مێردەکەی بێ نیکاحێکی تازە، یان بە نیکاحی تازە پاش بەسەرچوونی عیددە.

## (کچ و کوڕی نابالغ) کاتێ بالغبوون دەتوانن جیاببنەوە

بۆ خستنە ڕووی ئەم باسەو ڕوونکردنەوەی، ڕاو بۆ چوونی جەماوەری زاناکان بەم شێوەیەی خوارەوە دەدوێن:

حەنەفییەکان دەڵێن:

أ- هەر کات باوکێك، یان باپیرەیەك ژنی هێنا بۆ کوڕێکی (مێرمنداڵ)ی، یان کچێکی بچووکی نابالغی بەشوودا بە کەسێکی هاوکووف و هاوشانی کچەکەو، وەبە شیاوی خۆیشی مارەیی بۆ دانا (مهر المثل)، ئەو نیکاحە دادەمەزرێت، ئەگینە ناڕەواو نادروستەو دەبێ (تەفریق) بکرێن.

ب- ئەگەر غەیری باب و باپیرەئەو جۆرە نیکاحەیان (کوڕێکی مێرمنداڵ، ژنی بۆ هێناو مارەییەکی زیاد لە (مهر المثل) کردە مارەیی ژنەکە، یان کچۆڵەیەکی بەشوودا بە کەسێکی ناکفوو هاوشانی نەبوو و مارەییەکی کەمتر لە (مهر المثل)ی بۆ دانا بوو، نیکاحی ئاوا بۆ هیچ کامیان دانامەزرێت، خۆ ئەگەر کچۆڵەکەی لە هاوشانی خۆی مارەکردو مارەیی شیاویشی بۆ دانا..ئەو نیکاحە دادەمەزرێت، بەڵام کە بالغبوون دەتوانن نیکاحەکە هەڵوەشێننەوە.

ج- بـۆ (فەسـخ)و هەڵوەشـانەوەی نیکاحەکـە، پێویـستە داوا بەرزبکەنـەوە بـۆ دادوەرو مەبەستەکەی خۆیان.

**تێبینی:**

ئەگەر حاڵەتێکی ئاوا ڕوویدا - ئەگەرچی دەخوازین کە هەرگیز نە مێرمنداڵ ژنی لێ مارە بکرێ، نـە کـچی نابـاڵغیش بـەمێرد بـدرێت - دەتـوانرێ کـار بـەم راوبۆچـوونی حەنەفییانـە بکرێ و کێشەکەی پێ ببڕێتەوە.

## دەکرێ تەڵاق بدرێتە دەستی ژنان؟

تەڵاق لە بنەڕەتدا دراوەتە دەست پیاو (خستن و نەخستنی بەدەست ئەوە) بەڵام هـەرکات ژن تووشـی ئـازارو عەزیـەت بـوو بەدەسـت پیـاوەوە (لـەوئازارو نارەحەتیانـە لەسـەرەوە هەنێکیانمان باسکرد) هەقی پێدراوە کێشەکەی بباتە لای دادوەر بۆ لێکۆڵینـەوەو (تـەفریق). سەرەڕای ئەوەیش زاناکان دەڵێن: هەرکات پیاو ژنەکەی ڕاسپاردو (واتـە:تـەخویل)ی کرد بـە تەڵاقدانی خۆی، دەتوانێ هەرکات مەیلی بوو، بێ بردنە لای قاضـی تـەڵاقی خـۆی بدات، بـۆ زێدە روونکردنەوەی ئەم مەسەلە هێندێ لە قسەی زاناکان دێنین، بۆ نموونە:

یەکەم - حەنەفیی دەڵێن:

مێرد دەتوانێ چ لە کاتی (عەقد)ەکەدا، چ لـەدوای عەقدەکە تـەڵاق بداتـە دەسـت ژنەکـەی، ژنـیش دەتـوانێ لـەکاتی مارەبڕینەکـەدا ئـەو مەرجـە دابنێ.... وەبـەلای ئەوانـەوە (تـەفویض) واتە:تەڵاقدانە دەستی ژن، (تەملیك)ە، کەوابوو:

أ- مێرد پاش ئەوە تەڵاقەکەی دایە دەستی ژنەکە، بۆی نییـە بڵـێ وا پەشـیمان بوومـەوە، مەگەر بەر لەوە کە ژنەکە خۆی تەڵاق بدات، پیاوەکە تەڵاقی بدات.

ب- ئەگەر لـەو جێگەیەدا ژن وپیاوەکە هەڵسان و، ژنەکـە تـەڵاقی خـۆی نـەدا، ئیتر هـەقی دەسووتێ، مەگەر (تەفویض)ێکی هەڵپەسێراوو ماوەدار بێت.

دووەم - شافیعیی، ئەمانیش لە مەسەلەی (تەفویض)دا دووقسەیان هەیە:

أ- لە قسەی کۆن و (قەدیم)یدا دەڵێ: (تـەفویض) (تـەوکیل)ـە... کـەوابوو دەتـوانێ پـێی بلێت: هەر کات سەری

مـانگ هـات خـۆت تـەڵاق بدە، ئیتر تەڵاقدانەکە (فەوریـەت)و دەسـت بـەجێی نـاوێ، وەکـو حەنەفییەکان دەڵێن دەبێ (فەوری) بێت و تەفویز (تەعلیق) هەڵناگرێت.

ب- لـە قـسەو بۆچـوونی نـوێ و (جەدیـد)یـدا وەکـو حەنەفیـەکان بیردەکاتـەوە، واتـە:

(تـەفویـض) بـە (تـەمیلك) دادەنێت، کـەوابوو دەبـێ دەسـت بـەجێ خـۆی تـەڵاق بـدات، ئەگینـە پیاوەکە دەتوانێ پەشیمان ببێتەوە. جا ئەگەر بە پێی مەرجەکان خۆی تەڵاقدا، یەك تـەڵاقی بـە ڕەجعیـی دەکـەوێت، بەمـەرجێ بەرلـەوە سـەرجێیی لـە گـەڵکردبێ و ئەوتەڵاقـەش یەکـەم تەڵاقی بێت.

سێیەم – حەنبەلی:

حەنبەلیەکانیش دووڕایان هەیە وەکو شافیعیەکان لەگەڵ هێندێ شیکردنەوەدا.

چوارەم – جەعفەریی: جەعفەری یەکانیش سێ ڕایان هەیە:

أ– تەڵاق هەر بەدەستی پیاوە، بە بەڵگەی ئەوە کە پێغەمبەر(صـلى الله عليـه وآلـه وسـلم) دەفەرمووێ: ((الطلاق بید من أخذ بالساق)).

ب– پیاو دەتوانێ ژنەکەی بکاتە (وەکیل)ی خۆی بۆ تەڵاقدانی خۆی.

ج– ڕێ بە (تەفویض) دەدەن.

پێنجەم: ظاهریی:

تەفویض بەلایانەوە نادروستو ناڕەوایە.

یاسای باری کەسێتی عێراقیش دەڵێت: (الطلاق رفع قید الـزواج بإیقـاع مـن الـزوج أو مـن الزوجة إن وکلت بـه او فوضـت او مـن القاضـي. ولا یقـع الطـلاق إلا بالـصیغة المخـصوصة لـه شرعاً). واتە: تەڵاق بریتییە لە لابردنی پەیوەنـدی ژنو مێردیـی، لەلایـەن مێردەکـەوە، یـان لـە لایەن ژنەکەوە، بەو جۆرە کە ژنەکە کرابێ بە (وەکیل) لەلایـەن مێـردەوە، یـان تـەڵاق درابێتـە دەستی، یان قاضی بیدات.

## صیغەو شێوەی داڕشتنی ( تەڵاق ) سێ جۆرە

یەکەم – تەڵاقی (تەنجیز)ە، واتە: گوتنی، یان هێنانی دەستەواژەیەك لەلایەن مێردەوە بـۆ جودابوونەوەو تەڵاق، وەکو گوتنی: (أنت طـالق = واتـە: تـۆ تـەڵاقت بکـەوێت))..بـەڵێ تـەڵاقی ئاوا، دەستبەجێ دەکەوێ، بەمەرجێ لقەکانی تری تەڵاق بێتـە دی. چونکە تـەڵاق بـۆ کۆتـایی هێنانە بە کێشەیەك لە نێو ژنومێرددا سەر هەڵدەدات، کـەوابوو (تـەنجیز) بناغـەو بنەمایـە لـە کـەوتنی تەڵاقـدا. هـەر لـەم ڕووەوەیـە کـە هێنـدێك لـە زاناکـان دەڵـێن: بـەدەر لـە تـەڵاقی (تەنجیز)،هیچ تەڵاقێکی تر ناکەوێت.

دووەم – تـەڵاقی (تـەعلیق)ـە هەڵپەسـێراو. ئەمـەیش بـەوە دەبـێ کـە مانـای (أنـت طـالق) ببەسرێ بەشتێکی ترەوە، بۆ نموونە: بڵێ: (إذا جاء رأس الشهر فأنت طـالق) واتـە: هـەرکات

سەرى مانگ هات تۆ تەلاَقت بكەويَت.

سێيەم – هەڵپەسێراو بە سوێند (التعليق الحلفى):

مەبەست بەم سێيەمەش ئەوەيە كە تەلاَقخۆر هانى خۆى، يان ژنەكەى، وەيان هەر كەسێكى تر دەدات بۆ كردنى كارێك، يان بۆ نەكردنى، واتە: بەدەر لەوە هيچ مانا و مەبەستێكى تر لە دڵيا نييە، بۆ نموونە دەڵێ: (بالطلاق لأفعلن كذا). يان (يلزمني الطلاق إن لم أفعل كذا) يان بە هەربێژەو شێوازێك لەناو كۆمەڵگەدا باوە.

جا بۆ دەركەوتنى ئاسەوارى شەرعيى لە (تەعليق)ى رووتدا (التعليق المحض) چەند راوبۆچوونێك هەيە:

راى يەكەم – دەڵێ: تەلاَقى (منجّز) نەبێ، هيچ تەلاَقێكى دى ناكەوێت، وە ئەم راو بۆچوونەش هى ئەم بەڕێزانەيە: جەعفەريى، ظاهيريى، (ئەبوو عبد الرحمن)ى شافيعى، هەروەهابڕێك لە حەنبەلييەكان، وە (ئەشهەب)ى ماليكى، تەنانەتى دەڵێن ئەمە راوبۆچوونى (عەلى كوڕى ئەبى تاليب)يشە، وە قاضى (شريح، عيكرەمە، عەتا، ئەبوو ثور)يش ئەو قسەيانە پەسەند كردووەو كاريان پێكردووە.

لە كتێبى (الخلاف في الفقه للطوسى) هاتووە: (لا يقع الطلاق إن علقه بشرط من الشروط أو بصفة من الصفات المستقبلة فإنه لا يقع أصلا لا في الحال ولا في المستقبل حين حصول الشروط والصفة).واتە: كەوتنى هەر تەلاَقێك ببەسترێ بەمەرجێكەوە، يان بەسيفەتێكەوە، تەلاَقى وا هەرگيز ناكەوێ. بۆ ئەمەيش (٥) بەڵگەى هێناوەتەوە (ئێمە لەبەر درێژبوونەوەى باسەكە نەمان نووسين).

لە كتێبى (المحلى لابن حزم الظاهري: ٢١٣/١٠) بۆپەشتگيرى ئەوە كە دەڵێن: تەلاَق تەنها بە (صيغە)ى (منجّز) دەكەوێت – هاتووەو دەڵێ: (لا يقع الطلاق إلا منجّزا فمن علق طلاقه على شرط أو إضافة إلى زمن فهو باطل..) بۆ ئەمەيش چەند بەڵگەيەكيان هەيەو لە رێ وشوێنى خۆياندا باسيان كردوون.

(إبن القيم) لە (إعلام الموقعين – ١٠١/٤)دا دەڵێ: (قال بعدم وقوع الطلاق المعلق مطلقا). وە (أبو عبدالرحمن أحمد بن عبد العزيز) وهو من أجل أصحاب الشافعي) واتە: (ئەبوو عبدالرحمن)يش كە پياوێكى بەڕێزى بەرزى شافيعيەكانە دەڵێ: هەرگيز تەلاَقى (تەعليق) ناكەوێت !.

(ئەشهەب) كە زاناترينى مەزەبى ئيمامى ماليكە (قال على الإطلاق بعدم وقوع الطلاق المعلق) دەڵێ ئەگەر ژنەكەلە بەرئەوە (معلق عليه)كە بكات تەلاَقەكە بكەوێت، هەرگيز ئەو تەلاَقى (تەعليق)ە ناكەوێت.

(حەنبەلی)یـەکان: ئـەو قسـەی (ابـن تیمیـه)و(ابن القیم)ـەیان هەڵبـژاردووەو پەسـەندیانە کـە دەڵێ: (لا يقع الطلاق المعلق إن قصد به الحمل على فعل شيء أو تركه.. (مجموعة فتاوي ابن تيمية٢٢٣/٣٣). واتە: ئەگەر مەبەست لە تەڵاقی (معلق) هانـدان بێت بـۆ کردنـی شتێك، یـان بـۆ نەکردنی، ناکەوێت. ئەمانیش بەڵگەی بەهێزیان هەیەو لە شـوێنی خـۆیدا باسـکراوە. سـەرەڕای ئەوانەش دەڵێن تەنها (تەڵاقی منجّز) پەسـەندە لای قورئـان، چونکە دەفـەرموێ: ﴿يأيُها النبي إذا طلقتم النساء فطلقوهن لعدتهن...﴾ واتـە: ئـەی پێغەمبـەر! هـەرکات دەتانـەوێ ژنـان تـەڵاق بدەن، لەکات وساتی عیددەیاندا تەڵاقیان بـەدەن، بـۆ ئـەوە ئەونـد ماتـڵ نـەبن، لـە مێـرد کردنـەوە ئەگەر بیانەوێ مێرد بکەنەوە، بێ گومـان کـاتێ ئـەم داوایـه جێبـەجێ دەبـێ و، کـاتێ ماتـڵ نـابن کـە تـەڵاق (منجـز) ێ، ئەگینـە ئـەو داوایـە نەهاتۆتـە جـێ، بۆیـە تـەڵاقی (معلـق) بـە ناپەسـەند دادەنێن و ڕەتـی دەکەنـەوەو هـیچ (ئاسـەوار)ێکـی لـێ پەیـدا نابێـت، لـەم مەسەلەیەشـدا (عـەلی کوڕی ئەبوو تالیب)و قاضی(شریح)و طاووس و ئەبوو ثور) یەك ڕەنگن.

دووەم – دەڵــێ: (تــەعلیق) هــیچ شــتێکی لێناوەشــێتەوە، بۆیــە دەســت بــەجێ تەڵاقەکــە دەکەوێ، ئەمە ڕیوایەتێکی (ئیمام مالیك)و راوبۆچوونی کۆمەڵێکیشە لـە (تـابعین)و مـەزەبی (الإباضية)کان، چونکە بەلای ئەوانەوە ئەگەر نەکەوێ دەبێ نیکاحی کـاتیش ڕەوابێـت، خـۆ ئەمـەش ناڕەوایـە. لـە جێگـەی خۆیـدا هەریـەك لـەم راوبۆچـوونانە زیـادە شـیکردنەوەیەکی تێدایە، لەبەر درێژنەبوونەوەی باسەکە بۆمان نەکرا بینووسین.

سێیەم – کەمەزەبی (حەنـەفیی)و(شـافیعی)و جـەماوەری حەنبـەلیو (زەیـد)یەکانـە دەڵـێ: مێرد ئازادیی تەواوی هەیە لە هەڵبژاردنی بێژەی تەڵاقی (تەنجیز) یان (تەعلیق)دا، کە وابـوو تەڵاقی (معلّق) بـە هاتنـە دی (معلـق علیـه) کـە دەکـەوێ. هەریەکەشـیان لـە کتێبـە فیقهیەکانـدا بەڵگەیان هێناوە.

دکتـۆر (زەڵمـی) دەڵێـت: سـەرەڕای ئـەو هـەموو راوبۆچوونو بەڵگانـەو لێکۆڵینـەوە لێیـان، گومـانی بـەهێز لەوەدایـە کـە هـیچ (فەقیـە)ێك بەڵگەیـەکی (قطعیـي) بـۆ دروسـتی (تـەعلیق)و نادروستی نییە.

## الحلف بالطلاق/ سوێند بەتەڵاق

کابرایەك بڵێ: (بالطلاق أفعل كذا) یان (.. لا أفعل كذا) واتە:بە تەڵاقم ئەوکارە دەکـەم، یـان نایکەم، لەکەوتنو نەکەوتنی تەڵاقی ئاوادا، لەناو (سەلەف)و (خەلف)دا – وەکو لە (مجموعـة فتاوي ابن تيمية/٢١٥/٣٣)هاتووە، (٣) ڕا هەیە:

یەکـەم – (حەنـەفیی و مـالیکی و شـافعی و هێنـدێ حەنبـەلی و زەیـدی یـەکان دەڵـێن: هـەر کات کارە(محلوف علیە) یەکەی کرد، یـان نـەیکرد، تەڵاقەکـەش دەکـەوێ.. بـەڵام زاناکـانی تـر چوون بە گژیاندا، چونکە:

– نەسوێند هەیەو نە ئیجماع بۆ چەسپاندنی ئەو داوایە.

– سوێند بەغەیری (زات)و (صیفات)ی خودا دانامەزرێت.

دووەم – نەتەڵاقی پێدەکەوێ‌و، نەکەفارەتیشی هەیە.

ئەم راوبۆچوونەش دراوەتە پاڵ (عەلی کوڕی ئەبوو تالیب)، وە قاضـی (شـریح و طـاووس و عیکرەمـە)ش پەسـەندیان کـردووە، هـەروەك بۆتـە مـەزەبی (جەعفـەریی)و (ظـاهیري)و (ئیباضیە)ش. شیاوی ئاماژەیە هەر کەس لە جێگەی خۆیدا بەڵگەی خۆی هێناوە.

**لە کۆتایی ئەم باسەدا پێویستە جیاکردنەوەیەك هەبێ:**

١– ئەگەر (صیغە)کە، صیغەی سوێند بوو، وەکوبڵێ: (بالطلاق أفعل كذا أو لا أفعله) دەبێ بڕیار بدرێت کە هیچ تەڵاقێکی پێناکەوێت، بەڵام کەفارەتی سوێندێکی دەکەوێتە سەر.

٢– ئەگـەر بـە صـیغەی (تـەعلیق) بوو،وەکـو ئـەوە بڵـێ: (إن ارتكبـت جريمـة الزنـا... فأنـت طالق) ئەوە هەرکات (معلّق علیه) هاتەدی، تەڵاقەکەش دەکەوێ، ئەگەر مەبەست لـەو ڕستەیە تـەنها هانـدانی ژنەکـە بـووبێ بـۆ دوورکەوتنـەوەی لـە کـاری تـاوان، ئـەوە تـەڵاقی پێناکـەوێت، ئەمەش هەڵبژاردەی (ئیبن تەیمیە)یە.

**تێبینی:**

یاسای عیراقیش لەم مەسەلەیەدا رای جەعفەری‌وظاهرییـەکانی وەرگرتـووە، بۆیـە دەڵێت: ((لا يقع الطلاق غير المنجّز أو المشروط أو المستعمل بصيغة اليمين))(م٣٦).

* شـێخی (ئەزهـەر – محمـود شـلتوت) خـوا لێیخـۆش بـبێ لـە کتـێبی (الإسـلام شـريعة وعقيـدة) دەڵێـت: (واذن فـالطلاق الـثلاث في كلمـة واحـدة، لا يقـع إلا ((واحـدة)) وكمـا رسـم الإسلام في الطلاق التفريق على هذا الوجه، وجعل الجمع لغوا، لا يقع به شيء، كذلك رسم فيه ان يكون منجّزاً أي موقعاً بالفعل، ليس معلقا علـى شـيء بفعل منـه أو منهـا، كـأن يقـول: ((إن فعلت كذا فأنت طالق)). وكذلك رسم فيـه ألا يتخـذه يمينـاً علـى شـيء يفعلـه أو لا يفعلـه، كـأن يقـول علـى الطـلاق أن هـذه السلعة بكـذا، أو امرأتـي طـالق، اذا لم تكـن السلعة مـن نـوع كـذا، وهكذا من الأيمان التي تجري بين الناس وهم في أسواقهم ومجتمعاتم، دون أن يكون لزوجـاتهم شأن بها، وكذلك رسم أن يكـون الطـلاق في طهـر لم يمسها فيـه، فـإذا طلقهـا في طهـر مـسها فيـه فإنه يكون لغوا ولا تأثير له على الحياة الزوجية، وكذلك إذا طلقها في غير طهر)).

ئەوە ڕاوبۆچوونی ئەو بەڕێزەش بوو لەو مەسەلەیەدا، بەندەش بێ دەسکاری و وەرگێڕان دامناو وازم لێهێنا، دیارە راوبۆچوونی ئەمیش وەك راوبۆچوونی زاناگەلێکی پێشخۆیە، هیوادارم بەڕێزەوە سەیری تەواوی ڕاوبۆچوونەکان بکرێت، چونکە مەسەلە گەلێکی (ئیجتیهاد)ین و موسڵمانان بە پێی کات و شوێن و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەتوانن سوودیان لێوەرگرن، شیاوی ئاماژە بۆ کردنیشە (بەندە)ش بە نیازی ئەوەوە ئەو ڕایانەم هێنا کە بواری خستنی تەڵاق و (تەفریق) و جیاکردنەوەی خێزان، تەسك بکرێتەوە و لەهەریەك لەو راوبۆچوونانە بۆ پیاوی خۆی و بۆ ڕێ و شوێنی خۆی،کەڵك وەربگیردرێ.وەکەسیش تاوانبار نەکرێ بە گومڕاو سەرلێشێواو، چونکە هیچ زانایەك ناتوانێ مل ڕانەکێشێ بۆ دەقێك لە ئایەت و فەرموودەکان ئەگەر ببێ وقەطعیی بێت، بۆیە ڕاوبۆچوونەکانیشیان لێك جیاوازن.

## تەڵاق بەدەست کێ بێت باشە..؟

مەسەلەی تەڵاق – کە دراوەتە دەست پیاو – لای ئەوانە کە فرمیسکی تیمساحیی دەڕێژن بۆ ژنان، بۆتە کێشەیەك و بەستەم و ناهەقیی دەدەنە قەڵەم، چونکە دەڵێن هەقە بدرایەتە دەست ژنان بە تەنها، یان دەستی ژن و پیاو، وە هەردوولا بڕیاریان تێیدا هەبا... جابۆ وەڵامی ئەو بۆرە گلەیییە دەڵێین:

أ- مارە کردن و تەڵاق لە کۆمەڵگای پێشووشدا لەسەر باوونەریتی (فیطرەت) ئەنجامدراوە، واتە: هەر نێرینە چووە مێینەی خواستووە، هەرگیز ژن نەچووە پیاو بخوازێ، جا ئیسلامیش بەپێی ئەمە بنەمای تەڵاق و جیابوونەوەی داناوە و مافی تەڵاق و جیابووەنەوەی داوەتە دەست پیاوان.

ب- زەواج – بەپێی باوو نەریت – جۆرە ئاڵو وێڵێکی ماڵ و دارایی تێدایەو دراوە بەسەر شانی (زەوج)دا، بەدەر لە نەفەقەی ژن و منداڵەکان کە پەیدای دەکات. ئەگەر باوونەریت ئاوا بێ و ئەو هەموو خەرج و باجە بە مێردەکە بکرێ...، کەی ڕەوای هەقە بۆکاتی دەست لێهەڵگرتنی هیچ حیسابێك بۆ پیاوە نەکرێ و هەمووشتێك تەسلیم بە ژنەکە بکرێت کە دینارێکی خەرج نەکردووە لەو (زەواج)ـەدا ؟ جگە لەوەیش ئەو سەرفی ماڵ و دارایییە لەو ڕێگەدا، وا دەکات کە پیاوەکە صەبرو ئارامی زیاتر بێت بۆ قبوڵکردنی هەڵچوونەکانی ژنان و بەئاسانی خێزانەکە هەڵنەوەشێنێتەوە، بە پێچەوانەوە ئەگەر لەو حاڵەتەدا بدرێتە دەست ژنان.

ج- لای هەموان ئاشکرایە کە ژنان – بە پێی سروشتیان – زووتر لە پیاوان لەبەردەم ڕووداوەکاندا هەڵدەچن و تێکدەچن، دیارە ئەگەر تەڵاق بدرێتە دەست کەسێك ئەوە خووی

بێت، بێگومان زۆر زوو بڕیاری جیابوونەوە دەداو ماڵو حاڵ وێران دەکات، ئەمەش لەگەڵێ لە ئوممەتانی بەر لەئیسلامدا تاقیکراوەتەوە، بەڵام ئەنجامەکەی جەحەننەمو واوەیلابووە.

**١- با تەنها بەدەست پیاوان بێت:**

ئەم بارەشیان هەر ناکرێت، چونکە گەلێ جار حاڵەتو قۆناغی تاڵو تفتو نالەباری وا بەسەر ژیانی ژنومێردیدا دێت، ئەگەر هەروا بمێنێتەوە زیان بە ژیانی ژنەکە دەگەیەنێتو بەرژەوەندییەکانی دەسووتێن... بۆ نموونە: پیاوەکە ملدەنێ بەشاراندناو ئاوڕێك بەلای ژنەکەدا ناداتەوە، یان وەکو خەڵکانی هاوشان نەفەقەی ناداتێ،یان پیاوەکە حاڵەتێك تووش بووە، گوزەرانکردن لە گەڵیا مەرگەساتە... تاد. جا ئەگەر تەنهاوتەنها هەق بەلای پیاوەوە بێت بۆ تەڵاق دان، ئەوا ئافرەتەکە لەدەیان حاڵەتدا دەبێتە قوربانی داخوازیو تۆڵەی پیاوانو ڕزگاری نابێت.

بۆیە نابێت تەڵاق تەنها بەدەستی پیاویش بێت، بۆیە ئەگەر کەمترین هۆکار بۆ تاڵکردنی ژیانی ژنەکە لە پیاوەکەوە سەریهەڵدا، لەئیسلامدا ژنەکە ڕێنمایی کراوە بچێت بۆ دادگاو سکاڵانامە بنووسێت بۆ جیابوونەوەو تەڵاق، ئەوکات دادوەریش پاش تەماشای سکاڵانامەکەو لێکۆڵینەوەو تاوانباربوونی مێرد، (تەفریق)یان دەکات، پیاوەکە ڕازی بێت، یان نا!.

**٢ - بەدەستی ژنو پیاو بێت:**

بەڵێ لە ئیسلامدا ددان بە تەڵاقێکدا دەنرێت بە ڕێکەوتنی هەردوولایان بێت، ژنو پیاوەکە پێکبێنو بڕیاری جیابوونەوە بدەن، وەکو لە شێوەی (خولع)دا... بەڵێ لە شێوازی خولعدا - پاش ئەوە کە ژنەکە ناتوانێ بەهەر هۆکارێکەوە بێت لەگەڵ پیاوەکە بژی - جا لەبەرامبەر بژاردنی زیانەکانی پیاوەوە کە لە پێناو بەیەکگەیشتنی ئەودا تووشی دەبێت، (عیوەز)ێك بە پیاوەکە دەداتو جیادەبنەوە.

**٣ - لەدادگادا تەڵاق بدرێت:**

ئەم حاڵەتی چوارەمە لای (مووسایی)و (عیسایی) پەیڕەوە.. لای ئەوان ژنو پیاو تا نەچنە بەردەم دادگای تایبەت بەباری کەسێتی ژن و پیاوەوە، تەڵاق ناکەوێت ! بەڵام ئیسلام لەبەرچەند هۆکارێکی خراپو ناشیرین کەلە بەردەم دادگادا ئاشکرا دەبن و دەدرکێنرێن، ڕێگە بەوە نادات کە تەنهاو تەنها تەڵاق دەبێ لەبەردەم دادگادا بێت، لەوانە: حاڵەتێکی دزێوو قابیلی نەدرکاندن لەبەردەم دادگادا، یان لای (پارێزەر)، ئەگەر بخرێتە روو لەوانەیە ژنو پیاوەکە، یان یەکێکیان یان کەسو کاریان تووشی نەنگولەنگی کۆمەڵگە ببن، بەتایبەتی ئەگەر مەسەلەی ئەخلاقی بێت... سەرەڕای ئەمەیش، دەکرێ ناکۆکی ژنو پیاو

هەندىٚ حاڵەتى وابێت، نەتوانن بەبەڵگە بيسەلمێنن، بەڵكو دەبىٚ لەدەرەوەى دادگا ڕێيـان پـىٚ بدرێت چۆن جيادەبنەوە..؟.

**٤ – بدرێتە دەستى پياوو فورسەتيش بەژنەكە بدرىٚ لەكاتى پێويستيدا :**

لەئيسلامدا ئـەم خـاڵى چـوارەمە هەڵبـژێردراوەو تـەڵاق دراوەتـە دەسـتى پيـاوو، لەهـەموو حاڵـەتێكى نارەحـەتو تـاڵى ژيـانى ژنەكەشـدا فورسـەتى بـۆ دانـراوە خـۆى ڕزگـار بكـات لاى دادگـا، چـونكە وەك لـە پێـشەوە گوتمـان مـادەم نەفەقـەو مـارەيىو هـەموو پێويـستييەكانى (زەواج) خراوەتە ئەستۆى پياوەكە، هـەر ئـەويش دەتـوانىٚ بەرامبـەر بـە پاراسـتنى ئـەو ماڵو دارايى خۆيـەوە پەيوەنـدى ژنو مێـردى بپـارێزىٚ و، لەبـەر كـەمتر هۆكـار بڕيـارى جيابوونـەوە نەدات، خۆ ئەگەر تواناى نەبوو وگەيشتە بڕيارى (تەفريق)، هەقە پياوەكە، ئەو بڕيـارە بـدات، لە پێشەوە باسمان كرد كە هەر شتێك – لەلايەن پياوەكەوە – كەرامەتى ژنەكە بريندار بكات، يـان زيـان بەجەسـتەو دروسـتيى، يـان نەفـسيىو دەروونـى بگەيـەنێت، هەقيـەتى داوا بـەرز بكاتەوە بۆ تەفريق، سـەرەڕاى ئـەو هـەموو بەڵگانـەش، كـاتىٚ ئـەوروپا تـەڵاقى خـستە دەسـتى ژنو پيـاو وەكـو يـەك، دەرەنجـام ئـاژاوەو كێـشەيەكى زۆرى لێكەوتـەوەو ژمـارەى تـەڵاقو جيابوونەوە چووە لووتكە.

## باوونەريتى چاخە كۆنەكانى پێش ئيسلام سەبارەت بەتەڵاق

يەكخستنى ژنو پيـاو وتەمـەنێك پێكـەوە ژيانيـان، بێگومـان ياسـاو ڕێـسايەكى گرنگـى دەوىٚ، بۆيە بەر لە مارەكردن، كۆمەڵىٚ هۆكارى قەشەنگ و پەسەند دادەنرىٚ بۆ كچو كوڕ، بـۆ ژنوپيـاو، ئەگـەر بيانـەوىٚ پێكـەوە – وەكـو ژنو مێـرد – بـژين، بەتايبـەتى لـە ئيـسلامدا، بێگومـان لـەناو گـەلانى بـەر لـە ئيسلاميـشدا، هـەر يەكە ياسـاو ڕێسايەكى خـۆى هـەبووە، بـۆ سەرەتاى نيكاح ودەست پێكردن، وە بۆ كاتێكيش بيانەوىٚ لێك جياببنەوە، بۆ نموونە:

يەكەم – وادى الرافدين – دۆڵى رافيدەين:

هەر لەسەردەمى (سۆمەر)يەكانـەوە – كـە (٤٠٠٠) هـەزار سـاڵ پ.ز لـە باشـوورى عێراقدا نيشتەجێبوون – تەڵاق هەبووەو بەپێى ئەو سەردەمە كارى پێكراوە.

تـەڵاق لاى ئـەوانيش سـنوورێكى هـەبووە، واتـە: هـەموو شـتێك بەدەسـت ژنو پيـاوەوە نـەبووە تـا هـەركات ويـستبێتيان كۆشـكى خێـزان بڕووخێنن، ئـەوەش بـۆ ئـەوە تـا بەشـكو دەرگاى تەڵاق تەسك بكرێتەوەو ئەوەند جيابوونـەوە پەيـدا نـەبێت، هێنـدىٚ جاريش – لەبـەر ئـەوەبوو – بـىٚ بـەزەيىو بـىٚ ڕەحمـى بەرامبـەر بـەژن كـراوە ! بـۆ نموونـە: لـە مـاددەى (١٤٢، ١٤٣)ى ياسـاى (حـامورابى)دا هـاتووە: ((إذا كرهـت الزوجـة زوجهـا وقالـت لـه: أنـت لـست

زوجـي)) علـيهم أن يلقوهـا في النهـر) واتـه: هـەرکات ژنێـك، مێردەکـەی خـۆش نەویـست و پێیگووت: ((تۆ مێردی من نیت)) دەبێ ئەو ژنە فڕێ بدەنە ڕووبارەوە! بەلام دەبێ:

أ- ئەو بڕیارە دادگا بیدات.

ب- ژنەکە کارێکی وایکرد بێت، شەرەفشکێنی مێردەکەی بێت.

لـە مـاددە (٦)ی تەختـەی حـەوتی زنجیرەی (انـا ایتـشو) پێشوو هـاتووە: ((إذا قـال الـزوج لزوجته: (أنت لست زوجتي)) هەرکات مێرد بەژنەکەی گوت: ((تـۆ ژنـی مـن نیـت)) ((فعليـه أن يدفع نصف المنا)) پێویستە لەبەرامبەر ئەو قسەوە نزیکەی (٥٠٥) گرام زیوی بداتێ.

(ول دیوارنـت) دەڵـێ: سومەریەکان لـە ژنانیـان دەویـست منداڵو نـەوەی زۆر بخەنـەوە بـۆ پیاوانو دەوڵەت! خۆ ئەگەر نەزۆك بووبا، مێرد دەیتوانی تەلاقی بدات، ئنجا ئەگەر ژن حەزی نەکردبا ببێتە دایكو ئەرکەکانی دایك جێبەجێ بکات، لە ئاوا نقوومیان دەکردو دەیانکوشت !. وە هـەروەها نـاوبراو دەڵـێ: نـەزۆکی ژنو داوێـن تـەڕیو ڕێـك نەکـەوتنی لەگـەڵ مێـردو، بەدڕەوشتیو شپرزەیی لە کاروباری ماڵدا... هەریەك لەمانە لای یاسا، ڕێ بەتەلاق دەدەن.

دووەم – لە یاسای (ئورغو – کە ساڵی ٢١٠٣ – ٢١١١ پ.ز ژیاوە – تـەلاق ڕەهـا نـەبووە، واتە: بەئارەزووی ژنو پیاونەبووە چۆنیان ویستبێت وابووبێ، بەلام ئـەو شتانە کە دەبوونـە مایەو هۆکاری تەلاق ڕۆشن نین چین.. خۆ لەگەڵ ئەوەشدا ددان بەوەدا دەنێ، کە ئەگـەر ژنێك بێ هۆو تاوان تەلاق درا، دەبێ دەسـەبەری ئەندازەیە ماددەی بۆ بکرێت، شیاوی ئامـاژە بـۆ کردنـە لەوئەنـدازە ماددەیـەدا کـە لەبەرامبـەر تەلاقەکـەوە دەدرێ،جیـاوازی لـە نێـوان کـچو بێوەژنداهەیە، واتە: ئەو ژنەی یەکەمجارە تەلاق بدرێت، (٥٠٥)گرام زیوی دەدرێتێ، ئەوەیش دووەم جاریەتی تەلاق بدرێت، نیوەی ئەوی دەدرێتێ.

**ڕوونکردنەوەیەك:**

لە یاسای کۆنی ژنو مێردی عێراقیدا، ئەم چەند خاڵەی خوارەوە ڕەچاو دەکران:

یەکەم – دەبێ باوكو دایکی ژنەکە بە شووکردنەکە ڕازیبن.

دووەم – زاوا ئەهلیەتی ژنو مێردی هەبێ.

سێیەم- (زەواج)ـە کە بەم شێوەی لای خوارەوە تۆمار بکرێت:

أ- ناوی هەردوو ژنو مێردەکە لە گرێبەستەکەدا تومار بکرێت.

ب- مارەییەك دیاری بکرێ بۆ ژنەکە.

ج- ناوی شایەتەکانو مێژووی (عەقد)ـەکەی تێدا بنووسرێت.

د- مێرد سوێند بخوات کە (إلتزام) بەیاساو ئوصولی ژنو مێردییەوە بکات.

هـ- هەرکامێکیان حاشاو نکوولّی لە ژن و مێردی بکات، سزاو تۆڵە بدرێت.

سەرەڕای ئەمانەش لە یاسای (اشنونا)ی ژن و مێردیدا هاتووە: کە ئەگەر پیاوێك بیّ پرس و را بە باوك و دایکی ژن، چوو مارەیکردو هیچ مۆرو ئیمزایەکی ئەوان لەسەر (عەقد)ەکە نەبوو، ئەو (زەواج)ە بە کارێکی ناشەرعیی ونا پەسەند دەدرێتە قەڵەم.

سێیەم – لەیاسای (لیپیت عشتار – کە پێنجەمین پاشای زنجیرەی پاشاکانی (ایسن)ەو ساڵی ١٧٩٤ ــ ٢٠١٧ پ.ز ژیاون – زەواج ڕەهاو (مطلق) نییە، بەڵکو سنورو میزانێکی هەیە، وە لەو یاسایەدا (خەیانەت)ی مێرد واتە: دەست تێکەڵکردنی لە گەڵ ژنانی تردا، دەبێتە هۆکارێك ژنەکە بچیّ داوای تەلاق بکات لای دادگا.

بەڵام (سك و زا نەکردن) ناکاتە هۆکاری تەلاّق وجیابوونەوەی پیاو لەژن، هەروەك ڕێگەش بە پیاو نادات تا ئەو ژنە لە ژیاندا بێت، بچێت ژنێکی دووەم مارە بکات. هەر وەك ڕێگەش بە مێرد نادات، بەهۆی تووشبوونی ژنەکەیەوە بەهەر نەخۆشییەکی سەرجێیی و درێژ خایەنەوە جیابێتەوە لێی... شیاوی ئاماژە بۆ کردنە لە یاسای عێراقیی کۆندا ڕێگە بە فرەژنی نادریّ، مەگەر مێرد بیانوویەکی شەرعیی و پەسەند هەبیّ.

چوارەم – یاسای حامورابی:

(حامورابی) پاشای شەشەمی زنجیرەی یەکەمی پاشاکانی (بابل، ١٥٩٤ – ١٨٩٤ پ.ز وە لە ١٧٥٩ – ١٧٩٢ حوکمی کردووە. یاساکەی بە زمانی (بابل)ی تۆمارەو، لە شاری (سوسە)ی پایتەختی (عیلام = خوزستان)، ساڵی ١٩٠١ – ١٩٠٢ لەلایەن (فەرەنسی)یەکانەوە دۆزراوەتەوە.

لەوە دەچێت ئەویاسایە دەسکارییەك بێت بۆ یاسا پێشووە عیراقییە کۆنەکان، هەندێکی لیّ زیادکراوەو، هێندێکی لیّ لا براوە، لە (٢٨٢) ماددە پێکهاتووە لەناو خۆیدا کراون بە (١٣)بەش، هەر بەشەی بۆ ڕێکخستنی مەسەلەیەکە، لەمەسەلەکانی ژیانی ئینسان، سەبارەت بەکاروباری خێزان، بەشی (٨)یان تەرخان کردووە کە دەکاتە ماددەی (١٢٧ – ١٩٤)، ئەم ماددانە ئەحکامی (زەواج) و تەلاّق و میرات و (تبنی)و پەروەردەیان لەخۆ گرتووە.

## هەندیّ جیاوازی یاسای ( حامورابی ) لەگەڵ یاساکانی تردا

یەکەم – تەلاّقی بیّ هۆکار: واتە: کەسێك بەبیّ گوناح، هەڵسیّ ژنەکەی تەلاّق بدات،جا هەرکەسێك کاری وابکات، لە تۆڵەیدا هەموو ئیمکانیات و پارەو پوولێکی لیّ دەسەنریّ بۆژنەکە.

دووەم – تەڵاقێك ژنەکە هۆکاری بێت: واتە: هەر کات لە لایەن ژنەکەوە کارێکی وا کەوتەوە کە مایەی نەنگ‌و لەنگ بوو بۆ پیاوەکە، پیاوەکە لە بەرامبەر ئەوەوە دەتوانێ تەڵاقی بداو لە هەموو مافەکانیشی بێ بەشی بکات، یان وەکو کەنیزە لەماڵ بیهێڵێتەوەو ژن بێنێ بەسەریا.

سێیەم – تەڵاق بەهۆی سك و زا نەکردنەوە: واتە:ئەگەر ژن بە نەزۆك دەرچوو، مێرد بۆی هەیە تەڵاقی بدات، بەڵام لەگەڵ ڕەچاوکردنی مارەیی بۆی‌و، هەر شتێکیش لە ماڵی بابیالە گەڵ خۆی هێنابێتی بیداتەوە. خۆ ئەگەر مارەیی نەبوو، پێویستە ئەندازەیەکی شیاو بە دابینکردنی پێویستیەکانی ئەو ژنە بیداتێ. هێندێ دەڵێن: دەبێ (٥٠٥) گرام زیوی بداتێ، خۆ ئەگەر مسکێن بوو دەبێ ٣\١ی ئەوەی بداتێ.

چوارەم – تەڵاق پێشگواستنەوە: بەپێی یاسای (حامورابی)، مێرد دەتوانێ – پێشگواستنەوەی ژن – تەڵاقی ژنەکەی بدات، ئەگەرچی هیچ پاساوێکیش بۆ ئەو تەڵاقدانە نەبێت... بەڵام پاشگواستنەوە، بە بێ پاساوی شەرعیی پەسەند، ناتوانێ تەڵاقی بدات.

ماددەی (١٣٣ – ١٣٦)ی یاسای (حامورابی) چارەسەری ئەوە دەکات کە ئەگەر مێرد بێ سەروشوێن و(مفقود) بوو، یان ماوەیەکی زۆر (غائب) بوو لە ژنەکەی، لەگەڵ دیاریکردنی ئەو حاڵەت‌و بارودۆخە کە ژن بتوانێ (فەسخ)ی (زەواج) بکاتەوەو مێردێکی تر بکات. هەروەك یاسای (نەفەقە) بۆ ژنان‌و، یاسای (تەحکیم) بۆ کۆتایی هێنان بە کێشەی ژن‌و پیاوو، یاسای (تەفریق) بەهۆی نەخۆشییەوە، یان (زەواج)ی دووەم، یان (تەفریق) بە هۆی (مصاهرە)وەی تۆمار کردووە، بۆ نموونە: دەڵێ ئەگەر باوك لەگەڵ ژنی کوڕیدا جووتبوو – پێشگواستنەوە – بەهەتا هەتایی ڕێ لەپەیوەندی جینسیی ئەو ژن و کوڕە دەبەسترێ، بەڵام پێویستە باوکەکە ئەندازەیەك ماڵی بەرچاو بدات بەژنەکە.خۆ ئەگەر پاشگواستنەوە باوك لەگەڵ بووکیدا سەرجێییکرد، بڕیاری کوشتنی دەدرێ‌و تووڕ هەڵدەدرێ بۆ ناو دەریا با بمرێت!.

پێنجەم – لەسەردەمی مەلیك (اشمی– دکان) ١٩٥٣ – ١٩٣٥ پ.ز کە یەکێکە لە زنجیرەی پاشاکانی (ایسن – ٢٠١٧ – ١٧٩٤پ.ن) مافیان بە ژن دا کە هەرکات مێردی کرد و مێردەکەی لە گەڵ ئەم و ئەودادەستی تێکەڵ بکات، داوا بەرزبکاتەوە بۆ دادگا بۆ جیابوونەوە... هەر بۆیە ژنەکەی (اشتار – أومی) داواو سکاڵانامەی بەرزکردەوە کە: مێردەکەی لەگەڵ هاوڕەگەزی خۆیدا مومارەسەی جنسی دەکات (عملية اللواطة)! جا پاش ئەوە کە توانی لای دادوەر داواکەی بچەسپێنێ‌و بەچاوی خۆی دیتی لەگەڵ پیاوێکدا خەریکە! دادوەرەکانی ئەو ڕۆژە سەری دەتاشن و لووتی کوندەکەن و لەسەر ڕێگایەك دایدەنێن بۆ سوکایەتی‌و ئابڕووبردنی‌و ڕێیش بە ژنەکەدەدەن داوای تەڵاق بکات.

ئەمـە چـەند ئـەحكامو یاسـایەك بـوو كـە لـە سـەردەمی پێـشوودا پیـادە كـراوە لـەبارەی ئوسـرەو خێـزانو تەلاقـەوە – ئەگەرچـی كۆمـەڵێ سـەرنجو تێبـینی دەبینـرێ – بـەڵام لـە هەموویاندا ئەوە وەردەگیردرێ كە هەرگیز خێزانی بێ سیستەمو بێ یاسا نەبووە، بێ تـەلاقو بێ لـێ پرسینەوە نـەبووە... دیارە ناشـكرێ ژنو پیـاو هـەردوو كوێخـابنو خـاوەن بڕیـار بـن، بـەڵكو دەبـێ یـەكێكیان بەپلـەی یەكـەم خـاوەن بڕیـار بـێ، ئـەوەش، كـەپیاوكراوە بـە خـاوەن بڕیارو دەسـەلات، لەبـەر بەرژەوەندی كاروباری ژیـان بووە... دیـارە ئەڵبـەت لەسـەر ئەوە كـە دەبێ تەلاق لای پیـاو بێت، كۆمـەڵێ تەجروبـەش هەیـە.. بـەڵام ئەگـەر لـە گشت ئـەو یاسـایانە ورد بینـەوە، دەبیـنین لـە ئیـسلامدا ئـافرەت زۆر زیـاتر لـەو یاسـانەی بـەر لـە خـۆی، مـافو دەسەلاتی دراوەتێ. مەبەست لەمەدا ئەوەیە كە ژنـان، ئافرەتان،خوشكان بـزانن ئـەو مافانـەی ئەمرۆ لە بەردەستانەو تۆماركراون بۆیان لە خۆوە دەست نەكەوتوون.

## تەلاق لە دۆڵی ( نیل ) دا

٣٠٠٠ – ٣٠ پ.ز میـصریە كۆنـەكان سـستمێكیان بـۆ (زەواج)و (تـەلاق) هـەبوو، كـە بەڕاسـتی زۆر لـە قـازانجی ژنانـدا بـوو، ئازادییـەكی تـەواویان درابوویـە لـە (زەواج)دا، وە پارەیەكی بەرچاویان لەسەر پیاو دادەنا، كە ئەگەر ڕۆژێ بیر لە تەلاق بكاتەوە.

(زەواج) بە ئیرادەو خواستی كچوكوڕ، یان ژنو پیاو بوو، كەسێك نەیدەتوانی زۆر لـە هـیچ كامێكیان بكات، خۆ ئەگەر كرابا،ئەو نیكاحە دانەدەمەزرا!.

(زەواج) بەم شێوە ڕێك دەخرا:

(زەوج) لەكاتی (عەقد)ـەكەدا دەیگوت: ((ئەوەنـدە مـارەییم بـۆ دانایـت، هـەركاتێكیش ركـم لـێ هـەڵگرتیت، یـان لـە مـاوەی ژیانتـدا ژنێكـی تـرم كـردە هاوسـەرم، ئەوەنـدەی تـر – زیـاد لەومارەییەكەتت دەدەمێ، وە هەموو ماڵێك ئێستا دەتـەوێت، یان لە ئایندەدا – لەبـەر وەفا بۆت – مسۆگەر دەبێ.ژنەكـەش دەیگوت: ئـەوا بوومـە ژنتو مارەییەكەشم قبووڵـەو، ئەگـەر ڕۆژێ خۆشم نەویستی، یان حەزم لەیەكێكی تركرد، مارەییەكـەمت دەدەمـەوەو چـی تریشم هەبێ هەمووت بۆ دەگێڕمەوە.

## ڕێیان بەتەلاق دەدا

تەلاق بەلایانەوە – هەركات هۆكار بووبا – شتێكی پەسـەندو ڕێ پێدراو بوو، بـەڵام بـەبێ هۆكـار، بەشـتێكی تـاوان و ناپەسـەند دادەنـراو، پیاوەكـەش لەبـەردەم خـوداو ڕای گـشتیدا بـەرپرس دەبوو! جـا لـەم سۆنگەیـەوە هەركـەس بـێ هۆكـاری پەسـەند، تـەلاقی ژنەكـەی دابـا،

دەبوو ماددەیەكی بەرچاو بدات بە ژنەكە، ئیتر لە (وادی النیل) دا تەلاّق زۆركەم ڕوویدەدا، یان بلّێین هەر نەما.

لەسەرەتاوە هەم (تەلاّق) وهەم فرەژنییان، ریّ پیّدا، بەلاّم بۆ دوایی – بە هۆی كۆمەڵیّ مەرجەوە كە ژنان لە كاتی ((عەقد)دا لەسەر پیاوانیان دانا– توانرا هەردوو نەهیّلّن‌و بۆ خۆیان زالّبین بەسەر پیاواندا.. بۆیە لە ئەنجامیشدا تەلاّقدان نەماو، هەموو شتیّك لە عەقدەكەدا باس دەكراو سەروەریەكەی دەدرا بە ژنان.. ئیتر مەگەر ژنەكە خەیانەتی كردبا لە میّردەكەی ئەگینە ریّی تەلاّقی نەبوو!

(ول دیورانت) دەڵیّ: لە (وادی النیل)دا ژیانی خیّزان زۆر ریّك‌و پیّك بوو، وە لە ڕووی ئەخلاقیی و، دەسەلاّتی باوك‌و دایكەوە گەیشتبووە ئاسۆی لووتكە... وە تەلاّق زۆر كەم ڕووی دەدا.. تەنانەتی ئەگەر ژن زینای كردبا میّردەكەی دەیتوانی لەماڵ دەریكاو هیچ حیسابیّكی ماددیشی بۆ نەكات ! بەلاّم بەبیّ هیچ هۆكاریّك ژن تەلاق درابا، دەبوو میّرد قەرەبوویەكی باش‌و بەرچاوی لەبەرامبەر تەلاّقەكەوە بە ژنەكە دابا.

لە (وادی النیل)دا ژن دەیتوانی میّرد تەلاّق بدات، بەمەرجیّ لە (عەقد)ـەكەدا هاتبیّ كە: هەركات ژنەكە ویستی خۆی تەلاّق بدات،ئازاد بیّ و بتوانیّ.

شیاوی باسە (ئەم مەرجدانان و باس و خواسە لە لای فوقەهاكانی ئیسلام، باشترو باشتر باسی هەیەو، ژن دەتوانیّ لە كاتی (عەقد)دا ئەو دەسەلاّتە بۆ خۆی دا بین بكات.

**تێبینی:**

لەبەرئەوە (میسر)یەكان لە كاتی عەقددا پارەو ماددەیەكی زۆریان دەخستە ژێر دەسەلاّتی ژنانەوە، بەڵكو هەموو بوون‌و نەبوونیّكی پیاو لای ژنان بوو، ئەو سەردەمە، ببوویە سەردەمی ژن سالاری... وە وای لیّهاتبوو ژن دەیتوانی – بەسەر بەخۆیی – ئاڵ‌و ویّل لە ماڵ‌و سامانی پیاوەكەیدا بكات، بیّ ڕەچاوكردنی ڕەزامەندی ئەو!

## تەلاّق لای هیندییە كۆنەكان

(هیند) (٣٠٠٠)هەزار ساڵ بەر لە زایین، خاوەنی چەندین یاساو ریّساو جۆرە شارستانیەتیّك بووە، هەر وەك خاوەنی چەندین (دین)و بیروباوەڕ بووە، بەناوبانگترینیان:

١– هیندوس ((هیندۆك)): دیانەتی هیندۆس كەسیّكی وا دیاری نییە دایمەزراند بیّ، بۆ ئەوە ڕووداو پیّشهاتەكانی بۆ بگەڕیّتەوەو لەویّ چارەسەر بكریّن، بەڵكو ((دین))یّكە لە كۆمەڵیّ باوونەریت‌و تەقالیدی (ئاری)یەكان – نەوە دوای نەوە – ڕیّكخراوەو كردوویانە بە ئایین بۆ خۆیان.

٢- جينيه (مهاوبرا). ئەمەش ساڵی (٥٩٩)پ.ز لەسەر بنەمای دەخاڵ دايمەزراندووە بۆ پاك‌و پاكژی (ڕوح)، وەكو مەسەلەی لێبوردن، ڕاستگۆیی، خۆبەكەمزانین... تاد.

٣- بووزیی: (ساڵی (٥٩٩-٥٤٤)پ.ز (بووزا) دايمەزراندووە، ئەوەند كە باسی مرۆڤ دەكات، ئەوەند لەباسە (لاهوتیە)كان نادوێت، چونكە - بەلای ئەوەوە - ڕزگاری مرۆڤ بەدەستی مرۆڤ خۆیەتی.

٤ - بەراهمیەو مانویەكان: ژن بەلای هیندیە كۆنەكانەوە، جۆرە شیوعیەت‌و حاڵەتێكی گشتی تێدا بووە، بۆ نموونە: ژنی خێڵێك موڵكی سەرجەم پیاوانی ئەو خێڵە بووە، بۆ دوایش بیرۆكەی فرە مێردیان داهێنا! ژنێك دەیتوانی لای ئەوان چەند مێردێكی ببێ !! لەگەڵ ئەوەیشدا ڕێ‌ی یەك ژن درا بوو بۆ پیاو، لەو لایشەوە ژنان ماڤ خۆ تەڵاقدانیان هەبوو، هەندێ جار ژنان چوار تا پێنج جار شوویان دەكردو مێردی دوایی مەسرەفەكەی دەگێڕایەوە بۆ مێردی پێش خۆی ! تاوای لێهات ژنان بەتەواوی بوونە خاوەن ماڵ‌و خێزانەكەی بەڕێوە دەبرد، بەئارەزووی خۆی لە مێرد جیادەبوویەوە... بەڵام ئەم دەسەڵاتدارییەی ژنان بەسەرهەڵدانی (بووزی) و(مانوی)یەكان‌و بڕێ تریشیان پێچەوانەبوویەوە.

(مانو) هەندێ یاسا‌و ڕێسای جۆربەجۆری دژ بە ژنانی داهێنا، لەوانە: ژن سەرچاوەی نەنگ‌ولەنگە، ژن سەرچاوەی ماندووبون‌و خەباتە، ژن سەرچاوەی بوونە لە دنیادا، كەوابوو لە ژنان خۆ پارێزن ! ژن هەرئەوەند نییە بتوانێ مرۆڤێكی (ئەحمەق)و بێ ئاوەز بخەڵەتێنێ، بەڵكو دەتوانێ مرۆڤی (حەكیم)و ژیریش لە خشتە بەرێ‌و چەواشەی بكات.

ژنان لای هندۆسەكان - بە كیژو لاوو پیرەژنەوە - هیچ دەسەڵاتێكیان نەبوو، كچ لە ژێر ڕكێفی بابیابوو، ژنی شووكردە لە ژێر فەرمانی مێردەكەیدا بوو، بێوەژن كوڕەكانی چاودێری بوون... بە هیچ شێوەیەك ئازادیی‌و سەربەخۆیی نەبوو!.

ژنان لای (بوزی)یەكانیش خراپترو سوكتر لە (مانوویە)كان تەماشا دەكران، گفتوگۆو ئاخاوتنێك لە نێوان (بوزا)و ئامۆزایەكیدا (ئانندا) سەبارەت بە ژنان دەكرێ، ئەو ئاخاوتنە باشترین بەڵگەیە بۆ بێ ڕێزی‌و بێ بەهایی ژنان بەلایانەوە.

ئانندا بە بوزا دەڵێت: بەڕێزم ! چۆن لەگەڵ ژناندا هەڵسوكەوت بكەین؟

بوزا: بۆیان مەڕوانن !واتە:بە كەمیان بزانن.

ئانندا: ئەی ئەگەر ناچاربووین ؟

بوزا: قسەیان لەگەڵ مەكەن.

ئانندا: ئەی ئەگەر قسەمان لەگەڵ كردن ؟

بـــوزا: زۆر بـــه پـــارێزەوە قـــسەیان لەگـــەڵ بکـــەن. بـــوزا پێـــی وایـــە ئەگـــەر ژنـــان نەبوونایە،((دین))ی پاکژو پاك هەر دەمایەوە.

٥- تـەڵاق لای هنـدۆس: ژنـان بـەلای هندۆسـەوە بـەم شـێوە بـوون: بابەکـەی چ کەسـێکی بـۆ هەڵدەبژارد، دەبوو تا لە ژییاندایە لە خزمەتیا بیٚ‌و، ڕۆژیٚ بیر لە تەلاق و جیابوونەوە نـەکات، کـە مردیش هەر بۆی نییە مێرد بکاتـەوە. ئەگـەر دیبـای مێردەکەی بایـەخی ناداتیٚ‌و لەگـەڵ ژنێکـی تردا ئەوینبازی دەکات، نەدەبوو رکی لیٚ هەڵگریٚ‌و درێغی بکات لـە خزمـەت کردنیـداو گـویٚ بـە ڕەزامەندی نەدات، چونکە — بەلای ئەوانەوە — بەهەشتی ژنان بەسراوە بەڕەزامەندی مێردەوە.

* تەڵاق لای (مانویە)کان:

ئەوان هەر لەسەرەتاوە کاروباری ژن هێنانیان دەدایە دەستی باوكو دایك، دەبوو بـاوك و دایك دەسەڵاتی تەواویان هەبیٚ لە هەڵبژاردنی دەسگیراندا بۆ کوڕەکەیان، هەر (زەواج)یٚکیش لەسـەر بڕیـارو ڕیٚکـەوتنی کچ‌وکـوڕ پیٚـك بیٚـت، بـەلای ئەوانـەوە بـە (زەواج)یٚکـی شـەهوانی‌و ئارەزوو بازی دادەنیٚن ! بەڵکو (زەواج)یٚك بـەباش‌و پەسـەندو سـەرکەوتوو دەزانن کـە لـە ژیٚـر چـاودیٚری (بـاب)دا بکریٚـت. بـەلای ئەوانـەوە دەبـوو لـەناو هـۆزو بـەرەی خۆیـدا — بـەدەر لـە خزمانی نزیك — ژن بیٚنیٚ‌و هاوشانیشی بیٚت، بۆ ئەوەی زوو هەڵنەوەشیٚتەوە.

بـــە لای(مانووییـــە)کانیـــشەوە فەرزەکـــە ژن پیـــاوی خۆشـــبویٚت، بـــەڵام لەســـەر پیـــاو خۆشەویستی بۆ ژن پیٚویست نـەکراوە!. بەلای ئەوانـەوە هـەر چاودیٚری بـابی‌و کـەس‌وکاری بەسـە بـۆی، چـونکە دەسـەڵاتی تـەواو وکـامڵ بـۆ بابـە بەرامبـەر بـەژن‌و کـوڕو کۆیلـەکان. بەلایانەوە: ژن دەبیٚ زۆر بە هیٚورو ڕیٚزەوە قسە لەگەڵ مێردەکـەی بکات، بۆ نموونـە: پـیٚ‌ی بڵـیٚ: گـەورەم ! بـەڕیٚزم! بگـرە بڵـیٚ خوداکـەم!.هـەرگیز بـۆی نییـە داوای تـەلاق بکـات، ئەگـەر مێردەکەشی خەیانەتی لەگەڵ بکات! بەڵام ئەگەر ژنەکە خەیانەتی بـەو کـرد، دەتـوانیٚ تـەڵاقی بـدات. پیـاو سـالاری — لای ئـەوان — بـیٚ سـنووربوو، بـۆ نموونـە: ئەگـەر ژنەکـە مەشـروبی خواردبا، یان نەخۆشکەوتبا، یان گویٚڕایەڵ نەبووبا، یان دەس بڵاوو هەڵـە خـەرج بووبا... لـە گشت ئەم حاڵەتانەدا پیاوەکە دەیتوانیٚ ژنـی دیکـە بیٚنیٚ بەسـەریا، بـەڵام نەیـدەتوانیٚ تـەڵاقی بـدات.بـەلای ئەوانـەوە: دەبـوو پـاش مـردن جەسـتەی ژنەکـە لەگـەڵ جەسـتەی مێردەکەیـدا سوتیٚنرابا، چونکە — لـە ژیـانی دووەمـدا — ئـەو ژنـە دەگەڕیٚتـەوە لای ئـەو مێـردەی، کـەوابوو دەبیٚ جەستەکەشی لەگەڵ ئـەودا بسوتیٚنریٚ.، بیٚگومـان ئیٚستا — بـەهۆی ئـەوەوە کـە ئیسلام چووە (هیند)ـەوە — ئەو باوو نەریتە نامۆیانە کەمبوونەتەوەو نەماون.

جا سەرەڕای ئەوە کە دەبوو ژنان تەواو ملکەچی مێردیان بن، شـەریعەتی (مـانو) ڕیٚگـە بـە

لێدانی ژنانی نەدەدا، ئەگەر بەگوڵەکیش بێت ! تەنانەتی دەیانگوت: هەر خێزانێك ڕێز لە ژنان بگرێت، خوداکانیش بەرامبەر بەو خێزانە دلۆڤان دەبێت، خۆ ئەگەر بە کەم تەماشایان بکەن، هەر چاکەیەکیشیان هەبێ –واتە: ئەو خێزانە – بەفیڕۆ دەچێ ! دەتوانین بەکورتتر بڵێین: لای هیندە کۆنەکان، ژن بەسێ قۆناغدا تێپەڕی:

یەکەم – ژن موڵکی گشتی بووو، بەشێوەی ((شیووعیەت) هەموو کەسێك دەیتوانی لەگەڵی ڕابوێرێ..! واتە: نە (زەواج) هەبوو، نە تەڵاق !

دووەم – تەلاق بە دەست ژنانەوە بوو، بۆیە پەیتا پەیتا مێردێکی تەڵاق دەداو، مێردێکی تری دەکرد!

سێیەم – پەیدابوونی دەسەڵاتی ((دین))و دەسەڵاتی باوکایەتی، لەم حاڵەتەدا تەلاق بەرەهایی نەمایەوە، بەڵکو لەچەند کاتێکی دیاریدا ڕێی پێ درابوو، وەکو:

أ‌- ژنەکە خەیانەت لە جێی مێردەکەی بکات.

ب‌- ژنو پیاو هەردوو پێکبێن بۆ جیابوونەوە.

ج‌- دادگا بڕیاری جیابوونەوە بدات (لەم حاڵەتانەدا دەتوانێ بڕیار بدات).

د‌- ژنەکە زۆر دڵ ڕەقو ناچیزە (ناشرە) بێت.

## تەڵاق لای چینی کۆن ( الطلاق الصینی القدیم )

چینیەکان – بەر لە هاتنی ئاینی ئیسلام – ئەم جۆرە دیانەتانەیان هەبوو: دیانەتی (کۆنفوشیوسی)، لە (٥٥١–٤٧٨) پ.ز بووە. (دیانەتی (لاوتسە). دیانەتی ((بوزا)) کەسێ سەدساڵ بەر لە دایکبوونی (مەسیح) لە ڕێی بازرگانەکانەوە گەیشتە چین.

لە ساڵی (٧٠٦) زایینی، کە دینی ئیسلامی پیرۆز، بەفەرماندەیی (قتیبة بن مسلم الباهلی) گەیشتە چین، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پەرەی دەسەند و بڵاو بوویەوە، بەتایبەتی لە سەردەمی (عەباسی)یەکاندا.

***شێوەی ژن بەشوودانیان:**

بۆ ژن هێنانو کچ بە شوودان، باوکی زاوا – بەر لە گرێبەستەکە، دەچووە لای بابی کچەکەو لە ناوی کچەکەو ڕۆژی لەدایکبوونی کچەکە پرسیاری دەکرد، ئەوسا ئەگەر تەمەنی کچوکوڕە بەیەکیان کردباو هاوتەمەن بووبان، کەسوکاری زاوا کچەکەیان دەبردە گەرماوێکەوەو ڕووتیان دەکردەوەو تەماشای جەستەیان دەکرد بە مەبەستی تەندروستیی و سەلامەتیی لە نەخۆشییەکان، پاشان زاوا – پێش ئەوە کچەکە ببینێ – مارەیی دەدایە، ئینجا لە ڕۆژی

زەماوەندا، زاواو بووکێ لە لای دوو کۆما گەنمو جۆیەکدا دادەنیشتنو بەکەشخەیەکەوە دەچوون و، خزمانیش — لەو دوو کۆمایە — گەنمو جۆیان بۆ هەڵدەدان، تا دەگەیشتە ماڵی زاوا، ئەوسا هەردوو پێکەوە لەسەر سفرەیەك کەمێکیان دەخوارد، بەوە گرێبەستەکە تەواو دەبوو.

*** پلەی ژنان لای چینییەکان:**

ژن بەلای چینیەکانەوە کۆیلەی پیاوانە، بۆیە ئەگەر هەڵس‌وکەوتی ژن خراپ بوو لەگەڵ مێردەکەیدا (١٠٠) شەلاقیان لێدەدا، کەچی بۆ ئەشقیی و بەدکرداری پیاوەکە لەگەڵ ژنەکەیدا، هیچ تۆڵەیەك نەبوو!

*** هۆکارەکانی تەلاق:**

ژن لەگەڵ ئەوەیشدا کە پیاو سالاری کارو بارەکانیبوو، پیاو ئازاد نەبوو تەڵاقی بدات، مەگەر یەکێ لەم هۆکارانە بووبا:

١- نەزۆکی ژنەکە

٢- خەیانەت لە جێی نووستنی مێرد.

٣- ڕێز نەگرتن لەباوکی مێردەکەی.

٤- دزیکردن لە مێردەکەی.

٥-نەخۆشی درێژ خایەنو پەتادار.

٤- چەقەبازی ودرێژ دادڕی ژنەکە.

## تەلاّق لای فارسە کۆنەکان

(فورس: بەوانەیان دەگوت لە (ئیریان — ئێرانی ئێستا- دەژیان).

فارسەکان چەند ((دین))و دیانەتێکیان هەبوو، بەناوبانگەکانیان:

یەکەم: زەردەشتیی: زەردەشت، یان (زەرادەشت) یان (زرشترا) پاش (مەجووس)یەکان ساڵی (٦٦٠-٥٨٣پ.ز) پەیدا بوون.

(ول دیوارنت) دەڵێ: کاتێ زەردەشت هات، (فورس) (مثرا = خودای خۆر) و (أنیتا) خودای زەویو پیت)و (هوما = گا پیرۆزەکە)ی دەپەرست!

زەردەشت زۆر بە بوێرانە پێی ڕاگەیاندن کە جیهان یەك خودای تاكو تەنیای هەیە، ئەویش ((ئەهورا — مزدا: خودای ڕووناکیی و عاسمان)ـە. وەکو کۆمەڵەنامەوکتێبێکی هەبوو، پێیان دەگوتن: (ئەبستا) یان (ئەبستان) خۆرئاواییەکان پێیان دەڵێن: ((زند = ئەبستا)). بەلایانەوە ژن پایەو پلەیەکی ئێجگار بەرزی هەبوو، تەنانەتی کارە (کهنوت)یەکانیشیان پێدەسپاردن.

بـەڕێز دکتـۆر (إبـراهیم معـروف طـە) لـە ماسـتـەرنامەکەیدا (المـرأة الکوردیـة ودورهـا في المجتمع الکردي) دەڵـێ: لـە دیاریکردنی ئـەو سـەردەمەی (زەردەشت)ی تێدا ژیاوە کێشەو ناکۆکی هەیە.

(هـەرج ولـز) خـاوەنی کتـێبی (معـالم تـأریخ الإنسـانیة)دا گوتویـەتی: سـەردەمی ژیانەکـەی زانراو نیە، لە هەمانکاتدا هێندێ دەیبەنـەوە بۆ (١٠٠٠) ساڵ بەر لـە دایکبوونی (مەسیح). ناوبراو دەڵـێ: (ول دیورانت) دەڵـێ: مێژوونوسـەکان دەیگێڕنـەوە بـۆ نێوان سـەدەی دەیـەمو شەشەمی بەرلە زایین.، ئیستاش کورد بە پێغەمبەری خۆیانی دەزانن، ئەگەرچی – مخابن – لایانـداوەو هەریەکـە بـە شـیوو دۆڵێکـدا دەچـێ!... بێگومـان هـیچ نەتـەوەو گـەلێك خـودای میهرەبان بێ پێغەمبەر نەیهێشتوتەوە، ئێمەیش – وەکو گـەلێ لـە موسـڵمانان بـە پێغەمبـەری دادەنێن – خۆشحاڵین پێغەمبـەرمان بووبێ، ئەگەرچی بوونی پێغەمبـەر بۆ هـەر گـەلێك ئـەوە ناگەیەنێت کە ئێستاش – پاش هاتنی پێغەمبەری دوایی (محمد-ص) – هەر شوێن کەوتـەی ئـەو بـن، بـەڵکو دەبـێ – لەگـەڵ بـاوەڕبوون بـەویش و بەهـەوڵو تێکۆشـانەکانی ئـەویش – بـە تێکرا پـەیڕەوی لـەم دینـە نوێیـە (دیـنی ئیسلام) بکرێـت، بەتایبـەتی کـە کتێـبو نامـەی ئـەو پێغەمبەرانـە بـەهۆی کـەمی هـۆی نووسـینەوەو هێشتنەوەو هـەڵگرتن، تیاچوونو دەسکاری کراون، جگە لەوە کە خودا دەیەوێ گشت جیهان دوای ئەم پێغەمبەرە (محمد -ص) بکەوێت.

دووەم: مانەوی:

(مانی بن فاتك الحکیم) ساڵی (٢١٥ د.ز) سەری هەڵداوەو داوای پێغەمبەریـەتی کـردووەو ساڵی(٢٤٥) د.ز شەریعەت وبەرنامەی خۆی ڕاگەیاند.

سێیەم: مزدەکیی:

(مـزدك بـن بامـداد) خـەڵکی (نیـشابوور)ـەو سـاڵی(٤٨٧) زایـنی هاتۆتـە دنیـاوە.، مـزدك دەیگوت: مرۆڤەکان سەرجەم وەکویەك لە دایکبوون، کەوابوو دەبێ بەیەکسانیش بژین، بـەڵام لە مەسەلەی ماڵو سامانو ژنو مێردیدا، ڕێگەی ئیشتراکییو سۆشیالیستی گرتبووە بەر!

(تەبـــەریی) دەڵـــێ: ئـــەم بانگهێـــشەی (مـــزدك) لاوانو گـــۆرانی بیـــژانو ئـــەهلی رابـــواردن قۆزتیانـەوەو خۆشەویـستی چـووە دڵیانـەوەو دەسـەڵاتداری سـەردەمیش (قبـاذ)نـاو – لەبـەر مانـەوەی کورسـیەکەی – پـشتگیری لێکـردو ڕەواجـی دایـە، دەرەنجـام (ئێـران) لەبـەر کـاری گەندەڵیو دزێوو بەدڕەوشتی، نقوومبوو بە دنیای شەهەواتو رابواردن، ئەوسا ساڵی (٥٢٩)ز (نەوشیروان)ێکی بۆ پەیدابوو و کوشتیی!. (المراة الکوردیة..) دکتۆر ابراهیم معروف.

(فـارس)ـەکان ڕێگـەیان بـە فـرە ژنـی نـەدەدا. هێندێکشیان – وەکو مزدەکیـە – ڕێیـان بـە

مارەکردنی ژنی مەحرەم دەدا:واتە: باوك کچی خۆی، کوڕ دایکی خۆی... تاد.

کچ ئازاد نەبوو بۆ هەڵبژاردنی مێرد بۆ خۆی، بەڵکو هەموو شتێك بەدەست باوکی بوو، بەڵام زۆریشی لێ نەدەکرد کە مێرد بەو کەسە بکات ئەو بۆی هەڵبژاردووە.

فارسی کۆن هەر بە منداڵی کچانیان بە مێرد دەداو پارەیەکی باشیان لە مێرد دەسەند بۆ باوکی کچەکە ! بەلام ئەگەر کچەکەی ڕازی نەکردبا، مەبلەغەکەیان لە باوکی دەسەندەوە!.

*** تەلاق بەلای فارسی کۆنەوە:**

تەلاق بەلای فارسی ئەو سەردەمەوە، شتێك نەبوو بەکاربێت بۆ جیابوونەوەو بچڕانی پەیوەندی نێوان ژن‌وپیاو، ئەمەش چەند وێنەیەکی تەڵاقدانە لایان:

یەکەم – تەڵاقدەدراو ئازاد دەکرا هەرچی بکات بیکات، ئەگەر مێرد گوتبای: تەلاقت کەوتبێ‌ولە ئێستایشەوە ئازادی چی دەکەیت بیکە، ئەم تەڵاق‌و ئازاد کردنەوەی وای نەدە بەخشی کە بگەڕێتەوە بۆ هەر پلەوپایەیەك بوویەتی بەر لە تەلاقەکە، بەڵکو ئەوەند بێ کەڵك دەبوو لای کۆمەڵگە، دەکرا بەکارەکەری ژنێکی تر.

دووەم – تەڵاقدانی ئازاد و رەها... تەڵاقی ئاوا ماڤ بەژنەکە دەدا شوویەکی تازە بکات، بەڵام هەر منداڵێکی بووبا دەدرا بە مێردی یەکەمی، ئەوەش وایدەگەیاند کەهێمان پەیوەندی بتەوی لەگەڵ مێردی یەکەمی ماوە!

سێیەم – تەڵاق بە شێوەی (تەنازول)و لە هەقی خۆ دابەزین.. مێرد دەیتوانی ژنەکەی تەڵاق بدات بۆ برایەکی هەژارو بێ ئەنوا، لەبەرئەوە ژنەکە هاوکاری بکات بۆ بژێوی‌و ژیاندنەوەی، شیاوی باسە ئەم تەڵاق و نیکاحە تازەیە بە گرێبەستێکی یاسایی ڕێکیان دەخست، بەڵام ژنەکە نەیدەتوانی ڕازی نەبێ‌و مێرد نەکات بەم پیاوە هەژارە دووەمە! ئەگەر مێردی یەکەم – پاش جێبەجێبوونی کاری مێردی دووەم – ویستبای بیباتەوە، دەیبردەوەو ڕێگری نەبوو.

## تەڵاق لای ( یابان )یەکان

یابان یەکێکە لەو وڵاتە خاوەن شارستانیەت‌و خاوەن ژیارەکانی دنیا، (٣٠٠) ساڵ بەر لە دایکبوونی (مەسیح) ئەوان ناوبانگی شارستانیەتیان هەبووە، ناوبانگی پیتۆڵزانین‌و زانستیە جۆراوجۆرەکان‌و هونەرو پیشەسازییان هەبووە، لە خۆرهەڵاتی (چین) لە دەریای (هادیء) لە خۆرهەڵاتی سەرەوەی ئاسیادایەو پێکهاتووە لە چەند (جەزیرە)و دوورگەیەك.

لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنەیاندا، خۆرو هەسارەو باخاتە چڕو پڕەکان دەپەرستن!!

ئێستاش دیانەتی (شنتویە)یان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە! چین (روح)ی مردووەكانو هێزە سروشتییەكان دەپەرستن ! هەشیانە دیانەتی (بووزیە) كە ساڵی (٥٥٢) دوای زایین كەوتە یابان، هێندێكیشیان – لە ڕێی بزووتنی (تەبشیر)ییەوە بوونەتە مەسیحیی و (كاسۆلیك)و (پرۆتستانت). بەڵام دیانەتەكانی تر لە مەسیحیی زۆرترن.

*** زەواج لە یابان:**

لە وڵاتی یابان پتر یەك ژن دەهێنن، بەڵام بۆ كوڕانی چینی سەروو هەیە، كە چەندین دۆست بگرن و لەگەڵیان ڕابوێرن!، ئەوەتە جەنابی (ئیمپڕاتۆر)یان دەرگای بۆ واڵاكرابوو كە چەند ژن بێنێ و چەند كەنیزەش ڕاگرێت.، ژنان ئازادی تەواو و دەسەڵاتی بێ سنووریان هەبوو، تا باوونەریتی چینیەكان كەوتە ناویانو ژنیان ژێر دەستە كرد. ژن ئەگەر خەیانەتی سەرجێیی لە مێردەكەی كردبا، دەیتوانی ژنەكەو دەست درێژ كارەكە بكوژێ.

*** تەڵاق لەیابان:**

+ پیاو – لەبەر سادەترین هۆكار – بۆی هەبوو ژنەكەی تەڵاق بدات، بەڵام ژن هەقی داوای تەڵاقی نەبوو!

+ پیتۆڵناس(اكن) دەڵێ: ئەگەر ژن لە ڕووی مێردەكەیدا قسەی زۆرو بەرزو نزمو دەمدرێژی كرد، مێرد هەقیەتی تەڵاقی بدات، بەڵام ئەگەر مێرد بەدڕەوشتو فاسیدو سروشت گەندەڵ بوو، دەبێ ژنەكە پتر گوێڕایەڵ بێت بۆی! تا ساڵی (١٨٧٣) یاسایەك دەرچوو ماف بەژنو پیاودا – وەكو یەك – لەمەسەلەی تەڵاقدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا كە ژن دەسەڵاتی تەلاقی زۆرنییە، دیاردەی تەڵاقدان زۆر زۆر بووە لە (یابان)!.

## تەڵاق لە ئەوروپا

**١- تەڵاق لە یۆنان:**

یۆنان وڵاتێكی ئەوروپی یەو دەكەوێتە باشووری نێوەدوورگەی (بلقان)ەوە، زۆرینەیان ملكەچی مەزەبی (ئەرسوزكس) بوون، بەڵام بەرلەوە مەسیحیەت بگاتە ناویان، هێزە سروشتیەكانیان دەپەرست، هەمیشە جەنگ لە نێوان (فەلسەفە) و(دین)ەكەیاندا گەرم بوو، جاری دین سەردەكەوت، جاری فەلسەفە.

**زەواج لە یۆنان:**

لە یۆنان پەیوەندی سێكسی جۆراوجۆری هەبوو، بۆیە ئەوەند بەدڕەوشت ببوون، سێكس كرابوویە پیشەو بازرگانی پێوە دەكرا ! هێندێ كات مێرد دەكرا بۆ ژن، هێندێ كاتیش ژن

دەکرا، وە بەپێی یاساو باوونەریتیان ڕێیان تەنها بەیك ژن دەدا، بەڵام ڕێ بە پیاو دەدرا – لەپاڵ ئەوەدا – بچێ چەندین دۆست بگرێو لەگەڵیان ڕابوێرێ !.

دوای ئـەو جـەنگ‌و هێرشـەی سـاڵی (٤١٥ پ.ز) کـە گەیـشتە صـقلیە)وکۆمەڵـە پیـاوێکی زۆری تیا کوژراو ڕێژەی ژنان بەرز بوویەوە، ڕێیان بە پیاودا دوو ژن بێنێ، ئەم کارەش بەلای (سقراط)ـەوە نرخا.

یۆنـان زۆر بـە کـەم ڕێـز تەماشـای ژنانیـان دەکـرد، نـەیان دەهێـشت – نـەزۆر، نەکـەم – هاوکاری ژیان بکات، وە بەکاروکردەی شەیتان ناویان دەبرد!! لەڕووی یاسایشەوە ڕێ بە فرۆشتنیان درابوو، لـە میراتیش بـێ بـەش بـوون و، هـیچ ئیرادەو ئیدارەیەکیشیان بەدەست نەبوو، چۆنیان ویستبا بەکێیان ویستبا بەشوویان دەدا!.

أ– هۆکارە سەرەکییەکان بۆ تەڵاقدانی ژنان:

١– ژنەکە خەیانـەتی لـە جێی نووستنی پیاوەکە کردبا، لـەو حاڵەتـەدا پیاوەکە ژنەکەی تەڵاق دەداو، هەر شتێکیشی بۆ سەرف کردبا لێی وەردەگرتەوە.

٢– نەزۆکی ژنەکە.. هەرکات ژنەکە نەزۆك بووبا، هەق بە پیاو دەدرا تـەڵاقی بدات، بـەڵام ئەگـەر پیاوەکـە نـەزۆك بووبـا، دەیتـوانی بـچێ خزمێکـی نزیکـی خـۆی بـێنێ بـۆ ئـەوە لەگـەڵ ژنەکەی خۆیدا جووتی بکات، بۆ دوایش – ئەو منداڵی بووبا – دەبوویە منداڵی مێردەکە!.

لـە چـەرخە ناوەڕاستەکانیـشدا: تـەڵاق زۆر زۆر بـوو، چـونکە شـەوی بـە زاوا بـوون نـەبێ، نـەیان دەهێـشت یـەکتر ببیـنن، ئـیتر ئەمـە وایـدەکرد کـە زاوا ژنەکـە تـەڵاق بـداو جـارێکی تـر بەختی خۆی تاقی بکاتەوە! یونانیـەکان وا تەماشـای ژنیـان دەکـرد، کـە خادیمـە وکارەکـەری ماڵـە، بۆیـە مێـرد بەئاسـانی دەیتـوانی بیگـۆڕێ، هێنـدێ جاریش مافیـان بـە ژنـان دەدا داوای تەڵاق بکەن لای دادوەر، ئەگەر مێرد پیاوێکی لاسارو پشتگوێخەری مافی ژنەکە بوو..

**ڕۆمانیەکان:**

ڕۆمانیەکان – سەرەڕای سەر لەبەری خۆیـان، خەڵکانی دنیاش هەمیشە لەوانەوە یاساو ڕێــسایان وەرگرتــووە، خــاڵی ڕەهــابوون بــووە بــۆ بــزووتنی (تەشــریع)و پێــشکەوتن‌و شارستانیەتی کۆن‌و نوێی ئەورووپا.

یاسـای ڕۆمـان ئێـستاش لـە دنیـادا نـرخ‌و بەهاو ڕێـزی خـۆی هەیـە، وە لـە زانکۆکانـدا بـە وردی دەخـوێنرێ... بۆیـە ئەگـەر لـە بـارەی (زەواج)و تەڵاقیشەوە پلـەیـەکی تایبـەتیان هـەبێ جێی سەرسوڕمان نییە.

**زەواج بەلای ڕۆمانەوە:**

ڕۆمانیەکان هەمیشە فرە ژنییان ڕەتکردۆتەوەو، دوو جۆر (زەواج)یان بووە:

**زەواجی سەلاریی‌و، زەواجی غەیرە سەلاریی:**

دەسـەڵات‌و سـەلاری لـە جـۆری یەکەمـدا تـەنها بـۆ مێـرد بـوو، ژنەکـە وەکـو مـردو — بـێ هەسـت‌و نەسـت — لەبـەر دەسـتیا بـوو، ئەمـەیش بـە فـەرمی دەچـوونە پەرسـتگای (جـوتیر)، ئەوسـا زاوا کێـك‌و هەنـدێ لـەو شـتانەی تـر لـەوێ بـاوبوون دەیـدا بـە ئامـادەبووان‌و هەنـدێ دەستەواژەی دینیـان دەخوێنـدەوەو بـە چاودێری (الحبر الأعظم) و(کـاهن المعبـد) و ئامـادە کردنی دە شایەت ڕێکیان دەخست.

لـە جـۆری دووەمیـشدا (الـزواج بـلا سـیادة): بـە شـێوەیەکی سـادەو سـاکار (بـێ چـوونە پەرستگاو ئامادەبوونی (الحبر الأعظم) و شـایەت لـە نێـوان ژن‌و پیاوەکـەدا، زەواجەکـە تـەواو دەبوو، ئەڵبەت زاوا بەر لەوە دەینارده لای باوکی دەزگیرانەکەی‌و خوازبێنی لێدەکرد، پاشـان ئاهەنگێکی جەماوەرییان بۆ دەگێڕاو دەیانبردە ماڵی زاوا.

**ب- تەلاق لای ڕۆمان:**

لای ڕۆمانـەکان: تـەڵاق بەسـێ قۆناغـدا تێدەپـەڕی: کـۆن، کلاسـیکیی، ئیمپراتۆریـەتی خـوارو. لـە سـەردەمی کۆنـدا بەدەگمـەن تـەڵاق ڕووی دابـا، چـونکە بـەدەر لـەوە کـە دەسـەڵاتی پەیوەندییـەکانی نێـوان ژن‌و مێـرد بەدەسـت سـەرۆکخێزانەوە بـوو، لـە ڕای گشتیـشدا تـەڵاق شتێکی ناشیرین‌و ناپەسەند بوو، ئەگەر مێرد بیری لە تەڵاق کردبایەتەوە، دەبوو خانـەوادەی نزیکـی ژنەکـە کۆبکاتـەوەو مەشـۆرەتیان پـێ بکـاو ڕایـان وەرگرێـت، خـۆ ئەگـەر کەسـێك لـە خۆیەوە ژنێکی تەلاق دابا، تا دەمرد نەنگ‌و لەنگ بوو بەسەرچاویەوە!.

**لەسەردەمی کلاسیکیشدا:**

ژنـان — لـە پـاڵ دەسـەڵاتی پیاوانـدا — دەسـەڵاتێکیان پەیـدا کردبـوو بـۆ تەڵاقدان‌و هـیچ حیـسابێك بـۆ سـەرەك خێـزان (رب الأسـرة) وەك جـاران نـەدەکرا ! بۆیـە تـەڵاق بـە شـێوەیەکی نائاسایی پەرەی سەندو تەنانەت کەوتە ناو پیاوە بـەرزەکانی دەوڵـەتیشەوە، هـەیانبوو چـوار پێنجێکی تەڵاق دەدا، چونکە نەدین نەدەسەڵاتی یاسا دەرەقـەتی مەسـەلەکە نـەدەهات، بۆیـە خێزانەکان شپرزەو ماڵ کاول بوون‌و، زیناو داوێن تەڕی بە زۆری وڵاتەکەی گرتـەوە، هەنـدێ هۆکاری ئەوکارە دەگێڕنەوە بۆ سەروەت‌و سامانێکی زۆر — بـە تایبـەت — لای پیـاوە گـەورەو سیاسییەکانی دەوڵـەت کۆببوویـەوە، چونکە زیـاتر ئـەو پاشـاگەردانیە لەوانـەوە سـەریهەڵدا، ئەوان بوون ئیمکانیاتیان زۆر بووو ژنانیان تەلاق دەدا، یەکێ تر جوانتریان دەهێنا، هـەروا تـا زنجیرەی خێزان هەڵوەشا!

**لەسەردەمی ( الإمبراطورية السفلى ):**

پاش ئەو سەردەمە کلاسیکیە فەوزایە، مەسیحیەت کەوتە ناوچەکەوەو توانی ماناو مەبەست لە (زەواج) بخاتە دڵیانەوەو هەندێ دروشمی بۆ بەرزکردنەوە، لەوانە: زەواج پەوەندییەکە هەرگیز کۆتایی نییە. تاك ئازادە (زەواج) بکا، یانەیکا، بەڵام هەرکە کردی، نابێ وازی لێ بهێنێ. ئەوی خودا بەیەکی گەیاندن، نابێ بیبچڕێنێ.

## ( زەواج ) و ( تەڵاق ) لای عەرەب- بەر لە ئیسلام -

شێوەی بە یەکگەیشتنی ژنو مێرد وبوونە هاوسەر لای عەرەب پێش هاتنی ئیسلام، چەند جۆرێکی جیاوازی هەبوو، مەبەستیش لە زەواج (تەناسول)و منداڵبوونو دروسکردنی دۆستایەتیو پەیوەندی لەگەڵ هۆزو خێڵەکانی تر بوو، شیاوی ئاماژە بۆ کردنە کچەمام – بەپێی باوی ئەوان – قورخی ئامۆزای بوو!

*** زەواجو مەرجەکانی:**

لای زۆرینەی عەشیرەتو خێڵەکان تەنها ڕەزامەندی (وەلی)و سەرپەرستیاری کچەکەو زاوا ڕەچاو کرابوو، وە کچەکە لەبەر دەست (وەلی)دا بووو، هەقی درابوو بە وەلیی زۆری لێ بکات بۆ هەر کەسێك خۆی حەز بکات. ئەگەرچی لای هێندێ خێڵ، ڕەزامەندی کچەکەش مەرج بوو.

*** مارەیی:**

مارەیی – هەر چەند بوایە – کرابوویە هەقی (وەلی)، کچەکە نەیدەتوانی دەست بۆ درەمێکی ببا! مارەییان دەکردە دووبەش: حازر، قەرز (مؤجل، معجّل) هەروەك لای سەرووویان دیاری نەدەکرد، (وەلی) وا هەبوو (١٥٠)وشتری لە زاوا دەسەند بۆ خۆی، بێ ئەوە کچەکە قازانجێکی لێ ببینێ.

دایكو کچو خوشكو پوور – لەهەردوو سەرەوە – مارە کردنیان قەدەغەبوو، هەروەك ژنیش ڕێگەی نەبوو مێرد بە (ئوصول) و (فروع)و براو مامی خۆی بکات.

فرەژنی بە لایانەوە زۆر باو بوو، هەر کەس توانای بووباو حەزی لەهەر چەند ژن کردبا مارەی دەکردن، بێ ئەوەی بەرپرس ببێ لەبەردەم هیچ یاساو ڕێسایەکدا! هەر ئەوەش بوو کاتێ ئیسلام هات چەند یاساو ئەحکامێکی بۆ فرەژنی داناو لای سەرووی دیاریکرد.. هەروەها کۆکردنەوەی دوو خوشك پێکەوە بە لایانەوە ڕەواو دروست بوو!.

*** ئەم نیکاح و گرێبەستانەیان بەلاوە ڕەوا بوو:**

یەکـەم – ئـەم نیکاحـەی ئێـستای لای خۆمـان (ڕەزامەنـدی وەلـی و (زەوجـەین) و دانـانی مارەیی).

دووەم – پاش مردنی مێرد، لـە لایـەن یـەکێ لـە خزمـانی مێـردەوە ژنەکـە قۆرخ دەکراو بە ویستی ئەو نەبووبا نەیدەتوانی شووبکاتەوەو وەکو کەلەپوور وکالآی لێ دەهات ئەم نیکاحە (زواج المقت)ی ناو بوو.

سێیەم– لەجەنگەکانـدا هـەر کەسـێك هـەر ژنێکـی گرتبـا، بێڕەزامەنـدی ئـەوو بـێ مـارەیی دەیکـردە ژنـی خـۆی، ئـەوەش لەناوچـەکەدا بـاوبوو کـە هـەر کـەس – ژن یـان پیـاو – گیرابـا دەبوونە موڵك. بەو نیکاحە دەگوترا (زواج الظغینة).

چـوارەم – زواج المتعـة: ئـەم زەواجـەش بـۆ ماوەیـەکی کـورت و دیـاریکراو بـوو، تـەنها مارەیی و ڕەزامەندی ژنەکە تێیدا مەرج بوو، هەردوو – ژن و پیـاو – ڕێك دەکـەوتن، پاشـانیش بەڕەزامەندی هەردوو کۆتاییيان پێدەهێنا.

پێنجـەم – زواج الـشغار: ئـەم زەواجـەش بریتیبـوو لـەوە کەسـێك کـچەکەی خـۆی، یـان خوشکەکەی لە پیاوێکی تر مارە دەکرد، کەئـەویش لـە بەرامبـەر ئـەوەدا کچەکەی خۆی، یان خوشکەکەی لەم مارە بکا و هەر یەکەیان مارەی ئەوی تر بن!.

*** تەڵاق ولێکجودابوونەوە:**

هۆکـاری جیابوونـەوەی ژن و مێـرد و بـچڕانی پەیوەنـدی نێوانیـان – بـەر لـە ئیـسلام – سەرەڕای مردن، ئەمانە هەندێکیان بوون: (تەڵاق، خولع، ئیلاء، ظیهار، سبي، إنقضاء الأجل). هـەر کـامێکیش لـە ژن و لـە پیاوەکـە – تـەڵاقیان بەدەسـتبووبێ – ئـازادبوون لـە تەڵاقـدان و جیابوونەوە، بەم بێژەو ڕستەو وشانەش کە لەناوچەکەدا باو بوون تەڵاقیان دەدا، بو نموونە: بـچۆرەوە بـۆ مـاڵی باوکـت. جەڵـەوت لـە ملـی خۆتایـە. بـچۆ بـۆ کـوێ دەچـی بـچۆ، لەگـەڵ بەکارهێنانی هەندێ بێژەو وشەی تر کە بۆشانی ژنان نە دەگونجان!

**ژمارەی تەلاق:**

ژمـارەی تـەڵاق لای عەرەبـەکان هەمیـشە سـێ بـووەو، بـە سـێ جـارانیش خـستوویانە، واتە:(أنت طالق ثلاثا) بەیەك تەڵاقیان داناوە، بەڵام لەیەك جێگاو شوێن و مەجلیسدا توانراوە یەکـە یەکـە تـەواویان بکـات. ئەوەیـشمان لـەبیر نەچـێت کـە هەنـدێ خێڵـە عـەرەب سـنووری تەڵاقیان لانە بوو، کاتی وا هەبوو چەندین جار ژنەکەی تەڵاق دەداو، دەیهێنایەوە لای خۆی.

(خولع)یش لای ئـەوان وەکو کڕین و فرۆشتن بـوو، ژنەکـە خـۆی لـە پیاوەکەی دەکڕیـەوەو ئازاد دەبوو. (ئیلاء)یش: پیـاو سـوێندی دەخـوارد کـە سـاڵێك یـان دوو سـاڵ لەگـەڵ ژنەکەیدا

سەرجێیی نەكات.

(ظیهار)یش: پیاو ژنەكەی دەچواندە دایكی، یان خوشكی، ئیتر یەكجارەكی لێی حەرام دەبوو.

(سەبی)یش: ئەگەر ژنێك دیل كرابا، پەیوەندی بە مێردەكەیەوە دەبچڕاو دەبووە موڵكی دیلكەرەكە، هەر كاتێكیش دەگەڕایەوە لە ژنیەتی ئەمیش دەبچڕا.

(زواج المؤقت)یش: ژن و پیاوێك بە ئارەزووی خۆیان ڕێك دەكەوتن تا ماوەیەك پێكەوە بن، جا كە ماوەكە تەواو بووبا، خۆ بە خۆ تەڵاقی دەكەوت و پەیوەندییان دەبچڕا. هەندێ جاریش تەلاقیان دەدایە دەست ژنان، ژنەكەیش هەركات مەیلی بوایە پیاوەكەی تەڵاق دەدا!.

بەڵێ دیارە ئادەمزاد لە هەموو سەردەمێكدا هەمیشە یاسا و ڕێسایەكی ژن و مێردیی و تەڵاق و جیابوونەوەی هەبووە، هەرگیز نەكراوە و سەركەوتوو نەبووە كە ژن موڵك و ماڵی هەموو كەسێك بووبێ و بە شێوەی (شیوعییەت) و (ئیشتراكییەت) بەڕێوە چووبێ، گریمان - ئەگەر بەدەگمەن بووبێ - فەوزاو بەدڕەوشتی و ئیباحییەت و بەرەڵایەكی ڕەها سەری هەڵداوەو، ناچار بوون ئەو حاڵەتە بگۆڕن بە حاڵەتێكی تری شیاوو لایەق بە مرۆڤایەتی و خێزان و منداڵ و دایكی منداڵەوە، ئەگەرچی پرپیشبووبێ لە هەڵەو پەڵە.. تا وردە وردە بەو هەموو قۆناغانەدا هاتە خوارێ و ئیسلام هات و بەحەكیمانە چارەسەری كردو بۆهەتا هەتایی دایمەزراند و مافی ژنانی ڕەچاوكرد، ئەگەرچی مخابن لەگەلێ ناوچەو ولاتدا لەباتی ئەحكامەكانی ئیسلام عادەت و باو زاڵەو بەباوونەریتی خۆیان كاردەكەن و بەسەر ژناندا (تحكم) دەكەن!.

## تەڵاق لای (مووسایی) یەكان، (١٢٠٠)ساڵ بەر لەزایین

تەڵاق بەلای (یەهوود)ەوە - ئەگەرچی ڕێی پێدرابوو - بەڵام بێ هۆكار بەلایانەوە قێزەون و ناپەسەند بوو، ژنی تەڵاقدراویش لە كۆمەڵگەدا پایەو پلەی خۆی لە دەست دەدا.. لەگەڵ ئەمەیشدا ببوونە دوو دەستە:

١- دەستەو قوتابخانەی (شما): كە دەیگوت: ژن تا گوناح و تاوانێك نەكات، نابێ تەڵاق بدرێت.

قوتابخانەی یەكەم - چوار مەرجیان دانابوو بۆ خستنی تەڵاق:

یەكەم - لەڕووی دینەوە یا ساغ بێت، وەكو خواردنی شتی حەرام و پیس لە ڕۆژە پیرۆزەكانیاندا.

دووەم - لەكاتی بێ نوێژیدا بڵێ پاكم و مێردەكەی چەواشە بكات.

## ( زەواج ) و ( تەڵاق ) لای مەسیحییەكان

لە سەرەتاوە مەسیحیەت، یەك دین و یەك پارچە بوو، بەڵام بۆ دوایی بوونە سێ پارچەوە:

١- كـاثـۆلیـك: كاسـۆلیكیش (٧) دەسـتەبوون: قیبتیـەكانی میـسر، ڕومـی بنـەڕەت ئەوروپیی، ئەرمەن، بنەڕەت ئەرمەنی، سوریان، بنـەڕەت سووری موارەنەی لوبنـانی، كلـدانی عیراقی، لاتینی ئەوروپی، هەموو ئەمانە لە ژێر دەسەڵات و بڕیاری (پاپا)ی (ڕوما)دا بوون.

٢- برۆتستانت: ئەمانیش ئەگەرچی پارچە پارچەن بەڵام بەیەك دەستە دادەنرێن.

٣- ئەرسوزكس: ئەمانیش چوار تاقمن: (الأقباط، الروم، الأرمن، السريان).

**تێبینی:**

تا سـەدەی پێنجـەمیش تـەواوی كـە نیـشتە مەسـیحیەكان یـەكبوون و یـەك بیروبۆچوونیان هەبوو بەرامبـەر بـە (مەسیح)، بـەڵام سـاڵی (٤٥١)ی زایین یـەكێ لـە (مەجمەع)ـە دینیـەكانیان دەربارەی (عیسا) بڕیارێكی دەركرد كـە: عیسا دوو لایـەنی هەیـە: لایـەنی سروشـتی خـوایی. لایەن و سروشتی ئینسانی.

بەڵام هەمووكەنیشتەكانی (میسر) ئەو بڕیارەیان ڕەتكردەوەو گوتیـان: عیسا یـەك لایـەن و سروشتی هەیە، كە سروشتی خوایی یە! پاشان لەبارەی سەرۆكایەتی كە نیشتە لـە جیهانـدا بوو بە هەراو كێشەیان، بۆ نموونە: (ئوسقف)ی (قسطنطین) گوتی: دەبێ من سـەرۆكی بـاڵای (مەسـیحیەت) بم. لـە (ڕۆمـا)ش (پاپـا) قبـووڵی نـەكردو بـوو بـە نـەیاریی، دەرەنجـام سـاڵی (١٠٥٤)ی زایـین، سـەرۆكایەتی كرایـە دوو بـەش، بەشـی خۆرئـاوا، نازنـاوی (كـاثـۆلیكـی) وەرگـرت، بەشـی خۆرهـەڵاتیش (ئـەرسـوزكـس)، واتـە: خـاوەن رای دروسـت وڕاسـت. جـا لـە سەدەی شازدەهەمدا (پروتستانیەت) بە زۆری بڵاو بوویەوە.

**زەواج لای هەموویان:**

یەكەم – پەیوەندییەكی تاكییە، دەبێ تەنها لە نێوان ژن و پیاوێكدا بێت.

دووەم – زەواج نهێنیەكە بە نوێژو صـەڵەوات دادەمـەزرێت، بۆ ئـەوەش پیـاوێكی ئاینیـان دەهێناو سەرپەرشتی دەكرد.

## تەڵاق و جیابوونەوە

تەڵاقیش دەبوو هەر لە ڕێی دەسەلاتی (دیین)یەوە ئـەنجام درابـا، واتـە: وەكـو چۆن زەواج لە ڕێی دینەوە تەواو دەبوو، تەڵاقیش دەبوو كەنیشتە ئاگادار بێ و بڕیاری تێدا هەبێت.

ئەمـە كورتەیـەك بـوو لـە (زەواج) و (تـەڵاق)ی هـەموو بەشـە مەسـیحیەكان، وەكـو بنـەماو

(مبادئ)یان، بەلام بێگومان هەریەکەیان شێوەو تایبەتیەکی خۆیشی هەیە، ئێمە لەبەر درێژ نەبوونەوەی باسەکەمانو، زۆر لانەدان لێی، لەو چەند دێرەدا کورتمان کردەوە.

**تێبینی:**

بۆ نووسینی ئەم باسە (واتە: چاوخشانێك بەباوونەریتە کۆنەکانی – بەر لە ئیسلام – سەبارەت بە تەلاق)، سوود لەم کتێبانە وەرگیراوە: ((المرأة بين الفقه والقانون. المرأة الكوردية ودورها في المجتمع الكردي) بە تایبەتی کتێبی (مدى سلطان الإرادة في الطلاق..) کە وەکو سەرچاوەی یەکەم لەبەردەستدابوو.

## ژنان و مومارەسەی کاری سیاسیی

مومارەسەی کاری سیاسیی لە لایەن ژنانەوە – واتە: ببنە ئەندام لە دەوڵەتی سەردەمدا و یەکێ لە پۆستە گرنگ و گشتییەکانیان پێ بسپێردرێو، لە هەڵبژاردنەکاندا دەنگو ڕای خۆیانیان هەبێو بتوانن خۆ کاندید بکەن.. لەناو زاناکانی ئیسلامدا گرنگی خۆی دراوەتێو قسەو باسێکی زۆری لێکراوە، چونکە بەشێکی زۆری پێکهاتەی عالەمی ئیسلامیی وجیهان بە گشتیی ژنانن، کەوابوو هەقیانە پۆستە گشتییەکانیان پێ بسپێردرێ.

ئیمام (ئەبوو حەنیفە) دەڵێ: لە (حدود) و (قصاص)دا نەبێ، ژنان کاری (قەضاوەت)و دادگاییان دەدرێتێ. بەڵام (ئیبن جەریری الطبري) دەڵێ: بەشێوەیەکی گشتیی – واتە: بە (حدود و، قصاص)یشەوە– قەضاوەتیان دەدرێتێ، چونکە دادگایش وەکو (فەتوا) وایە، خۆ کەسێك نییە (ذکورەت) بکاتە مەرجی (فەتوا)، کەوابوو (قەضاوە ت)یش هەروا، وەلە (ئیبن حەزم)یشەوە دەگێڕنەوەکە دەڵێ: بۆ ژنان ڕەوایە کاروباری حوکمو قەضاوەتیان بدرێتێ، خۆ (عومەر)یش (د.خ) خاتوو(شفا)ی کردە چاودێری کاروباری بازاڕەکان لەو دەمەدا، جا ئەگەر کەسێکیش ئەم فەرموودە بکاتە بەڵگەی ڕێ نەدان بە قەزاوەتی ژنان کە دەفەرمووێ: ((لن يفلح قوم ولّوا أمرهم إمرأة)) دەڵێین: مەبەستی پێغەمبەر ﷺ – لەوە کە هیچ نەتەوەیەك بەختیارو ئاسوودە نابێ، کاروباریان بسپێرن بە ژنێك – خیلافەو ئەمیرایەتی گشتییە، نەك قەزاوەت. (المحلى لابن حزم، ج٩ص٤٢٩ – ٤٣٠).

لە ئیسلامدا هەقە ڕێ بەژنو پیاو بدرێت مومارەسەی کاری سیاسیی بکەن، بۆ ئەوە بەتوانای خۆیان خزمەت بەدینو نیشتمانو گەل و وڵاتیان بکەنو، لە پاڵ ئەوەیشدا کەسبی ڕزقو ڕۆزی بۆ خۆیان بکەن، بەڵام بێگومان بۆ ئافرەتان چەند مەرجێك هەیە لە مومارەسەی کاری سیاسەتدا، لەوانە:

١- نابێ بە هۆی ئەو كارەیەوە، كارەسەرەكییەكەی خۆی لەكیس بچێت.

٢- كاركردنەكەی لەبەر پێویستیی بەژیانو بژێوی بێ.

هەموان دەزانن كە كاری بنەڕەتی و (ئەصڵ)یی بۆ ژنان، سەرپەرستیكردنی ناومالٚو بە خێوكردن و پەروەردەی منداڵانو ماڤی ژنو مێردییە... بەشێك لەم فەرموودە ئەركەكانی ژنان دیاری دەكات كە دەفەرمووێ: ((...والمرأة راعية على أهل بيت زوجها وولده وهي مسؤولة عنهم..))بوخاري.

ئاخۆ ئەو ژنانە كە لەدەرەوەی ماڵەوە كار بكەن و كارێكی دەوڵەتییان پێ بدرێت، دەتوانن وەكو پێویست ئەركەكانی ماڵەوەیان ئەنجام بدەن ؟ دیارە ئەگەر ژنێك منداڵی نەبوو و مێردەكەشی ڕێی پێبدا لە دەزگایەكی دەوڵەتدا كار بكات، لە حاڵەتی ئاوادا (موباح)ـە بۆی، بەمەرجێ تووشی كاری ناشەرعیی نەبێت.

ژنان لەم ڕووەوە كە (نەفەقە)یان لەسەر بابو براو خزمو كەسو كارە، بەر لە مێرد كردن، لە سەر مێردیشە، دوای مێرد كردن، دەبێ لە بەرامبەر ئەوەوە ئەوانیش هەڵسن بە جێبەجێ كردنی كارەكانی خۆیان: (سەرپەرستی كاروباری ماڵ، پەروەردەی منداڵان، ماڤی ژنو مێردیی) كەوابوو ژیانو بژێوی ژنان لەم ڕووەوە مسۆگەرەو زەروورەتێك نییە لەماڵ بچنە دەرو مومارەسەی كاری سیاسیی بكەن.

هەندێ كەس دەڵێ: ئەمڕۆ بژێوییو ژیان زۆر گرانو سەخت بووە، جا ئەگەر لەم ڕێگایەوە ژن بەڕەزامەندی پیاوەكەی بچێتە دەزگایەكی دەوڵەتەوەو بە مانگانەكەی هاوكارییەكی مێردەكەی بكاو دایەنو كارەكەر بۆ ماڵو منداڵەكەی بگرێ، چ كێشەیەك دەمێنێ..؟

بۆ وەڵامی ئەمەش زاناكان دەڵێن: ئەو پەیوەندییەی لە نێوان ژنو پیاودا هەیە / هەرگیز بە (خادمە)و كارەكەر چارەسەر ناكرێ، سەرەڕای ئەوەش لەوانەیە كارەكەرەكەش بەمانگانەی ژنەكە ئینجا كاریان بۆ بكات، لەولا تریشەوە هێنانی (خادمە)یەكی نامەحرەم بۆ ماڵەوە، گەلێ جار گێروگرفتی لێ دەوەشێتەوە، بچووكەكەیان دەست تێكەڵكردنی پیاوەكەیە لە گەڵیاو تەلاقدانی ژنەكەیەتی، ئەمە جگە لەوەیش كە دەكرێ ئەو (خادمە)یەش ماڵومێردی بەجێ هێشتبێ كە ئەمەیش هەر كارێكی ناڕەواو ناپەسەندە.

## ژنو سەرۆك كۆمارێتی

سەرۆكایەتی دەوڵەت- لە بەر ئەو فەرموودەیە كە دەفەرمووێ: ((لن يفلح قوم ولّوا أمرهم إمرأة)) واتە: ئەو كەسانە كاروباری خۆیان بە ژن بسپێرن، هیچ كات ڕزگار نابن -بۆ پیاوان

قۆرخکراوه و به ژنان نادریٚ بۆ ئەمەش (شەوکانی، ئیبن حەزم..) دەتوانی بلیٚیت تەواوی فوقەهاکان یەکدەنگن!

دکتۆر (محمد سعید رمضان البوطی) دەڵێ: چونکه خیلافەت، یان سەرۆك کۆماری، پێش ئەوه کە کارێکی سیاسی بێت، کارێکی ئاینیی و (دین)ییە، بگرە دینییەکی رووتەو سیاسی نییه، بۆ نموونه: یەکێ لە کارەکانی خەلیفه کۆکردنەوەی مەردومە بۆ بەرپاکردنی نوێژی هەیینی، خۆ لە ئیسلامیشدا ژنان نوێژی هەینیان لەسەر نییه، کەوابوو کەسێك خۆی بەرپرس نەبێت لە کارێکدا، تەکلیفی رێکخستنی ئەو کارەشی لێناکرێت، یان کارێکی تری خەلیفه راگەیاندنی جەنگە لەگەڵ ئەوانەی تەماح لە خاك و وڵاتی موسڵمانان دەکەن، دیارە سەرۆکایەتی جەنگو هێزە جەنگاوەرەکان لە ئەستۆی پیاو دایەو ژنان – وەك پیاوان – جیهادو جەنگیان لەسەر نییه، کەوابوو سەرۆکایەتی هێزەکانیشی نادرێتێ، یان ئاگربەسی جەنگ، دەبێ خەلیفه بریاری بداو ئیمزاو مۆری بکات. یان ئامادەکردنی خەڵکان بۆ نوێژی جەژنەکانو نوێژە بارانە، هەر لە ئەستۆی پیاوان دایە، چونکه وتارو پێش نوێژی تێدایە، ئەمانەش لە ئیسلامدا – دووبارە – به پیاوان سپێردراون، نەك به ژنان.

دکتۆر (مصطفی سیباعي) دەڵێت:

سەرباری ئەوه کە ژنان لە ئیسلامدا لە ئەركو تەکلیفدا وەکو پیاوانن، بەڵام پاش کۆچی دوایی پێغەمبەرو کۆبوونەوەی هاوەڵان لە (سقیفة بن ساعدة)دا بۆ دانانو هەڵبژاردنی خەلیفه، هاوبەشی ژنان لەو رۆژەدا بۆ ئەو کارە، بەرچاو ناکەوێ.. جگە لەمەیش نابینین (خولەفای راشیدین) لەو کارانەدا کە پیاوانیان بۆ کۆ دەکردەوە، بەو شێوەیە ژنانیشیان بۆ کۆ کردبێتەوە، وەلە لاپەرەیەکی مێژوودا نابینین ژنان شان بەشانی پیاوان لە بەرێوەبردنی کاروباری دەوڵەتدا هاوبەش ببوون.

ئەوەی مێژوو بۆمان باس دەکات هەر ئەوەیە کە: پێغەمبەر ﷺ رۆژی فەتحی مەککە – بێ تەوقە وموصافەحە – بەیعەتی لە ژنان وەردەگرت، هەر کەسێك وابزانێ ئەو بەیعەتە دەلالەت لەسەر هاوبەشیو کاری ژنان دەکات لە کاروباری سیاسەتدا، ئەوه بێگومان داوایەکی ناهەق دەکاو رووداوەکانی مێژووی هەڵگێراوەتەوە! هاوبەشی هێندێ لە ژنان لە جەنگەکاندا بۆ برینپێچیو ئاودان بەدەم جەنگاوەرەکانەوە – هەموو ئەمانە هاوبەشکردنی ژنان لەکاروباری سیاسەتدا ناگەیەنێت، بەڵکو تەنها ئەوه دەگەیەنێت کە ژنانیش لە جەنگەکاندا لە برینپێچیو ئاوگێران بۆ بریندارەکان هاوبەشییان کردووه، خۆ ئەمەیش کەسێك ناتوانێ حاشای لێ بکات.

دەزانین کە لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا ژنانیش بە چڕو پڕی بەشداربوون لە گەیاندن و بڵاوکردنەوەی دینی ئیسلامداو فیداکار بوون بۆی، لەوانە: خوشکەکەی (عومەری کوڕی خەتتاب) و (ئەسمای کچی ئەبووبەکر) و دەیان و سەدانی تر، خوا لێیان ڕازی بێت، خۆ ئیستاش بەشداری ژنان بۆ ئیسلام و چاکسازی نێو کۆمەڵگە بەردەوامەو دەبێ پتر لەجاران هەوڵ بدەن بۆ ئەو کارەو بچنە ناو کۆمەڵگەوە بەوشێوەیە شەریعەتی ئیسلام بۆیانی دیاری دەکات. دەزانین کە لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ دا ژنان لە نوێژی جەژنەکان و وانە ئامۆژگاریەکاندا ئامادەبوون.

دەزانین کە (عایشە / دایکی موسڵمانان) لە جەنگی (جەمەل)دا بەشداری کردو سەرکردایەتی جەنگەکەشی لە ئەستۆ گرت. بەڵام بەتەئکید بۆ دوایی لەو کارەی زۆر پەشیمان بوو و ژنەکانی تری پێغەمبەر ﷺ لۆمەو سەرزەنشتیان کرد، چونکە بەدەقی قورئان ژنی پێغەمبەر ﷺ نابێ لەماڵ دەرچێت، بەڵام خاتوو عایشە (تەئویل) ێکی بۆ خۆی کردو تووشی ئەو هەڵەیە بوو، بێگومان ئەو کارە بەشداری ژنان لە سیاسەتدا حەڵاڵ ناکات... کەوابوو لە مێژووی ڕابردووی موسڵماناندا ژنانی ئیماندار قەت بەشداری سیاسەتیان نەکردووە بەو مەفهووم و چەمکە ئەمڕۆ بۆ سیاسەتی دادەنێن ! بەرز ڕاگرتنی شان و شکۆی ژنان لە ئیسلامدا و گەیاندنی بە پلەی پیاوان لە مافەکانیاندا نکوولی لێناکرێت، بەڵام دینی ئیسلام وا بەچاك دەزانێ کە ژنان لە هەموو ئیش و کارێکی تر ئازاد بکرێن و خۆ یەکلابکەنەوە بۆ کاروباری خێزان، هەر لەم ڕووەوە بوو ژیان و بژێوی لەسەرشان هەڵگرت و خستیە سەرباو کەس و مێرد – لەگەڵ ئەوەیشدا کە دەتوانێ بەئازادانە مامەڵەو کڕین و فرۆشتن وبازرگانی بۆ خۆی بکات.

لەمانەوە دەتوانین پەنجە بخەینە سەر حیکمەت و فەلسەفەی ڕێ نەدان بە ژنان کە لە دەرەوەی ماڵ – بە مەفهوومی ئەمڕۆ – کار بکەن و بچنە ناو سیاسەتەوە. (المرأة بين الفقه والقانون).

دەبێ ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین کە ژنی موسڵمان – ئەمڕۆ کەوتۆتە ژێر کاریگەری خۆرئاواوە – و لەماڵەوە جوڵاوەو هاتۆتە دەرەوەو دەیەوێ لە کاروباری سیاسەتدا شان بەشانی پیاوان کار بکەن و لە هەڵبژاردنەکاندا بەشدار بێ و، بۆ سەرۆك کۆماری و بەئەندام بوون لە ئەنجومەنی جێگراندا (مجلس النواب) خۆی کاندید بکات !

خۆ ئاشکرایە ئەو بیرۆکەیە لە ئازادیی و بیرو تێڕمانینی ژنان خۆیانەوە هەڵنەقوڵاوە، بەڵکو گوشارو بیرۆکەی خۆرئاوایە..! بەهەرحاڵ هەر چۆنێك بێت ئەوجۆرە ژنانە، ئەمڕۆ بە

مافی خۆی دەزانێ هەڵبژێردرێو خۆی کاندید بکات، دەبێ هەڵوێستی ئیسلام چۆن بێت ؟

پاش هەوڵو کۆشانێکی زۆرو کۆڵینەوە لەو مەسەلەیە، دەرکەوت کە هەڵبژاردن دانانی بریکارو (وەکیل)ـە لە لایەن ئوممەتەوە بۆ هەڵسووڕاندنی ئیشوکاری ناوخۆ و دەرەوە، بێگومانە کە ژنیش دەتوانێ بریکار بگرێ و بە ڕای خۆی بیکاتە ئەندامێکی ئەنجوومەنی جێگران و کاروباری وڵاتیان پێ بسپێردرێ، بۆئەنجادانی ئەوکارەیش دەتوانێ بچێتە بەردەم صندوقەکانی هەڵبژاردنو ڕای خۆی بە ئازادانە بدات، بەڵام دەبێ جلوبەرگی شەرعیی لە بەر بکاو تێکەڵ بە خەڵکانی نامەحرەم نەبێ، خۆ ئەگەر مەڵبەندێك بۆ دەنگدانی ژنان جیا بکرێتەوەو هەر ژنانیش بەسەر صندوقەکانەوە بن، کارێکی شەرعییو تەواو پەسەندە.

بەڵام ئەگەر بەوردی تەماشای ئەم (نوێنەرایەتی)یە بکەین، دەبینین کۆمەڵێ ڕێگر هەیە لە ژنان ببنە نوێنەر لە ئەنجوومەنی نوێنەراندا، دیارە لەبەر ئەوە نییە کە ژنان توانایان لە پیاوان کەمتر بێت، یان شانیان هەڵنەگرێ.. بەڵکو لەدەرەوەی کەسایەتی ژنانەوە کۆمەڵێ هۆکارهەن، بۆ نموونە: چاودێری ماڵو حاڵو خێزانو خۆ یەکلا کردنەوە بۆی، ئەوەند لە ژنان دەوەشێتەوە، ئەوەند لە پیاوان ناوەشێتەوە، کەوابوو هەقیانە جگە لەوە کاری تر نەکەن، تا مەسەلە سەرەکیی و گرنگییەکەیان لەدەست نەدەن، ئەگینە لەباردەچێو کۆمەڵێ گیروگرفت پەیدا دەبێت.

سەرباری ئەوەش لەو نوێنەرایەتییەدا (إختلاط)و تێکەڵی بە پیاوانی نامەحرەمەوە ڕوودەدا، لەوانەیشە گەلێ جار (خەڵوەت) و دەرخستنی دەموچاو و دەست و ڕوو، ڕوو بدات. ژنان بەتەنها بچنە سەفەر بۆ دەرەوەی وڵات..

بێگومان ئەمانە — کە لە دەرەوەی کەسێتی ژنانەوەن — ئیسلام جەختی کردۆتەوە کە نابێ هیچ کامێکیان ڕێیان پێ بدرێت — کاتی ناچارییو زەرووڕەت نەبێ — خۆ ئەو کارەش (نیابەت)، هەمووئەوانەی — بە زیادیشەوە — تێدایە، دەبێ ژن ماڵ بەجێ بهێڵێت، لەگەڵ پیاوان تێکەڵ ببێ . ڕووخسارو دەستی دەربخات، بەتەنها بچێتە دەرەوەی وڵات..و..و..

لەبەر ئەم هۆکارانە وا دەزانم هیچ موسڵمانێك نەوێرێ ڕێ بە (نیابەت)ی ژنان بدات.. جگە لەمانەش ئیسلام هەموو کات لە (تەشریعات)دا، بەرژەوەندییە گشتییەکان پێش دەخات، جا هەر شتێ بەرژەوەندی گشتیی داوای بکات، ڕێی پێدەدات، هەر تێکیش بەرژەوەندی داوای نەکات ڕێی لێدەگرێت.

دەسا با بێین پێکەوە تەماشای مەسەلەی (نیابەت)ی ژنان بکەین، بزانین بەرژەوەندییە گشتییەکان ڕێمان پێدەدەن ببنە جێگر لە ئەنجوومەندا، یانا ؟ چونکە بە ئەندامبوونی ژنان

له ئەنجوومەنی نوێنەراندا: ماڵو منداڵو بەرژەوەندییەکانی تری ماڵو پیاوان لە دەست دەچیٚ، وە هەر لەو ڕێگایەوە هەراو کێشەی حیزبایەتی لەناو خێزانەکەدا سەر هەڵدەدات..

دکتۆرسیباعیدەڵێ: لە یەکیٚ لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی ئەمریکادا ژنێك مێردەکەی خۆی کوشت، چونکە ئەم حەزی دەکرد سەرۆك کۆمارێك دەرچێت، مێردەکەشی حەزی دەکرد یەکێکی دی دەرچێت.

سەرقاڵکردنی ژنان بە سیاسەتەوە، هیچ مرۆڤێکی خاوەن ویژدانو هەقڕەو ناتوانیٚ نکووڵی لە زیانو زەرەرەکانی بکات، مەگەر مرۆڤە نەخۆش ویژدانو دەغز دارەکان، وەبێگومانە کە زیانی لە قازانجی زیاترە! خۆ ئەگەر دروست بیٚ بڵێین: ئەگەری ئەوەیش هەیە کە ئەو ژنە (نوێنەر)و جێگرە، ژنێکیقەشەنگو جوانو شۆخە شەنگ بێت، جا لە حاڵەتی ئاوادا دەکریٚ لە بەر جوانییەکەی سەرنجی گەلیٚ لە پیاوان بۆ خۆی ڕاکێشیٚو چەواشەیان بکاو دەنگی بدەنیٚ، ئەگەرچی شایستەی ئەو گۆڕەپانەیش نەبیٚ !

گریمان ئەوا بووە (نوێنەر) لە پەرلەماندا،ئەی دایکایەتییەکەی چی لیٚ دەکات ؟ ڕاستە واز لە کاری دایکایەتی بێنیٚ ؟! یاگریمان ببیٚ بە دایك، بەڵام ناوبەناو مۆڵەتێکی (سیٚ چوار) مانگی وەرگریٚ و بێتەدەر، وەکو ژنە وانە بێژو کارمەندەکانی تر ؟ خۆ گەلیٚ جاریش (حەیز)و بیٚ نوێژ، یان دووگیان دەبیٚ، لەو ماوەیەشدا ژن مەشرەبو سروشتی تێك دەچیٚو پێویستی بە مۆڵەتو حەوانەوەیە، بە کورتیی لەوانەیە ئەگەر ئەو مۆڵەتانەی بخەیتەسەر یەك، تەواوی دەورە دانیشتنەکانی پەرلەمان بگرێتەوەو ئەو هەر لە ئیجازەومۆڵەتدا بێت ! دە ئاخۆ دەزگا دەوڵەتییەکان بە کاری ئاوای ژنان چاودێری دەکرێت، یان دەتوانن یاسایەك (تەشریع) بکەن، کە ئەوە حاڵیان بێت ؟؟.

ئەگەر ژنان خاوەن ویژدان بن، بە وردی لەم مەسەلەیە تێدەگەنو بۆ خۆیان خەریکی کاری دایکایەتییو منداڵ بە خێوکردنو پەروەردەکردنیان دەبن و لە ڕووی لەشساغییو تەندروستییو گەشەدان بە ئەقڵو ژیریان چاودێریان دەبن.. ئایا (خادمە)، یان خزمو کەسوکار دەتوانن وەك دایك دلۆڤانیو خۆشەویستی بە منداڵ ببەخشن..؟ ئایا ئەو مندالانە کە ڕۆژانە چەند کات ژمێرێك لە دایکیان دوور دەخرێنەوە، وەکو ئەو مندالآنە میهرەبانن کە هەمیشە لەگەڵ دایکیان دەژین ؟

نازانم دەبیٚ کەڵکی چی بێت ژنان بکرێنە نوێنەر؟ بڵێیت بۆ پاراستنی هەستی ئینسانیەتی خۆیان بێت؟ واتە: بەوە ویژدانی خۆیان ئاسوودە بکەن کە لە کاروبارەکانی دەوڵەتدا هاوبەشن. بڵێیت بۆ ئەوە بێت ڕێزو حورمەتیان بگێڕنەوە؟ بە ڕای ئێمە هیچ کام لەوانە نییە،

چونکه هەر بە پێی یاسا ئەوانەی لە (سیلك)ی سوپادا کار دەکەن، ماف بەشداربوونیان نییە ببنە ئەندامی پەرلەمان ! دە ئاخۆ بەوە پلەو پایەیان دابەزیوەو سووك بوون ؟.

بەرژەوەنـدی گـەل وا هەڵـدەگرێت – هێنـدێ جـار – کۆمـەڵێك بـە کارێکـەوە خـەریك بـن و، کۆمەڵێکیش بەکارێکی تر، دەبێ هەندێ سەربازو پاسەوانی وڵات بن، هەندێکیش بازرگان، هەندێکی دی سەرپەرستی و چاودێری منداڵان بکەن و دایك بن، هەر کەس لە سنوورو توانای لێهـاتوویی و لێوەشـاوەیی خۆیـەوە، هـەموو ئەوانـەش جێگـەی ڕێـزو حورمـەتن لای گـەل و جەماوەر، هیچ کامێکیشیان لەوی تر کەمتر نییە لە بواری خۆیدا بۆ خزمەت بە کۆمەڵگە.

دکتۆر دەڵێ: ئەم مەسەلەیە لە جیهانی ئیسلامیەوە هەڵنەقوڵیوەو زادەی بیری موسڵمانان نییـە، بەڵکو گوشارێکی خۆرئاوایی یەو چاوبڕینە لەوان، کە ئەوانیش پاش سەدان ساڵ ئەوسا ئـەو بڕیارەیـان دا و ژنانیـان هێنایـە پەرلەمانـەوە، ئـەویش سـاڵ دوای سـاڵ ژمـارەی (نائبـات) کـەم دەبێتـەوە لـە پەرلەمانەکانـدا، چـونکە دەزانـن سـەرقاڵکردنی ژنـان بـە کـاری سیاسـەتەوە تەکلیفـە مەزنەکـەی خـۆی – چـاودێری مـاڵ ومێردو دایکایـەتی و پـەروەردەی منداڵان – لەکیس دەچێ و ئەوسا خێزان هەڵدەوەشێتەوە... سـەرباری ئەمانـەش من بـۆ خـۆم سـەردانێکی پەرلـەمانی (بـەریتانیا)م کـرد، تـەنها ژنـێکم نـەدیت، چـونکە هەریەکـە بـە بیانوویەکەوە (غائب)بوون و نەهاتبوونە سەرکارەکانیان !.

(سویسرا)کە وڵاتێکی پێشکەوتەو لەبەرە تا ئێستاش ژنەکانیان بە ئارەزووی خۆیـان مومارەسـەی کـاری سیاسـیی ناکـەن و هـەر کـاتێکیش ڕیفرانـدۆم کرابـێ بـۆ ئـەوە لـە ٩٥٪ ی‌دەنگەکان (نا) بووە بۆ مومارەسەی کاری سیاسی.

لـە کۆتـایی بابەتەکـەدا – دکتـۆر سـباعی – دەڵـێ: ئەگەرچـی تۆمـەتباریش بکـرێم بـە دواکەوتـەو جێمـاو لـە قافڵـەی گۆڕانکارییـە نوێکانـدا، بـەڵام بـە ڕاشـکاوی ڕادەگەیـەنم کـە: سەرگەرمکردنی ژنان بە (سیاسەت)ەوە، لای ئیسلام زۆر بێزراوو نکۆڵی لێکراوە، ئەگەر بڵێم حەرام و قەدەغەیە ! لەبەر لێنەهاتوویی و هەڵنەگرتنی شانی ژنان نییە بۆ سیاسەت، بەڵکو لەبـەر ئەوەیـە کـە کۆمەڵـە زیـانێکی گـەورەی لـێ پەیـدا دەبـێ بـۆ کۆمەڵگـەو بـە ئاشـکرایش پێچەوانەی داب ونەریت و ئەخلاق و قییەمی ئیسلامە، چونکە تێکەڵی ژن و پیاو و خەڵوەت و سەفەر بۆ دەرەوەو..و..و.. لێی پەیدا دەبێ.

بەڵێ.. بەپێی ئەم نووسین و شیکردنەوەیە، دەرکەوت کە لە بنەڕەتدا هیچ ڕێگرو هۆکارێك نییـە بـۆ مومارەسـەی کـاری سیاسـی لەلایـەن ژنانـەوە، وەلەبـەر لێنـەهاتوویی و کـەمتواناییيان نییـە – ئەگـەر ڕێنـەدرێن – ئـەوە نـەبێت کـە کارەسـەرەکییەکەی خۆیانیـان – دایکایـەتی و

پەروەردەی منداڵان و مافی مێرد – لە کیس دەچیٚ و ئیختیلاط و تێکەڵی لەگەڵ پیاوان ڕوو دەدات. ئایا چارەسەری ئەو شتانەی بۆ دەکریٚ تا بچێتە گۆڕەپانی سیاسەتەوەو کار بکات و کارەکانی خۆی ئیفلیج نەبن..؟!.

دکتۆر (محمد سعيد رمضان البوطي) لە کتێبی (المرأة بين طغيان النظام الغربي ولطائف التشريع الرباني) دەڵێت: کاتیٚ خوا دەفەرمووێ: ﴿..وشاورهم في الأمر..﴾ آل عمران:)١٥٩. واتە: لە کارەکاندا ڕاوێژو مەشوەرەتیان پیٚ بکە. یان دەفەرمووێ: (وأمرهم شورى بينهم..– شوری: ٣٨). واتە: کارەکانیان لەسەر بناغەی مەشۆرەتە لە نێوان خۆیاندا. دیارە ئەوانە کە ڕاوێژیان پێدەکرێت پێك دێن لە پیاوان و ژنان و هەردوولایان مافی ڕاوێژ پێکردنیان هەیە. ڕۆژی (حودەیبیە) – پاش ئەوە ڕیٚ لە پێغەمبەرو هاوەڵان گیرا کە بچنە ناو مەککەوەو عومرە بکەن – پێغەمبەر ﷺ داوای لە هاوەڵان کرد: ئەو حەیوانەی بە (هەدیی) ودیاریی هێناویانە بۆ (كعبة الله) سەری بڕن و سەریان تێغ بکەن تا تەعبیر لە شکاندنی ئیحرام بکات، بەڵام ئەوان – لەبەر ناڕەحەتی و کاریگەری ئەو مەسەلەیە لەسەردڵیان – نەجوولان و کارەکەیان ئەنجام نەدا ! پێغەمبەریش ئەمەی بە (أم سەلەمە)ی خێزانی گێڕایەوە، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ! ئەگەر دەتەویٚ ئەوان ئەو کارە بکەن، بچۆ بێدەنگ بۆ خۆت دیاریەك سەربڕەو کەسیٚ بانگ بکە سەرت بتاشیٚ، پێغەمبەریش ﷺ هەڵسا چوو کاری بە قسەکەی (ئوم سەلەمە) کرد. (بوخاریی).

شێخ (حەسەنی بەصری) دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە لەبەر ڕیعایەت وچاودێری خودا دا ژیاوە، وە لە هیچ کارێکدا پێویستی بە ڕاوێژ نەبووە بە ژنان، بەڵام ویستی بەوکارەیەی – دوای خۆی فەرمانبەرانی ئیسلام – پرس و ڕابە ژنان بکەن و بیکەنە بنەمایەك بۆ ڕاوێژ پێیان.

(ئیبن حەجەری عەسقەلانی) لە کتێبی (الإصابة)دا دەڵیٚ: (ئەبوو بردە) لە باوکییەوە گوتی: هەر گرفتێکمان پێش هاتبا و بردبێتمانە لای خاتوو (عایشە– خوا لێی ڕازی بیٚ) دەربارەی ئەو گرفتە زانیاریی هەبوو و چارەسەری دەکرد. (عەتا بن رباح) دەڵیٚ: خاتوو عایشە لەناو خەڵکدا لە هەموو کەسێك زیاتر و تێڕمانینی لە هەموان باشتر بوو.

(خولەفای ڕاشیدین)یش لەگەڵیٚ ئیش وکاردا مەشوەرەتیان بە ژنان دەکرد و کاریشیان پیٚ دەکرد. وە لە هیچ فەرموودەو کتێبێکدا نەهاتووە: مەشوەرەت بە ژنان نەکریٚ، یان بەگوێیان نەکرێت، ئەگەرچی لەوانەیشە درۆو دەلەسەیەکی زۆر بەدەم پێغەمبەرەوە دژ بە ژنان هەڵبەسرابیٚ.

مەسەلەی پرس و ڕا بە ژنان وقبوڵکردنی ڕاوبۆچوونەکانیان، لەلای ئیسلام و زاناکانی

ئیسلام قبوڵـەوکاری پێـدەکرێ و هـیچ کێـشەیەکی تێـدا نییـە، بـەڵام ئـەوەی ئـەمڕۆ بووبێتـە هـەراو کێـشەو ئیختـیلاف لای زاناکـانی سـەردەم ئەمەیـە کـە: ئـەو پـرس و ڕا وەرگرتنـەو مەشـوەرەتە پێیـان، لەسـەردەمی پێغەمبـەرو خولـەفای ڕاشـیدیندا بـە شـێوەو شـێوازی ئـەمڕۆ نـەبووە، واتـە: هـاتبن لـە جێگایەکـدا کۆمـەڵێ ژن وپیـاو بـە تێکەڵـە، یـان بەرامبـەر بـە یـەکتر کۆبکەنەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ هاتووە لە ڕێ وشوێنێکی تایبەتدا مەشوەرەتی بە خێزانی خۆی دەکرد، (عومـەری کـوڕی خـەتتاب) کە مەشوەرەت بـە (حەفصە)ی کـچی خـۆی دەکـات، لـەناو کـۆڕو ئەنجومەنێکـدا نـەبووە پێکهاتبێـت لـە پیـاوان و ژنـان، تـا (ئیختـیلاط)و تێکـەڵی ڕووبـدات، یـان ژنـان نـەتوانن کارەسـەرەکییەکانیان تێپـەڕێنن ! لێـرەوە کێـشەکە سـەر هەڵـدەدات و دەبێتـە هـەراو نـاکۆکی نێـو زانایـانی سـەردەم، ئەوانـەیان زانـاو بەرجەسـتەن دەڵێن: نابێ ژنان ببنە ئەندامو نوێنەر لە ئەنجوومەنەکانی ئەمڕۆدا، یان ئەگەر کرانـە نوێنـەر، دەبێ لە ماڵەوە پرس و ڕایان پێ بکرێت، نەك بچنە ناو ئەو کۆڕەوە کە پڕە لـە کـاری حـەرامو ناشـەرعیی بەرامبـەر بـە ژنـان. (سـەیری کتـێبی: (المفـصل فی أحكـام المـرأة..) ل٤،ل٣٣٣، وەکتێبی (نظریـة الإسـلام وهدیـه في السیاسة والقانون والدستور) ((أبـو الأعلـى المـودودي)) وەکتێبی (المرأة بین الفقه والقانون)ی دکتۆر سباعی بکە.

لەبـەر ئـەو هۆکارانەیـە کـە زانـای پایـە بـەرز (أبـو الأعلـى المـودودي) دەڵـێ: مـەرجی بـە ئەنـدامبوون لـە ئەنجوومـەنی ڕاوێـژدا (ذکورەت)ـە، واتـە: دەبـێ نێرینـە بێـت. یـان لـە کتـێبی (النظام السیاسي في الإسلام) (ذکورەت) دەکاتە مەرج بۆ ئەندامبوون لـە ئەنجومـەنی ڕاوێـژدا، جـا ئەگەرچـی هێنـدێ بەڵگـەش دێننـەوە بـۆ بۆچـوونەکەیان، وەك مەسـەلەی (قیوومیـەت)ی پیاوان بەسەر ژناندا:﴿الرجال قوامون على النساء..﴾ سوورەتی: نیساء /٣٤) بەڵام (الأحكام السلطانیة)ی (ماوەردی) کاتێ باسی مەرجەکانی (خەلیفە) دەکات، لە (ذکورییەت) بێ دەنگە ! بـەڵام کـە دێتـە سەرمەسـەلەی دانـانی (وزیـر التفـویض)، کـە ئـەمڕۆ جێگـری سـەرۆك کۆمـار دەگرێتەوە (ذکورییەت) دێنێتە ناو.

سەبارەت بە کردنی ژنان بە (وەزیر) هەر وەزیرێك بێـت لـە وەزارەتـەکان.. دکتـۆر (بـووتی) دەڵێـت: لـە هـیچ ئایـەت و فەرموودەیەکـدا نـەهاتووە ڕێ لـە ژنـان بگـیردرێ ببنـە وەزیـرو هـەر کەسـە بـە پێـی توانـا و لێوەشـاوەیی خـۆی کـار بکـات، بـە مـەرجێ پابەنـد بـن بـە حیجـاب و بـە (تعالیم)ـەکانی ئیسلامەوە.. هـەروەها دەڵێت: ئەو فەرموودەیـەش کـە دەفـەرموێ: ((لـن یفلـح قـوم ولّـوا أمـرهم إمـرأة = کەسـانێك کاروبـاری خۆیـان بـە ژن بـسپێرن، هـەرگیز ڕزگـار نـابن)) پێغەمبـەرﷺ کـاتێ ئـەوەی فەرمووکـە (پوراندخت)ی کـچی (شـیرویە) لـە (ئێـران) کرابوویـە

پادشاوله سەردەمی بابیا نوێنەرەکەی پێغەمبەریان کوشتبوو، کەوابوو تەنها پەیوەندی بە سەرۆك کۆمارەوە هەیەو تەنها لە سەرۆك کۆماری ڕێی لێدەگیردرێ، نەك بە ئەندام و وەزیر بوون لە پەرلەمانو وەزارەتەکان.

لە کتێبی (الحريات العامة فی الدولة الإسلامية \ نووسینی راشد الغنوشی) هاتووە:ئەو فەرموودەی ((لن يفلح قوم..)) لەوە تێپەڕناکات بۆیگوتراوە، واتە: نابێتە سەرچاوەیەك بۆ مەسەلە یاسایی یەکان ولەوەوە ڕێ لە ژنان بگیردرێ بۆ سەرۆك کۆماریی، لەولایشەوە زانایانی (علم الأصول) یەك دەنگ نین لەوەدا کە ئیعتیبار بە (عموم اللفظ)ـە نەك بە (خصوص السبب)، واتە:هەرشتێك بێژەکەی (عام) وگشتگیر بوو، مەرج نییە حوکمەکەیشی (عام) و گشتگیر بێت.

(غەنووشی) دەڵێت: نە ئایەتی(قەووامە- الرجال قوامون علی النساء..)،نە فەرموودەی (لن يفلح قوم ولوا أمرهم امرأة) بەڵگەن بۆ ڕێگرتن لە ژنان بۆ سەروك کۆماریی و، بوون بە ئەندمام لە مەجلیسی نوێنەران، چونکە ئایەتەکە سەبارەت بە ئاڵۆزی و کێشەی ناو خێزان هاتووەو دەدوێ، ئیتر هیچ پەیوەندییەکی بە مەسەلەی سیاسەتەوە نییە تا ببێتە لەمپەرێك بۆ ڕێگرتن لە ژنان لە کارو باری سیاسەتدا،ئاماژەشی بە راو بۆ چوونی (تقی الدين النبهانی) و(ئیبن حزم) کردووە کە هەردوو ڕێیان داوە ژنان ببنە ئەندام لە پەرلەماندا، جا بۆ دواییش باسی سیستمی کۆماری ئیسلامی ئێران دەکات کە ژنانی گەیاندۆتە پەرلەمان، بگرەکردوونی جێگری سەرۆك کۆمار.

**پوختـــەتر بڵـێین**: ئەو ئاڵو گۆڕو تەکانەی دنیای ئەمڕۆ - لە هەموو ڕوویەکەوە - جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ چاخەکانی پێشوودا، جا لەبەرئەوە بۆ چارەسەری ئەو کێشانە، فەتوای موفتییەکی زیرەك ودیندارو چاوکراوەو دنیا دیدەی دەوێ، دەیەوێ زاناکان - ئەوانەیان باوەڕ بە فەتوایان دەکرێت - لێرەو لەوێ- کۆببنەوەو زۆر بەوردی لە مەسەلەکە بکۆڵنەوەو ئەوسا ئیجتیهادی تێدا بکەنو ڕای خۆیان دەربڕن.

من وادەزانم - وەکو سباعی دەڵێت - ژنان هیچ کەمو کورتییو ناتەواویەکی جەستەییو یاساییو شەرعییان نییە، تا ڕێیان لێ بگیردرێ بۆ مومارەسەی کاری سیاسیی، بەڵکو سەرەتاو کۆتایی ئەوەی لەمپەڕ بێت لەبەردەم ئەو کارەدا: تێکەڵبوونو لەدەسچوونی کارەسەرەکییەکانیانە، وەکو (سەرپەرستی ناوماڵ، پەروەردەو پێگەیاندنی منداڵان، مافی ژنو مێردیی، تێکەڵ نەبوون) خۆ ئەگەر ڕۆژێ هات توانرا شەرعپەسەندانە ئەو کێشانە چارەسەرکران، هیچ ئەستەمێکی تر نابینرێ بۆ مومارەسەی کاری سیاسیی.

## بەشداری ژنان لە ناو سوپادا

١- دکتۆر (محمد خير هيكل) لە کتێبی (الجهاد والقتال في السياسة الشرعية)دا دەڵێت:

٢- بە پێی ئەو ڕیوایەتانە لە (بوخاریی)و کتێبەکانی تردا هاتوون، بەشداری ژنان لەناو سوپادا زۆر کەمو بە شێوەیەکی وا بووە، کە زۆرێکی زۆرینەی سوپاکە نەیانزانیوە بە هاتنیان بۆ جەنگ و بەشداریکردنیان، بەتایبەت جارێك (نجدة الحروري) نامەیەك بۆ (ئیبن عەباس) دەنووسێ ودەپرسێ: ئایا پێغەمبەر ﷺ غەزای بەژنان دەکرد؟ ئەویش گوتی: (وقد كان يغزو بهن فيداوين الجرحى). (صحيح مسلم، رقم الحديث (١٨١٢)ج ١٤٤٤/٣). واتە: بەڵێ پێغەمبەر ﷺ ژنانی دەبردە غەزاو، تیمارو چارەسەری زەخمییەکانیان دەکرد، ئەمە مانای وایە کە بەشداربوونیان بە شێوەیەك بووە، زۆرکەم دەرکیان پێکردووە.

٣- بەشدارییان لەبەر ئەوە نەبووە کە وەکو پیاوان جیهادیان لەسەر فەرز بوو بێت، بەڵکو – بەپێی ئەو ڕیوایەتە کە دەڵێ: (ئوم سولەیم) داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر ﷺ کرد لەگەڵی بچێتە غەزا و، فەرمووی: (يا أم سليم ! إنه لم يكتب علي النساء الجهاد...) واتە: ئوم سولەیم! ژنان جیهادیان لەسەر نییە – بە (تطوع) وئارەزووی خۆیان بووە.

٤- دۆزی ئەو ژنانەش بەشداریان دەکرد، خزمەت بوو بە جەنگاوەرەکان: کەل‌و پەلەکانیان دەپاراست، خواردنیان ئامادە دەکرد، برینەکانیان بۆ دەپێچان، تیمارو چارەسەری نەخۆشەکانیان دەکرد، جەستەی شەهیدەکانیان دەگوێزایەوە لە ناوچەی جەنگەکەدا... هتد.

٥- چەك هەڵگرتنیان و مومارەسەی جەنگەکان.. لەو ڕێ‌و شوێنانەدا جەنگەکە (فرض العين) بووبێ، چەك هەڵگرتنیش فەرز دەبووە سەریان، لەلایەکەوە بۆ بەرگری لە خۆیان، وەکو ڕۆژەکەی (یەرمووك)، لە لایەکی دیکەشەوە بۆ بەرگری لەخودی پێغەمبەر ﷺ – کە ئەمەش لەبەرگری لەخۆ گرنگترە – وەکو (أم عمارة الأنصارية) کە لە (ئوحود)دا بە قارەمانانە لە پێغەمبەر ﷺ بەرگری دەکرد، یان (ئوم سولەیم) ڕۆژی (حونەین) خەنجەرێکی بەدەستەوە گرتبوو بەرگری لە خۆی دەکرد، یان ڕۆژی (ئوحود) ژنان چەکیان هەڵگرت‌و ڕاستەوخۆ چوونە جەنگەوە، لە هەمان کاتیشدا ئایەتی (حیجاب) هاتبوو. واتە: مەسەلەی (حیجاب) ڕێ لە جیهادی ژنان ناگرێت.

فوقەهاو زاناکانیش – لەگەڵ جیاوازیی مەزەبیان – دەڵێن: ئەگەر جیهادەکە (فرض الكفاية) بوو، ژنان جیهادیان لەسەر نییەو نایەنە جەنگەکانەوە. خۆ ئەگەر دوژمن هێرشی هێناو بە پیاوان بەرگری نەدەکرا، دەبێ ژن‌و پیاو، کۆیلەو قەرزار بەشداری بکەن، بەڵام کە جیهاد نە (فرض العين) و نە (فرض الكفاية) بوو لەسەر ژنان، ئایالەو کاتانەدا دەتوانن چەك

هەلگرن‌و ڕاستەوخۆ بچنە جەنگەوە؟

بەپێی ئەو فەرموودە لە (بوخاری)یدا، ژمارە (٢٨٧٥)ج ٧٥/٦ی (فتح الباری)دا هاتووە لە وەڵامی پێغەمبەرﷺ بۆ خاتوو (عایشە): ((جهادكن الحج...)) وەكو (إبن بطال) دەڵێ كە جیهادیان لە سەر نەبێ: مانای ئەوە نییە بە ئارەزووی خۆشیان نەتوانن جیهاد بكەن.

(إبن قدامە)ی (حەنبەلی) دەڵێ: ژنان ئەگەرچی جیهادیان لەسەر فەرز نەبێ، بەڵام دەتوانن بچنە جەنگەكانەوە، جا بۆ پشتگیری لەو قسە ی خۆیە دەڵێ: (كانت (أم سليم) و(نسيبة بنت كعب) تغزوان مع النبي – صلى الله عليه وآله وسلم – فأما نسيبة فكانت تقاتل! وقطعت يدها يوم اليمامة...) المغني لإبن قدامة. ٣٩١/١٠. واتە: (ئوم سولەیم) و (نوسەیبە) لە گەڵ پێغەمبەردا – دروودو سڵاوی لە سەر بێت – دەچوونە غەزا، نوسەیبە لە نەبەردەكاندا جەنگی دەكردو لە (یەمامە)شدا دەستی پەڕی.

لەوانەیە ئەم پرسیارە بێتە پێشەوە: ئایا ژنان بە عەمەلی دەتوانن بچنە ناو سوپاوەو دۆزی خۆیان ببینن ؟

بۆئەو وەڵامە دەڵێین: بێگومانە كە ژنان جیهادیان لەسەر نییە، چونكە جیهادو خۆئامادەكردن بە پلەی یەكەم لەسەر پیاوانە، وەهەر پیاوانیش بە ئاسانی دەتوانن سوپا پێكبهێنن‌و ئامادە بن بۆ ڕۆژی تەنگانە.. جا لەگەڵ ئەوەیشدا ئەگەر بەرژەوەندی موسڵمانان خواستی كە ژنانیش – بەپێی بڕیاری سەرۆك‌و پەرلەمانی موسڵمانان – بە عەمەلی بچنە ناو سوپاوە، لە حاڵەتی ئاوادا كارێكی دروست‌و ڕەوایە. (الجهاد والقتال في الشريعه الإسلاميه) دكتۆر (محمد خير هيكل) بەرگی ٢ ل١٠٢٣ – ١٠١٣.

## ژنان‌و كاركردن لەدەرەوەی ماڵ !

لە دینی ئیسلامدا بە گەلێ ئایەت‌و فەرموودەی باوەڕ پێكراو مرۆڤ هاندراوە بۆ كردو كۆشش و هەوڵۆ تەقالا بۆ پەیداكردنی ژیان‌و گوزەرانێكی خۆش، لەوانە: ﴿فإذا قضيت الصلاة فانتشروا في الأرض وابتغوا من فضل الله...﴾ سوورەتی (جمعە) ئایەتی ١٠. ﴿هو الذي جعل لكم الأرض ذلولا فامشوا في مناكبها وكلوا من رزقه وإليه النشور﴾ سوورەتی (ملك – ١٥). لە فەرموودەیشدا: (إن الله يحب العبد المؤمن المحترف). (ما أكل أحد طعاما قط خيرا من أن يأكل من عمل يده، وإن نبّي الله داود – عليه السلام – كان يأكل من عمل يده) بوخاري. كەوابوو كارو كاركردن لە ئیسلامدا كارێكی پیرۆزو پێویستە و دەبێ پشتگوێ نەخرێت، هەر وەك فێربوونی پیشەو پیشەسازیش كارێكی پەسەندو (مستحب)ی ئیسلامە،

خودا بە داود – علیه السلام – دەفەرمووێ: ﴿ولقد آتینا داود منا فضلا، یا جبال أوّبي معه والطیر وألنا له الحدید، أن اعمل سابغات وقدّر في السرد واعملوا صالحا إني بما تعملون بصیر﴾ سوورەتی (سبأ/١٠ – ١١).یان ئایەتی ﴿وعلمناه صنعة لبوس لكم لتحصنكم من بأسكم فهل أنتم شاكرون﴾ سوورەتی (ئەنبیا /٨٠).

* کارکردن شتێکی ڕێی پێدراوو (مباح)ـە، خۆ ئەگەر مرۆڤ پێویستی هەبوو بە ژیانو گوزەرانی ماڵو منداڵی،کارکردن (واجیب) دەبێ.

* مرۆڤ لە پەیداکردنی ژیانو گوزەراندا ئازادە، وەکو لە ئایەتو لە فەرموودەکانەوە دەردەکەوێت، واتە: نەبە زۆر کاری پێدەکرێ، نە ریگایشی لێدەگیرێ، بەڵکو ئازادە چۆن کاردەکاو کەی دەیکات، مەگەر کاتێ کارەکەی زیان بە مەردم بگەیەنێت، وەکو (ئیحتیکار) وقۆرخکردنی شتومەكو فرۆشتنی بە بەهایەکی زۆرو گران بەپێی ڕۆژگار. یان کاتێ ئەگەر کار نەکات، خۆیی و ماڵو منداڵی برسیان ببێ، لەهەردوو ئەو حاڵەتەدا، شەریعەتی ئیسلام دەست دەخاتە کارەکەیە وەو بەزۆر کاری پێدەکات، یان ڕێی پێنادات ئەو جۆرە کەسابەتە بکات.

* بێگومان کارکردن بۆ بەدەستهێنانی ژیانو گوزەرانو پەیداکردنی جلو بەرگو مەسکەنو جێی نیشتەجێبوون، لای ئیسلام پێویستو واجیبە.

ئینجا سەبارەت بەکاری ژنان لەدەرەوەی ماڵ – لەکاتێکدا کە ئەوان ژیانو گوزەرانیان لەسەر براو باوكو خزمو مێردە – دەبێ ئەو کارکردنەیان کارەسەرەکییەکانی ماڵەوەی– وەکو کارەکانی ناو ماڵ وژیانی ژنو مێردیی و وەڵامدانەوەی خواستەکانی و پەروەردەو پێگەیانو چاودێری منداڵان – لە کیس نەدات، چونکە جێبەجێکردنی ئەو کارانە کاتێکی زۆری دەوێت، لەوانەیە ئەگەر بە راستی ماف خۆیانیان بدرێتێ، ژن ئەوەند کاتی نەمێنێ بۆ کارکردن لە دەرەوەی ماڵ، خۆ ئاشکرایە کە یەکێ لە مافەکانی مرۆڤ بەسەر یەکەوە ئەوەیە بەرامبەر تەنگە تاونەکاو ماف نەخوات.

* لەبەر ئەوەیە کە زاناکان ڕێ لە کاری ژنان لە دەرەوەی ماڵ دەگرن، چونکە بەو هۆیەوە کارە سەرەکی یەکانی خۆیان لەدەست دەدەن و تێکەڵی بە پیاوانیش ڕوودەدات، بێ ئەوەی هیچ زەروورەتو ناچارییەك هە بێت. خۆ لەوانەیشە کەسێك بڵێت: ژنان دەتوانن لە جێی خۆیاندا (کارەکەر)ێك دابنێن بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان:(ئیشو کاری ناوماڵ و پەروەردەی منداڵو... هتد) ئایا لەو حاڵەتەشدا هەر ڕێیان لێ دەگیردرێ ؟

بۆ ئەو وەڵامە دەڵێین: ئاشکرایە ئەو دڵسۆزیو دلۆڤانیە کە ژنان خۆیان بەرامبەر بە ماڵو منداڵو پەروەردەی منداڵان هەیانە، هەرگیز بەکارەکەر پڕ ناکرێتەوەو جێبەجێ نابێت،

بەتایبـەتی مـافی ژن‌و مێـردی، خـۆ لەولایـشەوە کارەکـەریش هـەر ژنـەو لـەماڵ هاتۆتـە دەر و، لەوانەیە ئەویش ئیشەکانی خۆی لەدەست بدات !

پرسیارێکی تر دێتـە پـێش: ئایا ئـەو ژنانـە مێردیـان نـەکردووە، رێ لـەوانیش دەگیـدرێت لەدەرەوەی ماڵ کار بکەن ؟.. لەوەڵامدا دەڵێین: لەحاڵەتی ئاوایشدا هەر رێیان لـێ دەگیردرێ، چونکە – ئەگەر هەژار بن – نەفەقەو ژیانیـان لەسـەر پیاوانـەو، ماڵیش باشـترین رێ‌و شـوێنە بـۆ پـاك راگرتنیـان‌و تـووش نـەبوونیان بـەکاری ناشـەرعیی، لـەو لایـشەوە دەبـێ خزمـەت بـە باوك‌و دایکیان بکەن و لەسەر کاری ناوماڵ رابێن.

* بەڵام ئەگەر چوونە دەرەوەیان زەروورەت بوو و هیچ چارەسەرێکیان نەبوو، ئـەوە لـەژێر بنەمای: (الضرورات تبیح المحظورات) دەتوانن بە ئەندازەی پێویستییەکەیان بچنە درەوەو دەست بکەنە ئیش‌و کاری شەرعیی وریێ پێدراو لـە ئیسلامدا، هـەروەها بـە بەڵگـەی ئـەوە کـە دوو کچەکەی (شوعەیب) – لـە کاتێکدا باوکیـان پیرەو نـاتوانیێ ئیش‌وکاری دەرەوە بکـات – هەڵدەسـن دەچـنە لای پـەزەکان‌و دەیانلـەوەڕێنن‌و دەیـان هێـنن بـۆ سـەر ئـەو گۆلاوانـەو حەشامەتێکی لەسەر کۆبۆتەوە بۆ ئاوە خۆرەی ئاژەڵەکانیان، ئەمانیش لەدوورەوە چاوەڕوان دەکەن کە بەشکو گۆلاوەکان چۆڵ ببن و ئەمانیش پەزەکان بێننە سەر ئاوەکە وئاو بخۆنەوە، لەو کاتـەدا (مووسا) پێغەمبـەر – علیه السلام – لـە (میسر)ـەوە دێتـە (مەدیـەن)و ئـەو حاڵەتـە دەبـێنێ‌و بـەزەیی دێتــەوە پیایانـداو بۆیـان ئـاو دەدات، دیـارە ئەگـەر زەروورەت نـەبووبا و باوکیان پیر نەبووبا ئەو کارەیان نەدەکرد، وەکو لـەم ئایەتـەوە دەردەکەوێت: ﴿ولما ورد ماء مدين وجد عليه أمة من الناس يسقون، ووجد من دونهم امرأتين تذودان، قال: ماخطبكما قالتا لانسقي حتى يصدر الرعاء وأبونا شيخ كبير فسقى لهما..﴾ سوورەتی (قصص/٢٣–٢٤). خۆ دیارە ژیانی گوندنشینەکانیش لەگەڵ ژیانی شارنشینەکان جیاوازە، بێشك ئەگەر شـوعەیب نێرینەیـەکی لابووبـا کـچەکانی نـەدەنارد بـۆ نـاو ئـەو حەشـامەتە، کـەوابوو لـەکاتی ناچاریدا بۆ ژنان رەوایە لە ماڵ بێنە دەرو ئێش‌و کاری خۆیـان جێبـەجێ بکـەن، بـەڵام لەگـەڵ ریعایـەتی پـەردەی شـەرم‌و حیـشمەت دا، وەکـو دوو کـچەکە نـەیان ویـست تێکـەڵ بـبن بـە پیاوەکان‌و چاوەڕوانیان کرد تا بەشکو چۆڵ ببێ !.

* ئیمامی (بوخاری) لە (ئەسمای کچی ئەبووبەکرەوە– خـودا لێیـان رازیـی) دەگێڕێتـەوەو دەڵێـت: کـاتێ(زوبـەیر) مـارەی کـردم لەسـەر رووی زەویـدا جگـە لـە وشـترێك (ئاومـان پـێ دەردەهێنا)و ئەسپێك، هیچ شتێکی نەبوو، ئینجا بۆ خۆم ئالیکم بە ئەسپەکە دەداو، ئاویشم دەردەهێنـاو سـەتڵە گەورەکـە – کـە ئـاوم پـێ دەهێنـا – دەم دووریـەوەو هـەویرم دەشـێلا،

ئەگەرچی باش نەمدەزانی نان بكەم، بەڵكو ژنە دراوسێ ئەنصاریەكان دەهاتن نانیان بۆ دەكردین، كە بەڕاستی كۆمەڵە ژنێكی ڕاستبوون، سەرباری ئەوەیش پووشو پڵاشی ئەو زەویەی پێغەمبەر ﷺ دابووی بە زوبەیر دەمنایە سەرسەرم و دوورم دەخستەوە، جالە كاتی ئەنجامدانی ئەو كارەدا بە پێغەمبەر ﷺ — كە كۆمەڵە پیاوێكی ئەنصار لە خزمەتیا بوون — گەیشتمو بانگی كردمو وشترەكەی پخ كرد، بۆ ئەوەی لەپشتی خۆیەوە سوارم بكات. (ئیبن حەجەری عەسقەلانی) دەڵێت: پێغەمەر ﷺ ویستوویەتی ئەسما و كەلوپەلەكەی سواری وشترەكەی بكاو، بۆ خۆشی بچێ وشترێ پەیدا بكات سواری ببێت. ئەسما دەڵێ: شەرمم كرد لەگەڵ پیاواندا بچم، لەولایشەوە غیرەتی زوبەیرم بیركەوتەوە، كەبەڕاستی لە هەموو كەس بە غیرەتتر بوو، ئیتر كە پێغەمبەر ﷺ زانی من شەرم دەكەم، ڕۆیشتو منیش هاتمە لای زوبەیرو ئەوەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش گوتی: سوێند بە خوا گواستنەوەی ئەوشتانەم بە سەر هەڵگرتن لانا خۆشتربوو لەوە لەگەڵی سواربوویتایە، ئەمجا دەڵێ: بۆ دوایی (ئەبووبەكر — خوا لێی رازیی) خزمەتكارێكی نارد ئەسپەكەی بۆ بە خێو دەكردن، ئەوەندەم پێخۆشبوو وامدەزانی ئازادی كردووم. فتح الباری/٩٩٠ل٣٩٦ ژمارەی فەردووده: ٥٢٢٣.

(ئیبن حەجەری ئەسقەلانی) دەڵێ: هۆكاری ئەوە كە (ئەسما) قبووڵی ئەو هەموو كارە قورسو سەختانە بكات و (ئەبووبەكری) باوكیی و (زوبەیری) مێردیشی بێدەنگ دەبن، سەرقاڵبوونیان بوو بە جیهادوو كارەكانی پێغەمبەرەوە ﷺ، زوبەیر بۆ خۆیشی پەردەژی نەبوو هەڵسێت بە ئەنجامدانی ئەو كارانەو دەسەڵاتیشی نەبوو كەسێك بە كرێ بگرێت بۆ كارەكانو (بەندە)یشی نەبوو ئەو كارانە بكات بۆیان، لەبەر ئەوە ئیشو كارەكان خڕبوونەوە سەرشانی (ئەسما)و ئەویش زۆر بە جوامێرانە شانی دایە بەریانو سەرباری ئەوانیش ئیشو كارەكانی ماڵەوەیشی دەكرد! تا زوبەیر باشتر خۆی یەكلا بكاتەوە بۆ سەرخستنی ئیسلام، جگە لەوەیش، باوونەریتی ئەو كاتە — وەكو ئەمڕۆ — هاوكاری ژنان بۆ پیاوەكانیان بەنەنگ و لەنگ دانەدەنرا.

ئەم فەرمووده وادەگەیەنێت كە ژنان هەڵسن بە ئەنجامدانی هەموو ئەو ئیشو كارانە مێردەكانیان پێویستیانە، وەكو ئیمامی (ئەبوو ثور) دەڵێ، بەڵام جەماوەری زانایان دەڵێن: ئەسما بە ئارەزووی خۆی و بە (تطوع) هەڵساوە بەو كارانە، نەك وەكو ئەوە لە سەر شانی پێویست بووبێت. (ئیبن حەجەری ئەسقەلانی) دەڵێ: ئەوی بۆم دەردەكەوێ لەم ڕووداوەو وێنەی ئەو رووداوە،حاڵەتی ناچاریی و (ضرورت) نیشاندەدات، بۆیە ئەوە ناكرێ بە حوكمو بڕیارو بدرێ بەسەر ژنانی تردا.

كە وابوو لەم داستانەی خاتوو(ئەسما)وە دەردەكەوێت كە ژنان دەتوانن لە ماڵ بچنە

دەرەوەو کـار بکـەن، ئەگـەر زەروورەت و پێویـست بـوو، چـونکە هەمیـشە (زوبـەیر)ی مێـردی خاتوو ئەسما سەرقاڵی جیهاد بوو، خـاتوو ئـەسمایش بـە تـەنها لـە ماڵـەوە هـەموو کارەکـانی دەرەوەو نـاوەوەی ماڵـەوەی دەکردو خزمـەتی (زوبـەیر)یـشی لـەکیس نەدەچوو، وەکـو چـۆن ژنـانی مانـدو نەناسـی ئـەمڕۆی لادێکـانی خۆمـان، شـان بەشـانی پیـاوان کاردەکـەن و بـە سەختیـشی نـازانن و کەسیش بەنـەنگ و لـەنگی نـازانێ، چونکە ژیـانی بـۆ ئـەوان وا بـە ڕێـوە دەچـێت، هەقـە زانایـان بڕیـار لەسـەر حاڵـەتی زەروورەت و ناچـاری بـدەن و دیـاری بکـەن، بێگومـان ژنێکـی هـەتیوبارو بێکـەس، زۆر بـە ئاسـانی دەتـوانێ بـچێتە دەرەوەو کارەکـەریی و باخـەوانی و کـشتوکاڵ بکـات، بـەڵام هـەرکات زەروورەتەکـەی نـەما، بـۆ نموونـە: منداڵـەکانی گـەورەبوون، یـان لـە لایەکـەوە مانگانەیـەکیان بـۆ دیـاریکرا، دەبـێ دەسـت لـە کـاری دەرەوە هەڵگرێ و بگەڕێتەوە ماڵ.

دکتـۆر (سیباعی)دەڵێت: ئـەوی لـە ئـەحکام و شـەریعەتی ئیسلام شـارەزابێت، دەزانـێ کـە کـڕین و فرۆشـتن لـە لایـەن ژنـان و بازرگـانی کردنیـان ڕەواو دروسـتە، تەنانـەتی پێویـست بـە مۆڵەتی مێردو سەر پەرستیاریشی ناکات. هەروەها لەو حاڵەتەدا کە ژنان کەسێك شك نەبەن نەفەقەیان بکێشێت، لە نێو زانایاندا هیچ ئیختیلاف وناکۆکی نییە کە دەتوانێ لە ماڵ بچێتە دەرو کار بکات.. تەنانەتی ئەو کچەش کە بەپێی شەریعەتی خودا تا مێر دەکات نەفەقەی لەسـەر باوکیـەتی، ئەگـەر بـاوکی مۆڵـەتی دا بـچێت – بـۆ نموونـە – لـە دەرەوەی مـاڵ بەرگدروویی بکات، دەتوانێ بچێ کار بکا، ئەوسا نەفەقەی لەسەر شانی باوکی نامێنێت.

بەڵێ.. ئیسلام زۆر بەحورمـەت و بە ڕێـزو سـەنگەوە سـەیری ژنـان دەکـات، بە هـیچ شـێوەیەك رازیی نییـە سـەرماو گـەرمایان ببێـت، ڕازی نییـە ئیش و کـاری قـورس و سـەختیان پـێ بکرێـت، سـەرەڕای ئەمانـەیش گـشت، ژیـان و ژینیـانی خـستۆتە سـەر شـانی پیـاوان: تـا کـچن ومێردیـان نـەکردووە، دەبـێ بـاوك و دایـك و بـراو خـزم و کـەس وکاریان بـێ منـەت بیانژیـەنن، کـە کـاتێکیش مێردیـان کـرد، پێویستە مێردەکـەیان بەشـێوەیەکی شـەرعی پەسـەند گوزەرانیـان بدەنـێ،جا لـەم سۆنگەوەیە کە ژنان – تا ناچار نەبن – ڕێیان نادرێ لە ماڵ بچنە دەر بۆ ئیش و کار، بـەڵام بـەلای خۆرئاواییەکانەوە هەرکات کیژ گەیشتە(١٧) ساڵ، دەبێ بچێت هەوڵی نان و تفاق و گوزەران بـۆ خۆی بدات، بۆ ئەوە شتێك پێکەوە بنێت بۆ ئەو ڕۆژەی مێرد دەکات، تا پێشکەش بە مێردەکـەی بکات، جا کەمێردیشی کرد، دەبێ شان بەشانی مێردەکەی هەوڵ بدات بـۆ بـژێوی خـۆی، ئەوسـا کە پیریش دەبێ ولە هەمانکاتدا توانای کاری دەمێنێ، هێمان هەر دەبـێ بـەردەوام بێـت لەهـەوڵی پەیداکردنی نان وئاودا، ئەگەرچی کوڕی ملیۆنلێریشی هـەبێت ! ئەمەیـە کەلـەوێ وادەکات ژنان

شـەووڕۆژ لـەدەرەوەی مـاڵ لـە یـەکێ لـە کۆمپانیەکانـدا سـەرقاڵی ئیش‌وکاروکاریگـەری بـن، سـەرەڕای (حـەمل)و سك وزایـان و تێرکردنـی ئـارەزووی گورگانـەی پیاوەکانیـان ! ئەگـەر ژنـان بـەلای ئەوانـەوە ئـەوە حاڵیـان بـێ‌و خۆرئـاوا بەرنامـەی ئـاوای بـۆ تۆمـارکردبن، خەریکـە بڵـێین ڕاکردنیان لەماڵەوە بۆ دەرەوە لە پێناو بەدەست هێنـانی ژیـن و گوزەران هەقە، خۆ بێگومـانیش گـەلێ جار وەکو پێویست کاریـان دەست ناکـەوێ، بۆیـە ناچاری لەشفرۆشیش دەبن ! چونکە نەباوك‌و برا لێیان دەپرسێتەوە، نەمێردیش پاش شووکردنیان.

جا کەئەوە حاڵی ئەوان بێ، بێشك ناچارن و دەتوانن لەماڵ دەرپەڕن، بەڵام بۆ دەبێ ژنـانی لای خۆمـان وەکـو ئـەوان پێیـان خـۆش بێـت لـە مـاڵ بێنـە دەرو شـان بدەنـە بـەر ئیش‌وکـار، لەکاتێکـدا ئیـسلام هـەموو کـات ژیـانی مـسۆگەرکردوون ؟!. جارێکیـان لەگـەڵ کـچە لاوێکـی زانکۆدا – کە لە یانەیەکی بازرگانیدا لەسەر ئامێرێکی تایپ – کاری دەکرد و پێویستیشی بەوکارکردنـە نـەبوو، کەوتمـە بـاس‌و توێژینـەوەو پێمگـوت: دەبـێ فەلـسەفەی چـی بێـت تـۆ کاردەکەیت و ئاتاجیش نیت ؟ گوتی: تا هەست بە ئینسانیەتی خۆم بکەم ! گوتم: کارکردن‌و کارنـەکردن پەیوەنـدیان بەهەسـتکردن بـە ئینـسانییەتەوە نییـە، چـونکە زۆرێـك لەوانـە کـار دەکەن، هـەر نـازانن هەسـتی ئینـسانیەت چییە؟ زۆرێکیش هـەن کـار ناکـەن بـەڵکو بـە فیکـری خۆیان هەوڵدەدەن، لە هەموو کەسێك پتر هەست بە ئینسانیەتی خۆیان دەکەن.

بـۆ نموونـە: لەهەنـدێ وڵاتـدا سـەربازو کارمەنـد ڕێیـان نـادرێ بازرگـانی بکـەن، چـونکە سەرقاڵی ئیش‌وکاری ترن‌و لە یەك کاتدا ناتوانن هەردوو کارەکە ئەنجام بدەن، سـەرباز دەبـێ هـیچ کـارێکی تـر نـەکات ئـەگینا خزمـەت‌و پارێزگـاری وڵاتـی پێنـاکرێ.. ئایـا ئـەو ڕێ پێنەدانـەیان دەبێتـە ئیهانـەو سـوکایەتی بـە (ئینـسانیەت)یان؟ ئایـا سـەرۆك کۆمارێك ڕۆژ تـا ئێـوارە سـەرقاڵی ئیـشوکاری جـەماوەرەو ڕێـی بازرگـانی‌و کـاری تـری لـێگیراوە، هەسـت بـە سـوکایەتی دەکـات...؟. گـوتی: مـن نامـەوێ ببمـە نانـە خـۆری بـابم، دەمـەوێ بـە ئـارەقی نێوچـەوانی خـۆم‌و دەسـت‌و بـاهووی خـۆم بـژیم. گـوتم: مەگـەر ئـەو کارمەنـدو سـەربازانەی لەدەوڵەت مووچە وەردەگرن، خۆیـان بەنانـەخۆری دەوڵـەت دەزانن‌و چاولەبەری دەوڵـەتن، لـە کاتێکدا ژیانیان لە خزمەتدا دەبەنە سەر؟ ئەو کچەش لەماڵەوەیە هەمیشە لەخزمـەتی پاك‌و تـەمیزی ناومـاڵ‌و ڕێك‌و پێك کردنیـدا دەژی و هـەردەم لـە خزمـەت بـاوك ودایکیدایـەو، هـیچ منەتێکی تێدانییە، ئەگەر نەفەقەی لەسەر کەس‌وکاری بێت. ئایا ئەو ژنانـەی لـە مـاڵ دەچنـە دەرو (٨–٩)کاتژمێر سەرقاڵی ئیش‌وکارن، کاتێ دەگەڕێنـەوە مـاڵ پـەلاماری خزمـەتی منـداڵ و ناوماڵ نادەن؟ مەگەر تا دیسان دەچێتەوە دەرەوە شەوو ڕۆژ خەریکی ڕێکخستنی ناو ماڵ

نین ؟ واته: ئیشوکارەکانی ژنان دووبەرامبەر بۆتەوە، چونکە ئەو ماوە زۆرە لە دەزگایەکی دەوڵەتدا، یان لە کۆمپانیایەکدا خەریکی ئیش‌وکارە، کە دەشگەڕێتەوە ماڵ، حاڵی لەوە باشترنییە ! ئایا ئەمە ستەم نییە لە ئافرەتان..؟ بە داخەوە ژنانی لای خۆیشمان دەیانەوێ چاو لەوان بکەن ! بۆیە داوای کار دەکەن لەدەرەوەی ماڵ، ئەگەرچی ژنانی خۆرئاواو وڵاتەکانی سۆڤیەت ناچاریش بن لەدەرەوەی ماڵ کار بکەن.

ئێمە دوو بەرامبەرکردنەوەی کاری ژنان بەوشێوەیە، بەکارێکی ناهەق‌و ستەم دەزانین،بێگومان ژنێك لە ماڵەوە خەریکی خزمەتی ماڵ‌و منداڵ بێت،پاشان ئیش‌وکاری کشت‌وکاڵ‌و ئاژەڵ بە خێوکردن‌و باخداری پێ بکرێت بە ستەمی دەزانین، بەستەمی دەزانین بنێردرێتە دەزگایەکەوە لەبەرامبەر پارووییەکەوە کە ئەویش لە گەڵ رێزدا بۆیان تەنها بەشی ئارایش‌و خۆڕازاندنەوەی خۆی دەکات، بەتایبەتی ئەگەر لەم لای خوارەوە بکرێتە خزمەتکاری قوتابخانەیەك، یان نەخۆشخانەیەك، یان لە جێگایەکدا چای پێ لێ بنرێت ! یان لەدەر گای (وەزیر)ێکدا لەسەر کورسییەك دانیشێ تا جەرەسی بۆ لێبداو بچێتە خزمەتی بزانێ چی دەفەرموێ ؟!

بەستەمی دەزانین کە گەلێ جار جەنابی بەڕێوەبەر ئیش‌وکاری ماڵەوەیشی پێدەکات، جا لەم سونگەیەوە بە پێویستی دەزانین – کە هەردوولا – ئیسلامیی‌و خۆرئاواو سۆڤیەت، بە جیددی چاوێ بگێڕنەوە بە مەسەلەی ژناندا، چونکە ئەوی ئیسلام دیاری دەکات بۆ ژنانی موسڵمان، بێگومانم بەڕێك و پێکی بۆیان ئەنجام نادەن، دیارە کە خۆرئاوایش ئەرکی ژنانی دووبەرامبەر کردۆتەوە! سەرباری ئەوەش کردوویەتی بە ئامێرێکی ڕابواردن بۆ پیاوان‌و، ئەوەند یانەی خۆجوانکردنیان بۆ ئامادە کردوون‌و ئەوەند خەرج‌و باجی خۆ ئارایشدانیان خستۆتە سەرشانیان، ئەگەروەکو ئنیسانییەت بنێردرێ بۆ رەش ورووتەکانی ئەفەریقا بەشی هەموان دەکات.

## ژنان لە دەربڕینی ڕاوبۆچووندا ئازادن

لەبەر ئەوە کە ئیصلاح‌و چاکسازی نێو کۆمەڵگە کارێکی زۆر زەروورو پێویستە، هەقە لەسەر ژن و پیاو هەردوو هەڵسن بەو کارەیەو هەردەم لەهەوڵ‌و تەقەلادابن بۆی، هەر لەبەر ئەمەش بوو کە لە سەردەمی ڕابردوودا ژنگەلێك هەبوون بەئازادانە ڕایان دەربڕیوەو داوای ماڧ خۆیانیان کردووەو وەڵام دراونەتەوە، لەوانە:

١- خاتوو خەولە –خودا لێیخۆش بێت – کاتێ لەگەڵ (ئەوس)ی مێردیدا ناکۆك بوون،

ئەوس پێیگوت: تۆ وەکو دایکمی، ئەوقسەیەش لەلای خەولەخان زۆر کاریگەرو سەخت بوو، چـونکە بـەپێی نـەریتی ئەوسـەردەمەیە حـەرام دەبـوو لـە (ئـەوس) ! بۆیـە چـووە لای پێغەمبەر(صلی الله علیە وآلە وسلم) سکالاًی لە ئەوس کردو گوتی: (أكل مالي وأفني شبابي، ونثرت له ما في بطني حتى إذا كبرت سني وانقطع ولدي، ظاهر مني، اللهم إني أشكو إليك) ئەی پێغەمبەر! ماڵی خواردم و سەردەمی لاوی فەوتانموو، منداڵم لێیبووە، وا ئیستایش کە پیربووم پێمدەڵێ: تۆ وەکو دایکمی! ساخوایا سکالاً بۆ تۆ دێنم، ئینجاخودایش بە ئایەتی ﴿قد سمع الله قول التي تجادلك في زوجها...﴾ وەڵامی داخوازییەکەی دایەوەو چارەسەری بۆ دانا، وەکو لە شوێنی خۆیدا باسکراوە.

٢- ئیمامی بوخاریی لە فەرموودەی ژمارە (٤١١٤)دا لە (خەنسای کچی خزام)ی ئەنصارییەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: من بێوەژن بووم و، باوکم بە مێردی دام‌و حەزم لێ نەدەکرد! منیش چوومە لای پێغەمبەر(صلی الله علیە وآلە وسلم) رووداوەکەم بۆ باس کرد، ئەویش لە بەر ئەوە کە حەزم لێنەدەکرد نیکاحەکەی هەڵوەشانەوە. لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (أن أباها زوجهاوهي بكر) نەسائی. واتە: هەر بە کچیی باوکی بەمێردییداو، ئەویش حەزی لێنەکرد، پاشان پێغەمبەر(صلی الله علیە وآلە وسلم) نیکاحەکەی هەڵوەشاندەوە.

٣- نەسایی لە خاتووعایشەوە -خودا لێیرازیی بێت - دەگێڕێتەوە کە: کچێك چووە ماڵیان گوتی: باوکم لەبرازایەکی خۆی مارەیکردووم، دەیەوێ بە من شانی بەرزبکاتەوەو منیش حەزم لێی نییە ! خاتوو عایشە لای خۆی داینا، پاشان کە پێغەمبەر (صلی الله علیە وآلە وسلم) هاتەوە قسەو باسەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش ناردی بەدوای باوکیا بۆ چارەسەری کێشەی ئەو کچەیە، لە هەمانکاتیشدا مەسەلەکەی خستە دەستی کچەکە (کە ئەگەر ڕازی دەبێ بەو کابرایە لێی مارە کراوە دانیشێ، ڕازیش نابێ، دەتوانێ نیکاحەکەی هەڵوەشێنێتەوە)، کیژەکەش گوتی: ئەوەی باوکم کردوویەتی، منیش مۆڵەتم دا و هەڵم بژارد، بەڵام ویستم بزانم کە ژنانیش بۆ کاروباری خۆیان شتیان بەدەستە.

٤- ئیمامی بوخاریی لە فەرموودەی ژمارە (٤١١٦) دەگێڕێتەوە کە ژنێك بە ناوی (بریرە)وە، ژنی (مغیث) ناوێکی کۆیلە و ڕەشتاڵەو ناشیرین دەبێ، بریرەش – کە نیزەك دەبێ – خاتوو (عایشە) دەیکریێو ئازادی دەکات، کەنیزەیش بەپێی باوو نەریت، هەرکات ئازاد کرا سەرپشك دەبێ بۆ مانەوەو جیابوونەوە لە مێردەکەی، بۆیە لای نەمایەوەو لێی جیابوویەوە، چونکە زۆر بێزار بوو لەسەرو سیمای (مغیث) ی مێردی، ئەویش (بریرە)ی زۆر خۆش دەویست. (ئیبن عەباس) دەڵێ: (مغیث) لە پشتی (بریرە)وە دەرچوو و ئەسرین لە

چاوی دەڕژا بەسەر ریشیاو تەڕی دەکردو هەردەم دەگریا بۆی ! ئەوسا پێغەمبەر(صلی الله علیه وآله وسلم) (بریره)ی بانگ کردو گوتی: کاش دەچوویتەوە لای. گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! فرمانم پێ دەکەیت بەو داوایەت یانا؟ فەرمووی نەخێر.. تکات لێ دەکەم، بریره گوتی: هیچ کارێکم پێی نیە ئەی پێغەمبەری خودا!.

بەڵێ لەم فەرموودانە و لە چەند فەرموودە گەلێکی ترەوە کە لەبەر درێژبوونەوەی باسەکە نەمانهێنان – ڕوون بوویەوە کە ژنان بە ئازادانە دەتوانن لای سەرۆکی دەوڵەتیش ڕاوبۆچوونی خۆیان دەربڕن و داکۆکی لە مافەکانی خۆیان بکەن و پێویستە لەسەر هەموو کەسیش گوێیان بۆ بگرێ و لەچوارچێوەی ئیسلامدا داخوازی یەکانیان جێ بەجێ بکات، بەتایبەتی لەمەسەلەی (زەواج)دا، چونکە ڕەوای هەق نییە بەزۆر مرۆڤێك بکرێتە هاوسەری کەسێك، بەهیچ شێوەیەك حەزی لێ نەکات.

## ژنان سکاڵا دەبەنە لای پێغەمبەر ﷺ

(ئەسمای کچی یزید ئەنصاریە) دەچێتە لای پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: من نوێنەری کۆمەڵێ لە ژنانم ناردوویانم بێمە لات ئەم پرسیارە بکەم و وەڵامەکەی بەرمەوە بۆیان...پرسیارەکە ئەمەیە کە ئێمە وەکو ژنان دەبینین پیاوان زیاتر ئامادەی نوێژەکانی (جومعەوجەماعەت) دەبن و دەچنە جیهادەوە، ئێمەش لەماڵەوە ماڵ و منداڵیان بۆ بەخێو دەکەین، بڵێیت وەکو ئەوان پاداشتمان هەبێ ئەی پێغەمبەری خوا! پێغەمبەریش ﷺ ڕووی لە هاوەڵان کردو فەرمووی: تا ئیستا بیستووتانە باشتر لەم ژنە، ژنێك بێت لەمەڕ دینەکەیەوە پرسیار بکات ؟! گوتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: دە بچۆ هەواڵ بەو ژنانەی تریش بدە کە: ئەو باشگوێ ڕایەڵی و بەخێوکردنی ماڵ و منداڵەتان بەرامبەر بە پاداشی ئەرك و هەوڵی پیاوانە.

**تێبینی:**

ئازادی بۆ دەربڕینی ڕاوبۆچوون، سنووری هەیەو نابێ هیچ کەسێك لەو سنوورە دەربچێت، خۆ ئەگەر کەسێك لێی دەرچووو بە ئارەزووی خۆی پێنووسەکەی، یان زمانی خستە گەڕ، وە بێ شەرموشکۆ لە موسڵمانان و خاوەنی ئەم دینە، کەوتە ئاخاوتن دژ بە ئیسلام – لێرەولەوێ – ئەوە لە حاڵەتی ئاوادا ڕێیان لێ دەگیردرێ و ئازادی ئاوا قەدەغە دەکرێت، چونکە ئازاری کۆمەڵێ مرۆڤی تر دەدەن، وە ئەو وڵاتەیش وڵاتێکی ئیسلامیەو دەبێ ڕێز لە بەها پیرۆزەکانی بگیردرێ.. دیارە ئەم مەسەلەیە لەگەڵ کەسێکی نەشارەزادا، کە

بیەویٚ گومانو دوودڵی خۆی لە هەندیٚ مەسەلەدا بڕەوێنێتەوە جیاوازی هەیە، بۆ ئەمەیان ڕێگەی (مناظەرە)و لێکۆڵینەوە هەیە لەهەر باسێکدا بۆی ڕوونو ئاشکرا نەبێت، بەڵام ئەو کەسە فێربووە کە هەمیشە زمانو قەڵەمی خراپو بەد دەڵێت، بیٚ ئەوەی بیەویٚ شارەزاو ڕێنما بکرێت لە ئیسلامدا، هەقە ڕێی لیٚ بگیردریٚ.

## ژنان دەتوانن فێری هەموو زانیارییەك بن

هەر ئایەتو فەرموودەیەك لەبارەی فێربوونی زانستو زانیاریەوە هاتبن، ژنو پیاو تیایاندا وەکویەك هاوبەشنو پێویستە هەردوو فێریان بنو لەکاری ڕۆژانەیاندا کاریان پیٚ بکەن، بۆیە (ئیبن حەزم) دەڵێت: (وفرض على كل امرأة التفقه في كل ما يخصها كما ذلك فرض على الرجال..) هەروا لەسەر باسەکەی دەچیٚو دەڵێت: (ولو تفقهت امرأة في علوم الديانة للزمنا قبول نذارتها، وقد كان ذلك، فهؤلاء أزواج النبي ﷺ وصواحبه قد نقل عنهن أحكام الدين . وقامت الحجة بنقلهن، ولا خلاف بين أصحابنا وجميع أهل نحلتنا في ذلك، فهن أزواجه عليه السلام: أم سليم وأم حرام وأم عطية وأم كرز وأم شريك وأم الدرداء وأم خالد وأسماء بنت ابي بكر وفاطمة بنت قيس وبسرة، وغيرهن، ثم في التابعين: عمرة وأم الحسين والرباب وفاطمة بنت المنذر، وهند الفراسية وحبيبة بنت بسرة، وحفصة بنت سيرين و غيرهن) الإحكام في أصول الأحكام ج٣ص٣٢٤. کەوابوو فێربوونی زانیاری یە ئیسلامیەکانو هەرچی پێویستی ژیانی ئینسانەکانی لەسەر بێت، پێویستە لەسەر شانی ژنانیش وەکو پیاوان، تەنانەتی ئەگەر ئەوان شتێکیان داهێناو ئیجتهادێکیان بوو لەهەر مەسەلەیەکدا پێویستە جیهانی ئیسلامەتی گوێڕایەڵیان بنو کاری پیٚ بکەن، چونکە فەرموودەی: ((من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين)) گشتگیرە بۆ پیاوو ژنان.

ئیمامی (بوخاری) لە خاتوو (عایشەوە) — خودای لیٚ ڕازیی بێت – دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ((نعم النساء نساء الأنصار لم يمنعهن الحياء أن يتفقهن في الدين) بەخ لە ژنانی ئەنصار، چونکە بۆ فێربوونی کاروباری دین، شەرم ڕێی لیٚ نەگرتن. دووبارە (بوخاری) لە (زينب بنت أم سلمە)وە دەڵێت: (ام سلمە) هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: (يا رسول الله ! إن الله لا يستحي من الحق، فهل على المرأة من غسل إذا احتلمت؟ قال النبي ﷺ: إذا رأت الماء) ئەی پێغەمبەری خوا! خودا هەقەو شەرمی لە هەق نییە، مەگەر ژنیش خۆشۆشتنی لەسەرە کاتی (ئیحتیلام) بوو؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەرکات ئاوی دیٚت. واتە: ئەگەر کەسێك لە خەویا ئەو کارەی کرد، لەهەمان کاتیشدا (ئاوی) هاتەوەو ئاوەکەی دیٚت، دەبیٚ خۆی بشۆرێت

(پیاو بیٚ یان ژن). ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ لە بیستنی ئەو قسەیە شەرمگرتیو دەمو چاوی داپۆشی و گوتی: مەگەر ژنیش ئیحتیلامی دەبێت؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەستت بەخێردا بچێت، ئەی ئەگەر وانییە چۆن منداڵ لەدایکەکەی دەچێت؟.

ژنانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ لەبەرامبەر کاروباری دینیاندا ئاوا بوون، هەرگیز شەرم ڕێی لێ نەگرتوون لە پرسیارکردن، پیغەمبەریش ﷺ دنەی دەدان و پێیدەفەرموون: (فلتسأل، فإن طلب العلم فريضة). واتە: دە با ژن بپرسێ، بەڕاستی هەوڵی فێربوونی زانیاری (فەرز)و پێویستە. بۆیە ژنانیش لە پێغەمبەریان ﷺ خواست کە ڕۆژێکیان بۆ تەرخان بکات بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاریی، ئەویش ﷺ بەڵێنی دانیٚ و هەموو کات لەو ژوانەدا دەچوونە خزمەتیو ئامۆژگاری دەکردن. دیارە هەر شتێك پێویستی ژیان بێت، لە ئیسلامدا ڕێی پێدراوە کە ژن و پیاو فێری ببن، بەڵکو پێویستی کردۆتە سەریان، بەتایبەتی ئەو زانیارییانەی پەوەندییان بە ژنانەوە هەیە وەکو منداڵبوون و نەشتەرگەری بۆ ژنان و... هتد. ئیسلام بەفەرزی دەزانیٚ کە ئەو جۆرە ژنانە لە کۆمەڵگەی موسڵماناندا ببن، وەبە واقیعیش بوون و کاریان کردووە.

ژنان هەقیانە فێری پیشەو پیشەسازی بکرێن، زانای بەناوبانگ (ئیبن عابدین)ی حەنەفیی ئەو مەبەستە ڕادەگەیەنێت کە دەڵێت: (فله – أي للأب – دفعها – دفع ابنته – لامرأة تعلمها حرفة كتطريز وخياطة مثلا).. بەڵام هێندیٚ پیشە هەیە کە پتر شایستەی پیاوانە وەکو بیناسازی و کاری میکانیکی – پێویست نییە ژن خۆی پێوە سەرقاڵ بکات، چونکە بە پیاوانیش دەکرێت. ژنانی پزیشك دەتوانن (عیادە) بکەنەوەوکاری ژنانەی تیا بکەن، مەگەر زەروورەت بێت پیاوانیش ببینن.

ژنان – ئەگەر پێویست بوو – دەتوانن لەگەڵ مەحرەمی خۆیاندا بچنە دەرەوەی وڵات بۆ خوێندنی ئەو زانیاریانەی پێویستن بۆ ژنان و لەوڵاتی خۆیاندا مەیسەر نابێت.

ژنان دەتوانن ژنانی تر فێری پیشەو پیشەسازیو نووسین و خوێنەواری بکەن، (ئەبووداود) دەڵیٚ: (شفاء بنت عبدالله) گوتی: من و خاتوو (حەفصە) پێکەوە بووین و پێغەمبەر ﷺ هات و فەرمووی: ئەوە بۆ حەفصە فێری چارەسەری نەخۆشی (نەملە) ناکەیت، هەرچۆن فێری نووسینت کرد؟ (نەخۆشی نەملە: لەتەنیشت مرۆڤەوە کۆمەڵە برینێك دەردەچن و هەمیشە خاوەنەکەی وادەزانیٚ مێرووله پێوەی دەدا، خاتوو شفاء چارەسەری دەکرد).

لەم فەرموودەوە وەردەگیردریٚ کە ژنان دەتوانن، ژنانی تر فێری نووسین و خوێنەواری

بکەن و هیچ قسەیەکیشی تێدا نیە (وەکو خطابي و ابن القیم) دەڵێن.

(ئیبن خەلەکان) لە کتێبی (وفیات الأعیان) دا باسی خاتوو (شهدە بنت أبی نصر) دەکاو دەڵێت: (شهدە)خان یەکێك بووە لە ژنە زاناکانی ئەو سەردەمەی خۆی، وە لە هونەری خۆشنووسیدا باڵا دەست بووە، خەڵکانی زۆریشی فێر کردووە، وە لە ساڵی (٥٧٤ك) کۆچی دوایی کرد.

(مقری)یش لە کتێبی (نفح الطیب)دا دەڵێ: (ئیبن حبان) لەبارەی (عائشة بنت أحمد القرطبیة) گوتویەتی: (لم یکن فی زمانها من حرائر الأندلس من یعدلها علما وفهما وأدبا، وکانت حسنة الخط تکتب المصاحف) توفیت سنة (٤٠٠هـ).واتە: لەسەردەمی خۆیدا (لە ئەندەلووس)، لە ناو ژنانی ئازاددا، لەڕووی زانستو تێگەیشتنو وێژەو ئەدەبەوە وێنەی نەبوو، وە ژنێکی خۆشنوسیش بوو، گەلێ جار قورئانی دەنووسیەوە، ئەوەبوو ساڵی (٤٠٠)ك بە یەکجاری گەڕایەوە بۆ لای خودای گەورەو میهرەبان.

بێگومان لە فێربوونو فێرکردنی ژنان لە قوتابخانەو لە هەر شوێنێکی تردا، پێویستە کۆمەڵە ئاڕاستەو (تعالیم)ێکی ئیسلامیی ڕەچاو بکرێن، لەوانە:

١. قوتابخانەو ڕێ و شوێنی خوێندنیان لە کوڕان جیا بێت، بەتایبەتی لە قۆناغی ناوەندیی و دواناوەندیی و زانکۆو بەرەو ژوورتردا.

٢. جلوبەرگی باڵاپۆشو (حیجاب)ی ئیسلامیی پەسەند لەبەر بکەن بۆ هاتووچۆیان بۆ قوتابخانە.

٣. هەتا دەکرێت دەبێ ژنان وانەکان بڵێنەوە پێیان.

٤. بەرنامەی خوێندنیان ئیسلام پەسەند بێت.

## خشڵو زەنبەری ژنان

خۆ جوانکردنو خۆڕازاندنەوە – لەسنووری خۆیدا – بەجلوبەرگی جوانو، پاك و تەمیزیی لاشەو جەستە بۆ ژنان شتێکی حەڵاڵو ڕێ پێدراوە لە ئیسلامدا، خودا دەفەرموێ: (قل من حرم زینة الله التي أخرج لعباده والطیبات من الرزق). (أعراف: ٣٢) نەك هەر ڕێپێدرا بێت، بەڵکو ئەوەند کە ئیسلام باسی پاكو تەمیزیی و خۆجوانکردن و خۆ ئارایشدان دەکات، هیچ ئایینو بیرۆکەیەك بەلایدا نەچووە.

خشڵو زەنبەر بۆ ژنان – بەتایبەتی ژنانی مێرددار – شتێکی (مستحب)و کارێکی پەسەندە، ئیمامی (ئەحمەد)لە خاتوو (عایشە)وە – خودا ڕازیی بێت لێی – دەگێڕێتەوەو

دەڵێ: (كانت امرأة عثمان بن مظعون تخضب وتتطيب فتركته، فدخلت علي فقلت: أمشهد أم مغيب؟ فقالت: مشهد، عثمان لا يريد الدنيا ولا يريد النساء). واتە: هاوسەرەکەی (عوسمانی کوڕی مظعون) خەنەی دەگرت و، بۆنخۆشی بەکاردەهێنا، جا بۆ دوایی دیتم وازی لێهێنا و هاتە سەردانم، منیش پێمگوت: لەماڵە (عوسمان) یا نا ؟ (عایشە-خودا لێی رازیی بێت) وایزانی بۆیە خەنەو بۆنخۆشییەکەی جارانی نەماوە، عوسمانی مێردی لە ماڵ نییە) ئەویش گوتی: لە ماڵە، بەڵام نەدنیای دەوێ، نە ژنان. عایشە دەڵێ: پێغەمبەر(صلی الله علیه وآله وسلم) هاتەوەو بۆم باسکرد. جا بۆ دوایی کە پێغەمبەر ﷺ بە عوسمان گەیشتبوو، پێیگوتبوو: ((أتؤمن بما نؤمن به؟)) واتە: ئاخۆ تۆش باوەڕت بەوە هەیە، ئێمە باوەڕمان پێی هەیە ؟ گوتی: بەڵێ.. ئەی پێغەمبەری خودا ! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((فأسوة مالك بنا)). پەیڕەوی لە ئێمە بکە. واتە: نابێ پشت لە دنیا و لە ژنان بکرێت، مەگەر کەسێك نەخۆش بێ و توانای نەبێ، کەوابوو ئەو حاڵەتەت لەگەڵ ژنەکەت بگۆڕەو با ئەویش خۆ برازێنێتەوە بۆتۆ. (ئەم باسە لە (نیل الأوطار- شەوکانی بەرگی٦ ل٢١٤ هاتووە).

بەڵێ.. لە بەشێك لە پەیوەندییەکانی ژن ومێردییە، خۆشەویستیی و سۆزو میهرەبانیی بۆیەکتر، بەهەر شتێك ئەو خۆشەویستییە زیاد بکات، دەبێ هەم ژنان، هەم پیاوان هەوڵی بۆ بدەن، ژنان دەبێ — لەسنووری خۆیدا — هەمیشە هەوڵی خۆ جوانکردن و خۆ ڕازاندنەوە بدەن بۆ مێردەکانیان، پیاویش هەروا بەجل و بەرگی جوان و خۆ شۆرین و چوونە گەرماوەوە — لە سنووری خۆیدا — دەبێ دریغی نەکات، ئەگینە پێچەوانەکەی دەبێتە مایەی کەم سۆزی و کەم دلۆڤانی ویەکێکی تر دڵی دەڕفێنێ...!

ژنان بە تایبەت وا خولقاون، پتر لە پیاوان حەزیان لە خۆجوانکردن و ئارایشە، ئیتر لەهەر تیرەو خێڵ و هۆزو عەشیرەتێك هەبن، پلەی سیاسیی و خوێندەواریان هەر شوێنێك گەیشتبێ، بۆیە ژنە گوندنشینێك و خاوەن دکتۆرایەك هەردوو وەك یەك هەوڵ بۆ زێڕو زیوو و خشڵ و زەنبەرە دەدەن، من ناڵێم ئەوە مانای ئەوەیە کە ژنان بە سروشت خۆیان بەکەم دەزانن لە پیاوان، بۆیە سەد ئەوەندەی پیاوان خۆخەریك دەکەن بە خشڵ و زەنبەرەوە بەمەبەستی خۆ شیرین کردن لای پیاوان، بەڵام لەواقیعدا شتێك هەیە کە ئاوا پاڵ بە ژنانەوە دەنێت کە هەموو هۆیەك بەکاربێنن بۆ خۆ جوانکردن، تەنانەتی خۆشیان ڕووت بکەنەوە، تا بەڵکو دە ئەوەندەی تر پیاوان حەزیان لێ بکەن !

ڕاستە ژنان بەسروشت حەزیان لە خشڵە، بۆیە قورئان لە سوورەتی (زوخروف:١٨) دەفەرموێ: (أو من ينشأ في الحلية وهو في الخصام غير مبين).هەر ئەمەیە کە زێڕو زیوو

ئاوریشم بۆ ژنان ڕەوایە، کەچی بۆپیاوان ڕێ نەدراوە: ((حرم لباس الحرير والذهب على ذكور امتي وأحل لأناثهم)) ترمذي دەیگێڕێتەوە.

ژنانی بەر لە ئیسلامو، ژنانی هاوەڵان لە سەردەمی ئیسلامدا، هەموو جۆرە خشڵێکیان بەکاردەهێنا: ئەنگوستیلەی هەمەجۆر، ئەنگوستیلەی پەنجەی دەست، پەنجەی قاچ. ئیمامی بوخاریی لە (ئیبن عەباس)ەوە دەگێڕێتەوە: دەڵێت: (شهدت العيد مع النبي ﷺ فصلى قبل الخطبة، فأتى النساء فأمرهن بالصدقة، فجعلهن يلقين الفتخ والخواتيم في ثوب بلال). لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: ((.. فجعلت المرأة تلقي قرطها)).

## بەکار هێنانی (کل ) وگۆڕینی ڕەنگی موو

کل: ئەو مادە هاڕاوە ناسکەیە کە: بە ئامێرێك چاوی پێ ڕەش دەکرێت.. (ترمذي)و (ئیبن ماجە) لە (ئیبن عەباس)ەوە دەگێڕنەوە و دەڵێن: (كانت عند النبي ﷺ مكحلة يكتحل منها ثلاثا في كل عين). واتە: پێغەمبەر ﷺ (کلدان)ێکی لا بوو، هەموو جار چاوی پێ دەڕێژیی، هەر چاوەی سێ جار.، کەوابوو بەکارهێنانی (کل) بۆ ژن‌وپیاو، کارێکی ڕێ پێدراوەو هەردوو دەتوانن بەکاری بێنن‌و چاوی پێ بڕێژن.

## بەکارهێنانی هەرمادەیەك بۆ گۆڕینی ڕەنگی موو

ئیمامی (موسلیم) لە (جابر بن عبدالله) دەگێڕێتەوە کە ڕۆژی (فەتحی مەککە) باوکی (ئەبووبەکری صدیق) یان هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ سەروڕیشی لەسپێتیدا دەتگوت (سەغامە)یە، (سەغامە: گیایەکە: گوڵو بەرەکەی هەردوو سپین) پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((غيّروا هذا بشيء واجتنبوا السواد)).واتە: ئەم ڕەنگە سپییەی (سەروڕیشی) بەشتێك بگۆڕن، بەڵام لە ڕەش دوور بگرن.

هەر ئیمامی (موسلیم) فەرموودەیەکی دی دەهێنێت: ((إن اليهود والنصارى لا يصبغون فخالفوهم)). واتە: جوولەکەو گاور بۆیە ناکەن (واتە: ڕەنگی سەروڕیش) ناگۆڕن. ئێوە ئەی موسڵمانان ! خۆ لەوان جیابکەنەوە، واتە: ڕەنگی سپی سەرو ڕیشتان بگۆڕن.

* ئیمامی نەوەوی دەڵێت: گۆڕینی ڕەنگی موو بۆ پیاوان و ژنان بەڕەنگی زەرد یا سوور، کارێکی پەسەندو(مستحب)ە، بەڵام بەڕەنگی ڕەش حەرامە (واجتنبوا السواد) بەڵگەیەتی.

* (ئیبن حەجەری عەسقەلانی) دەڵێ: بەکارهێنانی ڕەنگی ڕەش لەکاتی جیهادا هەندێ زانا ڕێی پێداوە، زانای وایش هەیە لەهەموو کاتدا ڕێی پێداوە، دەستەیەکیش لە زانا پێشینەکان ڕێیان پێداوە، لەوانە: (سعد بن أبی وقاص، عقبة بن عامر، الحسن، الحسين، جريرة)..،هتد،

پـاش ئـەوانیش زانـا گـەلێك ڕێیـان پێـداوە، ئینجـا سـەبارەت بـەو فەرموودەیـە كـە دەفـەرمووێ: (جنبوا السواد) بۆ كەسـێكە بەتـەواوی سـەری سـپی بووبێـت و بـەڕەنگ و ڕوخساریشیەوە دیـار بێـت، بـەڵام كەسـێك لا و بـیّ و مـووی سـەرو ڕیـشی سـپی بـوبیّ، دەتـوانیّ ڕەشـی بكـات: ((كنـا نخضب بالسواد إذا كان الوجه جديدا، فلما نفض الوجه والأسنان تركناه).

(ئیبن قـەییم) دەڵـیّ: ئەگـەر كـەمێك لـە ڕەنگـی ڕەش تێكـەڵی خەنـە بكـریّ و سەروڕیشی پـیّ ڕەنـگ بكرێـت، ئـەوە لـە حاڵـەتی ئـاوادا قەیـدی نییـە، چـونكە ڕەنگـی مووەكـە لـەنێوان ڕەش و سـووردا ڕەنـگ دەداتـەوە. دیـسان ئەگـەر ئـەو ڕەنگـە ڕەشـە، پیاوێكـی پیر بـۆ خەڵەتانـدنی ژنـان بەكاری بێنێت، یان ژنێك بۆ چەواشەكردنی پیاوان بەكاری بێنێت، بێگومان حەرامە، خۆ ئەگـەر بۆ ژنهێنـان و مێـرد كـردن نـەبوو، هـیچ قەیـدی نییـە، دەڵـیّ: ((فقد صح عن الحسن والحسين – رضي الله عنهما – أنهما كانا يخضبان بالسواد). (تحفة الأحوذي: شرح جامع الترمذي).

كـەوابوو ژن و پیـاو هـەردوو دەتـوانن – بەمـەرجیّ – بـۆ چەواشـەكاری و تـەدلیس نـەبیّ – ڕەنگی موویان، بگۆڕن بەهەر ڕەنگێك خۆیـان دەیانـەویّ، واتـە: پیاوەكە لەبـەر ژنەكـەی خـۆی و، ژنەكەش بۆ پیاوەكەی خۆی بێت، بۆیە هەقە ئافرەتانی بیّ مێرد، بەهیچ شێوەیەك نزیكـی ئـەو بۆیـەو ڕەنـگ كردنـە نەكەونـەوە، تـا چەواشـەی ئەمونـەو نەكـەن و بیـانخوازن بـەنرخی لاویەتی، كەچی وایش نەبیّ.

## دەستگرتنە خەنە

(ئەبوو داود) لە خاتوو (عایشە)وە دەڵیّ: (هند بنت عقبة)ی خێزانی (ئەبووسفیان)، پـاش (ئـەبوو سـفیان)ی مێـردی، ڕۆژی فـەتحی مەككـە موسـڵمان بـوو و گـوتی: ئـەی پێغەمبـەر ﷺ! بەیعەتم لێوەرگرە. فەرمووی: ((لا أبايعك حتى تغيري كفيك كأنهما كفّا سبع)) لە بەر ئەوە كە دەستەكانت لەدەستی دڕندە دەچن، تابەخەنە نەیانگۆڕی، بەیعەتت لیّ وەرناگرم !.

دووبارە (ئەبوو داود) لە خاتوو عایشەوە دەڵیّ: ژنێك لە پشت پەردەوە دەستی ڕاكێشا بۆ ئەوە كە نامەیەك بدات بەدەست پێغەمبەرەوە ﷺ ئەمیش دەستی نووقاندو نامەكەی لیّوەر نەگرت و فەرمووی: ((ما أدري أيد رجل أم يد امرأة؟)) نـازانم ئایـا ئەمـە دەسـتی پیـاوە، یـان دەستی ژن ؟ ژنەكەیش گوتی: دەستی ژنە. فەرمووی: ((لو كنت امرأة لغيرت أظفارك)). واتـە: ئەگـەر ژن بویتـا و ئوصـوولّی ژنانـت ڕەچـاوكردبا، نینۆكـەكانت دەگـۆڕی. كـەوابوو ژنـان هـەردەبیّ نیـشانەی خۆیانیـان پێـوە دیـاربیّ و هەمیـشە پـاك و تـەمیزی لـەڕەنگ و ڕوخسارو جەستەیاندا دیار بیّ.

بەکارهێنانی خەنە بەتایبەتی بۆ ژنی مێردردار (مستحب)و کارێکی پەسەندەو، هەقە ژنان هەردوو دەستیان تا دەگاتە جومگەی دەستیان لەخەنە بگرن، چونکە دەبێتە هۆی جوانی و زەنبەر بۆیان، هەروەها هەقە خەنە لە قاچیان تا دەگاتە قولە پێ بگرن، بەتایبەتی مێرددار وەکـو زاناکـان دەڵـێن، بـەڵام ئـەم کارانـە بـۆ چارەسـەر نـەبێ بـۆ پیـاوان رێـی لێگیراوە.لەفەرموودەیەکدا هاتووە: ((کان النبي ﷺ یلعن القاشرة والمقشورة)) رواه الإمام أحمد. خاتوو عایشە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەفرینی لەو ژنانە دەکرد، دەمووچاویان بۆ ژنان هەڵدەگرت و، نەفرینی لەوانەیش دەکرد کەدەم وچاویان بۆ هەڵدەگیرا.

## هەڵگرتنی دەمووچاو

دەمـوو چـاو هـەڵگرتن ئەوەیـە کـە ژنـان دەچـوونە لای ژنـانی تـر، دەرمانێکیـان دەدا لـە ڕوخساریان و گەش دەبوونەوەو هیچ شتێکیشی پێوە نەدەماو ناسك و نەرمۆڵە دەبوون.

جا ئەوکارەی ئەمڕۆش کە ژنان بۆ خۆیان، یان لە یانەی خۆ جوانکردن ئەو مـاددە گیراوانـە بـەکاردەهێنن و ڕەنـگ و ڕوخسـاریان سـوور، یـان سـپی، یـان سـورو سـپی وەردەگێڕێ، کـارێکی حەرامـە، چونکە ئـەو مـاددە کیمیاویانـە زەرەروزیانیـان پێدەگەیـەنن ئەگـەر بـۆ دوایـیش بێـت، لەولایشەوە (تەدلیس)و چەواشەکاریە، چونکە ژنێکی ناشیرین، دەتوانێ سەدئەوەندەی ژنێکی شەنگ وشـۆخ خـۆی بگـۆڕێ و بـازاڕی خـۆی پێگـەرم بکـا و سـەرنجی داخـوازان ڕابکێـشێت بـۆ خۆی و، بەرامبەرەکەی لەخشتە بـەرێت، ئەمـەش حەرامـە، ئیتر قسە لـەو هـەموو زەرەروزیانـە دارایـی یە ناکەین کە لە ولاتـی دەدەن و خۆشیان گیرۆدە دەبن، هـەتا دەگاتـە کـەس وکار، یـان مێردیان، ئەبێ ئەوەمان لەبیر نەچێت کە ژنانی مێرد دار، دەتوانن لەماڵـەوە بـەو مـاددە گیراوانـە کە زیان بە ڕوخساریان ناگەیەنێت، خۆ ئارایش بـدەن بـۆ مێردەکانیـان و بـەوە خـۆ ئامـادە بکـەن بۆ یەکتر، کە ئەوە لـە ئیسلامدا بـە شێکە لـە مـافی ژن ومێـردی لەسـەریەك، پیاوەکـە لـە سـنووری خۆیـدا، خـۆی پـاك و تـەمیز ڕابگـرێ، ژنەکـەیش لەچوارچێوەی خۆیـدا خـۆ ئـارایش بـدات تـا هەردوو ئامادە دەبن، ئەگینە ستەمیان لەیەکتر کردووە.

## بەکارهێنانی بۆنخۆشیی

بـەکارهێنانی هـەر مادەیـەکی بۆنخـۆش لـە دەم وچـاو و مـوو و جەسـتەو بـۆنکردنی، یـان هەڵگرتنی کـارێکی (مستحب)و پەسـەندە، ئیمـامی (بوخـاریی) لەخاتوو عایشـەوە – خـودای لێڕازیـی بێـت – دەگێڕێتـەوەو دەڵێت: ((کنـت أطیّـب رسـول الله بأطیـب مـا یجـد، حتـی أجـد وبـیص الطیـب في شـعره ولحیتـه)) پێغەمبـەرم ﷺ بۆنخـۆش دەکـرد، بەبۆنخۆشـترین شـتێك

بووبای، تا دەمدیت مووەوکانی ڕیشی بریسکەیان دەهات.

بەکارهێنانی بۆنیخۆش بۆ ژن و پیاو حەلاڵە. (ئەبوو سەعید) دەڵێ: باسی ژنێکیان دەکرد لای پێغەمبەر ﷺ گوایا ئەنگوسیلەی بە میسك ناوخەنکردووە، ئەویش ﷺ فەرمووی: ((وهو أطيب الطيب))نەسایی. واتە: میسك لەهەموو بۆنخۆشەکان بۆنخۆشترە، کەواتە بابەکاری بێنیٚ.

بۆنخۆشی ژنان بەمادەیەك دەبێ، بەڕەنگەکەی دەزانرێ، بەلاٚم بۆنی نییە (وەکو زەعفەران)، هی پیاوانیش بۆنەکەی هەیەو ڕەنگی نییە (وەکو گولاٚو)، ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: (طيب الرجال ما ظهر ريحه وخفي لونه، وطيب النساء ماظهر لونه وخفي ريحه)) ترمذي.

ژنان تا لەماڵەوە بن، دەتوانن هەمووجۆرە بۆنخۆشییەك بەکاربهێنن، بەلاٚم کە لەماڵ دەرچوون نابێ بۆنخۆشی وەك (عەتر)و ئەو مادانە بەکار بێنن، ئەمەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إذا استعطرت المرأة فمرت على القوم ليجدوا ريحها فهو كذا وكذا – قولا شديدا)). واتە: هەرکات ژن بۆنخۆشی بەکاربهێنێت وەکو (عەتر)و لەماڵ چووە دەر، تابۆنەکەی ببیسن، حاڵی خراپ دەبێ. هەروەها کاتێ بۆنیخۆشی بەکارهێنا، نابێ ئامادەی مزگەوت ببێ بۆ نوێژەکان، بۆ ئەمەیش فەرموودە گەلێك هەیە، چونکە ژنان جێگەی سەرنج ڕاکێشانی پیاوانن، لەبەرئەوە نابێ کارێ بکەن، پیاوان لە خۆیان بەخەبەربێنن، خۆ بێگومان عەترو ئەو جۆرە ماددانەش لەوانەن کە پیاوان بە خەبەر دێنن.

## قژی سەر

قژ شتێکە جوانی دەبەخشێ بەمرۆڤ، بۆیە باسێکی دورو درێژی هەیە: داهێنان و شانەکردنی و ڕۆنکردن و چەورکردنی، هەڵکێشانی، هتد. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((من كان له شعر فليكرمه))ئەبووداود. هەر کەسێك قژی هەیە، دەبێ ڕێزی لێ بگرێ: واتە:پاك و تەمیزی و شانەو ڕۆنی بکا، دەسبەرداری نەبێ تاوەکو لبادوخوری بلکێ بەیەکا و سەروسیمای ئاڵۆز بکات.

خاتوو (عایشە/خ) دەڵێ: سەری پێغەمبەرم ﷺ شانە دەکرد و بێ نوێژیشبووم: ((كنت أرجل رأس رسول الله وأنا حايض))بوخاریی. لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە (ئەنەس دەیگێڕێتەوە) پێغەمبەر ﷺ گەلێ جار مووی سەری ڕۆن دەکردو ڕیشی شانە دەکرد: ((كان رسول الله ﷺ يكثر دهن رأسه وتسريح لحيته)).

بەلاٚم خۆکردنە خزمەتکاری قژو هەمیشە بچییە لای ئاوێنەیەك و شانەو ڕۆنی بکەیت،

لەسنوور دەردەچیٚ و (مەکروهە)، ئەمەیە کە دەفەرمووی: ((نهی رسول الله ﷺ عن الترجل إلا غبا)) نەسایی. واتە: بەیناو بەین نەبیٚ، پیٚغەمبەر ﷺ ریٚی لە قژداهیٚنان و ڕۆنکردنی مووگرت.ئەم باسی قژ شانەکردن و ڕۆنکردنەیی و...هتد بۆ ژن و پیاو وەك یەکە، بگرە دەبیٚ ژنان زیاترو باشتر بەدەم قژیانەوە بن و پاك و خاویٚنی بکەن و شانەی بکەن، بەتایبەتی تر ئەگەر میٚرد دار بوون، بەلاٚم ئەمانیش دەبیٚ وریابن خۆ نەکەنە کارەکەری قژیان و هەردەم خەریکی بن.

## هەلٚکیٚشانی مووی سپی

بۆ ئەمەیش فەرموودە زۆرە، لەوانە: ((نهی رسول الله ﷺ عن نتف الشيب)) نەسایی. یان دەفەرمویٚ: ((لاتنتفوا الشيب..)) ئەبووداود. بەلاٚم لەباتی هەلٚکیٚشان دەتوانریٚ خەنەو ڕەنگ بکریٚت.

## تاشینی بەشیٚ لە مووی سەر ( بۆ ژن و پیاو ) قەدەغەیە

تاشینی لایەکی سەر، لەبەر نەخۆشی نەبیٚت کاریٚکی حەرامە، ئەوەیە کە (ئیبن عومەر) دەلٚیٚ: ((نهی رسول الله ﷺ عن القزع، فقيل لنا: ماالقَزعُ؟ قال: أن يحلق بعض رأس الصبي ويترك بعض)). (ئیبن عومەر/خ) دەلٚیٚ: کاتیٚ پیٚغەمبەر ﷺ منداڵیٚکی دیت، هەندیٚ لەسەری تاشراوبووو هەندیٚکی هیٚلٚرابوویەوە، ڕیٚی لیٚگرت و فەرمووی: (إحلقوه كله، أو أتركوه كله))نەسایی، ئەبووداود. واتە: یا هەمووی بتاشن، وەیان هەمووی بهیٚلٚنەوە.

(عبدالله بن جعفر) دەلٚیٚ: پیٚغەمبەر ﷺ مۆلٚەتی بۆ (ئالی جەعفەر) – کە شەهید ببوو– دانا، کە دوای سیٚ ڕۆژ بیٚتە لایان،پاشان هات و فەرمووی: ((لا تبكوا على أخي بعد اليوم، ادعوا لي إبني أخي)) لەم ڕۆ بەدواوە بۆ براکەم (جەعفەر) مەگرین، دەسا برازاکانم بۆ بانگ بکەن، عەبدوالله دەلٚیٚ: بانگیان کردین وهاتینەلای، هەر دەتگوت بەچکە چۆلەکەین، پاشان فەرمووی: ((أدعوا لى الحلاق)) سەرتاشم بۆ بانگ بکەن، ئەوسا سەرتاشیان هیٚنا و سەری تاشین. (نەسایی و ئەبووداود)

لەم فەرموودانەوە دەردەکەویٚ کە: تاشین و نەتاشینی سەر، هەردوو حەلاٚلٚە، مەگەر کاتیٚك لەهیٚشتنەوەیدا سەروسیمای مرۆڤ تیٚك بچیٚت، وەیان ببیٚتە داب ونەریتی خەلٚکانی خراپ و خوانەناس، بەلاٚم لەم مەسەلەیەدا ژنان جیاوازیان هەیە، بۆیە بۆ ئەمان سەرتاشین ڕیٚی لیٚگیراوە.

(عەلی کوڕی ئەبی تالیب) دەلٚیٚ: ((نهی رسول الله ﷺ أن تحلق المرأة رأسها))نەسایی. واتە: پیٚغەمبەر ﷺ ڕیٚی لە ژنان گرت سەریان بتاشن. مەگەر پیٚویست و زەروورەت بیٚ، بۆ نموونە: ئافرەتیٚکی نەخۆش، یان ئافرەتیٚك نەتوانیٚ خزمەتی قژی خۆی بکات، وەکو ئیمای (ئەحمەد) دەلٚیٚ: هیوادارم لەوکاتەدا خراپ نەبیٚ.

## پەیوەستکردنی قژ بەقژەوە

لکاندنو پەیوەستکردنی قژ بە قژەوە بە مەبەستی خۆ جوانکردن وزۆر کردنیان، کارێکی حەرامو قەدەغەیە، چونکە:

یەکـەم – بوخـاریی و موسـلیم – لـە ئـەبووهورەیرەوە دەگێڕنـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ – فەرمووی: ((لعن الله الواصلة والمستوصلة، والواشمة والمستوشمة)). واتـە: نـەفرینی خـودا لـەو ژنانـە بێت کـە: قژ دەلکێنن بـە قژی خۆیانـەوە، یـا بـە قژی ژنـانی تـرەوە، وە لـە قژ بـۆ لکێنراوەکەش نەفرین بێ، وە لە ژنانی خاڵکوتو خاڵ بۆ کوتراویش بێت.

دووەم – خـاتوو عایـشە/خ دەڵێـت: کـچۆڵەیەکی (ئەنـصاریی) مێـردی کـرد، پاشـان نەخۆشـکەوتو قـژی سـەری هـەڵوەری، ئـەوجا ویـستیان بـە قـژی ژنـانی تـر بـۆی پەیوەسـت بکەنـەوە،جا بـۆ حـوکمی ئـەوە لـە پێغەمبـەریان ﷺ پرسـی، ئـەویش فـەرمووی: ((لعـن الله الواصلة والمستوصلة))، کەوابوو لکاندنی قژی ژنانی تر بە قژەوە، حـەرامو ڕێ لـێ گیراوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە نەفرینی لەهەردوولا کرد.

لکانـدنی (مـوو) بـە (مـوو)ەوە، ئـەوە حوکمەکـەی بـوو، بـێ جیـاوازی لـە نێـوان ژنوپیـاودا، بـەڵام ئەگـەر دەزوو و بـەکرەو خـوریی و ئاوریـشمی لکانـد بـە قژیـەوە، بـە مەبەسـتی جـوانیو خۆجـوانرکردن بـۆ مێردەکـەی – نـەك بـۆ چەواشـەو تـەدلیس، ئـەوە وەکـو (قاضـي عیاضـی مالکی) دەڵێت قەیدی نییە...

ئـەو قژانـە کـە حەرامـە لکاندنیان بەقژەوە، قـژی (صـەناعیی)و دەستکردیش دەگرێتـەوە، چـونکە چەواشـەکاریی و (تـەدلیس)ەکـە بـەمانیش دەکـرێ، ئیمـامی (نـەوەوی) لـە ڕاڤـەی فەرموودەی ((..صنفان من أهل النار..) ئەوەش وا دەبێ کە بە پەڕوو عیمامە و هـەر شتێکی دی دەیکـەن، کـەوابوو دەسـکاری سەروسـیمای ژنـان – بـەدەر بـۆ مێـردی خۆیـان، چەواشەکاریو تەدلیسە – بۆیـە ئەگـەر بـە پەڕۆ، بـە لۆکـە، بـە خـوریی..هتـد، بکـرێو سـەری خۆی لە دواوە گەورەبکا هەر حەرام و یاساغە.

## باریكو تەنككردنی برۆ

زانایـان – کـەمێکیان نـەبێ – دەڵـێن: دەسـکاری (بـرۆ)، واتـە: باریـكو تـەنك کردنیـان حەرامـە، بـۆ ئـەوەش ئـەم فەرموودەیـە دەکەنـە بەڵگـە ودەیهێـنن: ((لعـن الله الواشمـات والمـستوشمات، والنامـصات والمتنمـصات، والمتفلجـات للحـسن، المغـيرات خلـق الله...)) پێشەوا موسلیم. واتە: نەفرینی خودا لەو ژنانە بێ: خـاڵ دەکوتن، یـان خاڵیـان بـۆ دەکوتن،

بـرۆ باریـك دەكـەن، ددان تـەنك‌و شـاش دەكـەن، فیطـرەتـی خـودای پێـدەگۆڕن.چـونكە لـەو كارانـەدا چەواشـەو(تـەدلیس) هەیـە، ئەگـەر كەسـێك بیـان بینیٚ – بـەو شـێوەیە – سـەرنجی ڕادەكێـشن‌و لـە خـشتەی دەبـەن‌و دەسـتخەڕۆ دەبـیٚ، بۆیـە بـۆ ژنـی خـاوەن مێـرد ڕێـدراوە، بەمـەرجیٚ لەبـەرخاتری مێردەكـەی بێـت، چـونكە خۆجـوانكردن‌و خـۆ ئـارایش بـۆ مێـرد، خۆشەویستی‌و دلۆڤانی زیاد دەكات، وە بۆیـە دەڵێن: ژنـانی مێـرددار، دەتوانن مووی دەم‌و چاو و سمێڵ و ڕیشیان لابەن لەبەرخاتری مێردەكانیان.

هەندیٚ زانا دەڵێن: ئەگەر برۆ تەنككردن بووە نیشانەو كاری ژنانی خراپ‌و فاحیشەچی، نابیٚ ژنانی تر بیكەن.بەڕیز (عبدالكریم زەیدان) دەڵێت: هـەر برۆیـەك پتر لـە سنووری خـۆی درێژو زیاد بێت، دەتوانریٚ ئاسایی بكرێتەوەو، زیادەو پـەل‌و پۆكـەی لابرێـت، بێگومـان ئـەم رایە لە ڕۆحی ئیسلامەوە نزیكە لە ڕاوبۆچوونەكانی تر.

## خاڵكوتان‌و ددان شاشكردن

ئیمـامی بوخـاریی باقەیـەك فـەرموودەی – لـەبارەی خاڵكوتـان‌و ددان شاشـكردنەوە هێنـاوە، لەوانـە: (ئـیبن عەمـەر–خ) دەڵـیٚ: ((أن رسـول الله ﷺ قـال: ((لعـن الله والوصـلة والمـستوصلة، والواشمــة والمــستوشمة).بەڕاســتی پێغەمبــەر ﷺ فــەرمووی: نــەفرینی خــودا لــە ژنــی پەیوەستكەری قژو پەیوەست بۆ كراوەكەیش، وە لە خاڵكوت‌و خاڵ بۆ كوتراو.. وە فـەرمووی: ((.. والمتفلجـات للحسن، المغیرات خلـق الله)). بەمەسـتی نـەفرین كـردن لـە ژنـانی شاشـكەری ددانیـان، چـونكە وەكـو گوتمـان چەواشـەكاریی‌و (تـەدلیس)ی تێدایـە، بەتایبـەتی كـە ژنـانی بەسالاٚچوو دەیكـەن، بـۆ ئـەوە ئامـاژە بێـت بـۆ تەمـەن كـەمیی‌و لاویـەیتان، تـا بەرامبەرەكـەیان دەستخەڕۆ بكەن، لەو لایشەوە دەسكاری (فیطرەت)و دروستكراوەكانی خودایە.

## ڕەنگ‌و بۆیە كردنی ( پێڵو )ی چاوو سەرو ژێری چاوو سووركردنی كوڵم‌و لێو

ئەمانە هەرچەند هەندیٚ لە زاناكان دەڵێن: گۆڕانكارییە لە دروستكراوەكانی خودادا، بەلاٚم بـۆ ژنـانی مێـردار، ڕیٚ هەیـە، بەمـەرجیٚ بەمەبەسـتی خـۆ ئارایـشدان بێـت بـۆ مێردەكـەی‌و خۆشەویستی و دلۆڤانی زیاد بكات لای.

سووركردنی نینۆكی دەست، بەخەنە یان بـەو ماددانـە تـازە داهـاتوون، حەلاٚڵـە، مەگـەر بـۆ مەسەلەی دەستنوێژو خۆشۆرین گرفت دروست بكات، بەلاٚم درێـژ كردنـی نینـۆك – بـیٚ هـۆی شـەرعیی بۆپیـاوو ژن – پێـچەوانەی سـوننەتی پێغەمبـەرە ﷺ. دیـسانیش ئـەمڕۆ پـتر بۆتـە داب‌و نـەریتی خۆرئاوایی‌یـەكان، هیـوادارم نەكەوێتـە شـوێنی ئـەو كەسـانە لـە خـودا بـیٚ

خەبەرن و هیچ هەواڵێکیان لەقەبرو قیامەت نییە.

قژ برین – کە ئیستا بۆتە هۆیەك بۆ خۆ ئارایشدان لای ژنان – بەمەرجیٚ نەگاتە ئاستی قـژی پیـاوان و نەچـویٚ بـە پیاوانـەوە، ڕێـی پێـدەدریٚ، ئەڵبـەت ئەمـە جیـاوازە لەگـەڵ سەرتاشینیان، سەرتاشین بۆژنان ڕیٚ لێگیراوە: عەلی کوڕی ئەبوو تالیب – خ دەڵـیٚ: ((نهی رسول الله ﷺ أن تحلق المرأة رأسها))نەسایی.

## جوانکاریی ( عمليات التجميل )

لەباسـەکانی رابـوردوودا گوتمـان ژنـان دەتـوانن خەنـەو ڕەنـگ و بۆیـە و بۆنخۆشـیی بـەکاربێنن، لـەم باسەشـدا لـەوە دەدوێـین ئـاخۆ دەتـوانن لـەڕووی شـەریعەتی ئیـسلامەوە، نیشتەرگەری بکەن، بۆ لابردنی، یان بۆ ڕێککردنی هەر ئەندامێکی جەستەیان.

زاناکان لەم مەسەلەیەشدا قسەو باسێکی زۆریان هەیە، بەڵام هەرچەند سەیری ڕوحی ئیسلام بکریٚ کە چەندە گرنگی دەدات بە مرۆڤ و بەجوانی مرۆڤ، دەزانریٚ کە ئەو جۆرە دەسکاریانە بە نیشتەرگەریی و هەر هۆکارێکی تر بۆ ژن و پیاو حەڵاڵەو ڕێی پێدەدریٚ، بەبەڵگەی ئەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا بە (عرفجه بن أسعد) کاتیٚ لەڕووداوێکدا لووتی بڕابوو، بچێت لەئاڵتوون دروستی بکاتەوە.

ئیمامی (خـەتابی) لـە ڕاڤـەی ئـەم فـەرموودەدا دەڵـیٚ: دەشـتوانن ئەندازەیـەکی کـەم زێـڕ بـەکاربێنن بـۆ ئـەو جـۆرە شـتانە دێنـە پـێش و پەیـدادەبن، لـە کتـێبی (المجمـوع)دا هـاتووە: ((يجوز لن ذهب أنفه أو سنه أو أنملته، أن يتخذ مكانها ذهباً سواء أمكنه فضة وغيرها أم لا)). کـەوابوو دەسـکاری دەم و چـاو و ڕوخـسارو، ڕێککردنـی لـووت و هەرئەنـدامێکی تـری لەش، کارێکی باش و پەسەندە لەشەریعەتی ئیسلامدا، وە بە (تغيير خلق الله) دانانرێت.

## ( خەتەنە )کردن

ماوەیەکی زۆرە – لێرەو لەویٚ– نەیارو ناحەزانی دینی ئیسلام کردوویانە بە هەراو مشت ومـڕ لـە مـەڕ خەتەنـەی ژنانـەوە، گوایـا ئیـسلام سـتەمێکی گـەورەی لـە ژنـان کـردووە بـە فەرزکردنی خەتەنە لە سەریان !ئەوان وا تێگەیشتوون کە ژنان بە زۆریش بێت هەردەبیٚ خەتەنـە بکـرێن، ئامـانجیش لـە خەتەنـە کردنەکـەیان، کەمکردنـەوەی هێـزی سێکسیانە، بـۆ ئەوەیە ئارەزوویان نەمێنیٚو لەو شتە بنەڕەتییە بە مرۆڤ دراوە بۆ لەزەت وچێژ بێبەشبکرێن! جا ئێمـە بـۆ ڕۆشـنکردنەوەی ئـەو مەسـەلەو راسـتکردنەوەی بـارە راسـتەکەی، دەسـتمانکردە گەڕان وپشکنین بە سەر چاوە باوەڕ پێکراوەکاندا، دەرەنجام دیتمان کە تـەنها فەرموودەیـەك

سەبارەت بە (خەتەنە)هاتبیٚ و پشتی پیٚ ببەسریٚت، هەر ئەم فەرموودەیە کە دەفەرمویٚ: ((الفطرة خمس – أو خمس من الفطرة – الختان، والإستحداد، ونتف الإبط، وتقليم الأظفار، وقص الشارب)) کە ئیمامی بوخاری لە (كتاب اللباس/٥٨٨٩، باب (٦٣)، و ئیمامی موسلیم لە (الطهارة /٢٥٧ / باب: ١٦) هێناویانە.واتە: پێنج خەصڵەت هەیە کە بنەڕەتی پاك وخاوێنین بۆ مرۆڤ:خەتەنە، لابردنی تووکەبەر، هەڵکێشانی مووی بنباخەڵ،قرتاندنی نینۆك، بەرسمێڵکردن، تادەرکەوتنی سوورایی لێو.

ئیتر دوای ئەم ریوایەتە، هەر ڕیوایەتێکی تر لەبارەی خەتەنەوە هاتبیٚ، ناتەواویی وکەم وکورتیی و(لەکە)یەکی تێدایە، کەلە (مصطلح علم الحديث)دا، فەرموودەی پێدەدرێتە دواوەو کاری پێناکرێت، لەوریوایەتانە:

١– ئەم ریوایەتە کە (ئەبوو داود) لە (الأدب/٥٢٧١، باب (١٧٨) هێناویەتی و دەڵێت: ((عن أم عطية أن امرأة كانت تختن النساء بالمدينة، فقال لها النبي – صلى الله عليه وآله وسلم – لا تنهكى فإن ذلك أحظى للمرأة وأحب للبعل))، واتە:ئوم عەتیە دەڵیٚ: لە مەدینەدا ژنێك هەبوو خەتەنەی ژنانی دەکرد، پێغەمبەر – دروودو سلاّوی لیٚ بێت– پێیگوت: وریابە ! زۆر دەست دامەدەو بنە بڕی مەکە، چونکە ئەو شتە هەم بۆ ژنان جێی چێژو لەزەتە،هەم بۆ پیاوانیش. پاشان (ئەبوو داوود) بۆ خۆی دەڵێت: (وهذا الحديث ضعيف، لأن فيه ((محمد بن حسان)) وهو مجهول)، ئەم ریوایەتە لاوازە، چونکە (موحەممەدی کوڕی حەسان) ی تێدایە.

(قورتوبي)یش دەڵێت: (وفي رواية ذكرها رزين: ((ولا تنهكى فإنه أنور للوجه وأحظى عند الرجل)). ئینجا لێکۆڵەرەوەکەی تەفسیری قورتوبی دەڵێت: (إسناده ضعيف. وروى البيهقي في ((الكبرى)) (١٢٤/٨) من طريق عبد الملك بن عمير عن الضحاك بن قيس بلفظ: ((فإنه أسرى للوجه وأحظى عند الزوج)) قال يحيى بن معين: الضحاك بن قيس هذا ليس بالقوى))، ئەم ریوایەتانە هەموو لەمانادا دەبنەوە یەك، ئەگەرچی هەندیٚ جیاوازییان لە بێژەکانیاندا هەبیٚ، وە هەمووش لاوازن.

٢– روى الحجاج بن أرطاة عن أبي المليح عن أبيه عن شداد بن أوس أن رسول الله – صلى الله عليه وآله وسلم – قال ((الختان سنة للرجال، مكرمة للنساء)) واتە: خەتەنە بۆ پیاوان کارێکی پەسەندە، بۆژنانیش ڕێزو خەلاّتە بۆیان. قورتوبی دەڵێت: ((والحجاج ليس ممن يحتج به)) ئەم فەرموودە ئیمامی (بەیهەقی)ش هێناویەتی لە (الكبرى/٣٢٥/٨) دەڵێت: ((الحجاج لا تحج به)). الجامع لأحكام القرآن. بەرگی یەك / جزمی دوو، لاپەڕە (٩٦) چاپی ١٩٩٣م – ١٤١٤هـ.دیارە هەردوو – شێخی قورتوبیی و، ئیمامی بەیهەقیی– حەجاج بە

پیاوێکی ناراست دەزانن و ریوایەتی لێوەر ناگیردرێ.

*(شێخ ئیبن حەجەر العسقلانی) لە بەرگی ١٠- لاپەڕە ٤١٨ی (فتح الباری)دا ڕاڤەیەکی دوورودرێژی وشەی: ((الختان))ی کردووەو گەلێ سەروو خواری تێدا کردووەو ڕاوبۆچوونی زاناگەلێکی هێناوە، لەمەڕ خەتەنەوە بە شێوەیەکی گشتیی، ئەوسا بۆ پیاوان، ئەوسا بۆ ژنان، ئینجا واجبە، یان سووننەت؟ بۆ کێ سونەتە، بۆ کێ واجیبە، مەبەست بەم سووننەتە چ سوننەتێکە...؟ تاد، بەهەر هەموویەوە ئەوەی نەگەیاند کە خەتەنە بۆ ژنان پێویستە، ئەو ڕیوایەتەش کە دەڵێ خەتەنە بۆ ژنان (مکرمە)یە ڕیوایەتێکی لاوازەو کاری پێناکرێت.

* ئیمامی (نەوەویی) لە ڕاڤەی فەرموودەکەی (موسلیم: ((الفطرة خمس — أو خمس من الفطرة — الختان والإستحداد..)) دەڵێت: (فالختان واجب عند الشافعي وكثير من العلماء، وسنة عند المالك وأكثر العلماء، وهو عند الشافعي: واجب على الرجال والنساء جميعا..))صحيح مسلم بشرح النووي/المجلد الثاني / باب خصال الفطرة—ص١٤٨. واتە: خەتەنە بەلای شافعیی و زۆرێك لە زاناکانەوە واجبە،وە بەلای ئیمام مالك وزۆربەی زاناکانیترەوە سوننەت وپەسەندە و، بە تێکڕایش بەلای ئیمامی شافعییەوە بۆ ژن وپیاو واجبە.

* بەڕێز دکتۆر (أحمد الشرباصی) لە کتێبی (یسألونك فی الدین والحیاة/ب ٢ — ل\ ٣١ دەڵێت: (وخلاصة ما قال العلماء في الختان: هو أن مذهب الشافعية يقرر أن الختان واجب في حق الذكر والأنثى،ومذهب الحنابلة يقرر أنه سنة في حق الذكر، وليس واجبا في حق الإناث، بل هو سنة ومكرمة، ومذهب الحنفية والمالكية أنه سنة فى حق الذكور والإناث). لە کۆتایی باسەکەدا دەڵێت: (ولكن إذا ثبت — في بعض الحالات — أن ختان الأنثى ليس في مصلحتها، فلا إثم في ذلك لما قرر بعض الفقهاء)). واتە: پوختەی ئەو ڕاوبۆچوونانە لە باسی خەتەنەدا هاتوون ئەمەیە کە: شافعییەکان پێیان وایە بۆ پیاوو ژن واجبە.

حەنبەلییەکان: پێیان وایە بۆپیاوان سوننەتە، بۆ ژنان واجب نییە،بەڵکو کارێکی سوننەت و(مەکرەمە)یە بۆیان.

حەنەفیی ومالکییەکان: بۆژن وپیاو سوننەتە، خۆ ئەگەر دەرکەوت خەتەنە لە بەرژەوەندی ژناندا نییە و، نەکرا هیچ سەرپێچی گوناحێکی تێدا نییە.

* لە پەراوێزی کتێبەکەی بەڕێز (سەید سابق) (فقە السنە/ بەرگی١ /لاپەڕە ٣٧ی چاپی یەکی ١٩٦٩- هاتووە دەڵێت: (أحاديث الأمر بختان المرأة ضعيفة لم يصح منها شيئ).واتە: هەر شتێك بەناوی فەرموودەوە هاتبێ وفەرمان بدات بە خەتەنەی ژنان، لاوازو ناتەواوەو هیچی صەحیح نییە.

* (ئيمامى غەزالى)يش لە كتێبى (إحياء علوم الدين) بەرگى١- لاپەڕە (١٤٢)دا ئەم دوو فەرموودەيەى هێناوەو كردوويەتى بەبەڵگە بۆ خەتەنەى ژنان، يەكەم: ((الختان سنة للرجال، مكرمة للنساء)). دووەم: ((يا أم عطية! أشمي ولا تنهكي فإنه أسرى للوجه، وأحظي عند الزوج))، بەڵام دەرهێنەرى فەرموودەكانى (إحياء \ شيخ عبد الرحيم/هەولێرى) كە (٨٠٦)ى كۆچيى لە دنيا دەرچووە، ئيسنادى هەردوو فەرموودەكەى بەلاواز داناوە.

*(ئيبن تەيميە) لە (مجموعة الفتاوي)دا، بەرگى/١١ (فقه الطهارة والصلاة) لاپەڕە(٦٨) دەڵێ: دەبێ ژنان خەتەنە بكرێن، بە بەڵگەى ئەم فەرموودەيە كە دەڵێ: ((أشمي ولا تنهكي فإنه أبهى للوجه، وأحظي لها عند الزوج)). ديارە ئەم فەرموودەيە (ئەبوو داود) لە (سنن)ى خۆيدا و، لە كيتابى: (الأدب / ٥٢٧١) ڕيوايەتى كردووە، بەڵام ئيبن تەيميە/ خوا لێى خۆش ببێ — لە گەڵ ئەو هەموو وردەكارييەى لە مەسەلە شەرعييەكاندا هەيەتى، كەچى لێرە لەمەڕ (سەنەد)ى فەرموودەكەوە بێدەنگ بووەو هيچى لە سەر نەگووتوە! بەڵام دەرهێنەرى فەرموودەكانى (مجموعة الفتاوي): هەردوو بەڕێز: (عامر الجزار) و (أنور الباز) لە پەراوێزەكەيدا دەلێن: ((وقال أبوداود: ليس إسناده بالقوى)) وقد روى مرسلا، قال أبو داود: ومحمد بن حسان مجهول، وهذا الحديث ضعيف)، لاى هەمووانيش ئاشكرايە كە فەرموودەى لاواز لە (ئەحكام)دا كارى پێناكرێت، بەڵام ئەوەى جێگەى سەرسوڕمانە ئەوەيە كە چۆن ئيبن تەيميە ئەو فەرموودە لاوازەى هێناوەو ئەو بڕيارەى پێداوە؟!

* شەوكانى لە (نيل الأوطار) بەرگى١ — لاپەڕە (١٣٣-١٣٥)دا پاش شەنوكەوكردنى فەرموودەكەى: ((أشمى ولا تنهكى)) — دەڵێ: (والحق أنه لم يقم دليل صحيح يدل على الوجوب).واتە: پياو هەق بڵێ كە هيچ بەڵگەيەكى صەحيح نييەبۆئەوە كە خەتەنە واجب بێت.

* (مغنى ابن القدامة) دەڵێ: (فأماالختان فواجب على الرجال، ومكرمة فى حق النساء، وليس بواجب عليهن، هذا قول كثير من أهل العلم...). تەماشاى بەرگى (١) لاپەڕە(٧٠-٧١) وە(٨٥- ٨٦) بكەن.

* كتێبى (إحكام الأحكام) بە سەر (عمدة الأحكام)ەوە \ بەرگى (١)، لاپەڕە (٨٦)، دەڵێ: (وقد اختلف العلماء فى حكم الختان: فمنهم من أوجبه، وهو الشافعى رحمه الله، ومنهم من جعله سنة، وهو مالك وأكثر أصحابه، هذا فى الرجال. وأما فى النساء فهو مكرمة على ماقالوا). پاشان لێكۆلەرەوەكەى لە پەراوێزەكەدا دەڵێ: (لما رواه أحمد والبيهقى من حديث (الحجاج بن أرطاة) عن أبى المليح بلفظ ((الختان سنة للرجال، مكرمة فى النساء))... وفيه مقال: قال البيهقى:هو ضعيف منقطع. والصحيح أنه لم يقم دليل صحيح على الوجوب،

والمتيقن السنة، والله أعلم.

* دکتۆر (وهبة الزحيلی) لە کتێبی (الفقه الإسلامي وأدلته) بەرگی١ – لاپەڕە (٣٠٦) دەڵێت: (وهو – أي الختان – سنة للرجال، مكرمة للمرأة عند الحنفية والمالكية، لحديث: ((الختان سنة للرجال، مكرمة للنساء)) پاشان لە پەراوێزەکەدا نووسروە: (رواه أحمد والبيهقی من حديث ((الحجاج بن أرطاة)) وهو مدلس، وفيه اضطراب، قال عنه البيهقي: هو ضعيف منقطع (نيل الأوطار:١١٣/١) ورواه الخلال بإسناده عن شداد بن اوس.

هەروەها دەڵێت ئەو فەرموودەیەش کە دەڵێ: ((ألق عنك شعر الكفر واختتن)).. (إبن المنذر) بە دوایدا چووەو دەڵێت: ليس في الختان خبر يرجع إليه، ولا سنة تتبع.درێژەی ئەم قسەیە لە (المجموع) دا هاتووە.

* بەڕێز (عبد الله ناصح علوان) لە کتێبی (تربية الأولاد في الإسلام/بەرگی١/ لاپەڕە (١١٤) دەڵێت: هەموو فوقەهاو موجتەهیدو ئیمامەکانی فیقە یەکدەنگن لە سەر ئەوە کە (خەتەنە) بۆ ژنان (مستحب)ـەو پێویست نییە. مەگەر لە ڕیوایەتێکی (ئیمام ئەحمەد)دا کە هاتووە دەڵێ: (يجب على الرجال والنساء على السواء)، ئەویش لە ڕیوایەتی دووەمدا دەڵێ: (يجب على الذكور دون الإناث) دیارە ئەمەیش لەگەڵ ڕاوبۆچوونی تەواوی فوقەهاو موجتەهیدو ئیمامەکانی فیقهدا یەك دەگرێتەوە کە دەڵێن: خەتەنە بۆ ژنان (مستحب)و واجیب نیە. پاش ئەوانیش ئوممەتی ئیسلامیی – نەوە دوای نەوە – هەروا کاریان کردووە، واتە: خەتەنەیان بۆ ژنان بە (مستحب)داناوە، نەك بە پێویستو واجیب، بەڵگەشیان ئەوەیە کە پێغەمبەر – صلى الله عليه وآله وسلم –لەو ڕۆژەوە (خەتەنە)ی داهێناوە بۆ ئوممەتی ئیسلامیی، تەنها باسی لەپیاوان کردووە، نەك لە ژنان، وە فەرموودەیەکی لێ نەبیستراوە تێیدا فەرمان بدات بەخەتەنەی ژنان، ئەمە نەبێ کە دەڵێ: ((الختان سنة للرجال، مكرمة للنساء)) ئەمیش گوتمان لاوازەو کاری پێناکرێت، گریمان ئەگەر صەحیحو ڕەوانیش بێت،هەرئەوە دەگەیەنێت کە تەنها بۆ پیاوان واجیبە، نەك بۆ ژنان، سەرەرای ئەمەیش،ئاشکرایە کە ژنو پیاو جیاوازی یەکی زۆریان هەیە لە شکڵو حوکمو سوودو قازانج وەرگرتندا لە خەتەنەدا،چونکە ئەو پێستە زیادە کە بەزەکەری پیاوانەوە هەیەو، لەوانەیە ئەگەر لا نەبرێ، ژێرەکەی شتی پیس هەڵگرێت، ئەوسا هەم بۆ (طەهارەت)ی نوێژو خواپەرستیی زیانی دەبێ، هەم بۆ لایەنی تەندروستییو سێکسیش دەوری دەبێ، دیارە کە ئەو گۆشتو پێستە زیادەیە بە (فەرج)ی ژنانەوە نییە، بۆیە شەریعەتی ئیسلامیش ئەوەند کە باسی خەتەنەی پیاوان دەکات، ئەوەند باسی خەتەنەی ژنان ناکات، کەوابوو دەتوانرێ بگوترێ: چاك وایە

قازانج وزیانی ئەم مەسەلەیە حەواڵە بەپزیشكو پسپۆڕانی خۆی بكرێت، بائەوان بڕیار بدەن ئاخۆ بكرێ یا نەكرێت ؟ چونكە لەڕووی شەریعەتی ئیسلامەوە دەقێكی راشكاوو دوور لە ناتەواوییەكانی فەرموودە نەبوو بڕیاری یەكلاكەرەوەی تێدا بێت،وە لە مەڕ مەسەلە خودا پەرستییەكانیشەوە شتێكی ئەوتۆی تیا بەدی ناكرێت، كە ئەگەر نەكرێت ببێتە هۆی هەڵگرتنی پیسیی و نەخۆشیی و كار بكاتە سەر مەسەلە خواپەرستیەكان، وەك ئەوە كە لە نێرینەدا بەدی دەكرێت،ئەمە لەلایەكەوە، لەلایەكی ترەوە لە سەردەمی ڕابوردوودا، لەشارو لەلادێكاندا، بەدەستی ژنانی نەزان، كۆمەڵێ هەڵەی وا كراوە لەمەسەلەی (خەتەنە)ی ژناندا، هەرگیز قەرەبوو ناكرێتەوە،چونكە بۆتە هۆكارێك لە بێبەشبوونیان لە چێژو خۆشی جیماع و تووشبوونیان بە (برودە الجنس) یەوەو پاشانیش سەرهەڵدانی سەدان كێشەی تری شەرعیی و كۆمەڵایەتیی.

خوێنەری هێژا ! ئەمە كورتەو پوختەی ئەو باسەبوو، هیوادارین ئامانجی خۆی پێكابێت، ئێوەی بەرێزیش هەر لە پەنای هەق وعەدالەتدا بژین.

## ژنان و وەرزش..؟

بەڵێ دەتوانن هەموو ڕێگایەكی وەرزش – ئەوجۆرەیان لەگەڵ جەستەو وزەیاندا بگونجێت و لەچوارچێوەی شەریعەتدا بێ – بگرنەبەر، بەڵام دەرچوون بۆ ئەو جێگایانە تەرخان كراون بۆ وەرزش‌و مەلەی ژنان ناڕەواو ناپەسەندە، چونكە ئەگەری توشبوونی (فیتنە)یان زۆرەو لەوانەیە تووشی هەندێ كاری ناشەرعیی ببن، بەڵام لەماڵەوە ئازادە چ جۆرە ئامێرێك و چ جۆرە وەرزشێك هەڵبژێرێ بۆ یاریی خۆی.

## ژنان و خۆ قەڵەو كردن ؟

بەڵێ بەدەرمان، یان بە هەندێ خواردن و پرۆتینات ژنان دەتوانن خۆیان قەڵەو بكەن و وەزنی خۆیان ئاسایی بكەن، هەروەك دەتوانن ئەگەر وەزنیان زیاد بوو كەمی بكەنەوە بە دەرمان و وەرزش‌و هەر هۆكارێكی تری سوود بەخش.

ژنان دەتوانن هەر پەڵەو شتێك لەدەم‌و چاو و هەر ئەندامێكی تری جەستەیاندا پەیدا دەبێ، لای ببەن، بۆ خۆیان یان بچنە لای پزیشك.

مێیینە دەتوانن گوێیان كون بكەن‌و گوارەی تێ بكەن بەڵام نێرینە ڕێی پێنەدراوە، چونكە بەسروشت ئەو پێویستیەتی‌و ئەم پێویستی نییە، جا لێرە لەبەر درێژبوونەوەی باسەكە نەمانتوانی بەڵگەكان بێنین.

## خۆ پاراستن لە نەخۆشیی و چارەسەركردن

خۆپاراستن لـە توشـبوونى نەخۆشـییەكان، هەمیـشە باشـترە لـە هـەموو چارەسـەرێك دواى تووشبوون، خۆ پاراستن و دووركرتن لەو شتانە دەزانى دەبنە هۆى تووشبوونى نەخۆشیى، پەسـەندەو (موبـاح)ـە، بـەڵكو (مندوبـە)، واتـە: پێغەمبـەر ﷺ موسـڵمانى دنـە داوە بـۆى. (أم المنـذر بنـت قـیس الأنـصارية) دەڵێـت: پێغەمبـەر ﷺ هاتـەماڵمـانو (عـەلى كـوڕى ئـەبى تالیب)یشى لەگـەڵ بـوو، (عـەلى) نەخۆشـبوو و هێمـان تـەواو چاك نـەبوو بوویـەوە، هێـشووى جۆرە خورمایەكمان هەبوو هەڵمان واسیبوو بـۆ خـواردن، پێغەمبـەر ﷺ هەسـتا لێـى بخـوات، پاشان (عەلى)یش هەستا ویستى لێـى بخـوات، پێغەمبـەر ﷺ بە (عـەلى) فـەرمووو: ((مـە إنـك نـاقـە) واز بێنـە (تـۆ نـەیخۆیت)، چـونكە لـە نەخۆشـییەكەت بەتـەواوى چاك نەبوویتـەوە. (أم االمنذر) دەڵێ منیش جۆو سلْقم تێكەڵ كردو لێماننا و هێنام، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فـەرمووى: (يا على! أصبب من هذا فهذا أنفع لك (ئەبوو داود). واتە: عەلى ! لەمە بخۆ، بۆت باشە.

ئیمـامى (موسـلیم) لـە (عمـروبن الـشدید) دەگێڕێتـەوەو دەڵـێ: شـاندەكەى (ثقیـف كـە هاتبوون بۆ لاى پێغەمبەر ﷺ بۆ بەیعەت كردن) پیاوێكى (گەڕ)یان لەگەڵ بوو، پێغەمبـەر ﷺ ناردى بـۆ لاى و فـەرمووى: ((أنـا قـد بايعنـاك فـارجع)) پـێى بڵـێن: بەیعـەتمان لـێ قبـووڵكرد، دەبا بگەڕێتەوە.

ئیمـامى (بووخـارى) یـش لـە (ئـەبوو هـورەیرە وە—خ) دەگێڕێتـەوە كـە پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووى: ((.. فـر مـن المجـذوم فـرارك مـن الأسـد) هەرچـۆنێ لەشـێر هەڵدێیت، ئـاوایش لـە مرۆڤى (گول) هەڵبێ.

زاناكـان ئـەم چـەند فـەرموودەو بـە دەیـان فـەرموودەى تـر دەگەنـە بەڵگـە بۆخۆپاراسـتنو تەداوىو چارەسەر لە نەخۆشییەكان، وەدەڵێن پێویستە بۆ مرۆڤ خۆ بپارێزێ لە هـەر شـتێك بزانـێ زیانبەخـشە بـۆى، وەیـان تێكـەڵى ئـەو خەڵكـە نەخۆشـانە نـەكات، نەخۆشـییەكەیان پەتایـەو دەڕەوا بـۆ كەسـێكى تـر، هـەروەك پێویـستە ئـەو نەخۆشـانەیش خـۆ دوور بگـرن لـە تێكەڵى خزمو كەسوكارو شوێنە قەڵەباڵغیى وگشتییەكان، بـۆ ئـەوەى خـەڵكانى تـر تووشـى ئـەو نەخۆشـییە نـەبن، بەتایبـەتى ئەوانـە وا دەزانـن بـە نزیكبوونـەوە لـەو نەخۆشـانە تـووش دەبـن، ئەمەیـە كـە ئیمـامى (موسـلیم) ئـەم فەرموودەیـە دەهـێنێ: ((لا یـورد الممـرض علـى المصح)) واتـە: بـا خـاوەنى حوشـترو مـەڕو مـاڵاتى نـەخۆش، نـەهێڵێ تێكـەڵى حوشـترو مـەڕو ماڵاتە ساغەكان ببن، چونكە لەوانەوە— ئەگەر خودا بییەوێ — دەچێ بۆ ساغەكانیش.

ئـەم فەرموودەیـە گـەورەترین ئاڕاسـتەو (تەوجیـە)ى تێدایـە بـۆ مرۆڤـەكان كـە هـەوڵ بـدەن

هەمیـشە لـەش و جەسـتەیان سـەلامەت و دوور بـێ لـە نەخۆشـیی، وە ئـەو کەسانەشـیان نەخۆشیی پەتایانە جێگاو ڕێگای تایبەتیان بۆ جیابکەنەوە، با تێکەڵیی ئەمانی تر نەکەن، تـا چاك دەبنـەوە.. بەتایبـەتی دەوڵـەت و کاربەدەسـتان دەبـێ هەڵـسن بەجێبـەجێکردنی ئـەم کارەیـە... هـەروەها ئەگـەر بابـای خـاوەن ئـاژەڵ، بزانـێ یـەکێ لـە ئاژەڵـەکانی نەخۆشـە، دەبـێ خێرا لەوانی تـری جیا بکاتـەوە تـا دکتـۆری بـۆ دێنـێ، با ئـەوانی تـری تـووش نـەبن، وە هـەر کەسێك نـەخۆش بـێ و خـۆی لـە خـەڵکانی تـر نـەپارێزێ، ئـەوە لـە ڕووی شـەرعەوە گوناحبـار دەبێ، وە ئەگەر سوڵتە هەبوو، دەبێ بەزۆر جیایان بکاتەوە، کاتی خۆی لە (ئیبن تەیمیـە)یـان پرسی: ئەگەر کەسێك ئەو نەخۆشیانەی هەبوو، ئایا ساغەکان بۆیـان هەیـە لـە خۆیـان دووری بخەنـەوە؟ گـوتی: بـەڵێ دەتـوانن لـەو جێگاوشـوێنە دووری بخەنـەوە، چـونکە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمووێ: ((لا یورد الممرض علی المصح)). جگە لەوەش پێغەمبـەر ﷺ ڕێـی نـەدا کـابرای گول بێتە لای بۆ بەیعەت و فەرمووشی: لە گول هەڵبێن، چۆن لەشێر هەڵدێن.

کەوابوو ئەگەر نەخۆشیەکی پەتا لە شارێکدا بڵاوبوویەوە، دەبـێ ڕێ لـە هاتووچۆ بـۆ ئـەو شارە بگیردرێ، نەخەڵکان لە دەرەوە بچنە ناویان، نەئەوانیش هـاتوو چۆی دەرەوەی خۆیـان بکەن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((إذا سمعتم الطاعون في أرض فلا تـدخلوها، وإذا وقـع بـأرض وأنـتم بهـا فـلا تخرجـوا منهـا))بوخـاريي. لـە ئیـسلامدا نـابێ هـیچ کەسـێك زیـان بـە مرۆڤەکانی تر بگەیەنێت، وە دەبێ بڕگەی((لا ضرر ولا ضرار)) ڕەچاو بکرێت.

**تێبینی:**

ئـەم خـۆ پاراسـتنە لـە نەخۆشـی پـەتا، لەگـەڵ ئـەو فـەرموودەدا دەفـەرمووێ: ((لا عـدوي ولا طـيرة، ولا هامـة، ولا صـفر، وفـر مـن المجـذوم فـرارك مـن الأسـد)) دژ ناوەستێ،ئەگەرچـی بـە ڕەواڵەت لەوەدەچێت، چونکە ئەو فەرموودە بۆ ڕاستکردنەوەی بیروباوەڕی خەڵکانی سـەردەمی جاهیلیەت بوو کە پێیان وابوو نەخۆشیی بـە سروشـتی خـۆی لـە کەسـێکەوە دەگوێزرێتـەوە بـۆ کەسێکی تر، ئەوسا پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: (بـە ئیزنـی خـودا نـەبێ، نەخۆشـی لـە کەسـێکەوە ناگوێزرێتـەوە بـۆ کەسـێکی تـر، هەربۆیـە خـۆی لەگـەڵ کـابرای (گـول)دا نـانی خـوارد! لەگـەڵ ئەوەیشدا فەرمانیدا بە دوورکەتنەوە لەو جۆرە نەخۆشیە پەتایانـە دەگوێزرینـەوە لەکەسـێکەوە بـۆ کەسـێکی تـر. واتـە: لەگـەڵ ئیمـان و بـاوەڕی بـەهێز بـە دەسـەلاتی خـودا و هـیچ شـتێك بـێ فـەرمانی ئـەو ڕوونـادات، دەبـێ هۆکـارو ئەسـباب بـۆ هـەموو شـتێك – بـە پێـی خـۆی – بدۆزرێتەوەو بەکاربهێنرێت بۆ سەرکەوتن و بۆ خۆپاراستن لەهەر شتێك بێتە ڕێگای مرۆڤ.

چارەسـەری نەخۆشـیی (موبـاح)و حەڵاڵـە. (قورتـوبی)دەڵـێ: ئایـەتی: ((..فیـە شـفاء

للناس..)) نەحل – ٦٩. بەڵگەیە بۆ حەلاڵیەتی چارەسەر لە هەر نەخۆشییەك، سەرەڕای ئەوە كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((لكل داء دواء، فإذا أصيب دواء الداء برأ بإذن الله تعالى)) موسلیم. واتە: هەموو دەردێك دەرمانێكی هەیە، جا كە ئەو دەرمانە دەەسكەوت و بۆ ئەو نەخۆشیە بەكار هات، بەئیزنی خودا چاك دەبێتەوە، یان دەفەرمووێ: ((تداووا فإن الله تعالى لم يضع داء إلا وضع له دواء غير داء واحد: الهرم))ئەبووداود. واتە: دەرمان بەكار بهێنن بۆ نەخۆشیی، بێگومان خودا هیچ نەخۆشییەكی دانەناوە، مەگەر دەرمانیشی بۆ داناوە، بەدەر لە پیریی. لەم فەرموودانەوە پێشەوا (نەوەویی) دەڵێ: چارەسەر (مستحب)و پەسەندە لە ئیسلامدا، بەڵكو قسەی (راجیح) ئەوەیە هەندێ وەخت واجیبە، بەتایبەت بۆ ئەوكەسانە مانەوە یان، ئیسلام و موسڵمانان قازانجی لێ دەكەن و بوونەكەی زەروورەتە.

**تێبینی:**

ژن و پیاو لەم ئەحكامانەدا باسمانكردن چوونیەكن و هەرچی بۆ پیاو رێیدرابێ، بۆ ژنیش رێی پێدراوە.

## خۆ قەڵەوكردن بە دەرمان و پرۆتینات

باسمانكرد كە چارەسەر رێی پێدراوەو هەندێ جاریش واجبە، جا هەر لەو سۆنگەیەوە ئەگەر ژنێك ویستی خۆی قەڵەو بكات بە دەرمان، یا بە خواردنی پرۆتینات، لەبەر حەزی خۆی بێت، یان مێردەكەی حەزی لێ بكات، شەریعەتی ئیسلام رێی پێدەدات. خاتوو عایشە – خ دەڵێ: دایكم ویستی – بەرلەوە بچمە لای پێغەمبەرﷺ – بەدەرمان قەڵەوم بكات، منیش قەبووڵم نەكرد، ئەوسا بۆ خۆی ترۆزیو فەریكە خورمای پێدام قەڵەو بووم.

هەروەها ژنان دەتوانن هەوڵ بدەن بەدەرمان و وەرزش و هەر هۆیەكی دی كێشی خۆیان كەم بكەنەوە و خۆ لاواز بكەن.

**تێبینی:**

١– بەكارهێنانی دەرمان بۆ كەمكردنەوەی ئارەزووی جنسیی، بەتایبەت ئەوانەی ڕەبەنن و بۆیان ناكرێ بە شێوەی شەرعیی و بە ئاسانی ژن بهێنن، یان مێرد بكەن، وەیان هێزی سێكسیان لەسنوور بەدەرەو بە ژنێك تێر ناكرێ، زاناكان ئەم فەرموودە دەكەنە بەڵگەی ئەو مەسەلەیە كە پێغەمبەر ﷺ دەفەمووێ: ((يا معشر الشباب ! من استطاع منكم الباءة فليتزوج، ومن لم يستطع فعليه بالصوم فإنه له وجاء)) بوخاریی.

٢– هەروەك دەتوانن دەرمان بەكاربێنن بۆ كەمكردنەوەی هێزی جنسییان، هەروەهایش

دەتوانن لەڕێی دەرمانەوە بەهێزی بکەن، بەتایبەت ئەگەر زەروربوو، بۆ نموونە: کابرایەك خێزانو هاوسەری هەیە، بەلاّم لەبەر هەر هۆیەك بێت هێزی سێکسیی لاوازەو خێزانەکەی پێ ڕازی ناکرێ، ئەو کەسە دەتوانێ هەموو ڕێگایەکی شەرعیی بگرێتە بەرو چارەسەری خۆی بکات.

شیاوی باسە ژنانیش دەتوانن – ئەگەر تووشی لاوازی ئارەزووی جنسیی بوون، دەرمانو هەر هۆیەکی شەرعیی بەکاربهێنن بۆ چارەسەری خۆیان، بەمەرجێ مێرددار بێتو پیاوەکەی گلەیی هەبێ لێی.

٣- دەرمانێك بەکارنەهێنن ئیسلام بەحەرام و یاساغی دانابێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((..ولاتتداووا بحرام))موسلیم. یان (ئەبوو هورەیرە/خ) دەڵێ: ((نهی رسول الله ﷺ عن الدواء الخبیث))ئەبوداوود. خۆ ئەگەر دەرمانی پاكو حەلاڵ دەست نەدەکەوت، هەندێ لە زاناکان – وەك ناچاری – ڕێگە دەدەن، دەرمانی حەرام بەکاربهێنرێت. (ئیبن حەزم) دەڵێ: ((ومن أکره علی شرب الخمر أواضطر إلیها لعطش أو علاج، أو لدفع خنق فشربها،.. فلا حد علی أحد هؤلاء...)). خاوەنی (التهذیب) دەڵێ: ((یجوز للعلیل شرب البول والدم وأکل المیتة للتداوي إذا أخبره طبیب مسلم أن فیه شفاءه)) لەگەڵ هەندێ کتێبی تردا کە لەو بارەوە قسەیان کردووە، وەکو (البدائع – للکاساني)، (الفتاوی الهندیة)، خاوەنی (عمدة القاري – شرح صحیح البخاري).. هتد.

## کورتە باسێکی دوعاو نووشتە

بەبۆنەی باس دەرمانو بەکارهێنانی هەر شتێك بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشیی و ئێشو ئازارو تەندروستیی، بەچاکمزانی کورتە باسێکی دوعاو نویشتەش بکەم – کە بەتایبەتی ژنان زۆرتر لە پیاوان بەکاریان دێنن، لەپاڵ ئەوەیشدا گەلێ جار ڕێیان لە (فاڵچیو کوڵەنانی و دەستبڕەکان دەکەوێو چاكو خراپ تێکەڵ دەکەن)و هەندێ کاری دزێوو قێزەونو ناشیرینی لێدەکەوێتەوەو دەدرێ بەسەرشانی ئیسلامداو، ئیسلام دەبێتە (ئوسطورە) و (خورافە)، جا بەو بۆنەوە ئیسلام بە گشتی خۆیو پیاو چاكو خاوەن مێژووەکانیشی دەبنە قۆڵبڕ لای عەلمانیەکان، ئەگەرچی زیاتر ئەوانیش – ژنو پیاویان – پەنا دەبەنەبەریان بۆبەختو چارەنووسو دوعای (چەورو شیرینیو جادوو لە مێردو لە دەسگیران) وە بۆ هەڵگەڕانەوەی ژنی ئەمو ئەو بۆ خۆیان!.

خۆ دیارە کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام چەندە دژی ئەو جۆرەکارانەیەو چۆن جەنگاوە لە

گـەڵیان و چـەندە داواو هـاوار دەکـات کـە شـیفای نەخۆشـیی و لەشـساغیی و تەندروسـتیی و منـداڵ بـوون و نـەبوون و سـەرکەوتن و سـەرنەکەوتن، تـەنها بـەئیرادەو خواسـتی خـودای گەورەیـە، وە بـۆ هەریـەك لەوانـە تـەنها (صـەدەقە)و خێـرو خێـرات و دەسـگیرۆیی هـەژارو خەڵکانی بێ نەواو ئاوڕدانەوە بەلای پێویستییەکانی کۆمەڵدا پەسەندە لای.

ئینجا لەبارەی دوعاو نوشتەوە کە بەداخەوە ئەمڕۆ زۆر بۆتە باوو عادەت، دەڵێین:

١- دوعـا: واتـە: خوێنـدنی هەنـدێ لـە قورئـان، یـان لـە فـەرموودە بەسـەر نەخۆشـدا بەونیییەتـەوە خـودا شـیفای بـدات، یـان بـۆ (حـیفظ)و پاراسـتن لـە هـەر شـتێکی زیانبـەخش، کـارێکی ڕەواو پەسـەندە، بەبەڵگـەی ئـەوە کـە خـاتوو (عایـشە) دەڵـێ: پێغەمبـەرﷺ لـەو نەخۆشییەیدا کـە کۆچـی دواییکـرد، سـوورەتی (فەلـەق)و سـوورەتی (نـاس)ی دەخوێنـد بـە دەستی خۆیداو، دەیهێنـا بەجەستەیدا، جا کە نەخۆشییەکەی قورس بوو، من کارەکەم بۆ ئـەنجام دەداو خۆیـشی دەسـتی دەهێنـا بـە لاشـەیدا (بوخـاریی – ٥٧٣٥). وە لـە ڕیوایـەتێکی تـردا هـاتووە: پێغەمبـەرﷺ دوعـای بـۆ هەنـدێ لـە مـاڵ و منـداڵ دەخوێنـد و دەسـتی ڕاسـتی دەهێنـا بـە جێگـەی ئازارەکەیـدا ودەیفـەرموو: ((اللـهم ربِّ النـاس أذهـب البـأس واشـفهِ وأنـت الشافي لاشفاء إلا شفاؤك شفاءً لايغادر سقما))بوخاری – ٥٧٤٣.

(عـەوف کـوڕی مالـك) دەڵـێ: گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا ﷺ! ئێمـە بـەر لـە ئیـسلام نوشـتەمان دەکـرد بەلاتـەوە چـۆنە؟ فـەرمووی: بـابیبینم چـۆنتان دەکـرد؟ دەبـێ بـشزانن کـە هەرچی (شیرك) نەبێ قەیدی نییە دوعای پێ بکەن: ((..أعرضوا عليّ رقاكم، لابأس بالرقي ما لم يكن شركا))موسلم.

## مەرجەکانی دوعا و چارەسەری نەخۆشیی

یەکەم – دەبێ بە ناوە پیرۆزو صیفەتەجوانەکانی خودا بێت، وەیان شەریعەت پەسەندی بکات.

دووەم – ماناکەی ئاشکراو ڕوون بێت، نەوەك شتێکی تیا بێت (شیرك) بێت و پێی نەزانرێ.

سێیەم – دەبێ دوعا خوێن و نەخۆشەکە، تەنها خودا بە خاوەن شیفا بزانن.

ئـەوەمان لـەبیر نەچێت کـە ژنیش وەکـو پیـاو دەتـوانێ دوعـا بخـوێنێ بـە دەسـتیاو پاشـان بیهێنێ بەو شوێنەدا ئازاری هەیە، بەمەرجێ مەحرەم بن بەیەکدی.

**دوو تێبینی:**

یەکـەم – ئـاخۆ لەبەرامبـەر ئـەو دووعـا خوێندنـەو چارەسـەرەدا، ڕەوایـە داوای کـرێ و مـزە لـە بەرامبەرەکە بکرێت (ئەگەر شیفای بۆ هات بەو دوعاو چارەسەرەی ئەو؟ بۆ وەڵامی ئەمە زاناکان

دەڵێن: ئەگەر بەمەرجی شیفا بوو، واتە: ئەگەر بەو دوعایە چاکبوویەوەو، شتێکی لێوەرگرتو ئەویش قبوڵیبووئەوە ڕەوایە، خۆ ئەگەر چاك نەبوو، نابێ هیچ وەرگرێت، بەڵگەشیان: ئەوەیە کە جارێکیان یەکێ لە هاوەڵان سوورەتی (فاتیحە)ی خوێند بەسەر کابرایەکی مار پێوەدراودا و خودا شیفایدا، ئەویش چەند مەڕێکی بۆ نارد، چونکە پێشتر واتەی بۆ کردبوو کە ئەگەر چاکبوویەوە ئەو مەڕانەی بداتێ، ئەوجا هاوەڵەکە بە خۆیی وبە مەڕەکانیەوە چوو بۆ لای پێغەمبەرﷺ و ئەو مامەڵەیەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش ددانی هەم بەدوعاکەو هەم بە مەڕەکاندا نا بەو مەرج و مامەڵەیە وەریگرتووە. بوخاری (٢٢٧٦، ٥٧٣٦، ٥٧٦٣).

دووەم – ئایا هەر وەکو دوعا بە خوێندنی ئایەتێك، یان فەرموودەیەك بەسەر نەخۆشدا ڕەوایەو ڕێی پێدراوە، هەر ئاوا بە نوسینیش ڕێپێدراوە؟

بەڵێ. بەپێی ئەوە کە گەلێ پیاوچاکان نوسیوویانەو کاریان پێکردووە، حەڵاڵ و ڕەوایە، بەڵام قوتابخانەیە لە هاوەڵان بە هیچ کام لەو دوو شێوەی دوعاو نوشتەکردنەیە ڕێگە نادەن و دەڵێن: دەبێ مرۆڤ لە هەموو شتێکدا تەنهاو تەنها پشت بە خودای خۆی ببەستێ، بەبەڵگەی ئەو فەرموودەیەی ژمارە:(٥٧٠٥) ی ئیمامی (بوخاری) دەیهێنێ: ((.. لایسترقون، ولایتطیرون، ولا یکتوون، وعلی ربهم یتوکلون...)).

## لەباربردنی منداڵ ( الإجهاض )

لەباربردنی منداڵ – بەرلە تەواوکردنی ماوەی خۆی – بەهەر وەسیلەیەك هەبێ، وەبەهەر شتێك ببێ، بەتایبەتی پاش تەواو کردنی چوار مانگ، لای تەواوی فوقەهاو زاناکانی ئیسلام حەرامە.

ئیمامی (غەزالی) لە کتێبی (إحیاء علوم الدین) دا دەڵێ: ((ولیس هذا – أي العزل – کالإجهاض والوأد، لأن ذلك جنایة علی موجود حاصل، وله أیضا مراتب، وأدل مراتب الوجود أن تقع النطفة في الرحم، وتختلط بماء المرأة وتستعد لقبول الحیاة، وإفساد ذلك جنایة فإن صارت مضغة وعلقة کانت الجنایة أفحش، وإن نفخ فیه الروح واستوت الخلقة إزدادت الجنایة تفاحشا، وینتهی التفاحش في الجنایة بعد الإنفصال حیا)) بەرگی دووەم لاپەڕە ٥١. واتە: خۆ گرتنەوە دواوە (عەزل) لەکاتی جوتبووندا – کە کاتی خۆی هاوەڵان دەیانکرد و پێغەمبەرﷺ ڕێی پێدەدان – وەکو لەباربردن و زیندە بەچاڵکردنی منداڵ نییە، چونکە ئەو لەباربردنە تاوانە بەرامبەر بەبوونێك کە هەیە، ئەوەیش چەند قۆناغێکی هەیە، قۆناغی یەکەمی لەوەوە دەست پێدەکات تۆمەکە دەکەوێتە منداڵدانەکەوەو، لەگەڵ ئاوی ژنەکەدا تێکەڵ دەبێ و خۆ ئامادە

دەكات بۆ ژیانو گەشەكردن. دیارە لەناوبردنی شتی وا جنایەتو تاوانە، خۆ ئەگەر بوویە بەخوێنپارەوگۆشتپارە، تاوانەكە دزێوترە، ئینجا ئەگەر ڕوح بەبەریاكراو ئەندامەكانی جیابوونەوەو دەركەوتن، بێگومان تاوانەكە گەورەتر دەبێ، خۆ ئەگەر پاش لە دایك بوون بە زیندوویی هاتو لەناوبرا، دیارە تاوانەكە زۆر مەزنترو گەورەترە.

لەم بۆچوونەی (غەزالی)یەوە –خ – وەردەگیرێ كە لە تەواوی قۆناغەكانی (حەمل)دا (ئیجهاض) حەرامە، بەڵام ئەم قسەیە، زاناكانی تر ئەرێی لەسەر ناكەن و هەریەكەیان ڕای خۆی بەیان دەكاو دەڵێ:

یەكەم – شافعی دەڵێن:

أ – ئەگەر لەسەرەتای (حەمل)ەكەوە تا ئەو ڕۆژو كاتە چل ڕۆژ بوو و ژنو پیاوەكەش هەردوو لەسەری ڕازیبوونو دوو پزیشكی (عادل) گوتیان: هیچ زیانێكی بۆ ژنەكە نابێ، بە لای هەندێكەوە حەڵاڵەو، بەلای هەندێكی ترەوە (كەراهەتی تەنزیهی) هەیە.

ب– ئەگەر چل ڕۆژ تێپەڕیبوو بەسەر (حەمل)ەكەدا، دیسان لەباربردنی حەرامە، ئیتر كۆرپەلەكە بجووڵێت، یان ڕۆحی بەبەرا كرابێ یا نا؟

دووەم – حەنەفی دەڵێن: بەر لە تێپەڕبوونی چوار مانگ، واتە: ڕۆحی بەبەرا بكرێ، لەباربردنی دروستە ئەگەرچی هەندێ زانای خاوەن ئیمتیازیان دەڵێن بەر لە رۆح لەبەركردنیا – بێ بیانووی شەرعیی – حەڵاڵ نییە.

سێیەم – حەنبەلی یەكان دەڵێن: پاش تێپەڕ بوونی (١٢٠) ڕۆژ، لە سەرەتای پەیدابوونی (حەمل)ەكەوە، كە ماوەی ڕۆح بەبەراكردنی كۆرپەلەكەیە، لەباربردنی حەرامە.

چوارەم – مالكیەكان دەڵێن: هەر كە ئەو نوتفەیە چووە منداڵدانەوە، ئەگەرچی پێش چل ڕۆژیش بێت، حەرامە لەباربردنی، هەركە ڕۆحیشی بەبەرا كرا، بە ئیجماعی زاناكانیان حەرام دەبێ. كەوابوو بەلای ئەوانەوە هیچ ڕێگەیەك والاناكەن بۆ ئەو كارەیەو گشت یەكدەنگن لەسەر حەرامێتی.

پێنجەم – ظاهریەكان: نەبەر لە چوار مانگ، نە لە دوای چوار مانگ ڕێگە نادەن منداڵ لەبار ببرێت. كەوابوو پاش تێپەڕبوونی چوار مانگ (١٢٠) ڕۆژ بەسەر (حەمل)ەكەدا، لای تەواوی زاناكان حەرامە لەباربردنی منداڵ لەبەر نەخۆشی دایكەكەیو بەر لە چوار مانگ، وەكو چارەسەرێكی دایكەكە ڕێی پێدراوەو قەیناكات، بەڵام پاش تێپەربوونی چوار مانگ (١٢٠) ڕۆژ، فوقەها بە هیچ شێوەیەك ڕێگە نادەن لەبار ببرێت، ئەگەرچی دایكەكەشی بمرێت، ئەگەر لەبار نەبرێت. تەنانەتی لەباربردنی منداڵی زیناو ناشەرعیش بە هیچ شێوەیەك لە

ئیسلامدا جێی نابێتەوە، بۆ ئەمەیش بەڵگە گەلێك بەدەست زانایانەوەیە، لەوانە:

یەکەم: (ولا تزر وازرة وزر أخرى /ئیسرا: ١٤)

دووەم: ژنـە (غامدییـە)کـە، حاملـە بـوو هاتـە لای پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: بـچۆ هـەر کـە منداڵەکەت دانا، ئەو کات تۆڵە دەدرێیت.

سێیەم: ئەوانـەیش لـە مـاوەی چل ڕۆژدا ڕێگـە دەدەن، منـداڵ لـەبار ببرێـت، دەڵـێن بـۆ شـتی حەڵاڵ و شەرعییە، نەك بۆ (مەعصیەت) و تاوان، دیارە کە (حەمل)ی ناشەرعیی و زینا، هۆکاری گوناح و تاوانە، کەوابوو لە ماوەی چل ڕۆژەکەیشدا هەرنا بێت. (لە پەراوێزی کتێبەکەی (شیخ متولی الشعراوي / أحكام الزواج والطلاق والخلع)درێژە بەم مەسەلەی (ئیجهاض)ە دراوە، بەڵام لەبەر درێژ بوونەوەی باسەکە، نەمانتوانی زۆرتر سوودی لێ وەرگرین.

بەڕێز (محمد سعيد رمضان البوطی) لە کتێبی (مسألە تحدید النسل) دا کۆمەڵێ بەڵگەی هێناوەتـەوە بـۆ حەرامیـەتی لـە بـار بردنـی منـداڵی زینـاو سـەفاح، بـۆ خـۆی دەتـوانی سـوودی لێوەر بگریت. (عبد الكريم زەیدان)یـش مەسـەلەی ئیجهاض – لـە سـکی شـەرعیی– پوخـت دەکاو دەڵـێ: لـەباربردن لەبـەر ژیـانی دایکەکـە، ئەگەرچـی پـاش گیـان بەبەرکردنیـشدا بێـت، دروستە، قسەکەی خۆی بە بۆچوونێکی (إبن قدامه) و (شیخ محمود شلتوت) بـە هێـز دەکـات، کە لە حاڵـەتی بـەگیرهاتنی دایکەکەیدا،بەکارهێنانی بنەمای (إرتكاب أخف الـضررين) کـاری پێدەکرێت و دایکەکەی ڕزگار دەکرێ، بەلەباربردنی منداڵەکە.

## ڕێگرتن لە سکبوون ( منع الحمل )

لەسـەرەتاوە هـاوەڵان (عـەزل) یـان دەکـرد، واتـە: لـە کـاتی (جیمـاع)دا، بەرلـەوە مەنیەکـە بڕژێتە ناو منداڵدانی ژنەکەوە دەیانڕشتە دەرەوەی منداڵدانەوە، وەکو (جابر) دەڵـێ: (ئێمـە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ (عەزل)مان دەکرد و قورئانیش دادەبەزی)متفق عليه.(كنا نعـزل علـى عهـد رسـول الله والقـرآن ينـزل)ج ٩ ص ٣٠٥. (جـابر بـن عبـدالله) دەڵـێ: پیاوێـك لـە پێغەمبـەری پرسـی: جارییـەکم هەیـە و لـەکاتی جیماعـدا خـۆ عـەزل دەکـەم؟ پێغەمبـەرﷺ فەرمووی: کاری واڕێ لەوە ناگرێ، خودا بیەوێ ببێت. جابر دەڵێ: بۆ دوایی ئەو پیاوە هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو کەنیزەیەی بۆم باسکردیت دووگیانە ! فەرمووی: من هـەر بەندەو پێغەمبەری خودام. واتە: هیچ غەیبێك نازانم.

(خدامـة بنـت وهـب الأسـدية) دەڵێـت: لەگـەڵ پێغەمبـەردا ﷺ چـووینە ناوکۆمەڵـە مەردمێکەوە و دەیفەرموو: ((لقد هممت أن أنهى عن الغيلة، فنظرت في الروم وفارس فإذا هم

يغيلـون أولادهـم فـلا يـضر أولادهـم ذلـك شـيئا)) ويـستم ڕێ لـه پيـاوان بگـرم نەچنه لای ژنـی شیردەر، تەماشای (فارس)و (ڕۆم)م کردو دەبینم دەچنە لای ژنانی شیردەرو منداڵەکانیشیان تووشی زیان نابن. پاشان لە (عزل)یان پرسی: فەرمووی ((ذلك الوأد الخفی)) عەزل: سووکە زیندە بەچاڵکردنێکە.

ئیمامی (نەوەوی) دەڵێت: هەمووکات (عەزل) (مەکروهە)، ئیتر ژنەکە پێی ڕازی بێت یان نا؟ چونکە بنەبڕە بۆ (نەسل)و نەوەی ئاییندە.. هەروەها سەبارەت بەو فەرموودانە هەندێکیان ڕێ بە (عەزل) دەدەنو، هەندێکیشیان ڕێی لێدەگرن، دەڵێت: ئەوانەیان ڕێی لێدەگرن (کراهة التنزیە)، ئەوانەشیان ئیزن دەدەن، واتە: حەرام نییە، نەك کەراهەتی نەبێ.

## قسەی پەسەند لەمەسەلەی ( عەزل )دا

دەتوانین بڵێین، عەزل لە بنەڕەتدا حەرامە، بەڵام ئەگەر هۆکارێ پەیدابوو (موباح) دەبێت، بۆ ئەوانە (إبن قدامە الحنبلی) دەڵێت: ((والعـزل مكـروه إلا أن يكـون لحاجـة مثـل أن يكـون في دار الحرب فتدعوحاجته إلى الوطء فيطأ ويعزل أو تكون زوجته أمة فيخشى الرق على ولده..)) یان ژنەکە نەخۆش بێتو بەکەڵکی سكو زا نەیەت. وەزۆریی منداڵ دەبێتە هۆکاری شەرعیی، بۆ ڕێ لە منداڵگرتن وەکو ئیمامی (غەزالی) لە (إحياء علوم الدين) بەرگی ٢ ل ٥١ دا دەڵێت.

لەمەسەلەی ڕێگرتن لە سكوزا، سێ شت پێویستە:

١- ژنەکە ڕازی بێت.

٢- مێرد ڕازی بێت.

٣- کۆمەڵگەی موسڵمانان ڕازی بن، چونکە جیهانی ئیسلامیی پێویستی بەزاو ڕۆڵەو نەوەی ئاییندە هەیە، لە بەرامبەر جیهانی کوفرو خوانەناسیەوە، تا هێزو توانای ڕووبەڕوونەوەیان هەبێت، ئەگەر پێویست بوو... خۆ ئەگەر لەبەرئەوە بوو جوانی و جەحێڵی ژنەکە نەفەوتێ بەسكوزا، ئەمە جێی سەرنج و تێبینیە، ئەگەرچی لەوانەیە بۆ ماوەیەك دروست بێت... هەروەها ئەگەر دنیا دنیای هەراو کێشەو جەنگ بوو و بەوەو گرانیو ڕۆژێکی ئاوارەییو دەچوون، لەو کاتانەشدا – بەشێوەیەکی کاتی – دەتوانێ ڕێی لێبگرێت، ئەگەرچی بەبەستنی دەرگای (ڕەحم)یشی بێت، لە فیقهی حەنەفییەکاندا هاتووە: ((يجوز لها – أي للزوجة – سدّ فم رحمها كما تفعله النساء..))کەوابوو هەر شتێك ئەو مەنعە بکاو مەرجەکانی تر بۆ ڕێگرتن ببن، ژنان دەتوانن بەکاری بهێنن.

بەڕێز (عبدالكريم زەیدان) دەڵێ: لەهەر جێگایەك (عەزل) ڕەوا بێت، ڕێگرتن لە منداڵ

بـوونيش ڕەوايـە. ليژنـەى فـەتواى (ئەزهـەر) بەياننامەيـەكى – لـەوبارەوە دەركـرد – تێيـدا هـاتووە: ((إن استعمال دواء لمنع الحمل مؤقتا لا يحرم على رأي عند الشافعية، وبه تفتى اللجنة لما فيه من التيسير على الناس ورفع الحرج لاسيما إذا خيف من كثرة الحمل أو ضعف في المرأة من الحمل المتتابع، والله يقول: ﴿يريد الله بكم اليسر ولا يريد بكم العسر..﴾.

بێگومان شەريعەتى ئيسلام بۆ دابينكردنى ژيانى ئينسانەكان هاتووە، وەهەموو ئەگەر و ئيحتيمالێكى ڕەچاو كردووە: كـاتى ئاشـتيى، كـاتى جـەنگ، كـاتى ئـاوارەيى، كـاتى بـەڵاو نەهامەت و كارەسات، كاتى بێ بارانىو گرانى و قاتو قڕى، لە تەواوى ئەم كاتانـەدا تاك، يـان دەوڵـەت هـەموو دەرامـەتى خـۆى دەزانـێ، دەزانـێ سـاڵانە چـەند گـەنمو جـۆو دانەوێڵـەو نـەوتو موشـتەقاتەكانى نـەوتى هەيـە، دەشـزانێ ژمـارەى خێـزانو دانيـشتوانى وڵاتەكـەى چـەندەو، چـەندەش مەسـرفو خـەرجيان دەوێ، كـەوابوو – لـەم سـۆنگەيەوە – دەوڵـەتان دەتوانن بەرژەوەنديیەكانى خۆيان بپارێزنو چۆن بەرژەوەندى تێدايە ئەوە ڕەچاو بكەن بۆ خۆيان و خێزانو وڵاتيان. ((سـوود لـە (المفصل))، بـەرگى (٧) وە لـە كتێبـى (مسألة تحديـد النسل) وەرگيراوە.

## دەستنوێژو خۆ ششتن

١- هەر شتێك نەهێڵێت ئەندامێك، یان بەشێك لە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ، لە کاتی دەستنوێژو خۆ شۆریندا تەڕ ببێ (وەکو بۆیە، خەنە - ئەگەر جورمی هەبوو- یان هەر شتێکی تر)،پێویستە بەر لەوە لابرێ، چونکە ژێرەکەی تەڕ نابێت، کە تەڕیشنەبوو، نە دەستنوێژی دادەمەزرێ، نە خۆ شۆرینی.

٢- ژنانی حەیزدار، یان زەیسان، دەتوانن لەومایەدا هەم خەنە بەکار بێنن، هەم نینۆکیان بۆیە بکەن، چونکە نەنوێژیان لە سەرە نە خۆ شۆرین.

٣- بۆ دەستنوێژ سەری خەناوی (مەسح) دەکرێ، بەلأم بۆ خۆشۆرین دەبێ لا ببرێت، چونکە ژێری تەڕنابێت.

٤- کاتی سەرما، یان کاتێ سەرپۆشەکە -ئەگەر لابرێ- بە سەخڵەت بدرێتەوە بە سەردا، دەتوانرێ مەسح بەسەریا بکرێ ولا نەبرێ.

٥- ئەگەر بۆیەی سەر، ژێرەکەی تەڕ نەبێ، دەبێ بۆ مەسحی سەرو خۆ شۆرین لابرێن، هەروەها (زەیت)یش ئەگەر بەستیی وژێرەکەی تەڕ نەدەبوو پێویستە لابرێت.

٦- ئەگەر لە نوێژدا شتێکی پیسی بەجل وبەرگەکەیەوە دیت،پێویستە خێرا لە نوێژەکەی بچێتە دەرو بیشۆرێ، ئینجا دەست بکاتەوە بە نوێژەکەی.

٧- ئەگەر لە نوێژەکەدا، دوودڵ بوو کە شتێکی پیس وابە جل وبەرگەکەیەوە، دەبێ تا یەقین پەیدا نەکات، درێژە بەنوێژەکەی بدات.

٨- ئەگەر شتێکی پیس بکەوێتە سەر رایەخێك، دەبێ بۆ پاکبوونەوەی ئاوی بە سەرا بکرێ، ئەگینە بە سڕین پاك نابێتەوە.

٩- ئەگەر شتێکی وشکی پیس بکەوێتە سەر جەستە، یان بکەوێتە سەر جل وبەرگ، قەیدی نییە، بەلأم دەبێ لابرێت.

١٠- شۆرینی جل وبەرگی پاك وپیس پێکەوە، قەیدی نییە، ئەگەرچی بە جودا بشۆردرێن باشترە.

١١- ژنان دەتوانن مەسحی سەریان بکەن،ئەگەرچی قژیان لوولکرابێ،ئیتر شۆڕبووبێتەوە بۆ خوارەوە، یان لە عاستی خۆیدا بێت.

١٢- دەستدان بەپاش، یان بە پێشەوە(هی خۆی،یان هی کەسێکی تر، بچووك بێ، یان گەورە) دەستنوێژ هەڵدەوەشێنێتەوە.

١٣- ئەوهەوایە کە لە (فەرج)ی ژنانەوە دێتە دەر، دەستنوێژ هەڵناوەشێنێتەوە.

١٤- قسەی راست ئەوەیە کە ژنان دەستنوێژ ناشکێنن، ئیتر خێزانی خۆی بێت، یان بێگانەو حەرامی بێت، بە ئارەزوو دەست ئەنقەست بیَ یانا، مەگەر لەوەوە (مەنیی، یان (مذی) و(ودی) پەیدا ببێت.

١٥- ئەگەر ژنێك غوسڵی سەرجێیی لە سەربوو، تا خۆی نەشۆریَ، بۆی نییە قورئان بخوێنێت، چ لە بەر،چ لە ناو قورئاندا.

١٦- ئەو کەسە میز راناگریَ، یان هەمیشە(با)ی لێدەبێتەوە، دەبیَ لە کاتی بانگدا دەستنوێژ بگریَ و، خێرا دەست بکات بە نوێژەکە،پاشان ئەگەر هەرکامێکیان پەیدا بوون، نوێژەکەی دروستەو قەیدێکی نییە.

١٧- دەستنوێژ گرتن،یان خۆشۆرین بە ئاوی (کلۆر)اوی، دروستەو قەیدی نییە.

١٨- تەنها بۆ میزو ئەوی تریان خۆ پاککردنەوەپێویستە.....ئیتر نووستن ودەستدان بەپاش و پێشەوەو، دەرچوونی (با بە هەردوو جۆرەکەیەوە) تەهارەتی ناوێت، بەلکو تەنها دەستنوێژگرتنەوەی دەویَ.

١٩- نییەت هێنان بۆنوێژودەستنوێژ، تەنها بەدڵە، واتە: پیویست نییە بە زمان بگوتریَ.

٢٠- خەوەنووچکەو وەنەوز، دەستنویژ ناشکێنن.

٢١- راخستنی بەرماڵ لەسەر جێگایەکی پیس و، ئنجا نوێژ لەسەر کردنی دروستە.

٢٢- مردوو شۆرین دەستنوێژ هەڵناوەشێنێتەوە، مەگەر دەستی لە (عەورەت)ی مردووەکە بکەوێت، ئەگەر چی ناشبێت دەست بدات بە عەورەتیەیەوەو سەیری بکات، بەڵکو دەبیَ لە کاتی شۆریینیدا دەستکێش لەدەست بدات.

٢٣- مانەوەی خۆراك لە نێوان دداندا بۆ دەستنوێژ زیانی نییە، ئەگەر چی هەقە دوای نانخواردن چاك وپاك دەم و ددانی بشۆرێت، تا خۆی و ددانەکانی لە نەخۆشیی بپارێزرێن.

## خۆ ششتن

١- لەکاتی غوسڵی حەیزو زەیسانیدا، هەڵوەشانەوەی (پەلکە)ی ژنان،پێویست نییە، ئەگەرچی هەڵوەشاندنەوەی باشترە.

٢- ئەگەر ژنێك غوسڵی (جەنابەت)ی لەسەر بوو، دەبیَ بۆ غوسڵ ئاو بگاتە بنی تەواوی مووی سەری.

٣- ئەگەر ژنێك (ئیحتیلام)ی بوو، کەچی پاش بە خەبەر هاتنەوە، هیچ شتێکی نەدیت،

غوسڵی ناکەوێتە سەر، خۆ ئەگەر تەڕایی، واتە: بە جلەکانیەوە (مەنیی) دیت دەبێ خۆی بشۆرێت.

٤- بەهەر هۆیەك (مەنیی) بێتە دەر، ئەگەرچی بە جیماعیش نەبێ، غوسڵ واجب دەبێ.

٥- پەنجە کردن بە (فەرەج) دا (ژنەکە پەنجەی خۆی، یان هی کەسێکی تر) لەبەر نەخۆشیی، یان لەبەر هەرشتێ، بەوە غوسڵ واجب نابێت، بەڵکو تەنها دەست نوێژی دەوێت.

٦- بە شك و دوو دڵی، غوسڵ واجب نابێت.

٧- کەسێکی لەشگران، دەتوانێ بێ دەستنوێژ بخەوێت، بەڵام دەستنوێژ بگرێ ئەوسا بخەوێتەوە، باشترە بۆی

٨- بۆ چەند غوسڵێك، یەك خۆشتن بەسە، بۆ نموونە: (غوسڵی حەیزو زەیسانیی کەوتە سەر) دەتوانێ بە نییەتی هەمووانەوە یەك غوسڵ بکات.

٩- کەسێك بە نییەتی لەشگرانیەوە خۆی شۆریی، بەو خۆشۆرینە دەستنوێژیشی دادەمەزرێ، ئەگەرچی چاك وایە بەرلە خۆشۆرین دەستنوێژ هەڵبگرێ و پاشان خۆی بشۆرێت، دیارە بۆ غوسڵی حەیزو زەیسانییش هەروایە.

١٠- ئەگەر یەکجار ئاو کرا بە تەواوی لاشەدا بە نییەتی غوسڵ، وە هەمووی لاشە تەڕ بوو، ئەگەرچی بە (رەشاشە)یش بێت، غوسڵ دێت.

١١- بەکار هێنانی هەموو جۆرەکانی (شامپۆ) بۆ خۆ شۆرین دروستە.

١٢- ژنان لەکاتی غوسڵدا سێ جار ئاو بکەن بەسەریاندا، ئیتر پێویست ناکات (پەلکە) هەڵوەشێننەوە.

١٣- ئەگەر پاشخۆشۆرین، کەمێك (مەنیی) لە عەورەتیەوە دەرچوو، بەوە غوسڵەکەی هەڵناوەشێتەوە، مەگەر سەرلەنوێ خۆشیی پێگەشتبێت.

١٤- ژنان دەتوانن غوسڵی حەیز، یان غوسڵی لەشگرانی، دوا بخەن بۆ دوای بانگی بەیانیی، بەڵام نابێ دوای بخەن بۆ پاش هەڵهاتنی خۆرو نوێژەکەیبەیانیان بچێت.

١٥- لەسەرەتای غوسڵەوە (بسم الله) دەکرێ، وەپاش لێبوونەوەش گوتنی ئەم زیکرە سوننەتە: (أشهد أن لا إله إلا ألله وحده لا شريك له، و أشهد أن محمدا عبده و رسوله، اللهم اجعلني من التوابين واجعلني من المتطهرين).

## ژنانیش دەتوانن ( خف ) بەكاربهێنن

١- ڕاگوزەر (مسافر) بۆی هەیە، سێ شەوو سێ ڕۆژ، مەسحی (خف) بكات، نیشتەجێ (مقیم)یش، شەوو ڕۆژێك.

٢- مەرجەكانی بەكارهێنانی (خف): پێویستە حەلاڵ و پاكبن و، بگەنە شوێنی فەرزی شۆرینی پێ و، بۆ خۆشیان بە قاچەوە بووەستن و دوای دەستنوێژیش لە پێ بكرێن.

٣- شێوەی بەكارهێنانیشیان: دەست بە ئاوەكەدا دەكرێ، پاشان یەكجار مەسحی دیوی دەرەوەی سەرپێیان دەكرێ، واتە: ژێر و پاژنەیان مەسحیان ناوێ !.

٤- هەركات یەكێ لەم چوار شتەی لێ پەیدابوو، ئیتر كاریان پێناكرێ:

- لە پێ داكنران.
- غوسڵ كەوتە سەر پۆشەرەكەیان.
- دڕان و كونیان تێبوو.
- ماوەكەیان (واتە: سێ ڕۆژەكە، یان شەوو ڕۆژەكە)تەواو بوو.

٥- مەسح كردن بە سەر گوێرەویدا، ئەگەر هاوینیش بێت دروستە، چونكە گشتێتی فەرموودەكان، وا دەگەیەنێت.

٦- نابێ مەسح بە سەر گوێرەوی ناسك و دڕاودا بكرێت، واتە: بەو مەرجە مەسحیان دەكرێ، قاییم بن و داپۆشەری جێگەی فەرز بن.

## سووری خوێنی مانگانەی ژنان

١- قسەی ڕاست ئەوەیە كە ماوەی (حەیز) سنووری كەم و زۆری بۆ نییە.

٢- بەر لە تەمەنی (٩) ساڵی كچان، خوێنی حەیز پەیدا نابێت، چونكە بەر لە تەمەنی (٩) ساڵیی، هیچ ئافرەتێك ناگونجێ منداڵی ببێت، خۆئەگەر تەمەنی گەیشتە (٩) ساڵ و خوێنی بە خۆیەوە دیت، دەكرێ بگوترێ: ئەوە حەیزە.

٣- تێكچوونی یاساو سیستمی حەیز - دوای تەمەنی (٥٠) ساڵ- هەر خوێنێ هات، بە خوێنی حەیز دانانرێت، بەڵكو خوێنێ (فاسید)ەو، دەبێ ئەو ژنە نوێژ بكاو ڕۆژوو بگرێ.

٤- نیشانەكانی خوێنی حەیز:

- بۆگەنە.
- ئەوەند سوورە، ڕەش دەنوێنێت.
- خەست و چرە.

٥- ئەگەر ئافرەتێك خوێنی بە خۆیەوە دیت، دەشگونجا حەیز بێ و یەکەمجاریشی بوو، ئەوە بە حەیز دادەنرێ،وە دەبێ چاوەروانی بکات تا دوایی دێت،وە پێوەیست بە دووبارە بوونەوە ناکات.

٦- ئەگەر ژنێك بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك خوێن هات و ئینجا نەما، ئەوە حەیزە و دەبێ چاوەروانی بکات،چونکە دیسان دێتەوە.

٧- وا دەبێ پاشخۆشتن لەخوێنی حەیز، خوێنێکی زەرد و لێڵ دێت، ئەوەبە حەیز دانانرێ و، پێویست بە خۆشۆردن ناکات. بەڵام ئەگەر بە رەنگ خوێنی تەواو بوو، دەبێ سەر لەنوێ خۆی بشواتەوە، چونکە بە حەیز دادەنرێت.

٨- ئەگەر ژنێك بە هۆی تەمەن زۆرییەوە خوێنی نەما، ئەوە بە سەردەمی مەئیووس بوون لە حەیز (سن اليأس) دادەنرێ.

٩- ژنی بێ نوێژ تا پاك نەبێتەوەو خۆی نەشۆرێت، نابێ سەرجێی لەگەڵدا بکرێت.

١٠- ئەو کتێب و نامیلکانە کە هەندێ ئایەتی قورئانیان تێدایە، ژنانی حەیزدار و خەڵکانی لەشگران و بێ دەستنوێژ، دەتوانن دەستیان لێبدەن، چونکە (مصحف) نییە.

١١- ژنی حەیزدار دەتوانێ خەنە لە دەست و پێ و سەری بگرێت.

١٢- ژنان دەتوانن بۆئەوەی بکەونە حەیزەوە دەرمان بخۆن،ئەگەر بزانن تووشی زیان نابن پێی.

١٣- لە بەکارهێنانی(دەرمان) بۆ راگرتنی حەیز،پزیشکەکان (١٤) جۆر زەرەرو زیانیان باسکردووە.

١٤- لە مانگی رەمەزان و حەجدا، خواردنی حەبی راگری حەیز، قەیدی نییە، بە مەرجێ لە رووی تەندروستییەوە زیانبەخش نەبێ.

١٥- ئەگەر ژنێك حەبی بەکار هێنا بۆ ئەوە بکەوێتە حەیزەوە، پاشان خوێن هات، دەبێ بچێت لە پزیشك بپرسێت: ئەگەر ئەو گوتی ئەو خوێنە، خوێنی حەیزە، ئەوا باشە، ئەگینە کاریگەری حەبەکانەو حەیز نییە.

١٦- ئەگەر ژنێك دەرمانی بەکار هێناو کەوتە حەیزەوە، دیارە ئەوماوەیە بە حەیز بۆی دادەنرێ و گێڕانەوەی نوێژی لە سەر نییە، چونکە مادەم خوێنی حەیز هات، ئیتر بە هەر شێوەیەك بێت دەبێتە حەیز، هەرکاتێکیش نەما بە هۆی هەر شتێکەوە بێت، دەبێ نوێژو رۆژووی خۆی ئەنجام بدات.

١٧- ژنی حەیزدار دەتوانێ تەواوی ویردو زیکرە شەرعییەکان و زیکرەکانی بەیانیان و

ئێواران و دوعاكانی تر لەگەڵ كتێبی زانستیی و فیقهو فەرموودە و تەفسیرەكاندا بخوێنیتەوە.

١٨- ژنی حەیزدار و زەیسان، هیچ جۆرە نوێژێكی لەسەر نییە و نابیٚ بیكات، بۆ دوای پاكبوونەوەیشی گێرانەوەی ناویٚ.

١٩- ژنی خاوەن حەیز رۆژووی لەسەر نییە، بەڵام دەبیٚ پاش پاكبوونەوە بیگێرێتەوە.

٢٠- ژنی بیٚ نوێژ: نابیٚ چەرخە و(تەواف)ی دەوری ماڵی خودا بكات، بەڵام كردەوەكانی تری حەج، وەكو (هاتووچۆی نێوان (صەفا) و (مەروە) و وەستانی (عەرەفە) و شەومانەوە لە (مزدەلیفە)... تاد. دەتوانیٚ ئەنجامیان بدات.

٢١- ئەگەژنێك مەناسكی حەجی تەواو كردو پاشان كەوتە حەیزەوە، ئیتر نابیٚ (طواف الوداع) بكات.

٢٢- لە مزگەوتدا -تەنانەتی لە (مصلی) شدا- ژنی حەیزدار حەرامە بمێنێتەوە. بەڵام (داود الظاهری) و (مزنی) دەڵێن: لە مزگەوتدا دەتوانیٚ بمێنێتەوە، وە (إبن حزم الظاهری) رێگە دەدات بە ژنانی حەیزدار كە دەوری قورئان بكەنەوە، (مالك) یەكانیش هەروا.

٢٣- ژنی حەیزدار نابیٚ ریٚ بە مێردەكەی بدات (جیماع) ی لەگەڵ بكات، چونكە حەرامە.

٢٤- مێرد دەتوانیٚ - جگە لە جیماع- هەموو لەزەتێك لە ژنی حەیزدار و زەیسان وەرگریٚ و لەگەڵیا بخەوێت.

٢٥- ژنی حەیزدار حەرامە لەو كاتەدا تەڵاق بدرێت، تەنانەتی هەندیٚ لە زاناكان دەڵێن تەڵاقی ناكەویٚ.

٢٦- هەركات ژنی حەیزدار پاكبوویەوە، دەبیٚ تەواوی جەستەی بشۆرێت.

٢٧- زیاد و كەمكردنی ماوەی حەیز: بۆ نموونە: عادەتی (٧) رۆژ بووە،كەچی دوای شەش رۆژ خوێنەكەی نەما، یان بە پێچەوانەوە. قسەی راست ئەوەیە كە هەركات خوێنی دیت حەیزە، هەركاتێكیش نەما بە پاك دادەنریٚ. واتە: زیاد و كەم دەور نابینێت.

٢٨- پاش و پێشكردنی كاتی حەیز (جاریٚ لە سەرەتای مانگەوە، جارێكی تر لە كۆتایی مانگەوە) قەیدی نییە، هەركات خوێن پەیدا بوو حەیزە، هەركاتێكیش نەما، حەیز تەواو بووە.

٢٩- ژنان وادەبیٚ خوێنەكەیان بە زەرد رەنگ دەبینن، وایش دەبیٚ لێڵە لە نێوان زەرد و رەشدا.. ئەوە ئەگەر لەناو ماوەی حەیزەكەدا بوو، یان هێمان پاك نەبوبوویەوە، بە حەیز دادەنرێت، خۆئەگەر پاش پاكبوونەوە بوو، حەیز نییە.

٣٠- بچڕبچڕی خوێن (ئەمرۆ خوێن هەیە، سبەینیٚ خوێنی نییە) ئەمە ئەگەر هەموو كات

ئاوا بوو، ئەوە بە (ئیستیحاضە) دادەنرێت، خۆئەگەر بەیناوبەین بوو، ئەوە ئەگەر نەمانی خوێنەکە کەمتر لە رۆژێك بوو، بە پاك دانانرێ، مەگەر لە ئاخر و ئۆخری عادەتی خۆیەوە بێت.

٣١- تەڕی و (رطوبە)ی عەورەت: ئەگەر لەناو کاتی حەیزدا بوو و پێش پاکبوونەوە، بە حەیز دادەنرێت، خۆئەگەر پاش پاکبوونەوە بوو، حەیز نییە.

٣٢- ئەگەر لە غەیری رۆژەکانی حەیزیدا چەند دڵۆپێ خوێنی دیت، دەبێ دەست لە نوێژو رۆژووی خۆی هەڵنەگرێ، چونکە ئەوە خوێنی حەیز نییە.

٣٣- پێنج رۆژ بەر لە سووڕی مانگانەی خۆی، خوێنی دیت، ئەوە ئەگەر بەر لەوە خوێنی نەبوو، بە حەیز دانانرێت، واتە: دەبێ رۆژوو نوێژ بکات و بۆ هەموو نوێژێکیش دەستنوێژ بگرێت.

**تێبینی: گەلێ جار ئەم شتانە عادەتی ژنان دەشێوێنن:**

- بەکارهێنانی حەب بۆ رێگرتن لە حەیز (پێشی دەخەن، دوای دەخەن، زیادو کەمی دەکەن).

- بەکارهێنانی (لەولەب) بۆ رێگرتن لە منداڵبوون، چونکە بەهۆی ئەوەوە خوێنەکە بەکەمی دێتە دەر، ئەوساش لەباتی (٧) رۆژ، دە رۆژ دەخایەنێت.

٣٤- وادەبێ سێ رۆژ بەر لە عادەتی سوڕی مانگانەی خۆی، خوێن پەیدا دەبێ ئایا چی بکرێ؟.. بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین: ئەگەر ژنەکە عادەتی خۆی بە ژمارە بزانێت، یان بە رەنگی خوێنەکە، یان بەکات و زەمان، دەبێ لەوکاتەدا نوێژ نەکا، پاشان غوسڵ بکات و نوێژ بکات، ئەو خوێنەش پێش عادەت دێت، خوێنێکی (فاسد) ەو کاری پێناکرێ. واتە: لەبەر ئەو، واز لە نوێژ و رۆژوو ناهێڵرێت، بەڵکو دەبێ خوێنەکەی بشۆرێ و پاشخۆی ببەستێ و بۆ هەموو نوێژێکیش دەستنوێژ هەڵبگرێت، چونکە حسابی (مستحاضە)ی بۆ دەکرێت.

٣٥- ژنێك لە رۆژەکانی سووڕی مانگانەیدا، دوو رۆژخوێن دەبێنێ، پاشان دەبڕێ ونامێنێ، دیسان بۆ رۆژی چوارەم پەیدا دەبێتەوە، دەبێ بۆ رۆژی سێیەم چی بکات ؟ ئەگەر ئەو ژنە رۆژەکانی عادەتی خۆی بزانێت، دەبێ لەو رۆژانەدا دەست لە نوێژکردن هەڵگرێ ورۆژو نەگرێ، ئەگەرچی هەندێ رۆژیش خوێن نەیەت.

٣٦- خوێنی کەم لە رۆژەکانی عادەتی خۆیدا بە حیز دادەنرێت.

٣٧- لەکاتی عادەتی خۆیدا خوێن دێت و دەبڕێت، دەبێ چی بکات؟..بڵێ هەرکات خوێن هات،بە حەیز دادەنرێت، ئیتر نێوان ئەم حەیزەو حەیزی پێشووی زۆر بێت یان کەم.. ئەگەر کەوتە حەیزەوەو پاکەوە بوو پاشان دوا ی پێنج رۆژ،یان شەش رۆژ خوێن پەیدا بووەوە،

دەبیٚ دەست لە نویٚژو رۆژو هەڵبگریٚت، چونکە ئەوە حەیزە.

٣٨- ئەگەر پاش نەمانی خویٚنی حەیز، خویٚنیٚکی زەرد، یان خویٚنیٚکی لیٚلْ، یان رەشی دیت، ئەوە بە حەیز دانانریٚت،بەڵکو پیٚویستە نویٚژ بکا و رۆژوو بگریٚت.

٣٩- پاش دوو رۆژ لە رۆژەکانی عادەتی مانگانەی خۆی پاکبوویەوە، ئەنجا دوای رۆژیٚ، یان دوو رۆژ، خویٚن پەیدا بوویەوە، دەبیٚ لە و دوو رۆژەدا خویٚن هەیە، دەست لە نویٚژ و رۆژوو هەڵگریٚت.. لەو رۆژانەشدا خویٚن نییە خۆی بشۆریٚ و نویٚژەکان بکات.

٤٠- ژنیٚك لە سەرەتای هەموو مانگیٚکەوە بەپیٚی عادەتی خۆی (٦) رۆژ دەکەویٚتە حەیز، پاشان هەندیٚ جاردریٚژە دەکیٚشیٚ، دەبیٚ چی بکات؟.. بۆئەوە دەبیٚ لەسەرەتای هەموو مانگیٚکەوە (٦) رۆژ دانیشیٚ و نویٚژ نەکات، چونکە ئەوە حەیزە، بەلاٚم لە رۆژەکانی تردا، دەبیٚ غوسلْ بکا و نویٚژ بکات و گویٚ بە خویٚنەکەی نەدات.

٤١- ژنیٚك لەبەر پیریی وچوونە ساڵەوە خویٚنی نەما، پاشان چووە سەفەر و خویٚنی پەیدا بوو و دریٚژەی کیٚشا، دەبیٚ چی بکات..؟ دەبیٚ گویٚ بەو خویٚنە نەدات، چونکە زۆربەی زاناکان دەڵیٚن: کە ئافرەت گەیشتە (٥٠) سالْ حەیزی نامیٚنیٚ.

٤٢- ژنیٚك عادەتی خۆی (٩) رۆژ، یان (١٠) رۆژ بوو و پاك بویەوە، پاشان بە بچڕ بچڕ خویٚنەکەی هاتەوە.... بەڵیٚ پاش تەواو کردنی ماوەی خۆی، هەر خویٚنیٚك هات، کاری پیٚناکریٚ و فاسیدە.

## ژنان و ئیستیحاضە

١- ئیستیحاضە: بە وخویٚنە دەڵیٚن لە جیٚگەی حەیزەوە بە دەوام دیٚتە دەر، وەیان ئەگەر رۆژیٚ دوو رۆژ ببڕیٚت، دیسان دیٚتەوە.

٢- لەماوەی ئیستیحازەدا وا دادەنریٚت ئەو ژنە پاکە و، دەبیٚ بۆ نویٚژەکان هەموو جار چاوەروان بیٚت تا بانگ دەبیٚت، ئەوسا بۆ هەموو نویٚژیٚکی کات بۆ دیارییکراو دەستنویٚژ دەگریٚت، بەلاٚم بۆ نویٚژی کات بۆ دیاریی نەکراو، هەرکات ویستی نویٚژ بکات، دەستنویٚژ دەگریٚ و نویٚژ دەکات.

٣- هەرکات ویستی دەستنویٚژ بگریٚ، دەبیٚ ئەوجیٚگایە خویٚنی بەرکەوتووە بیشۆریٚ و، پاشان پارچەیە لۆکە بخاتە دەرگای (فەرج) ی و بە شتیٚك شەتەکی بدات، بۆ ئەوە خویٚنەکە راگریٚ و نەیەتە دەر، خۆ ئەگەر پاش ئەوە هەر هات، هیچ زیانیٚکی نییە.

٤- هەندیٚ جار بەهۆی نەشتەرگەری منداڵدانی ژنانەوە یان هی جیٚگایەکی تر، خویٚن بە

(فەرج)یانەوە دێتە دەر، جابۆئەم خوێنەیە دوو حاڵەت هەیە:

- دەبێ بزانێ کاتێ کە نەشتەرگەری منداڵدانی دەکاو فرێی دەدات، یان دەیبەستێ و ناگونجێ خوێنی لێ بێتە دەر، لەم حاڵەتانەدا ناکرێ لەگەڵ ئەو خوێنەدا مامەڵەی (ئیستیحاضە) بکرێ، بەڵکو دەبێ وەکو ئەو ژنانە بکەن کە پاش (طهارة) خوێنێکی زەرد، یان تەڕایی دەبینن، واتە: دەبێ نوێژ بخوێنن و ڕۆژوو بگرن و ڕێ لە تێکەڵی مێرد نەگرن، وە خۆ شتنیان لەسەر نیە، بەلاّم لەکاتی نوێژەکاندا خوێنەکەیان دەشۆن و بەشێك لە (فەرج) یان شەتەك دەدەن و کاتی نوێژ دەستنوێژ دەگرن.

- دەبێ وا نەزانێت پاش نەشتەرگەری حەیز نابێت، بەڵکو دەکرێ خوێنی حەیز پەیدا بێ، جا ئەوکاتە وەکو ژنانی خاوەن ئیستیحاضە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ.

٥- ژنانی خاوەن ئیستیحاضە بۆ ئەنجامدانی نوێژەکان - لەو ماوەدا - خۆ ششتنیان لەسەر نیە، مەگەر کاتێ خۆی بشۆرێ بۆ تەواو کردنی ماوەی سوڕی خوێنیان.

٦- ژنانی خاوەن ئیستیحاضە دەتوانن لەگەڵ مێردەکانیاندا سەرجێی بکەن.

٧- ژنانی خاوەن ئیستیحاضە سێ حاڵەتیانبۆ هەیە:

- عادەتی خۆی هەیە، ئنجا هەرکات کەوتە ئەو ڕۆژانەوە دەست لە نوێژ هەڵدەگرێت و پاشان خۆی دەشۆرێت نوێژەکانی دەکات، ئیتر سوڕی خوێنەکەی زۆر بێت یان کەم، ژنی وا هەیە لە مانگێکدا (٥) ڕۆژ لە حەیزدایەو (١٥) ڕۆژی پاکە پاشان دیسان (٥) ڕۆژ دەکەوێتەوە حەیزەوە و (١٥) ڕۆژ پاك دەبێ، ئیتر هەر بەو پێیە، ژنی وایش هەیە مانگەکەی (٣٥) ڕۆژەو (٧) ڕۆژی لە حەیزدایە و (٢٨) ڕۆژی پاکە، هەر بەوپێیە.

- ماوەی کاتی خۆی لە بیر کردووە یان دەیزانێ، بەلاّم هەرجارەی جۆرێکە، جارێ (٤) ڕۆژە، جارێ تر (٦) ڕۆژە، پاشان لێی تێکدەچێ و بەردەوام خوێنی دێت.. ژنانی ئاوا بەم شـێوەیە مامەڵـە بکـەن و پێیـان دەڵـێن (محیـزة) - هـەموو خـوێنێکی زۆر ڕەش حـەیزە، خوێنێکی سوری کاڵ (ڕەقیق).. کەوابوو لەکاتی خوێنە ڕەش و (غەلیظ)ەکاندا دەست لە نوێژ و.. هەڵبگرێ، وە لە ڕۆژەکانی خوێنە تەنکە (ڕەقیق)ەکەدا نوێژ ناکات.

- ئەو ژنانەش بەتەواوی سوری مانگانەی خۆیان لێدەچێت، زاناکان پێیان دەڵێن: (محیزة)، واتە: سەرگەردان و ڕێگە نەزان، ئەمانە دەبێ پتر لە ماوەی زۆربەی ژنانی خزمی خۆیان چاوەروان بکەن و دەست لە نوێژو.. هەڵبگرن (دایك و دایە گەورەو خوشك..) بەو مانایە ئەگەر سوری مانگانەی ئەوان (٧) ڕۆژ بێت، با ئەمانیش (٧) ڕۆژی ناو بنێن حەیزو نوێژو ڕۆژوو ئەحکامەکانی حەیزی تێدا ڕاگرن.

## تەڕایی ( رطوبەی ) فەرجی ژنان

١- هەندێ جار ئاوێکی زەرد دێتە دەر.

٢- دەکرێ ئاوێکی لێڵ (سوورێکی کاڵ) بێتە دەر.

٣- ئاوێکی سپیی (پاش نەمانی سووڕی مانگانە دێت). دەشکرێ ئەو ئاوە سپییە هەر نەبێ) بەڵام لەماوەی حەیزەێکەوە بۆ حەیزێکی تر، دەگونجێ ئەوئاوە لێڵە هەبێت، نیشانەی پاکبوونەوەی ئەمانە، وەستانی ئەو خوێنە لێڵەیە، ئەگەرچی زەردایی بمێنێ.

٤- هەر لێڵی و تەڕاییەکی زەرد لە ژنی خاوەن حەیزەوە بێتە دەر.. ئەگەر بزانرێ پێشەنگی حەیزە، ئەوا مامەڵەی حەیزی لەگەڵ دەکرێ، نیشانەی ئەوەش ئەوەیە کە ئێش و ئازارێکی لێ پەیدا دەبێ، خۆئەگەر بێ ئێش و ئازاری سك ئەو لێڵایی و زەردایییە پەیدا بوو، بە حەیز دانانرێ.

٥- هەر لێڵی و زەرداییەك - پاش تەواو بوونی رۆژانی حەیز بێت - دەبێ ژنان چاوەروابن تانەمێنێ، چونکە ئەو لێڵیە پەیوەست بێت بە حەیزەوە، حیسابی حەیزی بۆ دەکرێ.

٦- ئەو شتانەی لە غەیری کاتەکانی حەیزدا پەیدا دەبن لە (ئیفرازات)ی فەرجە و بە حەیز دانانرێن.

٧- هەرچی (ئیفرازات)ێك لە شوێنی منداڵبوونەوە دەرچێ پاکەو جل و بەرگ پیس ناکات، بەڵام دەستنوێژ دەشکێنێ. ئەوشتانەیش لە جێگەی میزەوە دەردەچن، پیسن و دەستنوێژ دەشکێنن.

٨- ئەو تەڕاییە بەهەمیشەیی لە منداڵدانی ژنەوە دەردەچێ پاکە، دەبێ لەکاتی نوێژدا دەستنوێژ بگرن و نوێژ بکەن، واتە: تا بانگ نەبێ دەستنوێژ نەگرێ بۆ نوێژەکان.

٩- بۆ ئیفرازاتی پچڕپچڕ، دەبێ چاوەروانی بانگ بکات ئەوجا دەستنوێژ بگرێ و نوێژەکانی بکات، ئەگەرچی لەکاتی نوێژەکانیشدا بێت.

١٠- ئەو تەراییە پاش غوسڵی جووتبون دێتە دەر.. ئەگەر بە ئارەزوو نەبێ غوسڵ پێویست ناکات، بەڵکو تەنها دەستنوێژ پێویستە.

١١- هەندێ جار لەگەڵ میزدا ئاوێکی سپی خەست دەردەچێت پێی دەڵێن (وەدی)، غوسڵ پێویست ناکات، بەڵکو دەبێ شوێنەکەی بشۆردرێت، چونکە وەکو میز پیسە.

١٢- هەندێ جار ئاوێکی تەنکی سپی لینج (رقيق أبيض) لەکاتی دەستبازی، یان کاتی بیرکردنەوە لە رابواردنی ژن و مێردیدا دەردەچێت، گەلێ جار مرۆڤ بە خۆی نازانێت، خۆی و جێگاکەی دەشۆرێ و دەستنوێژ دەشکێنێ، بەڵام خۆ ششتنی ناوێ.

١٣- (مەنی) پیاو: ئاوێكی قورسی سپیه، (مەنی) ژنانیش ئاوێكی تەنكی زەردە (رقیق أصفر) دەبیٚ هەردوو خۆ بشۆرن.

١٤- ئەو ژنانەی هەمیشه (ئیفرازات) یان هەیه.. دەبیٚ لەكاتی نوێژەكاندا خۆ خاوێن بكەنەوە و بەشتێك خۆ شەتەك بدەن و بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژ بشۆرن.

١٥- كچ یان بێوەژن تەرایەكی زەرد بە خۆوە دەبینن. ئەگەر (مذی) بوو خۆ شۆرینی ناویٚ، خۆ ئەگەر (مەنی) بوو و لەكاتی (شەهوەت) و ئارەزوودا، یان (ئیحتیلام) بوون دەبیٚ خۆ بشۆرن.

## ژنان و سكبوون

١- ئەو خوێنەی بەهەر هۆیەكەوە لە ژنی دوو گیان پەیدابیٚ، بۆ نموونە: دەكەوێتە خوارەوە لە شتێك، بە حەیز دانانرێت، واتە: پاكە و نوێژو رۆژو ئەنجام دەدات.

٢- یەكیٚ لە زاناكان دەڵیٚ: حیكمەت لە خوێنی حەیزدا ئەوەیە كاتیٚ سك دەبیٚ منداڵەكە بەو خوێنە نەش و نماو گەشە دەكا و زرۆبەی ژنان خوێنیان نامێنیٚ.

٣- ژنی دووگیان ناكەوێتە حەیزەوە.

٤- ئەگەر خوێنی بەربوو پێویستە بە ئەندازەی سوری خوێنی خۆی دەست لە نوێژو رۆژوو هەڵبگرێت، ئەوسا خۆی بشۆرێت و دەست بكاتەوە بە نوێژو رۆژووەكەی.

٥- شێوەی جێبەجیٚ كردنی نوێژەكەی: (فەرج)ی پاك دەشۆریٚ و پارچەیە لۆكە دەخاتە سەری و شەتەكی دەدات.

٦- ئەو ژنەی تووشی بەربوونی خوێن (نەزیف) دەبیٚ، دەتوانیٚ نوێژی نیوەرۆ لەگەڵ عەسر یان عەسر لەگەڵ نیوەرۆ بكات، نوێژەكانی شێوان و ەوتنانیش هەروا.

٧- دەرهێنانی منداڵدان ئەگەر زەروورەتێك هەبوو بۆ دەرهێنانی قەیدی نییە، ئەگینا واجبە كاری وا نەكرێت.

٨- بەستنی دەرگای منداڵدان... لەكاتی زەروورەت و پێویستدا وەكو تووش بوونی ژنەكە بە نەخۆشیی: شەكرە، پاڵەپەستۆی خوێن، چونكە منداڵ نائاسایی دەبیٚ.

٩- بەكارهێنانی دەرمان بۆ راگرتنی منداڵبوون.. لەكاتی زەروورەت بەشێوەیەكی كاتی قەیدی نیه.

١٠- رێكخستنی شێوەی منداڵ بوون (تنظيم الحمل)... هیچ قەیدێكی نیه بەتایبەتی ساڵی یەكەم ودووەمی شیردان بە منداڵ، بۆئەوەی دووبارە سكی نەبێتەوە تا ئەم لە شیر

دەبرێتەوە.

١١- متووربەکردنی ژن (التلقيح الصناعي).. (ئیبن باز) دەڵێ: من خۆم ریگە نادەم و ئامۆژگارییان دەکەم بەکاری نەهێنن، بەڵام هەندێ لە زانایان هاوچەرخ لەگەڵ ریعایەتی یاساو رێسای ئیسلام رێگە دەدەن.

١٢- منداڵ لەباربردن (الإجهاض).. لەبار بردنی منداڵ – ئەگەر لە زیناش بێت – دروست نییە و منداڵەکەش دەدرێ بەو کەسە لەگەڵی جووتبووە.

١٣- لەبار بردنی کۆرپەلەی کەمئەندام و ناتەواو (المعوق).. لیژنەی فەتوای هەمیشەیی لە (سعوودیە) دەڵێن: رێ بە لەباربردنی ئەو کۆرپەلە ناتەواوە نادرێت، ئەگەرچی پزیشکیش بڵێ چەند رۆژێکی تر لە سکیا دەمرێت، یان بە (معوق) ی لەدایك دەبێ. چونکە کوشتنی هیچ (نەفس)ێك بە ناهەق حەڵاڵ نەکراوە.

١٤- دانانی سنوورێك بۆ منداڵ بوون (دوان، سییان، چوار...) بێ هۆیەکی شەرعیی و پەسەند وەکو ئەوە دایك نەخۆش بێت، یان منداڵی زۆریان هەبێت – دروست نییە، بەڵام لەو حاڵەتەدا دەتوانێ دەرمان بەکار بهێنێ بۆماوەیەك رایگرێ. واتە: بۆ هەتا هەتایی رێ نییە بۆ راگرتنی.

١٥- منداڵی ناو شوشە (طفل الأنابيب) زاناکان رێیان لێگرتووە، چونکە (عەورەت)ی تێدا دەردەکەوێ و، دەست بە (عەورەت)ەوە دەدرێت.

١٦- ئەگەر ژنێك دوو گیان بێت لە(زینا) ئایا دەتوانرێ مارە بکرێت بۆ پیاوێکی تر؟ بێگومان نیکاحی وا دانامەزرێت، چونکە لە فەرموودەدا هاتووە: ((لا توطأ حامل حتى تضع)).

١٧- ئایا ژنی دوو گیان سەرجێیی لەگەڵ دەکرێ..؟ بەڵێ ئەگەر (حەمل)ەکە تووشی زیان نەبێت.

١٨- ژنی دوو گیان تەڵاقی دەکەوێ..؟ بەڵێ لەو ماوەیەشدا دەبێ نەفەقەی ژنەکە بدات تا سکەکەی دادەنێت.

١٩- لای کەمی نەوەی منداڵ لە سکدا (٦) مانگە.

٢٠- ئایا لەبەر دەست کورتی دەکرێ رێ لە منداڵ بوون بگیردرێ..؟ نەخێر، چونکە رزق و رۆزیی هەمووان لەسەر خودایە.

٢١- ژنێك بێ خوێن منداڵی بوو، ئاخۆ دروستە نوێژەکانی بکاو مێردەکەی سەرجێیی لەگەڵ بکا؟ بەڵێ ئەگەر ژنێك بێ خوێن منداڵی بوو، دەبێ خۆی بشۆرێ و نوێژ بکاو رۆژوو

بگرێت، مێردەکەشی دەتوانێ سەرجێیی لەگەڵ بکات.

٢٢- ئەگەر پاش تەڵاقدانی ژنەکەی (بەیەك تەڵاق) دەرکەوت دووگیان بووە.. ئایا مێردەکەی دەتوانێ بیگێرێتەوە لای خۆی؟ بەڵێ بەر لە دانانی سکەکەی دەتوانێ، ژنەکە رازیی بێت یان رازی نەبێت. بەڵام پاش دانانی سکەکەی بۆی نییە بیگێرێتەوە، مەگەر بە نیکاحێکی تازە و مارەیی و ئامادەبوونی (وەلیی)وشایەت.

٢٣- ئەگەر ژنێکی دووگیان کۆرپەلەیەکی وای لەبار چوو بەرەو دروستبوون و دەرکەوتنی ئەندامەکانی دەچوو، ئەوا بە زەیسان دادەنرێت، خۆئەگەر نیشانەی دروست بوون (تخلق)ی لێدەرنەکەوتبوو خوێنی هەبوو بە (موستەحازە) دادەنرێت.

٢٤- ژنێکی دووگیان زۆر نارەحەت و قەڵسە بە سکەکەی ئاخۆ دەتوانێ لەباری ببات؟ بەڵێ لە تەمەنی چل رۆژی سکەکەیدا دەتوانێ، هەروەها پاش ئەوەیش ئەگەر پزیشکەکان بڵێن بە مانەوەی ئەو کەسە دایکەکەی تیا دەچێ، یان زیان بە جەستەی دەگەیەنێت.

٢٥- بۆ لەناو بردنی سکێکی تەمەن چوار مانگ، دەبێ کۆیلەیەك ئازاد بکات، ئەنجا ئەگەر دەست نەکەوت، دوو مانگ بەدوای یەکەوە رۆژوو فەرز کراوە.

٢٦- ژنێکی دوو گیان بۆ ماوەی یەك مانگ ئاوێك لە (فەرج)یەوە دێت.. ئەو ئاوە پاکە، واتە: جل وبەرگ و جەستە پیس ناکات، بەڵام دەستنوێژ دەشکێنێ.

٢٧- ژنێك لەتەمەنی مانگ و نیوێکی سکیدا کورپەلەیەکی خست، پاشان پزیشك دەستکاری کردو منداڵدانی بۆ شۆری، ئینجا بۆ ماوەی (١١) رۆژ خوێن هات، ئەمیش لەوماوەیەدا دەستی لە نوێژەکانی هەڵگرت، ئایا چی بکات..؟ پێویستە هەموو نوێژەکانی قەزا بکاتەوە، چونکە زاناکان ئەو خوێنە بە خوێنی (نەزیف) دادەنێن، وە دەڵێن: ئەگەر تەمەنی ئەو کۆرپەلەیە لە (٨١) رۆژ کەمتر بوو، ئەوا هەر خوێنێك پاش ئەو بێت خوێنی (نەزیف)ە، واتە: حەیز نییە، کەوابوو نوێژەکانیشی بکات، خۆئەگەر تەمەنی سکەکەی زۆرتر بوو لە (٨١) رۆژ، هەر خوێنێ بێت بە خوێنی زەیسانی دادەنرێت، واتە: دەبێ تا نامێنێ، وە یان تا چل رۆژ نوێژ نەکات، ئەوسا خۆی دەشۆرێ و نوێژ دەکات نوێژ دەکات.

## ژنانی زەیسان

خوێنی زەیسانی، خوێنەکە لە منداڵدان بەر دەبێتەوە بەهۆی منداڵ بوونەوە، جا لەگەڵ منداڵەکە بێت، یان دوای ئەو، یان دوو سێ رۆژ بەرلە لەدایکبوون.

١- ژنانی زەیسان سێ حاڵەتیان هەیە:

– پاش چل رۆژ بە یەکجارەکی وشك دەبێ و ناگەرێتەوە، جا هەرکە خوێنەکە وشك بوو ژنەکە دەچێ خۆی دەشۆرێ و نوێژ دەکات.

– بەر لە تەواوبوونی چل رۆژەکە وشك دەبێ، پاشان پێش تەواو بوونی چل رۆژەکە پەیدا دەبێتەوە.... لە حاڵەتی ئاوادا هەر کە وشك بوو و نەما، خۆی دەشۆرێ و نوێژ و خواپەرستی خۆی دەکا، خۆ ئەگەر سەری هەڵدایەوە، دەبێتە (ئیغاس) و زەیسانی و دەست لە نوێژو رۆژووی هەڵدەگرێ.

– تا چل رۆژ تەواو دەکات بەردەوام خوێنی هەیە.. لەم حاڵەتەدا واز لە نوێژو جۆرە خواپەرستییەکانی تر دەهێنێ، جا کۆتایی هات و پاکەوە بوو و دەست دەکاتەوە بە نوێژو رۆژووی خۆی.

– چل رۆژ تێدەپەڕێ.. ئەمەیش دوو حاڵەتی هەیە:

أ– ئەگەر لەگەڵ کاتی حەیزیدا یەکیان گرت، ئەوە حەیزە.

ب– ئەگەر لەگەڵ کاتی حەیزیدا یەکیان نەگرت، ئەوە پاش چل رۆژ خۆی دەشۆرێ و نوێژو رۆژوو ئەنجام دەدات.

٢– دوو رۆژ،یان سێ رۆژ بەر لە لەدایکبوونی منداڵەکە خوێنی دیت.. ئەوە زەیسانییەو دەست لە نوێژو رۆژوو هەڵدەگرێت.

٣– ئەگەر(ژانی)لەگەڵ نەبوو، ئەوخوێنە بەخوێنی(فاسید)دادەنرێ وژنەکەش دەبێ نوێژوروۆژووی خۆی ئەنجام بدات.

٤– ژنی زەیسان هەرکەخوێنی نەما دەبێ خۆی بشۆرێت.

٥– ژنێك بەنیشتەرگەری منداڵیان لێ دەرهێنا، پاشان خوێنی هەبوو، ئەوە بە زەیسان دادەنرێ، خۆئەگەر خوێنی نەبوو نوێژو رۆژووی خۆی دەگرێ.

٦– ژنێك کۆرپەلەیەکی خست.. ئەگەر دەست و پێ و ئەندامەکانی تری جودا ببوونەوە، دیارە هەر خوێنێك بێتە دەر بە خوێنی (نیفاس) دادەنرێ، ئەگینە خوێنی (نیفاس) ە و دەبێ بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژ بگرێ و خۆی ببەستێ و نوێژ و رۆژوو بگرێ، ئەو رۆژانە نەبێ لەگەڵ سوری مانگانەیدا یەك دەگرنەوە.

٧– کۆرپەلە تەمەنی گەیشتە (٩٠) رۆژ، زیاتر وایە لەو تەمەنەدا گیانی بە بەردا دەکرێ.

٨– ئەگەر ژنێك پارچە گۆشتێك، یان پارەیەکی لێداکەوت، واتە: نیشانەی دروستبوونی مرۆڤی تێدا دیار نەبوو خوێنیشی هەبوو، ئەو خوێنە بە خوێنی (فاسید) دادەنرێت و دەبێ بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژ بگرێتەوە و خۆی شەتەك بدا، تا خوێنەکە نەیەتە دەرو پیسی بکات.

٩- ئایا ژن لەكاتی زەیسانیدا تەلاَق دەدریَ.. زاناكان دەلَیَن وەكو ژنی حەیزدار وایە. واتە: تەلاَقەكەی (بدعیە) و هەندیَ لە زانایانیش دەلَیَن تەلاَق ناكەویَ، ئەگەر چی جەماوەری زانایان دەیخەن.

١٠- (شیَخ بن باز) دەلَیَ: سنووریَك نییە بۆلای خوارووی پاكبوونەوەی ژنان، كەوابوو ئەگەر دوای (١٠) رۆژ لە مندالَ بوون یان كەمتر یان زیاتر، پاكەوە بوو، دەبیَ بشۆریَ و خواپەرستیی خۆی بكات.

١١- بەر لە چل رۆژ، لە زەیسانی پاكەوە بوو، پاشان خویَن هاتەوە و ئەویش بە رۆژوو بوو.. دەبیَ لەو رۆژانەدا خویَنەكە پەیدا بۆتەوە، دەست لە نویَژ و رۆژوو هەلَگریَت، چونكە بە خویَنی نیفاس دادەنریَت، تا یان پاك دەبیَتەوە، یان چل رۆژەكە تەواو دەبیَ.

١٢- ئایا ژنی زەیسان دەتوانیَ قورئان بخویَنیَ..؟ قسەی راست ئەوەیە كە دەتوانیَ، تا لە پاداشی گەورەیی قورئان خویَندن و بەجیَهیَنانی ئەحكامەكانی تری ئیسلام بیَ بەش نەبیَ.

١٣- ئەو خویَنە لیَلَ و زەردە لەماوەی زەیسانیدا بە دریَژایی چل رۆژ دیَتەدەر بە نیفاس دادەنریَ، وە پاش چل رۆژیش ئەگەر بە خویَنیَكی ئاسایی دادەنراو بەیناوبەین نەدەبرا، هەر خویَنی زەیسانیە، ئەگینە خویَنی (ئیستیحازە)یە.

١٤- ژنیَك پاش دە رۆژ لە پاكبوونەوەی لە زەیسانی چەند دلَۆپیَ خویَنی دیت، ئەگەر ئەو رۆژانە هاوكات نەبوون لەگەلَ سوری مانگانەدا، خویَنەكە بە (فاسید) دادەنریَ. واتە: دەبیَ دریَژە بە نویَژو رۆژووی خۆی بدات، ئەگەر لەو رۆژانەشدا دەستی لە نویَژ هەلَگرتبیَت، دەبیَ قەزای بكاتەوە.

١٥- دوای چل رۆژ لە مندالَبوون خویَنەكەی گۆڕا، ئایا نویَژو رۆژوو بگریَ..؟ بەلَیَ ژنی زەیسان ئەگەر لە سەرووی چل رۆژەوە خویَنی دیت و نەگۆڕا بوو، جا ئەگەر هاوكات بوو لەگەلَ ماوەی سووڕانەوەی خویَنیدا، بە حەیز دادەنریَ، خۆئەگەر هاوكات نەبوو لەگەلَیا، دەبیَ خۆی بشۆریَ و نویَژ بكا و رۆژوو بگریَ.

## ژنان و چل و بەرگ ( حیجاب )

١- بالاَپۆشیی: بەوجل و بەرگە دەلَیَن كە تەواوی جەستە داپۆشیَ، دیارە دەم و چاوو هەموو خشلَ و زەمبەریَك دەگریَتەوە، واتە: دەبیَ ژنان لە ئاست خەلَكانی نامەحرەم دەم و چاوو هەموو شتیَكی (زینەت) و سەرنج راكیَشیان داپۆشن و خۆیان دەر نەخەن بۆیان.

٢- خۆ دەرخستن (التبرج): بەوە دەلَیَن كە ژنان خشلَ و زەنبەر و جوانیەكانیان دەربخەن

بۆ پیاوانی نامەحرەم.

٣- خۆ دەرخستن بە چەند شتێك دەبێ:

أ) داماڵینی حیجاب و خۆ دەرخستن لە بەردەم پیاوانی نامەحرەمدا.

ب) هەندێ لەو زینەت و جوانیانەی دەربخا بۆ پیاوان کە ڕێنەدراوە بە دەرخستنی.

ج) پێکوتان بە زەویدا بۆ ئەوەی خاڵخاڵ و بازن و پاوانەکانیان تەقەی بێت، وە یان بەلار و لەنجە بچێت بەڕێوە.

د) بەناز و نوزەوە قسە بکات.

هـ) تێکەڵی لەگەڵ پیاوان بەهەر جۆرێك ناپەسەند و ناشەرعیی بێت، وەکو تەوقەکردن و پاڵەپەستۆ.

٤- ئەو فەرمودەیە کە دەڵێ: (إن المرأة إذا بلغت المحيض لم يصلح أن يرى منها إلا هذا و هذا) هەرکە کچەکان باڵغ بوون، دەم و چاوو دەستیان نەبێ، نابێ شتێکی تریان ببینرێ. (اللجنة الدائمة) دەڵێ: لاوازە)

٥- ئەوی ڕێ بە ژنان دەدا دەری بخەن بۆ مەحرەمیان: دەم و چاوو هەردوو دەستە، خڵخاڵ و گوارە و بازن و ملوانکە و سەرو هەردوو پێیانە.

٦- نابێ ژنان لە بازاڕدا دەست و باسکیان دەربخەن، چونکە فیتنەخێزە و سەرنج ڕاکێشە، بە تایبەت کە پەنجەکانی پڕبن لە ئەنگوستیلە و باڵەکانی لە بازن.

٧- خۆدەرخستن لای خزمەتگوزار (خدم) حەرامە و، نابێ پێکەوەیش بە تەنها دابنیشن.

٨- ڕوخسار دەرخستن لای نابینا و کوێر هیچ قەیدی نیە، لەبەر ئەم فەرمودەیە کە دەفەرموێ: (إعتدى عند إبن أم مكتوم، فإنه رجل أعمى) چونکە فەرموودەی: (أفعمياوان أنتما، ألستما تبصرانه) بە پێی لێکۆڵینەوەی (شێخ بن باز) لاوازە.

٩-چاو ڕەشکردن بە (کل) و جوانکردنی ڕوخسار و دەرخستنی بۆ خەڵکانی نامەحرەم حەرامە.

١٠- ئەو ژنانەی لە سك و زا نیشتونەتەوە دەتوانن ڕوخساریان لای نامەحرەم دەربخەن، خۆ ئەگەر دەری نەخەن و خۆیان بپارێزن باشترە.

١١- ژنی موسڵمان دەتوانێ لای ژنی کافر و خوانەناس لای سەروی ناوکیی و لای خوارووی ئەژنۆی دەربخات، بەڵام نێوان ئەژنۆ و ناوك بۆ هەموو ژنێکی مسوڵمان و نامسوڵمانیش عەورەتە، ئەگەرچی خزمی زۆر نزیکشی بێت.

١٢- کارەکەر دەبێ لای گەورەکەیدا نە خۆی دەربخات و نەخشڵ و زەنبەری، وە نابێ

هەردوو پێكەوە لە شوێنێكی چۆڵدا خەڵوەت بكەن.

١٣- جل و بەرگی تەسك بۆ ژنان، جگە لە ناشەرعیەتەكەی ئاسەوارگەلێكی خراپیشی لێ دەكەوێتەوە:

- پێست توشی حەسایەت دەبێ.
- گوشار دەكەوێتە سەر گەدە و ڕیخۆڵە و ئەندامەكانی ناوەوە.
- نەزۆكی لێ دەكەوێتەوە.
- گوشار دەكەوێتە سەر دەمار و ڕەگەكان، ئینجا بەو هۆیەوە خوێنیش بەرز دەبێتەوە، لەوەیشەوە ڕۆشتنیش لاواز دەكات.

١٤- پێویستە (عابا) ئەم مەرجانەی تیادا بێت:

- ئەوەندە ئەستوربێ، تاژێرەكەی دەرنەكەوێ و نەیشلكێ بە جەستەدا.
- پان و پۆڕبێ و تەواوی جەستە داپۆشێ.
- تەنها لە پێشەوە كراوەبێ و كۆتایی قۆڵەكانی تەسك بێ.
- پارچەیەكی سەرنج ڕاكێش نەبێ، واتە: نیشانەو وێنەو نوسینێكی وای پێوە نەبێ، ببێتە مایەی سەرنج ڕاكێشان.
- لە جل و بەرگی ژنانی كافر و بەدكردار نەكات.
- بیدات بە سەریا، نەك تەنها قۆڵی پێوە بكات.

١٥- ژنان دەتوانن (پەرچە)یەك بەكار بهێنن و ڕوخساریان، جگە لە هەردوو چاوو، یان یەكێكیان - داپۆشن - (بن باز) دەڵێ: بەو جۆرە ژنان دەبنە (محجبە)ی شەرعی كە هیچ شتێك لەجوانی خۆیان دەرنەخەن، دیارە هەر وڵاتەی باوو عادەتێكی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ بەكارهێنانی عابا، بەڵام هەر دەبێ ئەو مەرجانەی سەرەوەی تیادا بێ.

١٦- (ئیبن عثیمین) و (إبن الفوزان) دەڵێن: نابێ (نیقاب) وابێ دەم و چاوی تێدا دەركەوێ، واتە: دەركەوتنی كوڵم و پێڵوو برۆ و سەرتر و خوارتر دروست نییە، چونكە سەرنج ڕاكێشە.

١٧- (ئیبن جبرین) دەڵێ: نیقابێك لوت و برۆ و كوڵمی تیا دیار بێت دروست نییە، بۆیە دەبێ بە شێوەیەك بێت هیچ شتێك لە ژێرەوەی دەرنەكەوێ.

١٨- ژنان هەر ڕەنگێك هەڵدەبژێرن بۆ (حیجاب) لەگەڵ ڕەچاوكردنی مەرجەكانیدا دروستە.

١٩- هەر نێرینەیەك كەجێگەی گومان بێت (ئەگەر مێرد منداڵیش بێت) دەبێ ژنان

**خۆیانی لێ داپۆشن.، پێغەمبەرمان محمد ﷺ دەفەرموێ: (أيما إمرأة وضعَت ثيابها في غَير بيت زوجِهَا فَقَد هَتَكَت سَترَ ما بَينها و بينَ الله) واتە: هەر ژنێك بەدەر لەماڵی مێردیدا جل و بەرگەکەی خۆی دابنێ (لەبەریا دایماڵێ) ئەوە بێگومان پەردەی نێوان خۆیی و خودای ئەتك کردووە، مەبەست لەم فەرموودە ئەوەیە کە نابێ ژنان زۆر بەئاسانی لەملاو لەولا جل و بەرگیان داماڵن و عەورەتیان ببینرێ، تا ناوو شۆرەتی بەدکرداری بکەوێتە دوایان، بەڵام لە شوێنێکی ئەمن و ئاسایشدا، داماڵینی جل و بەرگ بۆ خۆ گۆڕین، یان بۆ فێنکیی، یان بۆ هەر مەبەستێکی تری شەرعیی قەیدی نییە.**

**٢٠- لە پێکردنی گۆرەوی ناسك و تەنك بۆ داپۆشینی (پێ) دروست نییە.**

**٢١- سەرپۆشی ناسك و تەنك (سەردانەپۆشێ) دروست نییە.**

**٢٢- لە پێ کردنی (پانتۆڵ) بۆ ژنان دروست نییە، چونکە بۆتە باوو عادەت پیاوان لە پێی دەکەن، پێغەمبەریش ﷺ نەفرینی کردووە لەو ژنانەی کە خۆیان دەشوبهێنن بە پیاوان.**

**٢٣- نابێ ژنان جل و بەرگێ لەبەر بکەن کە وێنەی ئینسان و ئاژەڵی پێوە بێ.**

**٢٤- نابێ ژنان جل و بەرگێ لەبەر بکەن عەورەتیان دانەپۆشێ(کورت بێت، یان تەنك).**

**٢٥- ئەو جل و بەرگانەی تایبەتن بە ژنانی کافر و بەدڕەوشتەوە نابێ ژنانی ئیماندار لەبەری بکەن.**

**٢٦- نابێ ژنان لە جل و بەرگەکانیاندا کون هەبێ و لەوێوە لاق و قاچ و قۆڵیان وەدەرکەوێ.**

**٢٧- نابێ ژنان کاتێ دەردەچن عاباکەیان لەسەر شانکەن، وەکو پیاوان، بەڵکو دەبێ بیدەن بە سەریاندا.**

**٢٨- ژنان و کچانی قوتابیی، نابێ لە هیچ بۆنەیەکدا جل و بەرگی تەسك و تروسك لەبەر بکەن، چونکە دەبێتە مایەی وروژانی هەواو هەوەسی گەنج و لاوەکان.**

**٢٩- نابێ ژنان دەست و باڵیان بۆ خەڵکانی نامەحرەم دەربخەن.**

**٣٠- (شیخ إبن جبرين) دەڵێ: نابێ ژنان لەلای خەڵکانی نامەحرەم دەم و چاوو ڕوخساریان دەربخەن.**

**٣١- دەرخستنی دەم و چاوو دەست و پێ لای خەڵکانی نامەحرەم حەرامە.**

**٣٢- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (المرأة عورةٌ فإذا خَرَجَت إستَشرَ منها الشيطان) واتە: حاڵەتی شیاوو لایەق بە ژنانەوە ئەوەیە هەمیشە لەماڵەوە بن و تا زەرورەت ڕوو نەدا دەرنەچن، چونکە هەرکە دەرچوون شەیتان تەماحیان تێدەکا و چەواشەیان دەکاو،**

خەڵکانیش پێیان چەواشە دەبێ، مەگەر کەسێك خودا بە بەزەیی خۆی ڕەحمی پێ بکات.. بەڵێ هەقە ژنان تا پێویست نەبێ لەماڵ نەچنە دەر، ئەویش بە ئەوپەڕی خۆدا پۆشین و لەبەرکردنی جل و بەرگی بالآپۆش و بەکار نەهێنانی بۆنی خۆش، بە تایبەتی لە بازاڕ و شوێنە قەرەباڵغەکاندا.

٣٣- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (صنفان من أهل النار لم أرَهُما.. و نساء كاسيات عاريات، مميلات مائلات، رؤسهن كأسنِمَة البُخت المائِلَة، لا يَدخُلنَ الجَنَة وَ لاَ يَجدنَ ريحَهَا..). واتە: دوو دەستە هەن جەهەننەمین و نەمدیتوون، (واتە: دوایی پەیدا دەبن)، دەستەی دووەم – کە مەبەستی ئێمەیە لەم جێگایەدا – ژنگەلێکن پۆشتەن و ڕوتن (جل و بەرگێکی ناسك و تەنکیان لەبەردایە) بەلارو لەنجە دەچن، یان چونکە پێڵاوی پاژنە بەرز لەپێ دەکەن، قژی سەریان لە دواوە بەرز بۆتەوە دەڵێی دووگی وشترە، (واتە: قژیان کۆ دەکەنەوە لە پشت سەریانەوە دەیبەستن و سەریانی پێ گەورە دەکەن).. دیارە ئەمەیش کارێکی حەرامە و نابێ ژنان بیکەن.

٣٤- نابێ ژنان لەلای خەڵکانی نامەحرەمدا ناوقەدیان شتەك بدەن و، بەژن و بالآیان باریك نیشان بدەن، چونکە بەوە قەبارەی کلۆك و سمتیان دەردەکەوێ، دیارە ئەوەیش حەرامە.

٣٥- نابێ ئەو جل و بەرگەی لەبەر دەکرێت، نوسینێکی پێوە بێت نەزانرێ چییە، چونکە گەلێ جار شت دەنوسرێت بە ئینگلیزیی، یان فەرەنسیی، ماناکەیشی قیزەوون و خراپە.

٣٦- (شێخ بن باز) دەڵێ: هەر جل و بەرگێك، یان هەر (فەروەیەك) لە پێستی ئەو حەیوانانە دروست بکرێت کە بە (دەباغ) پاك دەبێتەوە، لەبەرکردنی حەلآڵە، کەوابوو ئەگەر پێستی سەگ و بەراز بوو نابێ لەبەر بکرێت، چونکە ڕای زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەیە کەپێستی ئەودوانە دەباغی نایەت.

٣٧- مەلەوانگەی ژنان.. ئەگەر شوێنێکی شیاوو گونجاوو تایبەت بە ژنانەوە ئامادەکرا بۆ (مەلە) کردن تێیدا.. دەبێ هەرگیز نێوان ئەژنۆ و ناوکیان ڕوت نەکەن و بە شتێکی قایم و مەحکەم ئەو نێوانە داپۆشن.

٣٨- لەبەر کردنی ئەو جل و بەرگە کە ئایەتێکی قورئانی لەسەر نوسرابێ، یان (شەهادەتەین) قەیدی نییە، بەلآم دەبێ ڕێزی لێ بگیردرێ و پێوەی نەخەوێ و نەچێتە دەستشوویی و لەسەریشی دانەنیشێ.

٣٩- زێدە ڕۆیی لەجل و بەرگداو سەرفکردنی پارەو پولێکی زۆر بۆی، لەئیسلامدا

كارێكی ناپەسەندە، بۆیە پێویستە كە زیاتر ژنانی ئیماندار لە خوا بترسن و میانە ڕەوبن لەجل و بەرگدا، چونكە ئەو ماڵ و سامانە لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیارو وەڵامی لە سەرە: چۆنت پەیداكردو ؟ چۆنت سەرف كرد ؟

٤٠- هەندێ كەس دەڵێن: ژنی خاوەن شەرەف كەی پێویستی بە (حیجاب) هەیە ؟ بێ گومان، ئەوە قسەو بۆچوونێكی ناڕەوایە، وە لەگەڵ قورئان و فەرمودەكان و عەقڵ و سروشتی مرۆڤدا دژ دەوەستێ، چونكە بێ شك كە هەموو ژنێكی (متبرجە) و خۆ دەرخەر، پیاوان تەماحی تێدەكەن و تووشی ئازار دەبێ بە دەستیانەوە، ئەگەر چی خاوەن عیففەتیش بێت، دووریش نییە شەیتان لەخشتەی بەرێ، دڵنیابن ژن ئەگەر شەریف بێت، بە (حیجاب) شەرافەتەكەی زیاد دەبێ.

٤١- خۆ دەرخستن – تەنانەتی – لەولاَتە كافرەكانیشدا ڕەوا نییە، بەڵكو دەبێ لەهەر شوێنێكدا بن لەپیاوانی نامەحرەم خۆ داپۆشن، ئەگەر چی ئەو پیاوانە خوا نەناسیش بن.

٤٢- لەبەركردنی جل وبەرگی تەسك و تروسك و ناسك و باریك، ناڕەوایەو دروست نییە، چونكە بەرەنجام دەبێتە باوو ئولفەی پێوە دەگیردرێ و، جل و بەرگی قایم و شەرعیی دەخرێتە ئەولاوە.

## ئاگاداركردنەوەیەك:

هۆی سەرەكی بۆ لەبەركردنی جل و بەرگی تەسك و تروسك و ناسك و باریك و خۆ دەرخستن، دەگەڕێتەوە بۆ:

١- لاوازی (ئیمان) و بێ ترسی لەخودای گەورە و بەدەسەلاَت، چونكە ژن كە سزا و تۆڵەی خودای لەبیر بردەوە، بێ شك هەرچی دڵی بیخوازێ دەیكاو هەوڵی بۆ دەدا، چونكە شەیتان لەو ڕێگەیەوە زاڵ دەبێ بەسەریاو بۆ خۆیشی دڵ نەرم و دڵ ناسكەو دوای ئارەزووەكانی نەفسی دەكەوێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (اطلعت فی النار، فرأیت أكثر أهلها النساء) رواه البخاری، واتە: جەحەننەمم دیت، دەبینم زۆرینەی خەڵكەكەی ژنانن.

٢- پەروەردەی فاسید و تێكچوو.. بێ سۆ هەر خێزانێك گرنگی بە پەروەردەكردنی نەدرێ و پشتگوێ بخرێت، ڕێگەی گومڕایی و هەڵەدەگرێ و سەر لێشێواو دەبێ، چونكە منداڵان، بە تایبەتی كچەلاوەكان چاو لەماڵەوەیان دەكەن، ئەگەر دیتیان دایكیان (متبرجە) و ڕووتە، ئەوا ئەوانیش خۆیان ڕووت دەكەنەوە.

٣- میدیاكان.. ئاشكرایە لەگەڵ زۆربوونی هۆكارەكانی ڕاگەیاندن، دوژمنانی ئەخلاق و

ڕەوشتیش گرنگیەکی ئێجگار زۆریان داوە بەڕوخاندنی (ئەخلاق) و (قییەم) بە تایبەتی بۆ دەرهێنانی ئەو مرواریيە داپۆشراوە و فڕێدانی بۆ ناو گەنکاوەکانی بیٚ ڕەوشتیی و سروشت نزمیی.

٤- لاسایی کردنەوە.. بەڵیٚ لەم سەردەمەدا خۆمان تێیدا دەژین، هۆکاری سەر لێشێواویی و چەواشەکردن و لە خشتە بردنی ژنان زۆر بووە، بە شێوەیەك زۆرێکی زۆرینە ژنانیش بە کوێرانە لاسایی دەکەنەوە و جێگە پێیان هەڵدەگرن و خۆ دەشوبهێنن بە ژنانی خۆرئاواوە، کە هەموو ئاواتێکیان خۆ دەرخستنە، بیٚ گوێدان بە باری ئەخلاق و ڕەوشت بەرزیی.. دەبینی – سەدمەخابن – ژنێکی موسڵمان و خاوەن ئیمان، ڕێك بە ڕێك، هەنگاو بە هەنگاو، جێگە پێی ژنانی خۆرئاوا هەڵدەگریٚ و شوێنی ئەخلاق نزمی ڕووخاوی ئەوان دەکەوێت.

٥- هاوڕێی خراپ و فاسید.. دەتوانین بڵێین لە هۆکارەکانی تر خراپترو زیان بەخشترە، لە کۆنەوە گوتراوە (الصاحب ساحب) هەرچی ئەخلاق و قیەمی چاك هەیە لە مرۆڤدا، هاوڕێی خراپ و بەد کردار لەگەڵ خۆی دەیبات.

## ژنـان و نوێژکردن

١- (شـێخ بـن بـاز) دەڵـیٚ: هـیچ جیاوازییـەك لـە نێـوان نوێـژی ژن و پیـاودا نییـە، وە ئـەو جیاوازییـەش کـە هەنـدیٚ لـەزاناکان باسـی دەکـەن، هـیچ بەڵگەیـەکی لەسـەر نییـە، وەئـەو فەرموودەیەی: (صلوا كما رأيتموني أصلي) گشتگیرەو ژن و پیاو تێیدا یەکسانە، سوننەت ئەوەیە ژنان وەکو پیاوان نوێژ بکەن، وە لە رکووع و سوژدەو خوێندندا وەکو یەکن.

٢- ئەگـەر نوێـژی کـردو هەنـدیٚ لـە (عـەورەت) ی بـەدەرەوە بـوو، وەکـو لاق و پێـی و سەرو..تاد، ئەو نوێژەی نادرووستە.

٣- ژنان دەبیٚ لە نوێژدا تـەواوی جەسـتەیان داپۆشـن، دەمـو چاوو دەسـتییان نـەبیٚ، خـۆ ئەگەر پیاوێکی نامەحرەم لەویٚ ئامادەبوو، دەبیٚ ئەوانیش داپۆشرێن.

٤- لـەو جێگانـەدا سـوننەتە دەنـگ بـەرز کردنـەوە لـە نوێـژدا بـۆ پیـاوان – بەسـوننەت و فەرزەوە – بۆ ژنانیش سوننەتە، مەگەر نامـەحرەم لـەویٚ بـیٚ و بەدەنگەکەی لەخشتە بچێت، یان مەگەر سەر لە خەڵکی تر تێك بچێت بەهۆی دەنگ بەرزکردنەوەی ئەو.

٥- لەبـەر کردنـی ئـەو جـل و بەرگـەی وێنـەو خاچـی پێوەیـە حەرامـە، ئەگـەر بـەو جـل و بەرگەوە نوێژ کرا، نوێژەکە دروستە، بەلاّم گوناهبار دەبیٚ.

٦- ئەگەر لە نوێژدا (پژمی).. دەتوانیٚ بە هێواش ونهێنی لەدلاّ (الحمد لله) بکات.

٧- ئاماژە لەنوێژدا.. تۆ لە نوێژدایت، کەسێك پرسیارێکت لێدەکات، تـۆش بەسـەر، یـان

بەدەست ئاماژەی بۆ دەکەیت وبەوە تێیدەگەیەنیت، قەیدی نییە.

٨- (شێخ بن باز) دەڵێ: جم وجوولی زۆر، نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، بۆیە ئەگەر کەسێك وایزانی زۆر جوولاوەتەوە، دەبێ نوێژەکەی بکاتەوە.. بەلام دیارییکردنی جم وجووڵ بەسێ جار بۆ بەتاڵکردنەوەی نوێژ، قسەیەکی لاوازەو بەڵگەیەکی لەسەر نییە.

٩- پێویستە لەو جێگانەدا – لەکاتی نوێژدا بەتایبەت – دوورەوە کەوین، کە دڵمان رادەکێشێ و سەرقاڵمان دەکات لەنوێژەکە، بۆیە دەبێ هەر جێگایەك وێنەی تیا هەڵواسرابێ، یان شتێکی سەرنج راکێشەری تێدا بێت، دەبێ لێی دوورکەوینەوە.

١٠- لەکاتی سوژدەدا، سوننەتە (ژن وپیاو)، هەردوو ئانیشکیان لە زەوی بەرز بکەنەوەو هێز بخەنە سەر هەردوو لەپی دەستیان.

١١- ئەگەر کەسێك لە نوێژدا خوێنی(لووت)ی بەربوو.. ئەگەر خوێنەکە کەمبوو، دەتوانێ بە شتێك بیسرێ و بەردەوام بێت لەسەر نوێژەکەی، خۆ ئەگەر زۆربوو، دەبێ نوێژەکەی بڕێ وخۆی خاوێن و پاك بکاتەوە، پاشان لە سەرەتاوە تێهەڵچێتەوە.

١٢- ئەگەر کەسێك لە نوێژدا بوو و زەنگی دەرگا لێدرا، ئەوە ئەگەر ئەو نوێژە، نوێژی سوننەت بوو، دەتوانێ بیبڕێ و بچێ بزانێ کێیە، خۆ ئەگەر نوێژی فەرزبوو، نابێ پەلە بکات، مەگەر زۆر زەروورو و پێویست بێت، واتە: ئەگەر بەدەمیەوە نەچێت، کارەکەی لە دەست بچێت، خۆ ئەگەر بەچەپڵەو (تەصفیق) ئاگادار دەبوو، قەیدی نییە، ئەگەرچی نوێژ خوێنەکە ژنیش بێت.

١٣- ئەگەر ژنێکی دووگیان تووشی میزەچڕکێ هات، پێویستە بۆ هەموو نوێژێك (وەکوخاوەن ئیستیحازە) دەستنوێژ بگرێ و، بە(لۆکە) توند خۆی شەتەك بدا و نوێژەکانی بکات.

١٤-ئەگەر لە دەشت وچۆڵایەکا بوو، نەیدەزانی (رووگە) لە کوێوەیە، ئینجا پاش هەوڵێکی زۆر بۆ دۆزینەوەی، (جیهەت)ێکی هەڵبژارد بۆ رووگە و رووی تێکرد، جا بۆ دوایی دەرکەوت قیبلە نەبووە، ئەوە نوێژەکەی دروستەو قەزای ناوێ، خۆ ئەگەر لە ماڵەوە بوو، دەبێ قەزای بکاتەوە.

١٥- دزی نوێژ لە هەموودزێك خراپترە، دزی نوێژ ئەوکەسەیە کە مافی نوێژ نەپارێزێ، واتە: ئەندازەی مانەوەی نێوان رکووع و سوژدەو.. تاد. رەچاو نەکات، لە بەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((أسوأ الناس سرقة الذی یسرق من صلاته، قالوا: یارسول الله کیف یسرق من صلاته ؟ قال: لایتم رکوعها ولا سجودها)) رواه أحمد.

**١٦- ئەگەر لە نوێژدا (باویشك)ی بۆهات، دەبێ هەوڵبدا نەهێڵێ، چونکە شەیتان لەوێوە خۆی دەکاتە ژوورەوە، مەبەست ئەوەیە لەو کاتەدا دەست بگرە بە دەمتەوەو مەهێڵە بێت، ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:((إذا تثائب أحدكم في الصلاة، فليكظم ما استطاع فإن الشيطان يدخل)).**

**١٧- ئەگەر لە ناو فڕۆکەدا بووو جل وبەرگەکەی نوێژی نەبوو،ترسی ئەوەشی هەبوو تا دەگاتە جێ و خۆی خاوێن دەکات، کاتی نوێژەکە لە دەست دەچوو، لە حاڵەتی وادا دەتوانێ بەو جل وبەرگەوە نوێژ بکات.**

**١٨- ئەگەر لەناو فڕۆکەدا بوو و کاتی نوێژ هات و، فڕۆکە هەر لە ڕۆیشتندا بوو، لەوانەشبوو بەر لە نیشتنەوەی فڕۆکەکە نوێژەکەی لە کیس بچێت، دەبێ چەندە بۆی دەکرێ، ڕووی بکاتە رووگە و نوێژەکەی بکات.**

**١٩- ئەگەر دەیزانی بەر لە ڕۆیشتنی کاتی نوێژەکەی، فڕۆکەکە لە جێگایەك دەنیشێتەوە ودەتوانێ نوێژەکەی بکات، یان ئەو نوێژە لە گەڵ نوێژی تردا کۆ دەکرێتەوە،(وەکو نیوەڕۆ لە گەڵ عەسر، مەغریب لە گەڵ عیشا)و فریای کردنیان دەکەوت بەر لە نەمانی کاتی نوێژی دووەم، ئەوە وەکو زانایان دەڵێن، لە ناو فڕۆکەکەدا چۆن بۆی دەلوێ بیکات.**

**٢٠- ژنان لە کاتی نوێژدا دەتوانن، منداڵ بە کۆڵ، یان بە باوش هەڵبگرن، بەمەرجی:**

**- پاك وخاوێن بێت.**

**- پێویست بە هەڵگرتن بکات، واتە: ئەگەر هەڵ نەگیردرێ، بیکاتە هەراو کێشەو نوێژەکەی لێ تێك بدات.**

**٢١- (شێخ ئیبن عثیمین) دەڵێ: ئەگەر ژنێك مێردەکەی نوێژ نەکەربوو، دروست نییە لە لای بمێنێتەوە(ئەگەرچی منداڵیشی لێی ببێ) وە نابێ ڕێ بدات سەرجێیی لە گەڵ بکات، چونکە نوێژ نەکەر - بە پێی راو بۆ چوونی هەندێ لە هاوەڵان وپاشینان- بە کافر دادەنرێت.**

**٢٢- ئەگەر ژنێك لە(حەرەم)ی کابەدا خەرێکی نوێژ بووو منداڵەکەی دیار نەما، ئایادەتوانێ نوێژەکەی بڕێ و بە دوایدا بچێت؟ بەڵێ هەقە بەر لەوە دەست بکات بە نوێژ، هەوڵبدات منداڵەکەی دامرکێنێ،بۆ ئەوە ون نەبێ، جا ئەگەر پاش ئەو هەوڵانە ونبوو، دەتوانێ نوێژەکەی بڕێ و دوای بکەوێ.**

**٢٣- لە کاتی نوێژی نیوەڕۆدا خوێندکارێك دەچێتە ژووری تاقییکردنەوەوە، تاقییکردنەوەکەشیان دوو کات ژمێر دەخایینێ، دەبێ چی بکات لە بارەی نوێژەکانیەوە؟**

ئەگەر دەرفەت هەبوو لەو ماوەیەدا نوێژەکەی بکات، هەوڵبدات بیکات، ئەگینە لەگەڵ عەسر کۆی بکاتەوە.

٢٤- ئەگەر ژنێکی نەخۆش بییەوێ نوێژ بکات، لە کاتی سوژدەدا پێویست دەکات پشتییەك یان هەر شتێکی دی لە بەردەمیا دابنێ وسوژدەی لە سەر ببات؟ نەخێر، چونکە کاری وا لە سوننەتدا نەهاتووە، بەڵکو بە(کەراهەت)ـەوە نزیکە، بەڵکو هەر ئەوەند پێویستە کە لە کاتی سوژدەدا پتر لە رکووع بچەمێتەوە.

٢٥- دواخستنی نوێژ بە هۆی نەخۆشییەوە دروست نییە، بەڵکو هەرکات نوێژ بوو، دەبێ چۆن دەتوانێ خێرا بیکات، بە راوەستانەوە، بە دانیشتنەوە، لە سەر تەنیشت، لە سەر پشت، سەرەڕای ئەمەیش دەتوانێ نیوەڕۆو عەسر، شێوان و خەوتنان، پێکەوە بە(جمع التأخیر) یان بە(جمع التقدیم) بکات

٢٦- ئەگەر ژنێك کاتێ لە خەو هەڵسا، خۆرکەوتبوو،ئایا دەتوانێ پیش نوێژە فەرزەکە سوننەتەکەی بەیانی بکات؟ بەڵێ هەرکەسێك بە خەبەرنەیەت، دوای خۆرهەڵاتن نەبێ، دەتوانێ لە پێشەوە سوننەتەکەی پێش بەیانی بکات، ئنجا فەرزەکە بکات

٢٧- ئایا پیاو دەتوانێ رێ لە ژنەکەی بگرێ بچێت بۆ مزگەوت ؟ ئەگەر بە شێوەی شەرعیی خۆی داپۆشێ، بۆی نییە رێی لێ بگرێ.

٢٨- ئایا ژنی حەیزدار دەتوانێ بچێتە ناومزگەوتەوە ؟ وەلاَم- هەر جێگایەك ئامادەکرابێ بۆ نوێژ، ژنی زەیسان و حەیزدار بۆیان نییە بچنە ناوی و تێیدا بمێننەوە، بەلاَم بە شێوەی تێپەڕبوون قەیدی نییە.

٢٩- چاو نووقاندن لە نوێژدا (مەکرووهە)، بەڵکو خووو باوی ئاگر پەرسەکانە، یان خووی یەهوودە، بۆیە بێ هیچ هۆکارێك نابێ.

٣٠- لاکردنەوە لە نوێژدا – بەلای راستدا، یان بەلای چەپدا – بەبی هۆکاری پەسەند، مەکرووهە وهەقە نەکرێ

٣١- ئەو چرکانەی لە نوێژدا پەیدا دەبن و لە چرکەی میز دەچن، تا یەقینمان نەبێ میزە، نەدەستنوێژ هەڵدەوەشێنێتەوە، نە نوێژ بەتاڵ دەبێتەوە.

٣٢- ئەگەرکەسێك لە نوێژەکەیدا کەوتە گومانەوە: ئاخۆ سوورەتی(فاتحە)ی خوێندووە؟ ئەو دوودڵی و گومانە هیچ کاریگەری بۆ نوێژەکەنابێ وقەیناکات، خۆ ئەگەر دووبارەی کردەوە، سوژدەی سەهووی ناوێ.

٣٣- ژنێك رۆژێك یان دوو رۆژ بەر لە منداڵبوون، خوێنی بە خۆیەوە دیت، ئەوە حسابی

زەیسانی بۆ دەکرێ و نابێ نوێژ کات،خۆ ئەگەر ئێش و ئازاری هەبووو خوێنی نەبوو، ئەوە دەبێ نوێژ کات.

٣٤- ئەو هەوایە لە(فەرج)ی ژنانەوە دەردەچێ، دەستنوێژ ناشکێنی.

٣٥- ئـەو تەڕایـە - پـاش دەسـتنوێژ - لـە فـەرجی ژنانـەوە دەردەچـێ، ڕێ لـە قورئـان خوێندن و نوێژە فەرزو سوننەتەکان ناگرێ.

٣٦- نوێژکردن بە نیقابەوە مەکرووهە،چونکە پێویستە بە رووتی تـەوێل و لـووت بخرێتـە زەویی.

٣٧- ئەگـەر ژنێـك بـە هـۆی رۆیـشتنی بـۆ نوێـژی تـەراویح، هەنـدێ لـە ئـیش وکارەکـانی ماڵەوەی بۆ نەدەکرا، هەقە لە کاتی ئاوادا نەچێ،چونکە ئیش وکاری ماڵەوە(واجب)ـە، بەلاّم رۆیشتن بۆ مزگەوت(مباح)ـو ڕێ پێدراوە، خۆ دیارە لە بەر کاری موباح، دەست لـە واجب هەڵناگیردرێ.

٣٨- ئەگـەر ژنیـك لـە کـاتی سـوژدە بردنـدا قـژی بەردابوویـەوە و، بـەری سـوژدەکەی لێگرت..ئەوە ئەگەر لە کاتی سوژدەدا تەوێڵی رووت بێت باشترە.

٣٩- ئەگـەر ژنێـك لـە نوێـژدا ئـاوێکی سـپیی لـە فەرجیـەوە هاتـەدەر، بێگومـان ئـەو ئـاوە پیسە،واتە: دەبێ دەستنوێژ بگرێتەوەو بەر هەر جێگایەکیشی کەوتبێ، دەبێ بیشۆرێت.

## نوێژ گێڕانەوە

١- ئەگـەر ژنێکـی زەیـسان،یان خـاوەن حـەیز، بـەر لـە بـانگی بـەیانی پاکـەوەبوو، دەبـێ نوێژەکانی شێوان و خەوتنانیش بکاتەوە

٢- ئەگـەر ژنێـك بـەر لـە مـەغریب پاکـەوەبوو، دەبـێ نوێـژەکانی (نیـوەڕۆ)و(عەسـر)یـش بکاتەوە.

٣- ئەگـەر ژنێـك بـە هـۆی ئـێش و ئـازاری منداڵبوونـەوە، رۆژێ دوو رۆژ بـێ توانـاو بـێ ئاگـابوو لـە نوێـژەکانی وخوێنیـشی نـەبوو.. دەبـێ قـەزای نوێـژەکانی بکاتـەوە، چـونکە ئـەو حاڵەتـە نابێتـە هۆکـار بۆ نوێـژ نـەکردن، ئەمـە لەلایەکـەوە، لـە لایـەکی ترەوە، ئـەو چـەند رۆژە خوێنی نەبووە، تا بە زەیسان دابنرێ.

٤- ئەگەر ژنێك کات ژمێر (١)ی پاش نیوەڕۆ کەوتە بێ نوێژییەوەو، هێمان نوێژی نیوەڕۆی نەکردبوو، ئایا هەقە نوێژەکەی نیوەڕۆی بکاتەوە؟ بەڵێ پێویستە نوێژەکەی بکاتەوە.

## نوێژ گێڕانەوە بە قەزا

١- هەرنوێژێك لە كاتی خۆیدا نەكرا، پێویستە بە شێوەی تەرتیب (واتە: یەك لە دوای یەك) قەزا بكرێتەوە، بۆ نموونە: بەیانی،نیوەڕۆ، ئینجا عەسر..تاد.

٢- ئەو كەسەی دوای هەڵاتنی خۆرەوە نوێژی بەیانی دەكات،(شێخ بن باز) دەڵێ: ئەگەر بە دەست ئەنقەست و تەمەڵی بێت، بەلای تەواوی زانایانەوە پێی كافر دەبێ، بۆیە حەرام وقەدەغەیە كە موسڵمان لە كاتی خۆیدا شەو نەخەوێ، تابتوانێ بە رێك وپێكی لە كاتی خۆیدا نوێژەكانی بكات.

٣- (شێخ بن باز) دەڵێ: هەركەسێك دەست ئەنقەست نوێژ تەرك بكات، ناتوانێ قەزای بكاتەوە، بەڵكو دەبێ تەوبە بكات وپەشمان ببێتەوە و بڕیار بدات جارێكی تر كاری وانەكات.. خۆئەگەر نوێژێكی لە بیر چوو، یان لەبەر نەخۆشی بۆی نەكرا، یان لە خەو خەبەری نەبووەوە.. دەبێ ئەوانە قەزا بكاتەوە.

٤- ئەگەر ژنێك لە حەیز پاكەوە بوو و هێمان كاتیش ئەوەندەی مابوو خۆی بشۆرێ و نوێژەكەی بكات، كەچی نەیكرد، دەبێ ئەو نوێژە بە پەلە بكاتەوە.

## نوێژە سووننەتەكان

١- نوێژی چێشتەنگاو كە (صلاة الإشراق) یشی پێدەڵێن، دەبێ لەسەرەتای كاتەوە بكرێت، زاناكان دەڵێن: كە خۆر هەڵهات و بەرزەوە بوو گەرمی كرد، چاك وایە لەو كاتەدا بكرێ و دوا نەخرێ بۆ دواتر، لای خوارووی ئەو نوێژە دوو ركاتە، لای سەروویشی دیاری نەكراوە (شێخ بن باز).

٢- (صلاة التسابيح): لیژنەی فەتوای هەمیشەیی (سعوودیە) دەڵێن: ئەو فەرموودە لەبارەی (صلاة التسبيح) ەوە هاتووە، (صەحیح) نییە، (شاذ) و (منكر المتن) وە پێچەوانەی گشت ئەو فەرموودانەیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوون لەبارەی نوێژی سووننەتەوە. تەنانەتی (شيخ الإسلام ئیبن تەیمییە) دەڵێ:هیچ زانایەك بە (مستحب)ی نەزانیوە،چونكە ئەو ریوایەتە ناراستە.

٣- ئەگەر بانگی بەیانی گوتراو، هێمان نوێژی (وەتری) بۆ نەكرابوو، دەبێ چی بكات؟(شێخ بن باز) دەڵێ: هەڵیگرێ بۆ كاتی چێشتنگاو، ئینجا كە خۆر بەرز بوویەوە، بزانێ ئەگەر عادەتی وابووبێ (٣) ركات وەتری كردبێ و ئێستا لە بەر نەخۆشی، یان لە بەر خەبەر نەبوونەوە لە خەو، بۆی نەكرابوو، ئێستا (٤) ركات نوێژی چێشتنگاو بكاو دوو سەلام بداتەوە. خۆ ئەگەر عادەتی وابووە(٥) ركاتی كردووە، ئێستا (٦) ركات بكات و سێ سلام بداتەوە.

٤- کەسێك نوێژێکی سوننەتی دابەست، یان لە ڕۆژێکی سووننەتدا بەڕۆژوو بوو، دەتوانیٚ نوێژەکە ببڕیٚ و ڕۆژووەکەشی بشکێنیٚ ئەگەرچی چاك وایە هەردوو تەواو بکات، حەج و عومرە نەبیٚ، ئەم دووانە کاتیٚ دەستی پێکردن، هەردەبیٚ تەواویان بکات، ئەگەرچی سووننەتیش بن.

٥- کەسێك نوێژێکی سوننەتی دابەست، یان لە ڕۆژێکی سوننەتدا بە ڕۆژووبوو، دەتوانیٚ نوێژەکە ببڕیٚ و،ڕۆژووەکەیش بشکێنیٚ، ئەگەرچی چاك وایە هەردوو تەواو بکات، حەج وعومرە نەبیٚ، ئەم دوانە هەر کات دەستی پێکردن، هەر دەبیٚ تەواویان بکات، ئەگەرچی سوننەتیش بن.

## نوێژی تەوبە ( صلاة التوبة )

لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگیراوە:((ما من عبد يذنب ذنبا ثم يتطهر فيحسن الطهور، ثم يصلي ركعتين، ثم يتوب الله من ذنبه،إلا تاب الله عليه)) رواه أحمد. واتە: هەر بەندەیەك گوناحیٚ بکات، پاشان دەست نوێژێکی تێرو تەسەل بگریٚ، ئینجا دوو رکات نوێژ بکاو داوای لێبووردن لە خودا بکات، خودا لێیوەردەگریٚ وتەوبەی قەبوولٚ دەکات.

## ( صلاة الإستخارة )

١- ئەم نوێژەیش وەکو نوێژە سوننەتەکانی تر دەکریٚ، ئینجاپاش سلاٌو دانەوە ئەم دوعا دەخوێنیٚ و لەخودا دەپاڕێتەوە: ((اللهم إني أستخيرك بعلمك..)).

٢- ئەگەر خەریکی نوێژی وەتر بوویت و بانگی بەیان بوو،تەواوی بکەو هیچ قەیدی نییە.

٣- ئەگەر کەسێك لە سەرەتای شەوەوە وەترەکەی کرد، پاشان بۆ ئاخری شەویش هەڵسا بۆ شەو نوێژ، دوورکات، دوورکات نوێژ بکات، ئیتر وەتر بۆ ئەو نییە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ:((لا وتران في ليلة)) واتە: لە شەوێکدا دوو جار وەتر ناکریٚ.

## ( صلاة الضحى )

نوێژی چێشتنگاو سوننەتە، جا ئەگەر کارمەندێکی دەوڵەت، یان کرێکارێك ئەوەند ماوەی بۆ دەرەخسابیکات، با بیکات.

## ( صلاة الحاجة و صلاة حفظ القرآن )

١- بۆ ئەم دوو نوێژە (شێخ ئیبن عثیمین) دەڵیٚ: لە بارەیانەوە هیچ فەرموودەیەکی باوەڕ پێکراو نەهاتووە، دیارە تا بەڵگە نەبێت ناچەسپێن.

## نوێژ بە كۆمەڵ ( صلاة الجماعة )

١- ئایا بانگ وقامەتكردن بۆ ژنان سوننەتە..؟ لیژنەی هەمیشە كاری سعوودییە دەڵێ: نە بانگ، نە قامەت بۆژنان سوننەت نییە، ئیتر بە تەنها نوێژ بكەن، یان بەكۆمەڵ، بەڵكو تەنها بۆ پیاوان سوننەتن، وەكو لە فەرموودەكانەوە دەردەكەوێ.

٢- ژنان دەتوانن لە نوێژی فەرزو تەراویحدا، پێشنوێژی بۆ یەكتر بكەن، بەلاّم پێشنوێژی ژنان، نابێ وەكوپێشنوێژی پیاوان لە ریزەكە دەرچن، بەڵكو دەبێ لە ناوەراستی ریزەكەدا راوەستن.

٣- (شێخ ابن عثیمین): دەڵێ نوێژی ژنان لە ماڵەوە لە نوێژی مزگەوتی(حەرام)یش خێری گەورەترە، چونكە ئەم فەرمووده دەفەرموێ: ((وبیوتهن خیر لهن)) سەرە رای ئەمیش، لە ماڵەوە باشتر لە فیتنەو خراپە دەپارێزرێت.

٤- ئەگەر نوێژگای ژنان بە پەردەیەك، یان بە دیوارێك، لە پیاوان جیا كرایەوە، لە حاڵەتی ئاوادا ریزی یەكەم بۆیان باشترە، تا ریزەكانی تر، چونكە لەم حەڵەتەدا مەترسی تووشبوونی فیتنەیان لێناكرێ، بەلاّم ئەگەر ئەو پەردەو دیوارە نەكرابوو، ریزی دواوەوە باشترە.

## نوێژی هەینی

١- ئەگەر ژنان لەگەڵ ئیمامدا نوێژی هەینییان كرد، دروستەو فەرزەكەی نیوەڕۆیان لە كۆڵكەوتووە، خۆ ئەگەر لە ماڵەوە كردیان، دیارە دەبێ چوار ركاتەكەی نیوەڕۆ بكەن.

٢- نوێژ بە كۆمەڵ ئەگەرچی سوننەتیش بێت، یان نوێژی هەینی، لەگەڵ ئێمامێك لە تەلەفزیۆن و رادیۆوە، دروست نییە، با گوێی لە دەنگی ئیمامیشەوە بێت

٣- ئەگەر ژنان لە نوێژدا، دەستكێشیان كردە دەست، قەیدی نییە.

٤- نوێژ لە مزگەوتێكدا كە نە ئیمامەكە دەبینرا، نە نوێژ خوێنەكانیش، بەڵكو تەنها دنگیان دەبیسرا دروستە.

٥- لە ریزی نوێژ بە كۆمەڵدا، هەقە ژنان هەمیشە لە دوای ریزی پیاوانەوەبن، خۆ ئەگەر لە ریزی پیاوەكاندا جێ نەما بۆ پیاوان، دەتوانن لە بەر ناچاری لە پشت ژنەكانەوە نوێژ دابەستن.

٦- ئەگەر ژنان وپیاوان پێكەوە نوێژیان بە كۆمەڵ دەكرد، دەبێ ژنان لە پشت پیاوەكانەوە راوەستن، ئیترئەو پیاوانە مەحرەمی ژنەكان بن،یانا.

٧- نوێژ بە كۆمەڵ بۆژنان (مباح)ە، نەك سوننەت، چونكە هیچ فەرموودەیەك نییە بە

راشكاوی سوننەتییەتی بگەیەنێت.

٨- قسەی راست ئەوەیە كە پێشنوێژیكردنی ژنان بۆ نێرینە - ئەگەرچی منداڵیش بێ- دروست نییە.

٩- دەتوانرێ لە مزگەوتێكدا لە پشت پیاوانەوە، چادرێك بۆژنان هەڵبدرێ و نوێژی تیا بكەن.

١٠- كاتێ ژنان دەیانەوێ بچن بۆ مزگەوت، دەبێ ئەم مەرجانە رەچاو بكەن:

- بە تێرو تەسەل خۆ داپۆشن.

- بۆنخۆشیی لە خۆ نەدەن.

- بە هۆی چوونیان بۆ مزگەوت، مافی ماڵ ومنداڵ ومێردیان نەفەوتێ.

- هیچ فیتنەو خراپەیەكی لێ نەكەوێتەوە.

١١- (شێخ ئیبن عثیمین) دەڵێ: لەبەرئەوە نوێژی ماڵەوە بۆ ژنان باشترە تەنانەتی لە (مسجدالحرام)یش، ئەو پاداش و فەزڵە بۆ پیاوان هەیە لە نوێژی بە كۆمەڵدا بۆ ژنان نییە، بەڵام رۆیشتن بۆ مزگەوت و داوای لێبوردنی فریشتە بۆیان و.. ئەمانەیان هەیە.

## ژنان و بەرێكردنی مردوو (تشييع الجنازة)

١- ژنان بۆیان هەیە لە نوێژكردن لەسەر مردوودا بەشداری پیاوان بكەن، بەڵام رەچاوی (حیجاب) و خۆداپۆشین.. بكەن

٢- بۆ نوێژ كردن لەسەر مردوو، (ئیمام) لەلای سەری نێرینەدا دەوەستێ و بۆ مێینەش دەبێ لە ناوەراستیدا بوەستێ. - ژنان نابێ دوای مردوو بكەون بۆ سەر گۆڕستان.

٣- هاوار هاوار و دەنگ بەرزكردنەوە لەسەر مردوو حەرامە و رێی پێنەدراوە.. بەڵام بەهێواشی و لەسەر خۆ گریان حەڵاڵە.

٤- ژن دەتوانێ مێردی مردووی بشۆرێ، هەروەكو پیاو دەتوانێ ژنی مردووی بشۆرێت، چونكە (عەلی كوری ئەبو تالیب) خاتوو (فاتمە)ی خێزانی شۆریی، (ئەسمای بنت عیسا)یش (ئەبووبەكری صدیق)ی مێردی شۆریی (خوا لە هەموویان رازی بێ).

٥- ژنی حەیزدار دەتوانێ ژنی مردوو بشۆرێ و كوفنیشی بكات.

٦- پیاو دەتوانێ ژنی مردو بخاتە ناو گۆڕەوە، ئەگەر مەحرەمیش نەبن.

٧- سەردانی گۆڕستان بۆ ژنان دروست نییە، چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لعن الله زائرات القبور))، ئەم دروست نەبوونەش لەبەرئەمانەیە:

- ژنان بە زوویی حاڵەتی خۆیان دەشێوێنن و دەیكەنە هەراو هاوار.

– ئەگەر زۆر زۆر بچنە گۆڕستان، ئەو دەورووبەرە قەرەباڵخ دەبیٚ و خەڵکانی نالەبارو خراپیش لێیان کۆدەبنەوە.

٨– سوننەتە ژن لە (٥) پارچەدا کوفن بکریٚ: دەرپێیەك، سەرپۆشێك بۆسەر سنگی، کراسێك لەبەری دەکەن، دووپارچەشی تێوە ئاڵێنن.

٩– قژی ژنان دەکریٚ بە سیٚ (پەلکە) و بەناو شانیدا بەردەدرێتەوە.

١٠– هەقە لەباتی بەکارهێنانی (مەرحوم، مەغفور لە، خوالێخۆشبوو)، بگوتریٚ (رحمه الله / خوا لێی خۆش بێت).

١١– بە دەم وچاو کوتان و داڕینی یەخەی کراس – وەکو ژنان دەیکەن – نادروست و حەرامە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((ليس منا من ضرب الخدود، أوشق الجيوب، أو دعا بدعوى الجاهلية)) متفق عليه.

هەقە لەکاتی بەڵاو نارەحەتیدا بە ئارام بن و چاوەروانی پاداش بن لە لای خودای گەورەو میهرەبان.

## ژنـان و رۆژوو

١– کچان هەرکات باڵغ بوون، دەبیٚ رۆژوو بگرن، باڵغ بوونیش بە یەکیٚ لەم چوار شتە دەبیٚ:

– (١٥) پازدە ساڵ تەواو بکات.

– مووی دەورووبەری (فەرج)ی بڕوێت.

– (مەنیی) پەیدا ببێت.

– بکەوێتە حەیزەوە، یان دوو گیان ببیٚ، هەرکات یەکیٚ لەم چوار شتە پەیدا بوو، هەقە رۆژوو بگریٚ، ئەگەر تەمەنیشی لە (١٥) ساڵ کەمتر بێت.

٢ – ژنێك پاش بانگی بەیانی لە حەیز پاکەوە بوو، زاناکان دوو قسەیان هەیە:

– قسەی پەسەند و راست (راجیح) ئەوەیە، لەسەری نییە تائێوارە ئیمساك بکات، لەبەرئەوەی لەسەرەتای رۆژەوە پاك نەبووە رۆژووی دروست نییە.

٣– کەمێك بەر لە خۆرئاوا بوون کەوتە حەیزەوە، دەبیٚ بیشکێنیٚ، بەڵام دوای خۆرئاوا بوون دروستە و قەزای لەسەر نییە.

٤– ژنێك هەستی کرد خوێنی حەیزی جووڵاوە، بەڵام پاش خۆرئاوابوون هاتە دەر، یان هەستی کرد بە ئێش و ئازاری حەیز، بەڵام پاش خۆرئاوابوون خوێن هات، ئەو رۆژووەی

دروستە.

٥- ئەگەر ژنێکی دووگیان، دڵۆپێ، یان دوو دڵۆپ، یان زیاتر، خوێنی لێچوو، ئەوخوێنە هیچ حسابێکی بۆ ناکرێ، واتە: دەبێ نوێژو رۆژووی خۆی جێبەجێ بکات.

٦-ئەگەر ژنێکی خاوەن حەیز، یان زەیسان، پێش بانگی بەیانی پاکەوەبووو،کەچی خۆشۆرێنەکەی خستە پاش بانگ، دەبێ ئەو رۆژە بە رۆژووبن، وەکو ژنێکی لەشگران، پاش بانگی بەیانی خۆی دەشۆرێ و، رۆژووەکەشی دادەمەزرێ.

٧- ژنێك کاتی بانگی بەیانی، لە حەیزدابوو، کەچی دوای بانگ پاکەوەبوو، رۆژووی ئەو رۆژەی لە سەر نییە.

٨- ئەگەر ژنێکی دووگیان،یان شیردەر، لە بەرخۆیان، یان لەبەر منداڵەکە، رۆژوویان شکاند، بۆدوایی تەنها قەزاکردنەوەیان دەکەوێتەسەر.

٩- ئەگەر ژن ومێرد هەردوو بە رۆژووبوون، کەچی بە زۆر سەرجێیی لە گەڵ ژنەکەدا کرد، رۆژووی ژنەکە دروستە وکەفارەتیشی ناکەوێتە سەر، بەڵام دەبێ پیاوەکە لە کەفارەتدا: بەندەیەك ئازاد بکات، جائەگەر نەبوو، دەبێ دوومانگ بە دوای یەکدا، بە رۆژووبێت، خۆ ئەگەرتوانای ئەوەیشی نەبوو، دەبێ نانی (٦٠) مسكین بداو، قەزای رۆژووەکەیشی بکاتەوە.

١٠- ئەگەر ژنەکەیش بە ئاسانیی خۆی دا بەستەوە، ئەویش وەك پیاوەکەی کەفارەتی دەکەوێتە سەر.

١١- ئەگەر کەسێك سێ رۆژ لە رۆژەکانی رەمەزاندا، لە سەر یەك لە گەڵ ژنەکەیدا سەرجێیکرد، پێویستە سێ کەفارەت بدات.

١٢- ئەگەر پیاوێك بەبێ تێکەڵی لە گەڵ ژنەکەیدا، (مەنیی) لێهاتە دەر، هیچ کەفارەتێك ناکەوێت سەری، بەڵام دەبێ ئەو رۆژە تا ئێوارە (ئیمساك)بکاو، دوابیش رۆژووەکەی بگرێتەوە.

١٣- پیاوێك لە مانگی رەمەزاندا ژنەکەی ماچکردو، کەوتە یاریی ودەستبازی لە گەڵی، هیچ گوناحێکی ناگات، بەڵام هەر کامێکیان ئاوی هاتەوە، رۆژووەکەی (فاسد) دەبێ و، پێویستە بیگرێتەوە، خۆ ئەگەر ئەو ئاوە لینجە هات پێیدەڵێن:(مذی) زیانێك بە رۆژووەکەی ناگات.

١٤- بەکارهێنانی داوو دەرمانی خۆ ئاریشدان وخەنە لە مانگی رەمەزاندا، هیچ زیانێك بە رۆژو ناگەیەنێت.

١٥- ژنێك قەرزاری رۆژووی مانگی رەمەزان بوو، وەبە هۆی نەخۆشییەوە بۆی

نەگیرایەوەو مرد، جائەگەر نەخۆشییەکە دەرفەتی نەدابوو بیگرێتەوە، دیارە لە حاڵەتی ئاوادا هیچ شتێك ناکەوێتە سەری،خۆ ئەگەرچاك بوویەوەو دەیتوانی بیگرێتەوە، کەچی تا رەمەزانێکی تری بەسەرا هاتەوە نەیگرتەوە، دەبێ لە باتی هەر رۆژەی نانی مسکینێك بدات.

١٦- ژنێك رۆژوو قەرزار بوو، کەچی بەبێ بەهانووی شەرعیی نەیگرتەوە، تارەمەزانێکی بە سەرا هاتەوە، ئەوە پێویستە قەزای بکاتەوەولە باتی هەر رۆژەیش، نانی کەسێکی بێ نەوا بدا، بەلاّم ئەگەر بیانووی هەبوو، تەنها قەزای لە سەرە.

١٧- ژنان تامێرد مۆڵەتیان نەدات، ناتوانن رۆژووی سوننەت بگرن،خۆ ئەگەر مێردی نەبوو، یان لە سەفەربوو، ئارەزوویەتی دەیگرێ، یان نایگرێ.

١٨- پەنجەکردن بەعەورەتدا، پزیشك بیکات،یان خۆی، بۆ دۆزینەوەی نەخۆشی بێت، یانا، زیانێك بە رۆژووەکە ناگات.

١٩- چێژتنی خۆراك بە مەبەستی بوون و نەبوونی خوێ، لەمانگی رەمەزاندا، زیان بە رۆژوو ناگەیەنێت، بە مەرجێ بیتوفێتەوە.

٢٠- ئەگەر ژنێك لە رمەزاندا تووشی(نەزیف) بوو، پێویستە بگەڕێتەوە بۆ پێش تووشبوونەکەی، تا بزانێ عادەتی چۆنبووە..؟ جا ئەگەر عادەتی وابووبێ هەموو سەری مانگێك (٦) رۆژ لە حەیزابووبێ، دەبێ ئێستاش (٦) رۆژ دانیشێ نوێژ نەکاو رۆژوو نەگرێ، پاشان خۆی بشۆرێ ونوێژ بکاو رۆژوو بگرێ.(شیخ ئیبن عثیمین) دەڵێ:دەتوانێ نوێژەکانی کۆ بکاتەوە(نیوەڕۆو عەسر، شیوان و خەوتنان) بە(جمع التقديم) یان بە (جمع التأخیر)، جا کاتێکیش ویستی فەرجی بشۆرێ، بە پارچەیە (لۆکە) شەتەکی بدات، پاشان دەستنوێژ بگرێ و نوێژ بکات

٢١- ئەگەر کەسێك (نەزر)ی کرد کە یەك ساڵ بە رۆژوو بێت، پاشان نەیتوانی، دەبێ کەفارەتی سوێندێك بدات: واتە: نانی(١٠) مسکین بدات، هەریەکەیان نیو مەن خورما، یان هەر شتێك کە زۆرینەی خەڵکی شار دەیخوات، جا ئەگەر دەسەلاّتی نەبوو، دەبێ (٣) رۆژ بە رۆژوو بێت.

٢٢- بە کار هێنانی دەرزی خۆراکیی(الإبرة المغذية)، بەبێ هۆکارو پێویست، رۆژوو دەشکێنێ، بەلاّم هەموو جۆرە دەرزییەکانی تر:(تەخدیر- سڕکردن، پەنسلین، دەرزی دەمار، لاڕان، قۆڵ..هتد. زیان بە رۆژوو ناگەیەنن.

٢٣- بەکار هێنانی (کل)و هەموو ماددەیەکی ئارایەش و، خەنەو میکیاج، زیان بە رۆژوو ناگەیەنن.

٢٤- بەكارهێنانی خەمیری ددان لەكاتی بەرۆژوو بووندا زیانی نییە، بەلاَم دەبیَ قووتی نەدات.

٢٥- ددان پاكردنەوەو پركردنەوەیی و هەڵكێشانی، زیانی بۆ رۆژوو نییە، بەمەرجیَ دەرمان و خوێنەكە قووت نەدات.

٢٦- بەكارهێنانی (قەترە)ی چاوو گویَ، رۆژوو ناشكێنیَ، بەلاَم ئەگەر هەستی بە تامەكەی كرد لە قوڕگدا، چاك وایە قەزای بكاتەوە، ئەگەرچی واجب نییە.

٢٧- بەكارهێنانی بۆنی خۆش لە رەمەزاندا، زیان بە رۆژوو ناگەیەنێت.

٢٨- بەربوونی خوێنی (لووت) و (تاقییكردنەوەی خوێن) لەكاتی پێویستدا هیچ زیانێكی نییە.

٢٩- (شێخ بن باز) دەڵیَ: بەكارهێنانی قەترەی لووت لەكاتی بە رۆژوو بووندا، زیان بە رۆژوو دەگەیەنێت، واتە: ئەگەر تامەكەی چووە قوڕگەوە دەبیَ قەزای بكاتەوە.

٣٠- بەكارهێنانی (ئیمساكیە)ی مانگی رەمەزان، بۆ نموونە: (١٠) خولەك بەر لە بانگ ن كەس شت نەخوات، (شێخ بن باز) دەڵیَ: لە شەریعەتدا بناغەو بنەمایەكی نییە، چونكە ئیمساك لەگەڵ بانگدا دەبیَ.

٣١- ژنێك لە گوماندا بوو (پاكەوە بووە یا نا)، ئینجا هەر بەو گومانەوە رۆژووی گرت، ئەو رۆژووە دانامەزرێت و دەبیَ قەزای بكاتەوە، چونكە خواپەرستیی بە دوودڵی و گومانەوە ناكریَ.

٣٢- بەكارهێنانی (تحامیل) لە مانگی رەمەزاندا لەبەر نەخۆشی، چ بۆ پاش، چ بۆ پێش، زیان بە رۆژوو ناگەیەنێت، چونكە تەنها (جیماع) و خواردن و خواردنەوە زیان بەخشن.

٣٣- بەكارهێنانی (مەرهەم) بۆ لێو، هیچ زیانێك بە رۆژوو ناگەیەنێت.

٣٤- بەكارهێنانی (سیواك) لە رەمەزندا دروستە، بەمەرجێك تامەكەی لە گەڵ توفدا قووت نەدریَ.

٣٥- ئەگەر لەكاتی ئاو رادان لەدەم، ئاو چووە خوارەوە، زیانێك بە رۆژوو ناگات.

٣٦- لیك قووتدان زیانی نییە، بەلاَم (بەڵغەم) - كە لە سنگەوە هەڵدەكنریَ - پێویستە قووت نەدریَ و فڕیَ بدرێت.

٣٧- خواردن و خواردنەوە لەكاتی بانگی بەیانیدا، پێویستە رۆژووەوان هەركە بانگی بیست، دەست لە هەموو شتێك هەڵگرێت، ئەگەر بزانێت ئەو بانگە بەر لەبانگی بەیانی ناگوتریَ.

٣٨- قەزا كردنەوەی رۆژوو لە رۆژێكی وەك (عەرەفە) یان (عاشورا) دا، بە نییەتی قەزاو

ڕۆژووی ئەو ڕۆژەش، پێویستە لەسەر ئەو کەسە قەرزارە، تەنها نییەتی قەرزەکەی لێبهێنێت، إن شاء الله خودای میهرەبان پاداشتی هەردووکیانی بۆ دەنووسێت.

٣٩- بەکارهێنانی (پەمپ)ی هەناسە توندی (ڕەبوو)، ڕۆژوو هەڵناوەشێنێتەوە، چونکە ناگاتە گەدە، بەڵکو بۆ بۆری هەناسە دەچێت، خۆئەوەیش بە خواردن و خوادرنەوە دانانرێت.

## ڕۆژووی سوننەت

١- مەرج نییە ڕۆژووی شەشەڵان یەك لەدوای یەك بگیردرێ، وە هەرکاتێکیش لەدەست دەرچوو، لەمانگەکانی تردا قەزا ناکرێتەوە.

٢- نەزیفی ژنی دوو گیان و،ئەو ئاوە بە (فەرج) یا دێتە دەر، ڕۆژوو ناشکێنن.

٣- کەسێك لەبەر پیری،یان لەبەر نەخۆشیەك کە چاوەڕوانی چاکبوونەوەی لێنەدەکرا، ڕۆژووی بۆ نەگیرا، پێویستە لەبۆ هەر ڕۆژەی نانی (مسکین)ێك بدات.

٤- لە خەودا (ئیحتیلام)ی بوو، یان بە نەزانین و لەبیر چوون شتێکی خوارد و خواردەوە، زیان بە ڕۆژوەکەی ناگات.

٥- ئەم شتانە یارمەتی ژنان دەدەن بۆ پتر خواپەرستیی و عیبادەت لەمانگی ڕەمەزاندا:

- ترس لە خودای گەورەو باڵا دەست.. بیر بکاتەوە کە خودا ئاگاداری هەموو کارو کردەوەیەکی مرۆڤە.

- یادی خودا زۆر بکاو، قورئان زۆر بخوێنێ و، نوێژەکان لەکاتی خۆیاندا بکاو، سوننەتەکانیش لەگەڵیاندا ئەنجام بدات.

- تا زۆر پێویست نەبێ لەماڵ دەرنەچێ، کاتێکیش دەرچوو - لەگەڵ ڕەچاو کردنی جل و بەرگی باڵا پۆش و خۆدەرنەخستن - خێرا بگەڕێتەوە.

- لە ڕازو نیازی دوور لە خودایی خۆ دوور بگرێت.

- زمانی بپارێزێ لە (غەیبەت) و جنێوو درۆو دەلەسە و قسە بردن و قسە هێنان.

## ژنان و زەکات

١- (شێخ ئیبن فوزان) دەڵێ: چاك وایە ژنان لە خشڵ و زەنبەردا زەکات بدەن، چونکە لە ناوزاناکاندا قسەو بۆ چوونی جیاواز هەیە لەوەدا،وە دەبێ بزانن کە هەر شتێك بە نییەتی بازرگانی

و كەسابەتەوە بێت، دەبێ زەكاتى بدرێ هەرشتێكيش بۆ بەكار هێنان بێت، زەكاتى تێدا نييە.

٢- خشڵ و زەنبەر بە نرخى ئەو كاتە دەخەملێ ساڵى بە سەرا دێتەوە، نەك رۆژى كڕينەكەى.

٣- ئەگەر ژنێك زەكاتى خشڵەكەى دايە مێردەكەى، قەيدى نييە و دروستە.

٤- زەكاتدان بە خوشكەزاو برازا..تاد بە مەبەستى مارەيى و نەفەقەى ژن هێنان رەوايە.

٥- زەكاتدان بە باوك و دايك دروست نييە، چونكە - ئەگەر موتاج بوون - هەقە نەفەقەيان بكێشێ.

٦- كەسێ بتوانێ منداڵى بژێينێ، نابى چ زەكاتيان بداتێ.

٧- زەكات بە خوشكى شوو كردو دەدرێ، ئەگەر مێردەكەى هەژار بێت

٨- ژنان بەبى ئاگادارى مێرد، دەتوانن لە ماڵى خۆياندا، خێرو صەدەقە بكەن، چ بۆ خۆيان، چ بۆخزم و كەس وكاريان،، چونكە ژنان لە ماڵى خۆياندا بۆ ئاڵ و وێل ئازادن.

٩- ژنان بۆيان هەيە لە ماڵى مێرديان‌دا خێرو صەدەقە بكەن، ئەگەر بزانن مێردەكەيان رازييە.

١٠- كۆكردنەوەى مووچە، پاشان ساڵى بە سەرا بێتەوە.. شێوەى زەكات دەركردن لێى بەم شێوەيە: هەر ئەندازەيەكى ساڵى بە سەرا هاتەوە زەكاتى بدات، بۆ ئەوى تريشى چاوەروانى هاتنى ساڵەكەى بێت، خۆ ئەگەر لە سەرەتاى ئەو بەشەيەوە ساڵى بە سەرا هاتۆتەوە، زەكاتى هەموو بدات دروستە.

## ژنان وحەج

١- بۆ حەجى فەرز، ژنان مۆڵەتى مێرديان ناوێ، واتە: هەركات حەجيان لە سەر فەرز بوو، دەتوانن بێ ئيزن و مۆڵەتى مێرد، بچنە حەج، چونكە مێرد بۆى نييە لە حەجى فەرزدا، رێ لە ژنى بگرێت.

٢- ئەگەر ژنێك حەجى لە سەر فەرز بوو،كەچى مەحرەمى نەبوو لە گەڵى بچێت، بۆى نييە بێ مەحرەم بچێت، بۆيە ئەگەرلەو ماوەدا مرد، پێويست ناكات، لە ماڵە جێماوەكەى حەجى بۆ بكەن.

٣- ئەگەر ژنێك بەبێ مەحرەم چووبۆ حەج و، حەجى كرد، حەجەكەى دادەمەزرێ و دروستە، ئەگەرچى — لەبەر بێ مەحرەميەكەى-كوناحباريش دەبێ

٤- ئەگەر ژنێك مێردەكەى لە سەرحسابى خۆى ناردى بۆ حەج، حەجەكەى دروستەو

دادەمەزرێ.

٥- ئەگەر ژنێك ویستی حەج،یان عومرە بكات، بۆی نییە لە (میقات) بەبێ ئیحرام تێپەڕێ، ئەگەرچی لە حەیزیشدا بێت، چونكە ئیحرام بە حەیزیشەوە دادەمەزرێ و، دەتوانێ جگە لە چەرخەی كابە، تەواوی پایەكانی حەج و عومرە ئەنجام بدات.

٦- بۆ هاتوو چۆی نێوان (صەفا)و (مەروە) دەستنوێژ پێویس نییە، چونكە بەشێك نییە لە مزگەوتی (حەرام).

٧- هەروەلە(رەمل) لە چەرخەی دەوری كابەدا بۆ ژنان سوننەت نییە، بەڵكو تەنها بۆ پیاوان سوننەتە.

٨- نابێ ژنان لە نێوان دوو نیشانە سەوزەكەدا- كەدانراوە بۆ خەڵكانی كەم ئەندام و ناتەواو، بە بیانووی تێكەڵ نەبوون بە پیاوان- (صەفا) و(مەروە) بكەن.

٩- ماچكردن و دەستدان بە(حجر الأسود) ـەوە بۆ ژنان سوننەت نییە، مەگەر كاتێك چۆڵ بێت.

١٠- ژنان دەتوانن - لە بەر ئاسانكاری بۆیان- لە گەڵ ئاوا بوونی مانگدا، لە گەڵ خەڵكانی كەمتواناندا، (موزدەلیفە) جێبهێڵن و بچنە(مینا) و(جمرة العقبة) بەردەباران بكەن،.

١١- جل و بەرگی تایبەت بە ژنانەوە، دیاریی نەكراوە بۆ ئیحرامیان، واتە: بۆیان هەیە هەموو جۆرە جل و بەرگێك بەكار بهێنن، بە مەرجێ جەستەیان داپۆشێ و(زینەت) نەبێ و نەشوبهێ بە هی پیاوانەوە.

١٢- ژنان لە بەرگی ئیحرامدا، نابێ (نیقاب) بكەن و، دەست داپۆشن، بەڵام كاتی ئامادە بوونی پیاوان، دەتوانن دەم و چاو داپۆشن.

١٣- هەركەسێك توانای بەردەبارانی(جمرات)ی نەبوو، دەتوانێ بریكار بۆ خۆی دابنێ، بە تایبەتی ئەگەر ژن بووو ترسی تیاچوون و ئێش و ئازاری هەبوو.

١٤- كەسێك ئیحرامی پۆشی، بۆی نییە لە ژنەكەی لەزەت وەرگرێ بە جیماع و پێشەكییەكانی جیماع.

١٥- كە پیاو ئەم سێ شتەی ئەنجامدا:، بەردە بارانی(جمرة العقبة)، سەرتاشین، یان كورتكردنەوەی مووی سەر، (طواف الإفاضة)، هاتوو چۆی نێوان(صەفا)و(مەروە)دوای (طواف الإفاضة)، دەتوانێ لەگەڵ ژنەكەیدا رابوێرێ.

١٦- ئەگەر لە كاتی مەسحی سەردا، یان لە كاتی خۆشۆریندا، چەند تاڵە موویەكی لێهەڵوەری، هیچ زیانێك بە ئیحرامەكەی ناگات، مەگەر بە دەست ئەنقەست بووبێ.

١٧- ژنانی خاوەن حەیز، یان زەیسان،(طواف الوداع) یان لە كۆڵ دەكەوێ، بەڵام (طواف

الإفاضة) دەمێنیٚ و پێویستە دوای پاك بوونەوەیان ئەنجامی بدەن.

١٨- هەر شتێك لە حەرام كراوەكان - لە كاتی ئیحرامدا- كرا بە نەزانیی، یان لە بیرچوون، یان بە زۆر، هیچ شتێك ناكەوێتە سەری.

١٩- ژنان دەتوانن جل و بەرگی ئیحرام بگۆڕن، لە بەر پێویستی بێت، یان نا.

٢٠- ژنان دەتوانن لە كاتی ئیحرامدا گوێرەوی لە پیٚ بكەن، چونكە پێغەمبەرﷺ ڕێی لێنەگەرتوون بۆ لەپیٚ كردنیان.

٢١-(شێخ ئیبن عثیمین) دەڵیٚ: ژنێك لە كاتی (طواف الإفاضة) دا كەوتە حەیزەوە.. جا ئەگەر دوای پاك بوونەوە دەیتوانی بە ئاسانی بگەڕێتەوە بۆ ئەنجامدانی، دەبیٚ بگەڕێتەوە بۆی، خۆ ئەگەر بۆی نەدەكرا بگەڕێتەوە بۆی، ئەوە بە باشی خۆی ببەستیٚ و بچێت (طواف) و سەعیەكەی بكات.

٢٢- نەخۆش وپەك كەوتە (واتە:ئەوانە ناتوانن ((طواف الوداع)) بكەن) بەسەر شان دەیانگێڕن و تەوافەكەیان پێدەكەن.

٢٣- ئەگەر ژنێك لە كاتی(طواف)دا وا هەستی كرد، خوێنی حەیز هات، لە حاڵەتی ئاوادا، تا نەگاتە یەقین، درێژە بەكاری خۆی دەدا وقەیناكات، خۆ ئەگەر گەیشتە یەقین،دەبیٚ دەست بكێشێتەوە تا پاك دەبێتەوە، ئەوسا لەسەرەتاوە دەست پێدەكاتەوە.

٢٤-ژنی مێرد مردوو، تا عیددەی تەواو نەبیٚ، بۆی نییە لە ماڵ دەرچیٚ و بچێت بۆ حەج.

٢٥-ژنیش دەتوانیٚ لە باتی پیاو، بچێت (حەج) و(عومرە) بكات.

٢٦-ژنان دەتوانن لە كاتی بەجێهێنانی (مناسك) ی حەج و عومرەیاندا،(حەب) بە كار بێنن بۆ ڕاگرتنی حەیز.

٢٧-ژنان دەتوانن لە كاتی ئیحرامیشدا، زێڕ بەكاربێنن، بە مەرجیٚ لای پیاوانی نامەحرەم دەری نەخەن، تا تووشی فیتنە نەبن.

٢٨- وا باشە لە كاتی قەڵەباڵغیدا، ژنان تەواف دووبارەو سیٚ بارە نەكەنەوە.

٢٩- بۆ ژنان وا چاكە حەج دووبارە نەكەنەوە، تا تووشی ئەو حاڵەتە نا ئاساییانە نەبن، كە لەو كاتەدا بە ناچاری تووشیان دەبن.

٣٠- پیاو ئەگەرچی دەوڵەمەندیش بوو، هەر لە سەری نییە، پارەی حەج بەژنەكەی ببەخشیٚ و بینێریٚ بۆ حەج.، خۆ ئەگەر بۆخۆی بتوانیٚ هاوكاری بكاو، كارەكانی بۆ ئاسان بكات،كارێكی باش و پەسەندە و هەقیشە وەكو وەفایەك، حەجی بۆ ڕێك بخاو بەڕێی بكات.

٣١- بۆژنان دروست نییە لە كاتی بەجیٚ هێنانی (طواف) و(مناسك) ـەكانی تردا، لە گەڵ

پیاواندا، پاڵە پەستۆو شان لە شانیان بگیرێنن، بەڵكو هەقە هەوڵ بدەن، بزانن چ كاتێ چۆڵ دەبێ، ئەو كاتە هەڵبژێرن، یان لە دوورەوە(طواف) و(صەفا)و (مەروە) بكەن.

## ژنان و قورئان

١- سەر رووتكردن لە كاتی خوێندنی قورئاندا بۆ ژنان، قەیدی نییە، بەڵام هەقە لەكاتی سوژدەی (تیلاوەت)دا، سەر داپۆشن.

٢- قورئان خوێندنی دەستە جەمعی وبەیەك دەنگ، ئەگەر لە بەر فێربوون بێت، قەیناكات، ئەگینە پەسەند نییە.

٣- ئاهەنگگێڕان وزەماوەند،بە بۆنەی تەواوكردنی قورئانی پیرۆزەوە، لەسەردەمی پێغەمبەرو هاوەڵاندا نەكراوە، ئەگینە پێمان دەگەیشت،كەوابوو بیدعەیەكی تاشراوو داهێنراوە.

٤- لە هەر جێگایەكدا پیاوی نامەحرەمی تیا بێت، بۆ ژنان رەوا نییە بەدەنگەوە قورئان بخوێنن، چونكە لەوانەیە تووشی فیتنە بن.

٥- گوێگرتن بۆ قورئان (بە تۆمار كراوی) لە كاتی سەر قاڵی بەئیش و كارەوە، قەیدی نییە، چونكە گوێگرتن بە پێی تواناو دەرفەتە، مەبەست بە ئایەتی:(وإذا قرئ القرآن فاستمعوا له وأنصتوا لعلكم ترحمون) هەر ئەمەیە.

٦- قورئان خوێندن لە كاتی ئیش وكاردا قەیناكات، ئەگەر لەو كاتەدا بێ ئیش بێت، هەروەها زیكرو تەسبیحات و تەهلیلەش، خۆ ئەگەر بەو هۆیەوە ئیش وكارەكەی دوا دەكەوت، یان لە دەست دەر دەچوو، نەیخوێنێ باشترە.

٧- بۆ خۆی دەور بكاتەوە باشترە، یان لە بەر شریتێكدا دەور بكاتەوە؟ بە هەر كامێكیان تەقوای زیاتر دەبوو، لە گەڵ ئەوەیاندا بیخوێنێ.

٨- نووسینی قورئان لەسەر شكڵ وبیچمی ئاژەڵ و پەلەوەر و نەخش و نیگار بۆ هەڵواسین یان نا، دروست نییە، چونكە دەبێ قورئان جۆرە شتانی بپارێزرێ و سووكایەتی پێ نەكرێ.

٩- نووسینی ئایەت و فەرموودەو (أسماء الحسنى) لە سەر تەختەو پارچە ئاسن و شتی وا، یان بە دارو دیوارەوە بۆ جوانی، یان بۆ وەبیرهێنانەوەی قورئان، یان بە مەستی برەوو رەواجدان بە دوكان وبازرگانییەكەی و فرۆشتنی كەل و پەل وكووتاڵەكەی،یان بۆ چەواشەو

فریودانی مەردم، تا خەڵك پتر روو بکەنە کۆگاو دوکانەکەی، بێ گومان ئەو کارانە ناڕەواو ناپەسەندن،چونکە قورئان فەرموودەی خوایە و بۆ کۆمەڵێ مەبەست و ئامانجی هەرە بەرز وقەشەنگ ناردوویەتی.. نێردراوە بۆ ئەوە ببێتە رێنمایی و هیدایەت بۆ مرۆڤ، هاتووە بۆ ئەوە بکرێتە ئامۆژگاری و عیبرەت، هاتووە بە ئەحکامگەلێکەوە بۆ ئینسان، تاکاری پێ بکەن، بێ شك بەکار هێنانی بۆ غەیری ئەمانە،بەکار هێنانیەتی بۆ غەیری ئامانجە بەرزەکانی خۆی، دەرەنجام لە رەوتی سەرەکی خۆی دوور دەکەوێتەوە و تووشی هەزاران نشێوی و هەڵدێر دەبین وەك ئەمڕۆ.

١٠- نووسینی ئایەتێك لە شتێکدا، بەمەبەستی ئەوە ئاوی تێبکرێ و نەخۆش ئاوەکەی بخواتەوە، کاری وا لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگیراوە کە قورئانی بە سەر نەخۆشدا خوێندووەو فووی لە جەستەی کردووە، سەرە رای ئەمەش ئەگەر قورئان بە ئاوێکدا بخوێنرێ و نەخۆشەکە بیخواتەوە قەیناکات.

١١- نووسینی چەند ئایەتێك لە کاغەزێکدا، پاشان سڕینەوەی بە ئاوو نەخۆشێك بیخواتەوە بۆ شفا.. هەندێ لە زاناکان، وەکو (ئیمام ئەحمەد وئیبن تەیمییە وابن القیم) مۆڵەتیان داوە بکرێ. بەڵام لە گەڵ ئەوەیشدا لەوە ناچێت کە پێغەمبەر ﷺ نە بۆ خۆی، نە بۆ خەڵك کردبێتی، جا لەبەر ئەوە باش وایە هەر نەکرێ، بەڵکو ئەوە بەسە کە بخوێنرێ بە سەر نەخۆشەکەدا، وە یان بەسەر ئاوێکدا بیخواتەوە.

١٢- کەسێك دەوری قورئان بکاتەوە، بەڵام (تەجوید) نەزانێ وبە هەڵە بیخوێنێتەوە.. زاناکان دەڵێن: هەرکەسێك قورئان دەخوێنێ، پێویستە چاك بیخوێنێتەوە و(تەجوید) بزانێ،ئەگەرچی زۆریش ماندوو ببێ تێیدا، چونکە خوێندنی قورئان و دەور کردنەوەی بە تەجویدەوە، لای خودا خێری زیاترە.. ئەوەیە کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:((الذی يقرأ القرآن ويتعتع فيه، وهو عليه شاق، له أجران)) رواه مسلم.

١٣- (شێخ بن باز) دەڵێ: سوژدەی تیلاوەتی قورئان، نەدەستنوێژی دەوێ، نە رووکردنە رووگە، هەروەك بەرز بوونەوەی سوژدە، نە (الله أكبر) ی دەوێ، نە سلاو.

١٤- کەسێك گوێی لە خوێندنی سوژدەی تیلاوەتەوە بوو، ئەگەر قورئان خوێنەکە سوژدەی برد، ئەوا بۆ ئەمیش سوننەتە سوژدە ببات، ئەگینە سوننەت نییە.

١٥- (شێخ بن باز) دەڵێ:لە سوژدەی نوێژەکاندا چ تەسبیح ودوعایە دەخوێنێ، لە سوژدەی تیلاوەتیشدا هەر ئەوانە خوێنێ.

١٦- ئەگەر بانگبێژ، بانگیدا، کەسێکیش لەو کاتەدا خەریکی قورئان خوێندن بوو،

سوننەتە وەڵامی بانگە كە بداتەوەو لەو كاتەدا قورئان نەخوێنێ، پاشان ئەگەر ویستی بچێتەوە سەر قورئان خوێندنەكەی.

١٧- گواستنەوەی قورئان لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر، لە كاتی پاك و خاوێنكردنی ماڵدا – بێ دەستنوێژ –قەیدی نییە.

١٨- (شێخ ابن فوزان)دەڵێ: خوێندنی (فاتحە) بۆ مردوو بیدعەیە،چونكە لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەهاتووە فاتحەی بۆ مردوان خوێندبێ، بۆیە هەقە لە باتی ئەوە، داوای لێبوردن و بەزەیی خودای بۆ بكات، وەیان خێرو صەدەقەی بۆ بكات.

١٩- ئایا دەور كردنەوەی قورئان بە دەنگی بەرز پەسەندە، یان بە هێواش؟ ئەگەر قورئان خوێنەكە بە دەنگی بەرز چالاك تردەبووو (خشوع)ی بۆ پەیدا دەبوو، پتر لەوە بەهێواش بیخوێنی، دەتوانێ دەنگ بەرز بكاتەوە، بە مەرجێ نەبێتە هۆكاری ئازارو عەزیەتی خەڵكی دەورو بەر، ئەگینە بە هێواش باشترو پەسەندە.

٢٠- ئەگەر كەسێك بییەوێ لەگەڵ (رادیۆ) و(تەسجیل) دەور كاتەوە، هیچ قەیدی نییە، بەمەرجێ بە هۆی ئەوانەوە لەماناو مەبەستەكەی سەرقاڵ نەدەبوو.

٢١- ئەگەر قورئانێك هەڵەی تێدابوو،یان رزیبوو.. دەتوانن بیسووتێنن، یان لەجێگایەكی دوور لە هاتوو چۆ، بكرێ بە ژێر خۆڵەوە.

٢٢- ئەگەر ژنان بە تەنها بوون – لە ماڵەوە، یان لە دەرەوە- یان تەنها پیاوی مەحرەمی لێبوو، دەتوانن بەدەنگی بەرز دەور بكەنەوە.

٢٣- (شێخ بن باز) دەڵێ:نەلە قورئاندا، نەلە سوننەتدا، وەنە لە هاوەڵانەوە، نەهاتووە كە قورئان بخوێنرێ وهەدیە بكرێ بە باوك ودایك، یان بە كەسێكی تر، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە زاناكان دەڵێن:دەكرێتە هەدیەو دیاریی بۆیان، بەڵام قسەی دەستەی یەكەم لە راستەوە نزیكە، چونكە ئەگەر كرابا، (سەلەف)ی ئەم ئۆممەتەیش دەیكرد.

٢٤-دانانی قورئان لە ناو سەیارەدا، یان لە هەر جێگایەكی تردا، بەمەستی خۆ پاراستن لە جنی وشەیاتین، شتیوا نەبووەو نابێ، خۆ ئەگەر بۆ دەور كردنەوەبێت قەیناكات.

٢٥- هەڵگرتنی ئەو كاسێت و شریتانە قورئانیان لەسەر تۆمارە، قەیدی نییە، تەنانەتی بردنیشیان بۆ سەر ئاو قەیناكات، چونكە ئایەت و فەرموودەكانیان تێدا نە نووسراوەو دەر ناكەوێ.

٢٦- نووسینەوەی هەندێ ئایەت، بە مەبەستی هەڵگرتنیان لە كاتی نارەحەتی و گیرو گرفتدا، نارەوایەو دروست نییە، چونكە قورئان بۆ ئەو مەبەستانە نەهاتووە، بەڵام خوێندنی

به سەر نەخۆشدا ڕێی پێدراوە.

٢٧- ئایا دەور کردنەوە لە ناو قورئاندا، خێری باشە، یان لەبەر ؟ بێ گومان لە ناو قورئاندا مرۆڤ پتر لە هەڵەو پەڵە دەپارێزرێ، تائەوە لە بەر بیخوێنێ، بەلاّم لە گەڵ ئەوەشدا ئەگەر لەبەر (خشوع)ی زیاتر بوو تالەناویا، بالە بەر دەور بکاتەوە.

٢٨- دووبارە و سێ بارە کردنەوەی ئایەتی سزا،یان ئایەتی ڕەحمەت لە قورئاندا، لە کاتی خوێندنا.. ئەگەر بەوە خشووع زیاد دەبوو قەیدی نییە.

٢٩- ئەگەر کەسێك لە کاتی دوعاکردندا گریانی بۆ دەهات، کەچی لە کاتی قورئان خوێندندا بۆی نەدەهات، ئەوە قەیناکات، ئەگەرچی هەقە لە کاتی قورئان خوێندا بگری،بەلاّم دیارە گریان بە دەستی مرۆڤ نییە.

٣٠- خەتمی قورئان لە مانگی ڕەمەزاندا سوننەتە، نەك واجب، واتە: ئەگەر کەسێك خەتمی بۆ نەکرا،خەتایەکی نەکردووە، بەلاّم لەو خێرە گەورەیە بێ بەش بووە.

٣١- ڕووکردنە ڕووگە لە کاتی دەور کردنەوەی قورئاندا (مستحب)ـە، چونکە عیبادەتە، دیارە بۆ هەموو عیبادەتێك ڕووکردنە ڕووگە باشەو خێرە، خۆ ئەگەر ڕووی نەکردە ڕووگە، قەیناکات.

٣٢- قورئان بردنە(گەرماو)ـەوە، ئەگەرلە بەرناچاریی وترسی تیا چوونی نەبێت،دروس نییە.

٣٣- سەبارەت بە لە بیر چوونەوەی قورئان-پاش لە بەر کردنی- قسەی ڕاست ئەوەیە کە کەسی پێ گوناحبار نابێ، ئەگەرچی هەقە موسڵمان، هەوڵ بدات هەرگیز قورئانی لە بیر نەچێتەوە، چونکە ئەو فەرموودەیە هەڕەشە دەکات لەو کەسانە قورئانیان لە بیر بچێتەوە،(فەرموودەیەکی لاوازە).

٣٤- ئەگەر وێستگەیەك، خەریکی قورئان خوێندن بێت، کەسێکیش لە بەر هەواڵگرتن بیکوژێنێتەوە، وەیان بیگوێزتەوە بۆ وێستگەیەکی تر،هیچ قەیدێکی نییە، چونکە هەموو شتێك کات و ساتی خۆی هەیە.

٣٥- هەڵگرتنی کاسێت، یان ئەو شریتانە، قورئانیان لە سەر تۆمارە،لە لایەن کەسێکی لەشگرانەوە، قەیدی نییە.

٣٦- خوێندنی قورئان لە لایەن ژنانی حەیز دارەوە، (لەبەر) قەیدی نییە،دەشتوانێ بە شتێکی پاك هەڵیبگرێت،بەلاّم لەشگران بە هیچ شێوەیەك، بۆی نییە قورئان بخوێنێ،یان هەڵیبگرێ.

٣٧- ئەگەر ژنان پێشبڕکێی لەبەر کردنی قورئانیان سازدا و لیژنەی تەحکیم لە پیاوان

بوو، هیچ قەیدی نییە.

٣٨- لەکاتی خوێندنی قورئانەکەدا دەنگی نەرم و ناسك نەکات.

- جل وبەرگی شەرعیی بالآپۆشی لەبەردا بێت.

- تووشی خەڵوەت نەبێت لەگەڵ نامەحرەمدا.

٣٩- فێرکردنی قورئان بە کرێ و مزە دروستە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إن أحق ما أخذتم عليه أجرا كتاب الله)) رواه البخاري.

٤٠- بەهەر شێوەیەك قورئان بخوێنرێ - بەپشتدا بکەوی، بە دانیشتن، بە راوەستان.. قەیدی نییە.

٤١- دوای خوێندنی قورئان، گوتنی (صدق الله العظيم) بیدعەیە، چونکە نە پێغەمبەر ﷺ نە خولەفای راشیدین نە هاوەڵانی تر، کەسێکیان دوای قورئان خوێندن نەیگوتووە، لە فەرموودەیشدا هاتووە: ((من عمل عملا ليس عليه أمرنا فهو رد)) رواه مسلم.

٤٢- بەڵگەیەك نییە بۆ ماچکردنی قورئان.

٤٣- تا بگونجێت دەبێ قورئان لە شوێنێکی بەرزدا دابنرێ، ئەگینە لە زەویشدا لە جێگایەکی پاك دا دەبێ.

٤٤- (ابن عثيمين) دەڵێ: (تەرتیل) بۆ قورئان واجب نییە، بەڵکو لە ئاداب و شێوەی قورئان خوێندنە.

٤٥- بە پەلە دەور کردنەوەی قورئان - لەگەڵ ریعایەتی پیت و (شەددە)کانیدا- زیانێکی نییە.

٤٦- خوێندنەوەی ئەم سوورەتانە: (یس - الدخان - الواقعة - الملك) هەموو رۆژێك یان هەموو شەوێك فەرموودەیەکی صەحیح دەربارەیان نییە، بەڵکو هەقە بۆ موسڵمان هەموو قورئان دەور بکاتەوە.

٤٧- بەپێی ریزبەندی ئێستای قورئان، دەورکردنەوە پەسەندو رەوایە، خۆئەگەر لە سوورەتی (الناس) ەوە -بۆ فێرکردن دەستی پێکرا زیانی نییە.

٤٨- چاوگێران بە قورئاندا بە بێ (تلفظ) و لێو جووڵاندن بە قورئان خوێندن دانانرێ.

٤٩- بەکرێ گرتنی قورئان خوێن لە بۆنەکاندا دروست نییە، هەرکەسێك ئەو کارە بکات گوناحی دەگا و هیچ پاداشێکی نییە، چونکە قورئان خوێندن عیبادەتە، کاری عیبادەتی نابێ بۆ بەدەستهێنانی دنیا بێت.

٥٠- بە کرێ گرتنی کەسێك بۆ قورئان خوێندن دروست نییە، بەڵام ئەگەر بۆ فێربوون و

فێركردن بێت دروستە.

٥١- قورئان خوێندن لەسەر گۆڕەكاندا شتێكی بیدعەیەو پێغەمبەر و هاوەڵانی نەیانكردووە.

٥٢- دوعا كردن بۆ مردوو لەلای گۆڕەكەیدا بێت، یان لە دوورەوە قەیدی نییە.

٥٣- قورئان دانان لەلای سەری منداڵدا، بۆ مەبەستی پاراستنی لە (جن)ی كارێكی ناپەسەندە.

٥٤- دەكرێ ژنێكی جادولێكراو ببرێ بۆ لای زانایەك قورئانی بەسەردا بخوێنێ؟ بەڵێ دەكرێ بەڵام بەم مەرجانەی لای خوارەوە:

- ئەو زانایە ناوبانگی پیاوچاكی و دینداری و عەقیدە پاكی هەبێت.
- لەكاتی خوێندنی قورئانەكەدا بەسەریا، دەبێ بەشێوەیەكی شەرعیی داپۆشرێ.
- نابێ دوو بە دوو بن، تا خەڵوەت دروست نەبێ.
- تا دەكرێ نە تەماشای ژنەكە بكاو نە دەستی لێبدات.

٥٥- ژنی حەیزدار دەتوانێ سوژدەی (تیلاوەت)ی قورئان ببات، چونكە قسەی راست ئەوەیە كە سوژدەی (تیلاوەت) دەستنوێژو (طهارە)تی ناوێ.

٥٦- قورئان خوێندن لەناو قورئاندا - لەكاتی نوێژەكاندا فەرز یان سووننەت- دروستە ئەگەر پێویست بێ.

٥٧- قورئان خوێندن بۆ ژنانی حەیزدار، هیچ فەرموودەیەكی صەحیح نەهاتووە رێیان لێبگرێ، بەڵام چاك وایە تا پێویست نەبێ وەكو مامۆستا یان قوتابی نەیخوێنێ.

٥٨- ژنی خاوەن حەیز دەتوانێ بە وردبوونەوە لە قورئان بێ ئەوە بە زمان بیڵێت قورئان بخوێنێت، (ئیمامی نەوەوی) هیچ كێشەیەكی تێدا نییە.

٥٩- كەسێكی لەشگران ناتوانێ نە لەبەر نە لەناو قورئاندا دەور بكاتەوە بەڵام دەتوانێ تەماشای كتێبی تەفسیر و فەرموودە بكات بە مەرجێ ئایەتەكان نەخوێنێتەوە.

٦٠- ژنی حەیزدار دەتوانێ (استغفرالله) و دوعا و هەموو زیكرێك بكات، هیوادارین خودا لێی وەرگرێت.

## ژنان و زەماوەندو بۆنەكان

١- خۆدەرخستنی زاواو بوك پێكەوە لەناو ژناندا دروست نییە، چونكە كاری وا مانای نەمانی شەرمە و، لاسایی كردنەوەی خەڵكانی ئەخلاق رووخاوە.

٢- جل وبەرگ خواستن یان بەکریّ گرتن هیچ قەیدی نییە.

٣- ئاهەنگ گێران لە هۆلّ و هوتێلەکاندا گەلیّ جار ئەم خراپانەی لێدەکەوێتەوە:

- مالّ و سامانێکی تیا خەرج دەکریّ بیّ ئەوە پێویست بێت.

- ژن و پیاو تێکەلّ دەبن..

- بردنی زاواو بوك بۆ شوێنێکی بەرزو نیشاندانیان لەناو ژنگەلێکدا -کە ئەوانیش بە جوانترین شێوە خۆیان رازاندووەتەوە - دروست نییە... دەبیّ زاوا لەجێگایەکی تایبەتی پڕ لە حەیاو شەرمدا لەگەلّ بووکیّ کۆببێتەوە.

٤- وێنەگرتن بەهەر ئامێرێك یان بە ڤیدیۆ بۆئەوە نیشانی خەلّکانی نامەحرەم وخراپی بدات دروست نییە، پێویستە هەموو موسلّمانێکی ژیرو فامدار لەو جۆرە کردارانە خۆی بپارێزیّ.

٥- هەر ئاهەنگێك بزانریّ کاری خراپ و (منكر)ی تیایە، نابیّ موسلّمان تێی بچێت مەگەر بە چوونی ئەو (منكر)ەکە نەمێنیّ.

٦- ژنان دەتوانن بەم مەرجانە هەلّپەرن:

- لەو جێگایەدا تەنها ژنانی تیابێت.

- ئەوەند نەکریّ بە هەراو سومڕ کە لە دوورەوە پێیان بزانریّ.

- بـە شـێوەی شـەرعیی تـەواو خـۆی داپۆشـێت، واتـە: لـەکاتی هەلّپەرینەکـەدا هـیچ جێگایەکی - ریّ پێنەدراوی - دەرنەکەویّ.

٧- وەلاّمدانەوەی دەعوەتی زەماوەند بۆ ژنان بەم مەرجانە دروستە:

- مێرد رازی بیّ و مۆلّەتی بدات.

- زەماوەندەکە (منكر)ی تێدا نەبیّ، یان بە چوونی ئەو نەمێنیّ ئەگینە واجب نییە وەلاّمدانەوەی.

- گویّ گرتن بۆ گۆرانی ناشیرین و پاشان ژنان پێی هەلّپەرن، کارێکی حەرامە.

٨- خۆ گۆرین لەو ژوورانەدا ئامادە کراون بۆ زەماوەند، دەبیّ زۆر بە حەیاو بەشەرمەوە بێت، بەتایبەتی نەوەك کامێرای شاراوە دانرا بێت و وێنەیان بگریّ.

## ژنـان وخشلّ و زەنبەر

١- هەموو جۆرە رازاندنەوەو خۆ ئارایشدانێك - خالّکوتان و برۆتەنك کردن وددان شاشکردن نەبیّ - دروستە بۆ ژنان، بەلاّم دەبیّ ئەم خالاّنە رەچاو بکرێت:

- نەشوبهێ بە هی کافران و خەڵکانی خراپکارو فاسیدەوە.
-خۆ نەچوێنن بە پیاوانەوە.
- رێ نـەگریˇ لـە گەیـشتنی ئـاو بـە جەسـتە، لـە کـاتی دەسـتنوێژو خـۆ شـۆریندا، ژنـانی حەیزدارو زەیسان نەبێ، واتە: بۆ ئەوان قەیدی نییە، چونکە نوێژو خۆشۆرینیان لە سەر نییە.
- زێدەرۆیی تیا نەکرێ، چونکە دەبێتە(إضاعة المال)، ئەوەیش لە ئیسلامدا حەرامە.
- کاتی زۆری پێ نەکوژێ، واتە: زۆرێك لە کاتەکانی لە بەردەم ئاوێنەدا نەباتە سەر.
- خۆی تووشی کیبرو خۆهەڵکێشان نەکات.
- بە پلەی یەکەم لە بەر مێردەکەی خۆی ئارایش بدا و خۆ برازێنێتەوە.
- لە گەڵ (فیطرە ت)دا دژ نەوەستێ، وەکو درێژ کردنی نینۆك، چونکە لە فەرموودەکاندا فەرمان دەدات بە کردن و قرتاندنی نینۆك.
- لەو خۆ ئارایشدانەدا (عەورەت)ی دەرنەکەوێ.
- لەو دەورو بەرەدا خۆی نەکاتە جێی سەرنجی خەڵکانی نامەحرەم.

٢- خۆ بۆنخۆش نەکاو پاشان بچێت بۆ بازاڕ و ببێتە مایەی سەرنجی ئەم و ئەو.

٣- خۆ بۆنخۆشکردن وپاشان رۆیشتن بۆ مزگەوت، قەدەغەو حەرامە.

٤ - دەبێ ژنان لە ماڵانیشدا نەهێڵن عەترو بۆنخۆشییان لێ بپژێنن، چونکە دەگونجیˇ لە کاتی گەڕانەوەدا،تووشی پیاوان بن و سەرنجیان رابکێشن.

**٥- بەکارهێنانی ئامێرو داوودەرمان بۆ خۆ جوانکردن، بەم مەرجانە نەبێ دروست نییە:**
- جەستەی پێی تووشی زیان نەبێت.
- خۆ نەچوێنێ بە کافرو خەڵکانی فاسید وخراپەوە.
- زێدە رۆیی تیا نەکات.
- لە کاتی خۆشۆرین و دەستنوێژدا، رێ لە تەڕبوونی جەستەی نەگرێ.
- پەڵەو نەخۆشی لە دەم وچاووو روخسار دروست نەکات.
- هەرکرێمێك زیان بەخش بێت بە پێست، بەکار هێنانی حەرام دەبێت.
- میکیاج کردنی پێست، زیان بە پێست دەگەیەنێت، لەبەرئەوە نابێ بەکار بهێنرێت.

٦- بەکار هێنانی نینۆکی دەستکرد و(صناعیی) دانـانی (عەدەسـە) لەچاودا بـۆ جـوانیی و، گـۆڕینی ڕەنگـی چـاو دروسـت نییـە، چـونکە دەسـتبڕین و خەڵەتانـدن و چەواشـەگەری تێدایە: پزیشکەکان لە دانانی ئەو جۆرە (عەدەسە)انە زۆریان باس کردووە.

٧- تەنك کردنی ددان و بەین تێ خستنیان بۆ جوانی کارێکی حەرامە، پێویـستە ژنـانی

مسولْمان خۆیانی لیٚ دوور بگرن، بەلاٌم ئەگەر لەبەر نەخۆشی بوو.. هیچ قەیدی نییە.

٨- بـەکارهێنانی (بـرۆ)ی دەسـتکرد (صـناعیی) یـان هەلْکێـشانی یـان بـڕین و کـورت کردنەوەی دروست نی یە، مەگەر ناشیرینی بکات یان بێتە خوارەوە بۆ ناوچاوانی.

٩- داماڵینی ئەو موانە لەسەر ڕوخسار و لاق و دەستی ژنان دەڕوێن دروستە.

١٠- خالْکوتاندن کارێکی حەرامە و دەبیٚ ژنانی ئیماندار خۆیان دوور بگرن لێی، ئەگەر هـەر بە منداڵی بۆیان کوترابوو، دیارە گوناحەکەی لەسەر ئەو کەسەیە ڕێگەی پێداوەو بۆی کوتیوە.

١١- قژ کورت کردنەوە لەبەر ناچاریی و پێویست ڕەواو دروستە.

١٢- بەکارهێنانی (باروکە) واتـە: قـژی ژنێکـی تـر بخـوازیٚ، یـان قـژی دەسـکرد (صـناعە) لەسـەر بکـات، حــــرامە، چـونکە بـە هـەر شـێوەیەك بێـت چەواشـە گـەریی و (تـەدلیس) ە، سـەرەڕای ئـەوەش بـەر ئـەو فـەرموودە دەکـەویٚ کـە دەفـەرمویٚ: (لعـن الله الواصـلة و المستوصلة)، بـەلاٌم ئەگـەر ژنێـك سـەر تـاس یـان کەچـەلٚ بێـت، بـەکارهێنانی (باروکـە) بـۆی حەلاڵە، چونکە بۆ داپۆشینی نەنگ و لەنگێکە.

١٣- کۆکردنـەوەی قـژ و گرتنـەوەی بـە یـەك (پەلکـە) و بەردانـەوەی بـەناو شـاندا قەیـدی نییە، بەمەرجیٚ بۆ پیاوی نامەحرەم دەرینەخات.

١٤- قژ لوول کردن، مادام نەشوبهیٚ بە هی کافرانەوەو لە بەردەم نامەحرەمدا دەرنـەخریٚ دروستە، ئەگەر چی بۆ ماوەیەکی زۆریش بیٚ.

١٥- گۆڕینی ڕەنگی قژ، جاریٚ بە سوور، جاریٚ بە زەرد.. تاد، هیچ قەیدێکی نییە، بەلاٌم ڕەشکردنی حەرامە و ڕێی لێگیراوە.

١٦- ژنـان دەتـوانن بـە شـێوەی ئـەمڕۆی هاوچـەرخ دەسـکاری قـژیان بکـەن، بـە مـەرجیٚ نەشوبهیٚ بە هی کافرانەوە.

١٧- کۆ کردنەوەی قژ لەپشت سەرەوە (بۆ گەورە کردنی سەر) وەکو سەری پیاوان حەرامە.

١٨- شەتڵی قژ بۆ ئەو ژنانەی سەرتاسن یان کەچەڵن دروستە و هیچ قەیدێکی نییە.

١٩- حەرامە ژنان سەریان بتاشن، مەگەر کاتی نەخۆشیی و پێویست.

٢٠- لا بردنی مووی نێوان برۆ، دروستە.

٢١- لە پێکردنی نەعلی پاژنە بەرز لەبەر چەند هۆیەك دروست نییە، لەوانە:

- ژن بە بالاٌ بەرز و کەڵەگەت نیشان دەدات، لە واقعیشدا وانییە.
- گەلیٚ جار ئەگەری کەوتنیان لیٚ دەکرێت.
- پزیـشکەکان دەڵـێن: زیـان بـە منداڵـدان دەگەیـەنێت، چـونکە لـەکاتی دووگیـان بوونـدا

ناهێڵێ جەستەی ژنەکە ڕێك بوەستێ، سەرەڕای توش بوون بە نەخۆشی لاقان.

٢٢- ژنان دەتوانن بە ئارەزوو خشڵی ئاڵتوون و زیوو و موجەوهەراتی تر بەکاربهێنن، بە مەرجێ نەگاتە سنووری زێدەرەویی.

٢٣- ژنان دەتوانن (ئەڵقە، ئەنگوستیلە) بکەنە هەر پەنجەیەکیان بیانەوێت.

٢٤- بەکارهێنانی (لووتەوانە) بۆ ژنان دروستە.

٢٥- بەکارهێنانی (خەڵخاڵ) بۆ ژنان لە لای ژنانی تر و پیاوانی مەحرەمدا دروستە.

٢٦- درێـژکردنی (نینـۆك) دروسـت نـی یـە، چـونکە پێغەمبـەر ﷺ بـۆ نینـۆك کـردن و لابردنی مووی بن باخەڵ و موی..... (چل) ڕۆژی دیاری کردووە، بەرەو ژوورتر لەوە دروست نییە، چونکە کاری خەڵکانی کافر و بێ دینە.

٢٧- ژنـان بـە چاوی (کل) ەوە دروست نیـە لـە مـاڵ دەربچن و خۆیـان بـۆ پیـاوانی نامـەحرەم دەربخەن.

## ژنان و مێرد کردن

١- ئەگـەر ئافرەتێـك نـەخۆش بێـت، پێویـستە داوا خوازەکـەی ئاگاداربکـات، ئەگینـە لـە خشتەبردن و چەواشەگەریی و (تدلیس)ـە، ئەوەیش کارێکی حەرامە.

٢- ئەگـەر ئافرەتێـك مـەیلی لـە (زەواج) بێـت، دەتـوانێ سەرپەرسـتیارەکەی ئاگاداربکـات، وەسەرپەرستیار بۆی هەیە بەکەسانی صاڵح و چاك بڵێ: دەمەوێ کچەکەمت لێ مارە بکەم.

٣- ژنان دەتوانن بدەن بە گوێی پیاوی چاك و باشدا کە مارەی بکـات.. چـونکە خـاتوو (خەدیجـە) دایکـی موسـڵمانان خـۆی ناردیـە لای پێغەمبـەر ﷺ، هـەروەها (عومـەر) گـوتی بـە (ئەبوبـەکر) و (عوسمـان) یـەك لـە دوای یـەك دەمـەوێ (حەفصە) تـان لێ مـارە بکـەم، خـوا لـە هەموویان ڕازی بێت.

٤- ژنێك دەزانێ سك و زا ناکات، پێویستە ئەو کەسە ئاگادار بکات داوای دەکات، چونکە ئەوە (عەیب)ـە و دەبێ پیاو بیزانێت.

٥- ژنێك بەر لەمێرد کردن بەهۆی هەر کارێکـەوە بێـت، کـچێنی نـامێنێ.. ئەگـەر پێویـست بوو داواکارەکەی ئاگادار بکات لێی.. وەکو عادەت و باوی دەڤەرەکە - دەبێ ئاگاداری بکات، خـۆ ئەگـەر شـتێکی ئاسـایی بـوو، دەتـوانێ دەنـگ نـەکات، جـا پـاش گواسـتنەوەو تێکـەڵی، مێردەکەی حاڵی بکات.

٦- هەركەسێك بیەوێ ئافرەتێك بخوازێ، بەر لەداواكردنی دەتوانێ سەرو دەموچاوو دەست و پێی ببینێ، ئەگەر چی هەندێ لە زاناكان دەڵێن: تەنها دەم و چاوو دەست بەسە.

٧- ئەگەر باوك و دایك هەریەكەیان كەسێكیان هەڵبژارد بۆ كچەكەیان، كچەكەیش حەزی لە كەسێكی تر بوو، دەبێ حساب بۆ ڕاو حەزی كچەكە بكرێت، چونكە ئەو تێكەڵیی و هاوسەریەتی ئەو پیاوە دەكات، بە مەرجێ هاوشان و هاوكووف بێت بۆی.

٨- نابێ ژنی موسڵمان و ئیماندار، مێرد بە پیاوی كافر و خوانەناس بكات.

٩- ئەو كچانەی خەریكی خوێندنن، ئەگەر داواكاریان هات، هەقە مێردی پێ بكەن، چونكە (زەواج) پڕە لە بەرەكەت و بەرژەوەندی بۆ مرۆۋ و خودا ئاسانكاریی دەكات بۆیان.

١٠- بە بێ بیانووی شەرعیی، بۆ هیچ ئافرەتێك دروست نییە لە مێردكردن دوا بكەوێ، چونكە خۆ دواخستن لە شووكردن، ئایندەیەكی تاڵ و تفتی هەیە و پڕ دەبێ لە گیر و گرفت و ناسۆر، سەرەڕای ئەوەیش لادانە لە (فیطرەت)ی خودایی.

١١- (زەواج) سوننەتی پێغەمبەرانە - علیهم االصلاة والسلام - هیچ كەسێك بێ بیانووی شەرعیی بۆی نییە، لەو سوننەتە شەرعیە خۆ كلا بكات.. داستانی ئەو سێ كەسە كە هاتنە ماڵی پێغەمبەر ﷺ و لە شێوەو ئەندازەی خواپەرستی ئەویان پرسی و.. یەكێكیان بڕیاریدا: هەرگیز ژن نەهێنێ ! پێغەمبەریش ﷺ ڕەتی بۆچوونەكەی كردەوەو فەرمووی: ((من رغب عن سنتي فليس مني..)) باشترین بەڵگەیە بۆ ئەو ڕاستیە.

كەوابوو كارێكی نارێك و نارەوایە نێرومێ لەو سوننەتە لابدەن و خۆ پیرو كەنەفت بكەن و بۆ دواییش بە تەنها ژیان بەسەر بەرن.

١٢- خۆ نمایشكردن لە رۆژنامەكاندا بۆ (زەواج) و مێردكردن، پێچەوانەی عورف و باوی خەڵكانی بەحەیاو بەحیشمەتە.

١٣- قسەكردن بە تەلەفون لەلایەن (خوازبێنی كارو كچەكەوە) ئەگەر پێویستی (زەواج)ـە كە نەبێت، چاك وایە (وەلی)یەكەی قسە بكات لەگەڵ داواكارەكەیدا.

١٤- پەیوەندی لەنێوان كچ و كوڕدا.. ئەگەر پێش گواستنەوەو دوای گرێبەستەكە بێت، هیچ قەیدێكی نییە، خۆئەگەر دوای خوازبێنی و بەر لەگرێبەستەكە بوو، بەهیچ شێوەیەك دروست نییە. نە كۆبوونەوە لەگەڵیا، نەتەلەفون و قسە و حیكایەت و تەماشا كردنی.

١٥- گەڕانی كچ و كوڕ پێكەوەو سەفەركردن بۆ ئەم لاو ئەولا، پاش گرێبەست و بەر لەگواستنەوە، لەڕوی شەریعەتەوە هیچ قەیدی نییە، بەڵام بێگومان پێچەوانەی عورف و باوی كوردەواریی و شەرم و حیشمەتە، هەقە لەپێش چاو دایك و باوك و براو خوشك و خزمان و

خەڵکاندا کاری وا نەکەن.

١٦- کەسێك داوای کچێکی کرد و وەڵامی دایەوەو ماڵەوەشیان ڕەزامەندییان دەربڕی، ئیتر هەق نییە خزمانی تریان ڕەخنە بگرن و گرفت بخەنە ڕێگایەوە.

١٧- کەسێك لە حاڵ و ئەخلاقی کەسێکی خوازبێنیکاری پرسی، دەبێ وەك خۆی بۆی باس بکاو درۆ و دەلەسەی لەسەر نەکات.

١٨- کوڕێك خوێن بدات بە کچێك، بەوە نابنە مەحرەم، بەڵکو دەتوانن پێکەوە (زەواج) بکەن.

١٩- دروست نییە زۆر لە کچێك بکرێ بۆئەوە مێرد بە فلانە کەس بکات، ئەگەرچی باوك و دایکی کچەکەش لە (دین) و ڕەوشتی ڕازیبین.

٢٠- دروست نییە ژن بە شوودان نهێنی بێ و خەڵکان پێی نەزانن، بۆیە دەبێ شایەت ئامادە بکرێ و، سوننەتە زەماوەندیشی بۆبکرێ.. هەر ئەمەیشە ئەو خێزانە لە قسەی ناشیرین دەپارێزێ و کچەکەش لە تۆمەت دوور دەبێ.

٢١- ئەگەر برایەك - بێ ئاگاداری باوکی - خوشکەکەی لە کەسێك مارەکرد، پێویستە ئەو نیکاحە بکرێتەوە، چونکە بێ ڕەزامەندیی و ئاگاداری باوك، برا ناتوانێ کچ بە شوو بدات.

٢٢- ئەگەر ئافرەتێك گوتی: بەو مەرجە شووی پێدەکات، ڕێم لێ نەگری (تەدریس) بکەم و بچمە قوتابخانە، یان لە فلانە دەزگادا دەوام بکەم، ئەویش قەبووڵی کرد، دەبێ مەرجەکەی بۆ جێبەجێ بکات، خۆئەگەر پێچەوانە ڕەفتاری کرد، ژنەکە دەتوانێ داوای (فەسخ)ی نیکاحەکە بکات.

٢٣- هیچ ژنێك بۆی نییە -پاش مردنی مێردەکەی - ڕێ لەخۆی بگرێت لە شووکردنەوە، چونکە تەنها خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆیان نەبووە، پاش خۆی مێرد بکەن.

٢٤- هەر نیکاحێك پایە و مەرجەکانی بێتەجێ - ئیتر (زواج المسیار) یان (زواج العرفی) پێ بڵێن - دروستە و کاری پێدەکرێ، ئەمانە پایە و مەرجن بۆ گرێبەست و نیکاح (وەلی، مارەیی، دوو شایەت، ڕەزامەندی ژن و مێرد).

٢٥- دروست نییە بۆ (دەستگیران) لە پێش چاو داواکارەکەیەوە خۆی بگۆڕێ، یان خۆ ئارایشت بدا و میکیاج بکات، چونکە هێمان بە یەك نامەحرەمن.

## مارەیـــی

١- مارەیی هەقی ژنانە، جا ئەگەر ژنەکە بە ئارەزووی خۆی دەستی لێ هەڵگرت، یان لە بەشێکی پیاوەکەی ئازاد کرد، دروستە بە مەرجێ فامیدە و ژیر بێ.. ئەگینە بۆ هیچ کەسێك نییە شتێکی لێ ببات.

٢- ئەگەر بەشێك لە مارەیی دوا خرابوو بۆ کاتێکی دیاری کراو (المهرالمؤجل) دروستە و کاری پێ دەکرێ، وەمارەیی (مؤجل) ئەگەر بەسەر مێردەکەوە بوو دەوڵەمەندبوو، دەبێ زەکاتی بدات، ئەگینە زەکاتی لەسەر نیە.

٣- ژنی ژیر و فامیدە دەتوانێ بە ئارەزووی خۆی لەو مارەییە قەرزەی دەست هەڵگرێت، ئەگینە بە زۆر و زۆر کاری ئازاد نابێ و هیچ نابەسێتەوە.

٤- دەتوانرێ لە باتی مارەیی، فێرکردنی قورئان بێ، وەکو پێغەمبەر ﷺ لە تەمەنی خۆیدا ئەنجامیدا بۆ یەکێك لە هاوەڵان، هەروەها دروستە (قورئان) بکرێتە مارەیی، چونکە قسەی ڕاست ئەوەیە کە فرۆشتن و کڕینی قورئان دروستە.

٥- ژن دەتوانێ مارەییەکەی (عومرە) بێت لەسەر پیاوەکە دای بنێت.

٦- باوك دەتوانێ ئەندازێك -کە کچەکە پێویستی نەبێ- لە مارەییەکەی ببات بۆ خۆی (لیژنەی فتوای هەمیشەیی سعودیە).

٧- هەر بە گرێبەستەکە ژن مارەیی مسۆگەر دەکات، جا ئەگەر سەرجێیی لەگەڵ کرا، یان خەڵوەتیان کرد، یان یەکێکیان مرد، مارەیی تەواو دەبات.

٨- ئەگەر بەر لەسەرجێیی تەڵاقدراو، لە گرێبەستەکەدا مارەیی بۆ تەواو کرابوو، نیوەی مارەییەکە دەبات، ئینجا هەرکامیان دەست لە بەشی خۆی هەڵگرێ دروستە و کارێکی باشی ئەنجامداوە.

٩- ئەگەر بێ باسکردنی مارەیی نیکاحەکە کرا، دادەمەزرێ و ژنەکە (مهر المثل) ی بۆ دادەنرێت.

١٠- هەر کات بەر لە خەوتن ژنەکەی تەڵاقدا، بە پێی دارا و نەداریی مێرد، دەبێ (موتعە = ئەندازێ لەماڵ) بدرێ بە ژنەکە.

١١- ئەگەر بەر لەنوستن پێکەوە تەڵاقدرا، لەسەر لاساری ژنەکە، ئەوکاتە هیچی ناکەوێت.

١٢- باشترین نیکاح ئەوەیە مارەیی کەم بێت، بێ شك زێدەڕۆیی لە مارەیی و ئاهەنگگێڕان دا پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە، وە پیرۆزیش لە کەمی تێچوون و مارەیی

دایـە، ئەمـەش دەکەوێتـە سـەر شـانی ژنـان، هەقـە لـەباتی قورسـکردنی مـارەیی و تـەکالیف.. هەوڵبدەن ئەرکی سەر شانی زاوا کەم بکەنەوە..

١٣- نیکاح لە کاتی حەیزدا دروستە، بە مەرجێ سـەرجێیی لەگەڵ نەکرێت، بـەڵام تـەڵاق لە حەیزدا دروست نییە.

## چەند خاڵێك لە بارەی مافی ژن و مێردیەوە

١- دەبێ ژن لە سنووری چوارچێوەی شەرعدا گوێڕایەڵی مێردی بێت.

٢- دەبێ چاوی لە نامووس و شەرەف و ماڵ و ئەولادی بێت.

٣- هەرکات داوای سەرجێیی لێکرد، دەبێ وەڵامی بداتەوە.

٤- بە مۆڵەتی مێردەکەی نەبێ، لەماڵ دەرنەچێ.

٥- ئیش و کاری ماڵەوە، چی لەسـەر ئـەوە، دەبێ پێـی هەڵسـێت، سـەرەڕای ئەمانـە هەقە ڕەفتار و مامەڵەی شیرین و جوان بێت لەگەڵیا، وە پاداشـتی تونـدو تیـژیی و خراپـەکانی، بە نەرم و نیانیی و ڕەفتاری چاك بداتەوە، تا باشتر ئولفەت و خۆشەویستی نێوانیـان بچەسپێ. ڕۆژێك (شـەعبی) لـە حاڵ و ئـەحواڵی قازی (شـورەیح)ی پرسـی لەگـەڵ خێزانەکەیـدا، گـوتی: بیـست سـاڵە نەمـدیتووە کـارێ بکـات تـووڕەم بکـات، گـوتی: چـۆن ؟! شـورەیح وتـی: یەکـەم شـەوی بەیەکگەیـشتنمان دیـتم ئـافرەتێکی زۆر بـە جـەماڵ و شـۆخ و شـەنگە، لـە دڵـی خۆمـدا گوتم: با لـە سوپاسـی خـوادا دەسـت نوێـژ بگـرم و دوو ڕکـات نوێـژ بکـەم، کـە سـەلامم دایـەوە دەبینم ئەویش وەکو من خەریکی نوێژە، جاکاتێ خزم و میوان هەستان و چۆڵیان کرد و هەر خۆمـان ماینــەوە گـوتی: سـوپاس و سـتاییش بـۆ خـوا، سوپاسـی دەکـەم و داوای یارمـەتی لێدەکەم، دروود و سڵاویش دەنێرم بۆ گیـانی پێغەمبـەر ﷺ و بنەماڵـەی، پاشـان: من ژنێکـی غەریب و بێ ئاگام لە ئەخلاق و ڕەوشتی تۆ.. هەر ئێستا پێم بڵێ چیت پێ باشە با بیکـەم و، چیشت پێ ناخۆشە با نەیکەم، شیاوی باسە، تۆ دەتوانی لـە ژنـانی خۆتـان ژن بێنـی، منـیش دەمتـوانی مێـرد بـە کەسـێکی هاوشـانی خـۆم بکـەم، بـەڵام بڕیـاری خـودا هـەر دەبێ بـبێ، تـۆ بویتە خاوەنی من، خودا چ فەرمانێکی پێکردوی جێبەجێی بکە.. (یا بەباشی ڕامگرە، یان بە باشی جودا بینەوە.. (اقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولك...)

(شورەیح) گوتی: منیش ناچار بووم گوتارێکی ئاوام خوێندەوە و گوتم: قسەیەکت کرد ئەگەر ئاوابیت بەختیار دەبی، ئەگینە دەکەوێتە سەرت من ئەوەو ئەوەم پێخۆشە، ئەوەو ئەوەیشم پێناخۆشە، هەر چاکەیەکت لێ دیتم دەتوانی بلاّوی بکەیتەوە، هەر خراپەیەکیشت لێ دیتم دایپۆشە. گوتی: پێم خۆشە سەردانی ماڵی باوکم بکەم ؟ گوتم: هەرگیز حەزناکەم ماڵی خەزوورانم بێتاقەت بکەم. گوتی: لە دراوسێکان بە کێ حەز دەکەیی و بە کێ حەزناکەی بێنە ماڵت ؟ گوتم: فلاّنە خێزان پیاوی چاکن، فلاّنە خێزانیش خراپ، ساڵێکمان پڕ لە خۆشیی و خۆشەویستی بردە سەر، ڕۆژێك لە کار گەڕامەوە ماڵ، ژنێکم دیت لە ماڵەوە، گوتم کێیە ؟ گوتی: خەسووتە، ئەویش لای بەلامەوە کرد و گوتی: چۆن ژنەکەتت دیت ؟ گوتم: باشترین ژنان. گوتی: وریابە ! ژن لە دوو حاڵەتدا زۆر خراپ دەبێت: کاتێ دووگیان دەبێ و کوڕی دەبێ، کاتێ زانی مێردی خۆشی دەوێ.. لەبەر ئەوە چۆنت دەوێ ئەدەبی دابدە و پاکژەی بکە. بەلێ: بیست ساڵ لەگەڵم مایەوە و گلەییم نەبوو لێی، جارێك نەبێ، ئەویش تاوانی من بوو. (موسوعة فقه المراة المسلمة) یوسف الحاج أحمد.

٦- بە هیچ شێوەیەك دروست نییە، تێکەڵی کردن لەگەڵ ژناندا لە پاشەوە، ئەگەر کەسێك کاری وایکرد، دەبێ تەوبە بکات و نیەت بێنێ جارێکی تر نەچێتەوە سەر ئەوکارە.

٧- قسەی ڕاست ئەوەیە، ئەگەر کەسێك لە پاشەوە دروست بوو لەگەڵ خێزانیا کەفارەتی ناکەوێتە سەر.

٨- ژنان دەبێ ڕێ بەو کارە دزێوو ناشیرینە نەدەن.

٩- هەقە.. ئەگەر شتێکی وای دیت، سکالاّ بنووسێ و داوای (فەسخ) ی تێدا بکات.

١٠- ژن دەتوانێ تەماشای تەواوی جەستەی مێردی بکات، پیاویش دەتوانێ تەماشای تەواوی جەستەی ژنەکەی بکات.

١١- بە پێی فتوای (اللجنة الدائمة) لە (سعودیە) دەبێ ژنان خزمەتی پیاوەکانیان بکەن، چونکە ژنە ساڵحەکانی پێش، خزمەتیان کردوون، لەوانە: خاتو (فاطمة) و (ئەسما)ی کچی (أبوبکری الصدیق) -خوایان لێ ڕازی بێت- کە بەڕاستی هەریەکەیان بەدڵسۆزانە لە خزمەتی ئیش و کاری ماڵەوەو دەرەوەی ماڵدا بوون، لەبەر هاوکاری مێردەکانیان: (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) و (زوبەیری کوڕی عەوام) -خوایان لێ ڕازی بێت.

١٢- نابێ ژنان زیاد لە توانای مێرد و باوی کۆمەڵگە، داوای نەفەقە بکەن، چونکە خودا دەفەرموێ: (وعاشروهن بالمعروف)

١٣- هەقە ژنان هاوکاری مێردیان بکەن — سەبارەت بە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری

ماڵ و منداڵی، ئەگینە بە خراپکار دەژمێردرێ، بۆ ئەمەیش پێویستە بە ئارام بێت.

١٤- نابێ ژنان بە بێ موڵەت و ڕەزامەندی مێردیان، هیچ شتێك لە ماڵ و سامانی خەرج بکەن، چونکە خودا قەدەغەی کردووە کەسێك بە ناهەق ماڵی کەسێك بخوات.

١٥- پیاوێك بە پێی عادەت و باوی خەڵکانی وەك خۆی لە ناوچەکەدا نەفەقەی ماڵ و منداڵی نەدات، لەو حاڵەتەدا ژنان دەتوانن بەپێی هەقی خۆیان – بێ موڵەتی مێرد – لە ماڵەکەی نەفەقە بۆخۆیان خەرج بکەن.

١٦- ئەگەر پیاوان بە ڕەزامەندی ژنان شتێکیان لە ماڵ و سامانیان وەرگرت، دەبێتە حەلاڵیان، بەلاّم دەبێ پاش ئەوە منەت نەخەنە سەریان، هەروەك ئەگەر ژنان ڕازی نەبوون، نابێ پیاوان لە هقووقی خۆیان بێ بەشیان بکەن.

١٧- ژنان لە ئاڵ و وێڵ و، بەخشین و خێر و صەدەقە.. هتد، لەماڵی خۆیان ئازادن، بۆیە مێرد بۆی نییە پێی لێ بگرێ، بە مەرجێ فامیدە و ژیربێت.

١٨- هەرکات پیاو داوای لە خێزانەکەی کرد لەگەڵیا بخەوێ، حەرامە وەلاّمی نەداتەوە، مەگەر نەخۆش بێت، لەو حاڵەتەشدا نابێ پیاو داوای شتێکی وا بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (لا ضرر ولا ضرار) نابێ کەس زیان بە بەرامبەرەکەی بگەیەنێ.

١٩- نابێ پیاو بە خێزانەکەی بڵێت: دایە، خوشکە، یان ژن بە مێردەکەی بڵێ: بابە، برا، یان هەر وشەیەکی تر لەو بابەتە.

٢٠- نابێ ژنان خەڵکی نامەحرەم -ئەگەر چی هاوڕێی مێردەکەیشی بێت، یان پیاوچاك و بە متمانە بێ- بەرێتە ماڵ، لەو کاتانەدا مێرد لەماڵ نییە، هەروەها نابێ پیاویش خێزانی هاوڕێکەی یان دراوسێکەی بەرێتە ماڵەوە، بۆ خزمەتکردن و نان و چێشت کردن، نەوەك شەیتان خەتەرەو وەسوەسەیان بۆ پەیدا بکاو، کاری دزێوو ناشیرین ڕوو بدات، ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (إياكم و الدخول على النساء، قالوا: يارسول الله !: أرأيت الحمو ؟ قال: الحمو الموت) رواه البخاري.

٢١- ئەگەر ژنێك مێردەکەی بەهەشتی نەبێ، دەبێ خودا (بەدیل) ی بۆ پەیدا بکات..؟ بێگومان پاداشتی قیامەت بۆ ژن و پیاوە بە گشتی، (ومن يعمل من الصالحات من ذكر او أنثى وهو مؤمن فاولئك يدخلون الجنة..).

٢٢- ئەگەر ژنێك چەند مێردێکی کرد بوو و هەمووشیان ئاکار چاك و بەهەشتیبن، خودا لە ڕۆژی قیامەتدا سەرپشکی دەکات کە بە ئارەزووی خۆی یەکێکیان هەڵبژێرێ.

٢٣- پاش گواستنەوەی کچێك، دیتی کچێنیی نییە، دەبێ چی بکرێ..؟ (شێخ بن باز)

دەڵێ: ئەو کارە دەکرێ چەند هۆیەکی هەبێ، جگەلە زینا پێویستە گومانی باش ببرێ، چونکە دەکرێ بە هۆی توندی خوێنی حەیزەوە یان باز بردنێکەوە نەمابێ..، یان ئەگەر بە زیناش بووبێ، وا ئێستە تەوبەی کردووەو گەڕاوەتەوە.

٢٤- نادیار بوونی مێرد (غياب الزوج) ماوەیەکی زۆر لە هاوسەری، ئەگەر ژنەکەی ڕازی بوو، دیارە چوار مانگ یان شەش مانگ یان ساڵێك یان دوو ساڵ دیار نابێ، بە مەرجێ ژنەکە لە شارێکی ئەمین بێت و ڕازیش بێت، خۆ ئەگەر ڕێو شوێنی ئەمین نەبوو، خۆیشی بەوە ڕازی نەبوو، ڕێگە نییە ئەوەندە خۆی نادیار بکات، چونکە لە ئیسلامدا مامەڵە دەبێ بە (مەعروف) و شەرع پەسەند بێت.

٢٥- ئەگەر ژنێك بە مێردەکەی وت: تۆ برامی ! تۆ بابمی ! ئەم وشانە و هەر وشەیەکی تر لەو بابەتە، ژنان حەرام ناکەن لە مێردیان، واتە بە (ظهار) دانانرێ، بەڵکو تەنها بە سوێند دادەنرێ و دەبێ کەفارەتی سوێند (نانی١٠ هەژار) هەر هەژارەی نیو (مەن) لە خۆراکی خەڵکی شارەکەی بدات.

**سەرنجــــێك:**

(ظیهار) تەنها لەلایەن پیاوانەوە دەبێ، بۆ نموونە: بەخێزانەکەی بڵێ:(تۆ دایکمی، تۆ خوشکمی) ئیتر ژنان ناتوانن مێرد لەخۆ حەرام بکەن، بە بەکار هێنانی ئەو جۆرە وشانە.

٢٦- بێگومان لە نێوان ژن و مێردا، هەندێ شتی نهێنی ڕوو دەدات، پێویستە ژنان – بە تایبەت- ئەو نهێنیانە بپارێزن و، لای خەڵکی باسی نەکەن، هەروەها پیاوانیش.

٢٧- مێرد ناتوانی هیچ شتێك لە مووچەی هاوسەرەکەی وەرگرێ، یان لێی زەوت کات بە ڕەزامەندیی و خۆشحاڵی ئەو نەبێ.

٢٨- ئەگەر ژنێك پاش (زەواج) هەندێ شتی لە مێردەکەی دیت، مایەی دڵ نیگەرانی ئەو بوو، ئایا دەتوانێ داوای جیابوونەوەی لێ بکات..؟ بەڵێ ئەگەر هەندێ مەرج و بڕیار لە نێوانیاندا بوو و پێچەوانە دەرچوون، دەتوانێ داوای جیابوونەوە بکات، لە هەمانکاتدا هەرچی لە مێردەکەی وەرگرتبێ، دەبێ بیداتە دواوە، چونکە ئەوە هۆی جیابوونەوەیە، خۆ ئەگەر ڕازیی بوو، هیچ قەیدی نییە.

٢٩- ژن و پیاو بۆیان هەیە لەکاتی (جیماع) دا زیکری: ((بسم الله، اللهم جنبنا الشيطان، وجنب الشيطان ما رزقتنا)) بخوێنن، رواه البخاري.

٣٠- پیاوێك بۆ خۆی دەزانێ (نەزۆك)ـە و منداڵی نابێ.. پێویستە بە هاوسەرەکەی بڵێت،

ئەگینە خەیانەتە لێی.

٣١- لە ڕەمەزاندا ژن گواستنەوە (کەراهەت) ی نییە.

٣٢- (شـیخ إبـن عثـیمین) دەڵـێ: (شـهر العسل) دروسـت نییـە، چـونکە لاسایی خـەڵکانی ناموسـوڵمانە، لەولایـشەوە مـاڵ و سـامانێکی زۆر بـە فـیڕۆ دەچـێ و تووشـی هەنـدێ کـاری ناپەسەند دەبن.

٣٣- مێرد ناتوانێ ڕێ لە هاوسەرەکەی بگرێت، لە کڕینی شتومەکی (کەمالیات) لـە ماڵی خۆی، بەمەرجێ زێدەڕۆیی نەکات.

٣٤- ژنـان بـێ موڵـەت لـەمێرد نـابێ لـە مـاڵ دەرچـن، ئەگـەر چـی بـۆ سـەردانی بـاوك و دایکیشی بێت، مەگەر حاڵەتێك ببێ ژنەکە ناچار بێ بچێت.

٣٥- نەفەقـەی ژنـان لەسـەر مێـردە، ئەگـەر چـی مووچـە و مانگانەشـیان هـەبێ، مەگـەر بـۆ خۆیان پێیان خۆش بێت شتێك سەرف بکەن.

٣٦- ئەگەر ژنان ئەشقیی و لاساربوون، پیاو دەتوانێ - ئەگـەر ئامۆژگـاریی و نەصـیحەت بێ کەڵکبوو بۆی - جێنووستنی لەگەڵ جیابکاتەوە، وە یان لە کاتی خەودا پشتی تێ بکات، تاوەکو جارانی لێدێتەوە، بەلاّم هەرگیز بێ گوناح نابێ کاری وا بکات.

٣٧- فێڵ و مەکر لە ژنان بۆ ئاژاوە لەگەڵ پیاوەکانیاندا، یان لە خشتە بردنیان بۆ ئـەوەی لای مێرد دانەنیشن، کارێکی حەرامە و پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لیس منّـا مـن خبّـب إمـرأة علی زوجها، أو عبداً علی سیده)) رواه أبوداود.

٣٨- ئەگـەر پیاوێـك بـێ هۆکـارێکی شـەرعی، ماوەیـەك خـۆی نادیـار کـردو نەفەقەکـەی ژنەکەی نەدا، دەبێ هی ڕابردوویشی بۆ سەرف بکاتەوە.

٣٩- کەسێك لەگەڵ کیژێکدا بە حەرامی سەرجێیی کرد، پاشان ویستی مارەی بکات، هیچ قەیدی نییە، بەلاّم حەقە:-

- هەردوو تەوبە بکەن لەو گوناح و تاوانە کردوویانە.
- پەشیمانی دەربڕن لێی.
- نیەتی وابێت هەرگیز نەگەڕێتەوە بۆ کاری دزێوی وا.
- پتر لە جاران دەست بداتە ئاکاری چاك و خواپەرستیی.

**سەرنجێك:**

دەبێ بەر لـەمارەکردن (حـەیز) یـّك ببینـێ، بۆ ئـەوەی دەرکـەوێ دووگیـان نـەبووە، خـۆ ئەگـەر بەوکارەیان دوو گیان بووبێ، تا(حمل)ەکەی دانەنێ، دروست نییە نیکاح بکرێ. (اللجنة الدائمة)

٤٠- یادکردنـەوەی سـاڵی (زەواج) و دیـاریی و بەخـشش، کـارێکی نادروسـتە، چـونکە لەشەریعەتی ئیسلامی پیرۆزدا، ئەو تەکلیف و ئەرکە بیٚ جێیانە، جێیان نییە.. بەڵکو لەباتی ئەوە هەوڵ بدریٚ خۆشەویستی پتر بکریٚ.

٤١- مێـرد دەتـوانیٚ بـەدایکی خێزانەکـەی بڵـیٚ: پـوریٚ، هـەروەك ژن دەتـوانیٚ بـە بـاوکی مێردەکەی بڵیٚ: خاڵە، یان بڵیٚ مامە.

## لە گرێبەستدا ئەم خاڵانە ڕەچاو بکەن

- مارەیی دیاری بکریٚ و لە عەقدەکەشدا ناو ببریٚ.

- بیٚ (وەلیی) ژنەکە گریٚ بەست نەکریٚ، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: ((لا نكاح إلا بولي)).

- دوو شایەتی نێرینەی باڵغ و موسڵمان و عادڵ ئامادە بکرێن.

- کچ و کوڕ، دەبیٚ هەردوو ڕازی بن.

٤٢- پیـاو دەتـوانیٚ - لـە بەرامبـەر چـاکە و صـەلاحەتی ژنەکەیـەوە، هەرچـی بیـەویٚ بیبەخشیٚ پێی، ئەگەر زیانبەخش نەبیٚ بە میراتگرەکانی، هەروەها ژنیش دەتوانیٚ، چی دەبەخشیٚ بە مێردی، بیبەخشیٚ.

٤٣- وێنەگرتنی حاڵەتی ژن و مێردیی، لە کاتی (جیماع) و تێکەڵبووندا، کارێکی حەرامە و دەبیٚ موسڵمان خۆی لیٚ دوور بگریٚ، چونکە پاراستنی (عیرض) و (عەورەت) شتێکە لە ئیمان و فیطرەتی پاك.

٤٤- مێرد بۆی هەیە لە تەواوی جەستەی هاوسەرەکەی لەزەت وەربگریٚ، وە دەتوانیٚ لە پاشەوە - لەجێی خۆیەوە - سەرجێیی لەگەڵ بکات، واتە: لە (کۆم)ـەوە بە هیچ شێوەیەك ڕێی پێنەدراوە و هەڕەشەی سەختی تیادایە و پێچەوانەی هەموو ڕەوشتێکی مرۆڤایەتیە، تەنانەت ئاژەڵیش لەگەڵ یەکتردا بەکاری ناهێنن.

٤٥- ئەگـەر ژنێـك مێردەکـەی عـارەق خـۆر بێـت دەبـیٚ ئامۆژگـاری بکـاو، خـۆ ئەگـەر نەگەڕایەوە سەر ڕێی ڕاست، دەتوانیٚ لەگەڵی نەخەویٚ و داوای جیابوونەوەشی لیٚ بکات.

٤٦- دەبیٚ ژن بەسەر مێردەکەیدا دەنگ بەرز نەکاتەوە، هەروەکو هەقە پیاویش بەرامبەر هاوسەرەکەی نەرم و نیان و بەڕێز بێت، وەنابیٚ هیچیان مافی ئەویان پێشێل بکەن.

٤٧- دیارە نەفەقەی ژن لەسەر مێردە.. بەڵام هەرکات ئەشقیبوو و دەستی دایە لاساریی

و خۆی نەدا بەدەستەوە، نەفەقەش دەبڕدرێت.

٤٨- ئەگـەر ژنەكـە بەموڵـەتی مێردەكـەی چـووە سـەفەر، یـان بـێ موڵـەتی ئـەو، بێگومـان نەفەقەو (قەسم) ی دەفەوتێ.

٤٩- یەكخستنەوەی ژن و مێرد و نەهێشتنی ناكۆكییەكانیان بە (جادوو) كارێكی حەرام و قەدەغەكراوەو دروست نییە، هەروەك جیاكردنەوەیان بە (جادوو) حەرام و یاساغە، بەڵكو هەندێ جار دەبێتە كوفر و شیرك.

٥٠- نوشتەی چەور و شیرینی (وەكو كورد دەڵێ) بۆ ئەوە ژن و پیاوەكە یەكتریان خۆش بوێ، كارێكی حەرام و بە جادوو دادەنرێت.

٥١- حەرامە بۆ مێرد، ڕێ لە (صیلەی رەحم) بگرێت و نەهێڵێت ژنەكەی سەردانی باوك و دایكیی و خزمانی بكات، مەگەر بزانێ (مەفسەد)ـە یەكی لێ پەیدا دەبێ.

٥٢- حەرامـە بـۆ مێـرد، فـەرق و سـوون بخاتـە نێـوان ژنەكانیـەوە - ئەگـەر چـەند ژنێكـی هـەبوو - لـە خـانوو و جـل و بـەرگ و نەفەقـە و شـەومانەوە لـەلایان، ئەگـەر چـی هەنـدێ دەوڵەمەندیش بن.

٥٣- ئەگەر ژنێك بیـەوێ لـەماڵی خـەزووران دوورەوە كـەوێ، تاهـەراو دڵئێشانیان نـەبێ.. دەبێ مێـرد هەوڵبـدات كێشەكەیان چارەسـەر بكـات، خۆئەگـەر چارەسـەر تـەنها جیابوونـەوەو دووركەوتنەوە بوو، قەیدێكی نییە، بەڵام دەبێ دەست لە (صیلەی رەحم) هەڵنەگرێ.

٥٤- (عـەزل) واتـە: خۆكـشانەوە لـەكاتی (جیمـاع)دا، بـۆ ئـەوەی (مـەنیی)ـە كـە برژێتـە دەرەوەی ژنەكە، بەم مەرجانە درووستە:-

- دەبێ ژنەكە ڕازی بێت، چونكە هەقیەتی داوای منداڵ بكات.

- ئەگەر ڕازی نـەبوو دروسـت نییـە لـە لەزەت وەرگرتن بـێ بـەش بكـرێ، چـونكە لـەزەت و خۆشی ژنان، دوای ڕژانی (مەنیی)یەكە بۆ ناوەوە تەواو دەبێت.

## چەند مەسەلەیەك لە فرە ژنیی

١- فره ژنـی.. موڵـەت و ئیزنـی خـودای لەسـەرە، بـۆ هـیچ موسـڵمانێك ڕەوا نییـە بێـزاری دەربڕێ و ئیستنكاری بكات، بێگومان هەركەسێك فره ژنی پێ قەبوڵ نـەبێ، بـە (مورتـەدد) و پاشـگەز بـووە لـە ئیـسلام دادەنـرێ، وە بـەر ئـەم ئایەتـە دەكـەوێ كـە دەفەرموێ: (ذلـك بـأنهم كَرِهُوا مَا أنزَلَ اللهُ فأحبَطَ أعمَالَهُم) بێ شك ئەوانە وا فره ژنی ڕەت دەكەنـەوە، كەوتونەتـە ژێـر

کاریگــەری کــافر و خوانەناســانەوە، موســڵمانە دڵپــاك و ســادەکانیش بــێ چــەند وچــوون لاساییان دەکەنەوە و، هەریەکەو لە ئاوازێ لێ دەخوێنێ و پاساوی بۆ دێنێتەوەو، وا قسە دەکەن ئیسلام نەیپێکاوە و، بۆ ئەمڕۆ دەتوانرێ بەرهەڵست بکرێ !

٢- هەموو کات سەرژمێریی و ئامارەکانی جیهان، وا دەگەیەنن کە کچان پتر لە کوڕان لە دایك دەبن و، زۆربەی ئەوانەی دەمرن نێرینەن، چونکە جەنگ و ئاژاوەکانی دنیا زیاتر پیاوان دەگرێتەوە تا ژنان، کەوابوو هەمیشە ڕێژەی ژنان بەرزترە.. بۆیە ڕێ بە پیاوان دراوە تا چوار ژن بێنن، تا بەڵکو ئەو ڕێژە زیادەیە بێ مێردی شەرعیی و حەڵاڵ نەمێننەوە. خۆ بێگومان پیاوێك لەسەر بناغەی شەرعی لەگەڵ ئافرەتێکدا تێکەڵ بێت، زۆر باشترە لەوەی لەسەر شەقام و کۆڵانێکدا بە ناشەرعی تێکەڵ دەبن و، پاشان هەڵدەسێتەوە و خۆی دەتەکێنێ و پێچی لێدەکاتەوە.

٣- ئەگەر پیاوێك ویستی ژنی دووەم بێنێ، مەرج نییە ژنی یەکەم ڕازی بکات، ئەگەر چی سیفەتی جوامێریی و مەردی واهەڵدەگرێ، بە هەر شێوە و شێوازێك بوو بێت ژنەی یەکەم ڕازی بکات، چونکە ئەو ڕازییکردنە دەبێتە مایەی زیادبوونی خۆشەویستیی ودلۆڤانی نێوانیان لە ئاییندەدا.

٤- (شێخ بن باز) دەڵێ: بەکار هێنانی (عەدالەت) لە نەفەقە و (قەسم)دا واجبە، ئەگینە لە خۆشەویستیی و (جیماع)دا لە تواناداا نیە و ناکرێ.

٥- (قەسم) تەنانەتی بۆ ژنی حەیزدار و زەیسانیش واجبە، ئەگەر چی سەرجێییشیان لەگەڵ ناکرێت.

٦- ئەگەر ژنی دووەم کچ بوو، دەتوانێ (٧) شەو لەلای بمێنێتەوە، خۆ ئەگەر بێوەژن بوو، دەبێ (٣) شەو بمێنێتەوە.

٧- هاتووچۆی ژنێك - بەشەودا - سەرەی خۆی نەبێ.. تەماشای عورفی کۆمەڵگە دەکرێ.. ئەگەر ئەو کۆمەڵگەیە کاری وایان ڕێ پێدەدا و بە ستەمیان دانەدەنا، دەتوانێ هاتووچۆ بکات، ئەگینە واز بهێنێ لێی.

٨- ئەگەر ژنێك سەرەی خۆی بەخشی بە مێردەکەی، یان بە (هەویەکە)ی دروستە، هەرکاتێکیش داوای کردەوە هەقی خۆیەتی.

٩- دروست نییە - بێ هۆکاری شەرعیی - فەزڵی ژنێك بدات بەسەر ئەوانی تردا، لە بەخشش و دیاریدا.. خۆ ئەگەر یەکێکیان هاوکاری مێردەکەی دەکرد، لە ئیش و کارەکانیدا، دەتوانێ پتر لە بەرامبەر ئەوەوە، ئەمیش خزمەتی ئەو زیاتر بکات.

١٠- ئەگەر ویستی یەکێ لە ژنەکان، لەگەڵ خۆی ببات بۆ سەفەر، دەبێ (تیر و پشك)یان بۆ بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە وای دەکرد، هەر ژنێکیش بۆی دەرچوو، نابێ ژنانی تر داوای مانەوەی شەوێ زیاتر لەو بکەن، کاتێ گەڕانەوە، بەڵکو لە سەرەی خۆیدا دیسان دەست پێدەکاتەوە..

١١- ئەگەر ژنێك گوتی: بەمەرجێ شوی پێدەکات، هەوێکەی تەڵاق بدات، دەیشیزانی ئەو قسە ناهەقە، ئەو مەرجە پووچە و کاری پێ ناکرێ، خۆ ئەگەر نەیدەزانی، دەتوانێ (فەسخ)ی بکاتەوە.

## ژنان و تەڵاق

١- هەرکات مێرد وتی: تەڵاقی خێزانەکەم کەوتبێ، دەکەوێت، ئیتر بە ژنەکە بگات و بزانێ، یان نا.. تەنانەتی ئەگەر پاش (٣) حەیز، یان (٣) پاکی بە تەڵاقەکەی زانی، دەاتوانێ شوو بکات و، عیددەی تەواو بووە.

٢- لە دڵدا تەڵاقی ژنەکەی خست، بەڵام نەبە زمان گوتی، نەبە نوسین نوسی، ناکەوێ.

٣- (شیخ إبن عثیمین) دەڵێ: مانەوەی ژن لای مێردێ نوێژ نەکات، دروست نییە، بە تایبەت ئەگەر ئەو ژنە ئاقیدەی وابێت، مرۆڤی نوێژ نەکەر کافر دەبێت.

٤- ژیان بەسەر بردن لەگەڵ مێردی ئارەق خۆردا - بە پێی فەتوای (ئیبن عثیمین) - نە حەرامە و نە قەیدی هەیە، بەڵام دەبێ هەمیشە ئامۆژگاری بکات.. خۆ ئەگەر بزانێ شەو نەخەوتن لەگەڵیا، کاریگەری دەبێ بۆ وازهێنان لێی، دروستە و هەقە بیکات، خۆ ئەگەر بزانێ هیچ کەڵکی نییە، حەلاڵ نییە بۆی (سەرجێیی) لەگەڵ نەکات.

٥- بە یەك وشە (٣) تەڵاقەی ژنەکەی داو پێیگوت: (أنت طالق ثلاثاً)، بە یەك تەڵاق دادەنرێ و تا لە (عیددە)دا بێ، دەتوانێ بیهێنێتەوە بێ مارە کردنەوە، خۆ ئەگەر عیددەی تەواو کردبوو، دەبێ مارەی بکاتەوە.

٦- شایەتگرتن بۆ تەڵاق سوننەتە، واتە: تەڵاقدان بێ شایەت دروستە و دادەمەزرێ.

٧- ئەم شتانە ڕێ بە ژنان دەدەن داوای تەڵاق بکەن:

- مێرد لە نەفەقەدا درێغی بکات.

- مێرد زیانێك بە ژنەکەی بگەیەنێ، نەتوانێ لەگەڵیا بژی، لەوانە: جنێو، لێدان، زۆری لێ بکات بۆ کاری دزێوو و ناشیرین.

- مێرد بە جێی بهێڵێ و خۆ نادیار بکات، ئەمیش ترسی (فیتنە)ی هەبێ.

– مێرد زیندان بكرێ و، ئەمیش توانای خۆ گرتنی نەبێ.

– مێردەكـــەی ببینـــێ عەیبـــدارە، لەوانـــە: نـــەزۆكی، نـــەبونی توانـــای جیمـــاع، جـــۆرە نەخۆشیەكی ناشیرین و پەتا.

٨– تەلاَق لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا، ناپەسەندە و پێشی دەڵێن: (الطلاق البدعي):–

– لە حەیزدا، یان لە زەیسانیدا تەلاَقی بدات.

– یان لە پاكیدا تەلاَقی بدات، بەلاَم سەرجێیی لەگەڵ كردبێ.

– بە یەك وشە سێ تەلاَقەی بدات: (أنت طالق ثلاثا).

– لە یەك مەجلیسدا سێ تەلاَقەی بدات، بە سێ وشە: (أنت طالق، أنت طالق، أنت طالق)، بۆیە هەندێ لە زاناكان دەڵێن تـەلاَق لـەم حاڵەتانـەدا ناكـەوێ، ئەگـەر چـی جەماوەری زانایـان پێیـان وایـە تـەلاَقی (بیـدعی) لەگـەڵ ئـەوەدا حەرامـە، دەكـەوێ و هـەموو ئەحكامـەكانی تـەلاَق تێدا جێی دەبێتەوە.

٩– ژنێك یەك تەلاَق درابوو، سەرجێیشی لەگەڵ كرا بوو (المدخول بها)، پێیـدەڵێن تـەلاَقی رجعیی، چونكە مێرد دەتوانێ لە ماوەی عیددەیدا بیگێرێتەوە لای خۆی، بێ نیكاحی تازە.

١٠– بـۆ (رەجعـەت) كردنـەوە، وەلیـی و مـارەیی و رەزامەنـدیی و ئاگـاداریی ژنەكـە و نیكاحی تازەی ناوێ.

١١– لـە مـاوەی تـەلاَقی رەجعیـدا، ئـەو ژنـە بـە ژنـی تـەلاَق دراو دادەنـرێ، بۆیـە دەتـوانێ تەماشـای بكـات، لـە جێگـای خەڵوەتـدا لەگەڵیـدا كـۆ بێتـەوە، ژنەكـەیش دەتـوانێ خزمـەتی پیاوەكە بكات تا لە عیددەدا بێت، وە نابێ لە ماوەی عیددەدا مەنزڵەكەی بە جێ بهێڵێ.

١٢– ژن و پیاو ناكۆك بوون لە (رەجعەت) دا: پیاوەكە گوتی: رەجعەتم كردویت، ژنەكـەش بە درۆی خستەوە.. لە حاڵەتی ئاوادا گوێ لە ژنەكە دەگیردرێ، مەگەر پیاوەكە بچێت شایەت بێنێ بۆ (رەجعەت) بەر لە تەواو بوونی عیددە.

## خـــــولع

١– هـەركات ژن ناوچـاوی مێردەكـەی حـەز لێ نـەكرد و نەیویـست (لەبـەر ناشـیرینی، یـان لەبەر بێدینیی و رەوشت خراپی، یان لەبەر پیریی و لاوازیـی.. یـان.. یـان..) دەشترسا لەبەر ئەوە نەتوانێ بە شێوەی شـەرعی هـەڵس و كـەوتی لەگـەڵ بكـات، لـەو حاڵەتانـەدا دەتـوانێ بـە مارەییەكەی خۆی، یان بە هەر شتێكی تر خۆی رزگار بكات لێی.

٢- له هەموو کاتدا (له حەیز و له زەیسانیشدا) خولع لەگەڵ ژناندا دەکریٚ و دروسته و، دەشتوانیٚ به یەك (حەیز) عیددە تەواو بکات.

٣- ئەوانـەی لـە کـاتی نەخۆشـیی وسـەرە مەرگـدا، ژنیـان تـەڵاق دەدەن، بـە مەبەسـتی بێبەشـبوونی لـە مـیرات، کـارێکی حـەرام دەکـەن و لەگـەڵ ئەوەیـشدا، هـەر میراتـی لیٚ دەبـەن، ئەگەر چی تەڵاق بیٚ جودابوونـەوەی تـەواویش بێـت (بینونـة کبری)، چونکه نیـەتی خـراپ و ناشەرعی بووه.

٤- کەسێك سوێندی به تەڵاق خوارد، به مەبەستی ڕێگرتن لـه خـۆی لـه کـردن و نـەکردنی کارێك، بۆ نموونـه گـوتی: ئەگـەر جگـەرەم کێشا، یـان لەگـەڵ فلاٚنەکەسـدا قسـەم کـرد، تـەڵاقم بکـەویٚ، یـان گـوتی: ئەگـەر ئـەوکارە نەکـەم تـەڵاقم بکـەویٚ، لـەم حاڵەتانـەدا تـەڵاقی ناکـەوێت، چونکه مەبەسـت ڕێگـرتن و هـەڵنانی خـۆی بـووە بـۆ کـردن و نـەکردنی کارەکـە، نـەك خسـتنی تەڵاقەکە.

**تێبینـی**: زۆرێـك لـە ئـەهلی زانسـت ئـەم جـۆرە تەڵاقانـە دەخـەن، ئەگـەر چـی مەبەسـتیش ڕێگرتن و هەڵنانی خۆی بێت لەو کـارە، نـەك تـەڵاق، کـەوابوو هەقـه مرۆڤـی ئیمانـدار، هـەرگیز ئەو وشەو ڕستانه بەکار نەهێنیٚ.

٥- بیٚ هۆکـاری شـەرعیی، داوای تـەڵاق حەرامـه و دروسـت نییـه، چـونکه پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێت: ((أیمـا إمـراة سـألت زوجهـا الطـلاق مـن غـیر بـأس، فحـرام علیهـا رائحـة الجنـة)) أبوداود والترمذي.

٦- بۆیـه تـەڵاق بەدەسـتی پیاوانەوەیـه، چـونکه پیـاو زیـاتر دەتـوانیٚ لـه کـاتی هـەراو کێشەکاندا، خۆی کۆنترۆڵ بکات، لەولایـشەوه نەفەقـه لەسـەر ئـەوە.. کـەوابوو هەقیـشه تـەڵاق بەدەستی ئەو بێت.

٧- ئەگەر دایك داوای له کوڕەکەی کرد کەژنەکەی تەڵاق بدات... جائەگەر ژنەکـه صـاڵح و دیندار بوو و ئازارو بێزاری دایکەکەی نەدەکرد، حەق نییه وەڵام بدرێتەوە، خۆئەگەر ناصاڵح بوو ئازاری دایکەکەیشی دەکرد، حەقه بەگوێی بکات.

٨- ئەگەر ژنێك تەڵاق درا، دەبێت لـەو ماڵـه دەرنەچێت تـا عیـددەی تـەواو دەبێـت، ئـەگینا کارێکی حەرام دەکات، پیاوەکـەیش نابێـت دەری بکـات تالـه عیـددە دایـە، ئەوسـا ئەگـەر یـەك نەکەوتنەوە دەچێتەدەر، دیارە ئەمـه لەکاتێکدایـه ڕێـی گێڕانـەوەو ڕەجعـەتی ببیٚ، بـەنیکاحی تازە یان هەر بەڕەجعەت.

٩- لەبناغـەدا تـەڵاق دراوەتـە دەسـتی پیـاوان، ئینجـا ئەگـەر ژنەکـەی کـردە وەکیـل بـۆ تەڵاقدانی خـۆی، ئـەویش خـۆی تەڵاقـدا، تەڵاقەکە دەکـەوێت.. بـەڵام ئەگـەر لـە (عەقد)ـەکەدا مێرد گوتی: هەر کات ویستت خۆت تەڵاق بدە، ئەم مەرجە پووچە و کاری پێناکریٚ،چونکە پێچەوانەی حیکمەتی نیکاحە کە بۆ هەتا هەتایی و دامەزراندنی یەك جارەکییە.

١٠- ئـەو ژنـەی نوێـژ ناکـات، دەبـیٚ ئامۆژگـاری بکرێـت، جـا ئەگـەر نـەی بیـست، دەبێـت تەڵاقی بدات، وەکو لیژنەی فەتوای سعوودیە دەڵێت.

١١- هەر ژنێك تەڵاقدرا، دەبیٚ (عیددە) تەواو بکات، ئەوکات دەتوانێت - ئەگـەر بیـەویٚ - مێرد بکاتەوە.

١٢- ژنێـك بەمـەرجی گـرت: ئەگـەر شـووی پێکـرد، دەبێـت هەوێکـەی تـەڵاق بـدات ! نـابیٚ مێرد بەقسەی بکات، چونکە ئـەو مەرجـە (فاسـید)ەو دروسـت نییـە هـیچ ژنێـك جـیٚ بـەوی تـر چـۆڵ بکـات، بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمویٚ: ((لا تـسأل المـرأة طـلاق أختهـا لتكفـىء مـا فـي إنائها)) رواه البخاري.

## ژنان و عیددە ئەژماردن

١- عیـددە ئەوماوەیـە کـەدەبیٚ ژنـان پـاش مردنـی مێردیـان، یـان تەڵاقـدانیان، چاوەڕوانی تەواوبوونی بکەن، ئەوسا دەتوانن - ئەگەر بیانەوێت - مێرد بکەنەوە.

٢- عیددە بۆئەوە دانراوە کە:

- بزانریٚ ئەو ژنە دووگیان نییە.
- مۆڵەتێکە بۆ ژن و پیاو، بەڵکو لەو ماوەیەدا بیریٚ بکەنەوە بۆیەکگرتنەوە.
- ڕێزوحورمەتێکە بۆ ئەو ماوەیە کە ژن و پیاو پێکەوەوە ژیاون تێیدا.

٣- ژنێك تێکەڵی لەگەڵ نەکرابیٚ (غير مدخول بها)، هەرکات تەڵاقدرا، عیددەی لەسەر نییە.

٤- ژنـی سـەرجێیی لەگـەڵ نـەکراو، هـەر کـات مێـردی مـرد، دەبـیٚ (چـوارمانگ و دەشـەو دانیشێت).

٥- ژنانی خاوەن عیددە شەش جۆرن:

- دوو گیان.. هەرکە تەڵاقدرا، یان مێردی مرد، دەبیٚ سکەکەی دابنێت.
- مێردی مردوو دووگیان نەبوو، دەبیٚ چوارمانگ و دەشەو دابنیشیٚ.
- ژنی حەیزدار.. هەرکات تەڵاقدرا، یان فەسخی نیکاح کرایەوە، دەبێت (٣) پاکی دابنیشیٚ.

– ئـەر خـاوەن حـەیز نـەبوو – لەبـەر بـچووکیی، یـان تەمـەن زۆریـی – دەبـیٚ (٣) مـانگ دانیشیٚ. ژنی موستەحازەیش هەر وایە.

– ژنێك بیٚ هۆكار حەیزی نەماوە، دەبیٚ یەك سالٚ دانیشیٚ، ئیمامی شافیعی (خوا لێی رازی بێت) دەڵیٚ: پێشەوا (عومەر) –خودا پلەی بەرزبكاتەوە لە قیامەتدا – بەم جۆرە بڕیاری دەدا بۆ ژنانی (ئەنصار و موهاجرین) و كەسێكیش نكوولٚی نەدەكرد.

– ژنیٚ مێردی بیٚ سەروشوێن بێت (مفقود)، دەبیٚ چوار مانگ ودەشەو چاوەڕوان بێت، پاش تەواوكردنی ماوەی چاوەڕوانی كە چوار ساڵە.

## نەفەقەی ژنی عیددە دار

٦– ژنـی تەلاٚقـدراوی ڕەجعیـی – دووگیـان بێـت، یانـا، هـەقی مەسـكەن و نەفەقـە و جـل و بەرگی هەیە، چونكە بەژنی مێرد دادەنریٚ.

٧– ژنێـك بەیـەكجارەكی تەلاٚقیكـەوت (بینونـة كـبری) و دووگیـانیش بـوو، دەبێـت تـا سـكەكەی دادەنێـت نەفەقـەی بـدرێتیٚ، خـۆ ئەگـەر دووگیـان نـەبوو، نـە نەفەقـەی دەویٚ و، نـە مەسكەن.

٨– ژنی دووگیانی ئەشقیی (ناشز) یش، نەفەقەی دەكەویٚ لەبەر حەملەكەی.

٩– ژنـی مێـرد مـردووی دووگیـان، لـە بەشـە میراتـی سـكەكەی، نەفەقـەو مەسـكەن و جـل وبەرگی دەدرێتیٚ.. خۆ ئەگەر دووگیان نەبوو، نە نەفەقەی دەكەویٚ، نە مەسكەن.

## ژنـان و منداڵ

١– سـەردەمی جاهیلیـەت، زۆر بەكـەم و چـاوی سـووك سـەیری كـچانیان دەكـرد ! بۆیـە كردەوەی وا دەبێتە مایـەی تـوڕەیی خـودای گـەورە، خـۆ گـەڵیٚ جاریش، كچان زۆر باشـترن لـە كوڕان.

٢– منداڵ شەفاعەت و تكا دەكات بۆ باوك و دایكی.

٣– كارو كـردەوەی منـالاٚن بۆخۆیـان دەبـیٚ، بـەلاٚم پاداشـی بـاوك و دایكیـشیان دەدرێتـەوە لەبەرامبەر فێركردن و ڕێنماییكردنیان بۆ كاروكردەوەی چاك.

٤– جـەژن و ئاهــەنگ گێـڕان بەبۆنــەی لـەدایكبوونی منداڵــەوە، دروســت نییــەو، نـابیٚ

ئامادەیشی ببین و پیرۆز باییشیان لێ بکەین.

٥- هـەڵگرتنی وێنـەی منـداڵان، ئەگـەر چـی هـەڵیش نەواسـرێن بـەدیواردا دروسـت نییـە، مەگەر پێویست بێت بۆ پاساپۆرت و ناسنامە و... هتد.

٦- نوشتەکردن بەشانی منداڵاندا، بە مەبەستی پاراستنی لەچاو، یان لـەجنیی، یـان لـە نەخۆشی دروست نییە.

٧- ناونانی منداڵ، چ لە ڕۆژی لەدایکبوونی، چ لەڕۆژی حەوتەمدا دروستە.

٨- هـەر ناوێك بەندایـەتی بۆ غـەیری خـودا بگەیـەنێ، وەکـو (عبـدالنبی – عبدالرسـول..) حەرامە و دروست نییە.

٩- ئاهـەنگ گێـڕان بـۆ منـداڵ ناونـان، سـوننەت نییـە، چـونکە پێغەمبـەر ﷺ و هـاوەڵان، کاری وایان نەکردووە.

١٠- نـاو گـۆڕین لەبـەر ناوچاوو (طـالع) دروسـت نییـە، چـونکە کـاری (کەهانـە) و نوقلانـە دەرەکانە، بەڵام لەبەر ناشرینی دروستە.

١١- ناو نان بـەناوی خـوداوە، وەکـو (کـریم، عزیـز...) بـێ (ئـەلیف ولام) ((أل)) قـەیناکات، بەڵام (العزیز، الکریم) تەنها ناوی خودایە و دروست نییە.

١٢- ناونان بە (ئایەت) وەکو (ئالاء، أفنان..) قەیدی نیە، هەروەها (هدی، ڕەحمـە، صـالح، سعید.).

١٣- باشـــترین نـــاو، ئـــەو ناوانـــەن بـــە بەندایـــەتی خـــودا بگەیـــەنن، وەکـــو: (عبـــدالله، عبدالرحمن..).

١٤- منداڵی نێرینە، سوننەتە ڕۆژی ناونانی (ڕۆژی حەوتەمی) سـەری بتاشـرێ، بـەڵام بـۆ کچان سوننەت نییە.

١٥- حەوتـــەم کـــردن (عقیقـــە) بۆمنـــداڵ لـــە ڕۆژی حەوتـــەمی لەدایکبوونیـــدا ســـوننەتە، بۆنێرینـە دوومـەڕ سـەربڕدرێ و بۆمێیینـە مـەڕێك، کەسـێکیش دەسـەڵاتی نـەبێت، لـەکۆڵی دەکەوێ.

١٦- ســـوننەتە ســـێیەکی بخـــۆن و ســـێیەکی بنێـــرن بـــۆ دیـــاریی و دۆســـت و ناســـراو، سێیەکەکەی تری بکرێتە صەدەقە

١٧- هەر منداڵێك پاش چوار مانگ لەبار بچێت، قسەی ڕاست ئەوەیە وەکو منداڵی تـەواو مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ، واتە: حەوتەمی بۆدەکرێ، دەشۆردرێ، کفن دەکرێ، نوێـژی لەسـەر دەکرێ ودەخرێتـە گۆڕستانی موسڵمانان و نـاویش دەنـرێ، بـەڵام ئەگـەر بـەر لـەوەی گیـانی

بەبەردا بکرێت لەبار چوو، هیچ شتێك لەوانەی بۆ ناکرێت.

١٨- دەتوانێ خزم و دۆستی خۆی بۆ بانگ بکات، یان هەمووی ببەخشێتەوە بەسەر دۆست و خزماندا.

١٩- بەدەست دان لە (عەورەت)ی منداڵەوە، دەستنوێژ دەشکێ.

٢٠- ئاهەنگی خەتەنە بیدعەیە و نابێت بکرێت.

٢١- منداڵ بردن بۆ مزگەوت (لەلایەن ژنانەوە، یان لەلایەن پیاوانەوە)، ئەگەر گەیشتبوونە (٧ ساڵ)، دەتوانن بیان بەن بۆ ئەوەی پەروەردە بکرێن، بەڵام کەمتر لە (٧ ساڵ)، حەق نیە ببرێن بۆ مزگەوت، مەگەر بزانرێت نابنە عەزیەت بۆ مزگەوت و نوێژ خوێنەکان و، سەرەڕای ئەوەیش بردنیان پێویست بێت، وەکو ئەوە بەتەنها جێنەمێنن.

٢٢- سوننەتە منداڵانیش لە پشت سەر ئیمامەوە بۆنوێژەکان بووەستن، خۆ ئەگەر یەك منداڵ بوو، لەلای ڕاستیەوە بووەستێ.

٢٣- نابێ ئاڵ و وێڵ لەماڵی هەتیودا بکرێ، مەگەر بە مەبەستی زیادکردن و بازرگانیی و هەر بەرژەوەندییەکی تری ئەودا بێت.

٢٤- ئەگەر منداڵ حەجی پێبکرێ، پاداشتی هەیە، بەڵام حەجی فەرزی لەکۆڵ ناخات.

٢٥- ئیحرام و نییەتی ئەو منداڵە لەسەر (وەلیی) و سەرپەرستیاریەتی.

٢٦- پێویستە بە (عەدالەت) لەنێوان منداڵاندا ڕەفتار بکرێ، بەتایبەتی لە بەخششدا، نابێ بە هەندێ بدرێ و، هەندێ بێبەش بکرێ.

٢٧- نابێ دایکان شتێ بدەن بە هەندێ منداڵ و، هەندێکیان بێبەش بکەن، مەگەر باڵغبن و ڕازیی بن، یان یەکێکیان هیچ شتێکی نەبوو پێی بژی.

٢٨- نەفرین کردن لەمنداڵان، گوناحی گەورەیە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لعن المؤمن كقتله)) متفق عليه. هەروەها دروست نییە نەفرینکردن لە کەسێکی تایبەت، ئەگەرچی ئاژەڵ بێت.

٢٩- دوعای شەڕکردن لەمنداڵان دروست نییە، چونکە وادەبێ هاوکات دەبێ لەگەڵ ئەوکاتانەدا دوعایان تێدا گیرادەبێ، دایك دەبێ صەبرو ئارامی بێ، بەرامبەر بەمنداڵان، تائەوەی دوعای شەڕبکات، ئامۆژگارییان بکات، لێیان بدات.

٣٠- هەدیەو دیاریی بردن بۆمنداڵێك لەدایك دەبێ، یان بۆ دایکەکەی، ئەگەر کرابێ بەعادەت و باوی ناوچەکە قەیدی نییە.

٣١- ڕاگرتنی هەندێ باڵندە و پەلەوەر لە ماڵەوە بۆ ئولفەتی منداڵان قەیدی نییە، بە

مەرجیٚ دان و ئاوی بدریٚتیٚ و جیٚگەی حەوانەوەی باش بیٚت.

٣٢- ئەو شتانەی منداڵان یارییان پیٚدەكەن، ئەگەر ویٚنەی كامل وتەواونەبن، بۆ نموونە: چاوو لووت و دەمیان نەبیٚ، دروستە وەكو ئەو یاریانەی خاتوو (عایشە) بەمنداڵی یاری پیٚدەكردن، ئەگینە بەكار نەهیٚنریٚن باشترە لە بەكارهیٚنانیان.

٣٣- كونكردن لەگویٚ و لووتی كچۆڵە، بۆگوارەو لووتەوانە، هیچ قەیدیٚكی نییە.

٣٤- گۆرانی منداڵان.. ئەگەر لەگەڵ ئەو جۆرە مۆسیقا هەست بزویٚنەرانە بوو - ئیتر دینی بیٚت، یان نیشتمانی - دروست نییە.

٣٥- دروست نییە نەبۆ گەورە، نە بۆمنداڵ لە بەركردنی هەرجل و بەرگیٚك ڕەسم و ویٚنەی پیٚوە بیٚت، وە دروست نییە ڕاگرتنی ویٚنە بۆیادگاریی، یان بۆهەرشتیٚكی دی، مەگەر حاڵەتیٚكی زەروورەت و پیٚویست داوا بكات، وەكو پسووڵە و پاساپۆرت و..تاد.

٣٦- هەق نییە دایك و باوك ریٚ بە منداڵ بدات ئەگەر چی بچوكیش بیٚت، جل و بەرگی كورتی لەبەر بكریٚ، چونكە بۆدوایی خووی پیٚوە دەگریٚ وە بەئاسانی وازی لیٚ ناهیٚنیٚ.

٣٧- كچۆڵەی نابالغ دەتوانی بیٚ سەرپۆش نویٚژ بكات و قەبوڵیش بیٚ، چونكە نویٚژی كچی باڵغ بیٚ سەرپۆش قەبوڵ نابیٚت، پیٚغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ:((لایقبل الله صلاة حائض الا بخمار)) رواه ابوداود والترمزی. بەلاٚم باش وایە بەسەرپۆشەوە بیكات.

٣٨- ئەو كیژانە زوو گەشە دەكەن بەر لەباڵغ بوون، دەبنە جیٚگەی سەرنج و ڕوانین، هەقە حیجاب بكەن و خۆ داپۆشن، لەبەر فیتنەو ڕووداوی كاری خراپ و ناپەسەند.

٣٩- تیٚكەڵبوونی كچ و كوڕ لە قوتابخانەكاندا - بە تایبەتی- بەهیچ شیٚوەیەك دروست نییە، هەقە باوك و دایك و دەسەلاٚتداران كاری وا قەبوڵ نەكەن... ئەوەتە پیٚغەمبەرمان موحەممەد ﷺ فەرمان دەدا بەجیاكردنەوەیان، تەنانەتی لە شویٚن و جیٚگای خەویشدا.

٤٠- هەڵسانەوەی قوتابی لەبەر مامۆستا لە قوتابخانەكاندا پیٚویست ناكات، چونكە بەتوندی بەرچاو خراوە و (مەكروهە).

٤١- ڕەسم و ویٚنەی ئەوشتانەی گیانلەبەرن، بەهیچ شیٚوەیەك دروست نییە، ئەگەر چی بۆفیٚركردنیش بیٚت، بەلاٚم سەیارە و دارو دەرخت و دیوارو...تاد، قەیناكات.

٤٢- چەپڵە لیٚدان بۆمنداڵ، یان خۆی لیٚیبدات، كاریٚكی ناپەسەندەو لە شەریعەتدا بە (الكراهة الشديدة) لیٚكیان داوەتەوە.

٤٣- (شیٚخ بن باز) دەڵیٚ: باوك دەتوانیٚ بەخشش بدات بەوكوڕەی گویٚڕایەڵیەتی و، نابیٚتە ناهەقی بەرامبەر بەمنداڵەكانی تر.

٤٤- دەبێ ڕشانەوەی منداڵ بشۆردرێ، ئەوسا نوێژ بکرێ... واتە: ئەگەر منداڵ رشایەوە بەجل وبەرگی دایکیا دەبێ بشۆرێ، ئینجا نوێژەکانی بکات.

٤٥- بە لەشگرانی شیردان بەمنداڵ قەیناکات، تەنانەتی نایەوێ لەبەرئەوە بچێت خۆی بشۆرێ، یان دەست نوێژ بگرێت.

٤٦- ئەگەر منداڵان بە بەردەم نوێژدا بچن، نوێژەکە نابڕن و قەیدی نییە.

## ژنان وشیردان

١- منداڵێك مەمکەی ژنێکی گرت و مژیی، پاشان بەریدا بۆهەناسەدان، یان بێتاقەت بوو، یان لەم مەمکەوە گواستیەوە بۆئەوی تریان، یان تێربوو، هەموو ئەمانە بەیەك کەڕەت دادەنرێت، ئەگەر دووبارەی کردەوە دەبێتە دووکەڕەت، ئەگەر لە یەك مەجلیسیشدا بێ.

٢- شیر بە شایەتی تەنها ژنێکی صالّح و دیندار و ناوبانگ بەراستگۆ، ئیتر شیر دەرەکە بێ، یان ژنێکی تربێت، وەردەگیرێ و ئیسپات دەبێ.

٣- شیر بەم دوو مەرجە کاریگەری دەبێ:

- دەبێ لە پێنج جار کەمتر نەبێت، هەرپێنج جارەکەیش منداڵەکە تێر ببێ.
- تەمەنی منداڵەکە دووساڵ زیاتر نەبێ.

٤- هەرکەسێك کەوتە گومانەوە: ئاخۆ پێنج جار شیری خواردووە یانە ؟ شایەتیشی نەبوو، بەوە حەرام نابێت.

٥- ژن شیر بەهەرمنداڵێك بدات، لەم شتانەی خوارەوەدا دەبێتە دایکیی ئەو منداڵە:

- ناتوانێ مارەی بکات،
- دەتوانێ بەئارەزووی تەماشای بکات.
- لە خەڵوەتدا دەتوانن پێکەوە دانیشن.
- دەبێتە مەحرەمیی.

٦- ئەگەر لەڕێی (ترومپاوە) شیر بەمنداڵ درا، یان کرایە ناو پەرداخێکەوە وپێیدرا، هەروەکو ئەوە وایە خۆی لە مەمکەکە خواردبێتی.

## چەند پرسیارو وەڵامێکی جیاجیا لە بارەی ژنانەوە:

١- دەنگی ژنان (عەورەت) نیە، واتـە: بیستنی حەرام نیـە، مەگـەر دەنگیـان نـەرم و ناسك بکەنەوە وببێتە ناز و نووز، ئەو کاتە حەرام دەبێت بیستنی بۆخەڵکانی نامەحرەم.

٢- نـابێ ژن لەگـەڵ ژنـدا لـە ژێـر پێخەفێکـدا ڕاکـشێن، چـونکە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: ((وفرقوا بينهما في المضاجع)).

٣- هـەر ڕۆژنامـەو گۆڤارێـك وێنـەو رەسمـی رووتـی ئـارەزوو بزوێنـی پێوەبێـت، کـڕین و فرۆشتنی حەرامـە، دەبـێ ژنـانی ئیمانـدار لـەوجۆرە شـتانە خـۆ دوور بگـرن و لەماڵـەوە ڕایـان نەگرن.

٤- ژنـان نـابێ بەتـەنها لەگـەڵ شـۆفێرێکدا سـواربن، چـونکە کۆبوونـەوەو خـەڵوەت لەگـەڵ پیاوی نامەحرەمدا حەرامە.. بۆیـە ئەگـەر سـواری سـەیارە بـوو، پێویـستە ژنێکـی تـری لەگـەڵ بێت، یـان کەسـێکی تـری تێـدابێت، خـۆ ئەگـەر منـداڵێکی تیـا بـوو، شـەرمی لێ نـەدەکرا، نـابێ سواربێ.

٥- سەلامکردن لەژنێکی باڵاپۆش، بێ تەوقە و پێکەنێن و خەندە، دروستە.

٦- ژنان دەتوانن لە دەرەوەی ماڵ بەم مەرجانە کاربکەن:

- دەورو بەرەکەیان ژنان بن.
- ژن و پیاو تێکەڵ نەبن.
- لەگەڵ پیاوی نامەحرەمدا خەڵوەت نەکات.
- مێردەکەی ئیزن و مۆڵەتی بدات.
- بە جل و بەرگی شەرعییەوە بێت.

٧- ڕاگرتنی کارەکەر بۆماڵەوە، دەبێ ئەم مەرجانە ڕەچاو بکرێن:

- پێویستە کارە کەرەکە موسڵمان و شەرع ڕەوبێت و لە تەواوی نێرینـەی ئـەو ماڵـە خـۆی داپۆشێت.
- نابێ رووت و سافیرە بێت.
- نابێ لەگەڵ هیچ کەسێکدا (خەڵوەت)بکات.
- دەبێ مەحرەمی لەگەڵ بێت.

٨- نابێ ژنان بەفڕۆکە و شتی وا - ئەگەر چی ئەمینیش بێت - بەبێ مەحرەم سەفەر بکەن.

٩- نابێ تەوقە لەگەڵ ژناندا بکرێت، ئەگەر چی دەستکێشی لەدەستدا بێت.

١٠- باش وایـە ژنـان لـە تەلەفزیۆنیـشدا سـەیری پیـاو نەکـەن و پیـاوانیش سـەیری ئـەوان

نەکەن، چونکە گەڵێ جار فیتنەی لێ پەیدا دەبێ.

١١- ئاهەنگگێڕان بەناوی جەژنی (دایك)ـەوە بیدعەیە و دروست نییە.

١٢- ئەو شتانە هەدیە دەکرێن بۆمردوو:

- صەدەقە و خێرو خێرات بۆی.
- دوعاو پاڕانەوە بۆی.
- بژاردنەوەی قەرزی.
- حەج و عەمرە کردن بۆی.

١٣- ئەو شتانەیش هەدیە ناکرێن بۆمردوو:

- نوێژ کردنەوە بۆی.
- تەوافی ماڵی خودا.
- قورئان و خوێندن بۆی، ئەگەر چی هەندێ زانا ڕێی پێدەدەن، بەلاّم هەقە نەخوێندرێ بۆی.

١٤- نووسینی (بسم اللە...) لەسەر پسووڵە و شتی وا دروستە، بەلاّم دەبێ بپارێزرێ وفرێ نەدرێتە جێگای خراپ و پیسەوە.

١٥- ئەو رۆژنامەو گۆڤارانە، ناوی خودایان تێدایە، نابێ بکرێنە سوفرە و شتی وا، خۆ ئەگەر دەبێ چی ئایە ت و ناوی خودای پێوەیە لێ بکرێتەوە.

١٦- ئەو کتێب و رۆژنامەو نامیلکانە ناوی خودا و ئایەت و فەرموودەیان تێدایە، نابێ بخرێنە کیسێکەوە و دوور لەماڵ هەڵبگیردرێن.

١٧- گێڕانەوەی قسەی نەستەق و هەڵبەستنی قسە بۆپێکەنین، حەرامە و دروست نییە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ویل للذی یحدث فیکذب لیضحك بە القوم)) أبوداود.

١٨- موجامەلەو رووی خۆش.. ئەگەر نکووڵی هەق و ڕاستی تێدا نەبێ، هیچ قەیدی نییە، خۆئەکەر هەق و راستییەکان کران بەژێرەوە، ئەوە ناڕەواو نادروستە.

١٩- خۆپاراستن لە جنیی و لە خراپەیان:

- زیکری خودا زۆر بکرێت.
- زیکرەکانی ئێواران و بەیانیان و پێش خەو بخوێنرێن.
- دورکەوتنەوە لەگوناح و، بەجهێنانی واجبات.

٢٠- (تأمین / بیمە)ی سەیارە و تەندروستیی و، ژیان و ماڵ و خانووبەرە...تاد، دروست نییە، چونکە چەواشە و دەست برینی تێدایە، وا دەبێ موسڵمانێك پارەیەکی کەم دەدات و، پارەیەکی زۆر وەردەگرێتەوە، یان هەرهیچ وەرناگرێتەوە، گەڵێ جار کۆمپانیاکەش تووشی

زیانی گەورە دەبیٚ.

٢١- (تخیط)ی حەیوان و پەلەوەرو مرۆڤ دروست نییە، چونکە ماڵێکی زۆری تیا خەرج دەکریٚ و وێنەکەشی وەکو هەڵواسراوی لیٚ دیٚت. (شێخ بن باز).

٢٢- (شێخ بن باز) دەڵیٚ: خۆیندنی سوورەتی (یس) لەلای کەسێکدا لەسەرە مەرگدا بێت، فەرموودەکەی لاوازە.

٢٣- بانکە سوودارەکان.. سوو گەورەترین گوناحە و خودا نەفرینی کردووە لە بخۆریی، لە نووسەریی، لە شایەتەکانیی.

٢٤- بانق هەر قازانجێکی پێدایت، مەیگێڕەوە و مەیشیخۆ، بەڵکو بیکە بەخێرو صەدەقە بەهەژارو نەدارەکان.

٢٥- (شێخ بن باز) دەڵیٚ: دانانی پارەو عوملە - ئەگەر چی بەئەمانەت و بیٚ فائیزیش بێت - لە بانقەکاندا دروست نییە.

٢٦- پارە ڕاکێشان لە بانقەکاندا بەفائیز، ئەگەرچی بۆکارێکی شەریف وپەسەندیش بێت، وەکو خانوو و چارەسەری نەخۆشیی و زەواج و، قەرز دانەوە، دروست نییە.

٢٧- سوننەتە لای نەخۆش بڵێیت: ((لابأس طهور إن شاءالله)).

٢٨- بردنی گوڵ بۆ نەخۆش دروست نییە، چونکە سەرف ماڵە بە بێهوودە و، چاولێگەری دوژمنانی خودایشە.

٢٩- ژن هەرکە لەماڵ دەرچوو دەبیٚ:

- حیجابی کامڵ و تەواوی هەبیٚ.
- تێکەڵیی پیاوان نەکات.
- ئادابی شەرعی ڕەچاو بکات.
- مێرد رازیی بێت.

٣٠- چوونیان بۆ بازاڕ، مەحرەم پێویست ناکات لەگەڵ ژناندا بیٚ، مەگەر کاتیٚ ترسی فیتنە ببیٚ، چونکە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ژنان بەبیٚ مەحرەم دەچووونە بازاڕ.

٣١- دەنگ وەرگرتن لەهیچ موسڵمانێك - بەبیٚ هۆکاری شەرعی - دروست نییە، ئەگەرچی لەسەر داوای باوك و دایکیش بێت.

٣٢- دوعا کردن لەناو کاغەزدا - تەنانەتی لەنوێژیشدا - قەیدی نییە، بەلاّم ئەگەر لەبەر دوعا بکرێت باشترە، بۆ ئەوەی دڵ سەرقاڵ نەکریٚ بەشتێکی ترەوە.

٣٣- کەسێك تەوبەی کردو پاشان گەڕایەوە سەر بارودۆخی پێشووی، تەوبەی یەکەمی

ڕەوایەو، ئەگەر ئەمجارەیش، یان چەندجار تەوبە بکات دەتوانیٚ و دەرگای ڕەحمەتی خودا والأیە.

٣٤- دەستگرتنەوەو (فنجان)و خوێندنەوەی بورجەکان.. هەموو ئەمانە (کەهانە)و نوقلأنە لێدانەو، لەئیسلامدا حەرام و قەدەغەیە، وە بە بەشێك لە جادوو و سیحر دادەنریٚ و داوای (غەیب)زانینەو چەواشەکردنی مەردمە.

٣٥- سەبارەت بە ڕۆژوو لەمانگی (ڕەجەب)دا، فەرموودەیەکی تایبەت بەفەزڵی ڕۆژوو تێیدا سابت نەبووە.

٣٦- گاڵتەکردن بە ژنانی ئیماندارى (محجبـة)، لەبەر دینداریی و خۆبەستنەوە بەشەریعەتی ئیسلامەوە، کوفرە.

٣٧- کەلوو(بورج)ەکان.. ئەو جێگایانەن (خۆر)پیایاندا تێدەپەڕیٚ، ئەمەش ناوی هێندێکیانن: (بەرخ، گا، جەوزا..) خودا نەبیٚ هیچ کەسێك نازانیٚ چی ڕوودەدات تیایاندا.. هەرکەسێك بڵیٚ - بۆنمونە - لەبورجی گادا خۆشییەك، یان ناخۆشییەك ڕوودەدا، بیٚ شك دەستێوەردانی (غەیب)ە، خۆئەوەیش کاری خودایە و جگە لە خۆی کەس نایزانیٚ.

٣٨- گرەوکردن (مراهنـة): دووکەس بەیەکتر دەڵێن:ئەگەر قسەکەی من بوو، دەبیٚ ئەوەندەم بدەیتیٚ،خۆ ئەگەر قسەی تۆ بوو، من ئەوەندەت دەدەمیٚ.. ئەمە بەر قومار دەکەویٚ و حەرامە. (شێخ بن باز).

٣٩- باوك و دایك پاش مردنیان هەقە لەبەر ئەوان ئەم شتانە بکرێن:

- دوعایان بۆبکریٚ.
- داوای لێبوردنیان بۆبکرێت.
- جێبەجێکردنی وەسیەتنامەکەیان.
- ڕێزگرتن لەهاوڕێیانیان.
- سەردان لە خزمانیان.

٤٠- کەسێك کردو کەسابەتی حەرام بێت، دەبیٚ هەوڵ بدرێت نانی نەخوریٚ، خۆ ئەگەر نەدەکرا، دەبیٚ بەپێی پێویست بخوریٚ، چونکە ئەو جۆرە کەسانە گومان هەیە لەحەلألیەتی خواردنی نانیاندا.

٤١- خواردنی نانی ئەوکەسانە سوو کارو سووخۆرن حەرامە، ئەگەر دەعوەتی کردی بۆ نانخواردن، نابیٚ وەلأمی بدەیتەوە، بەلأم ئەو کەسانە ماڵیان تێکەڵە لەحەلأڵ و لەحەرام، نانخواردنیان قەیدی نییە.

٤٢- لەملکردنی ئەو گەردن بەندو (ملوانکە)یە ناوی خودای لێنووسرابیٚ، قەیناکات،

ئەگەرچی لەمل نەکردنی باشترە، بەڵام دەبێ بەشەودا داینێ و پێوەی نەچێتە هەندی جێگا شیاو نەبێت بۆئەو ناوە پیرۆزە.

٤٣– ئەو گۆشتانەی لەدەرەوەی وڵات دەهێنرێن، سێ حاڵەتیان هەیە:

– دەزانرێ کە بەشێوەی شەرعیی سەربڕاوە، ئەمە حەڵاڵەو دەخورێ.

– دەزانرێ بەشێوەی ناشەرعیی سەربڕاوە، ئەمەیان ناخورێ.

– دوو دڵین: ئاخۆ بە شەرعیی سەربڕاوە، یانە ؟ ئەمەیشیان هەر دەخورێ و حەڵاڵە، چونکە پێویست ناکات ئەوەندە لەسەری بچین: ئاخۆ چۆن سەربڕابێ، ئاخۆ (بسم اللە) لەسەر کرابێ یانە ؟

٤٤– قسەکردنی کچان و کوڕان، یان بڵێین: پیاوان و ژنانی نامەحرەم لە تەلەفوندا، بەمەبەستی ئەوێنبازیی خۆشەویستی، نارەواو ناشەرعییە، دەبێ هەردوولا خۆیان لەو جۆرە ئاخاوتنە بپارێزن، خۆ ئەگەر زەروورو پێویست بوو، قەیدی نییە، بەمەرجێ بەپێی پێویست بێت.

٤٥– بەکارهێنانی وشەی (ئالوو) لە تەلەفوندا، وشەیەکی (فەرەنسییە) هەقە موسڵمانان وشەیەك بۆخۆیان بەکاربهێنن، هی خۆیان بێت.

٤٦– ئەگەر مرۆڤ (ژن و پیاو) شتێکی دیت، پێی خۆشحاڵ، یان پێی سەرسامبوو، وەیان حەزی لێنەدەکرد، هەقە – لەباتی چەپڵە – (سبحان اللە، اللە اکبر) بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەرکات شتێکی دیتبا پێی خۆشحاڵ بووبا، یان پێی خۆش نەبووبا ((سبحان اللە)) یان ((اللە اکبر))ی دەکرد. اللجنة الدائمة.

٤٧– وێنەی هەرشتێکی گیاندار (مرۆڤ، ئاژەڵ) حەرامە، بەڵام وێنەی ئەو شتانەی بێ گیانن ڕەوایە.

٤٨– بەیەکگەیشتنی ژن و پیاو لە (ئاسانسوار) دا، خەڵوەتە، واتە: نابێ پێکەوەو دوو بەدوو بچنە ناویەوە.

٤٩– وێنە فۆتۆگرافیەکان.. قسەی ڕاست ئەوەیە، وەکو وێنەکانی ترەو حەرامە، چونکە ئەو بەڵگانەی وێنەی گیاندار حەرام دەکات، گشتیی یە، واتە: فۆتۆگرافی بێت، بەدەست بێت،پەیکەر بێت یان نا.

٥٠– هەرکەسێك چاوی پیس کاری تێکرد، ئەم حاڵەتانەی بۆبەکار دەهێنرێت:

– سوورەتی (فەلەق) و (الناس) و (آیة الکرسی) و سوورەتی (الکافرون) و (الفاتحە) و ئایەتی کۆتایی سوورەتی (بەقەرە)ی بەسەرا بخوێنرێ.

٥١– چاودەر دەستنوێژ بگرێ و ئاوەکەی بکرێ بەسەر چاو دراوەکەدا.

٥٢- خێرو خێرات کردن بۆ خەڵکانی ناموسڵمان دروستە، بەمەرجێ شەڕفرۆش نەبن لەگەڵ موسڵماناندا.

٥٣- هەڵوەشانەوەی جادوو بەجادوو:

- ئەگەر بە قورئان و ئەو دوعایانە بێت حەڵاڵن، ئەوە ڕەوایە و دروستە.

- ئەگەر ئەمیش بەجادوو هەڵیوەشاندەوە حەرامە.

٥٤- ئاخۆ سیحر حەقیقەتێکی هەبێ ؟ (شێخ بن باز) دەڵێ: بەڵێ هەقیقەتی هەیە، وە (شەیاتین) دەپرستن و گوێڕایەڵی ئەوانن، شەیاتینیش خودا توانای داونەتێ کە هەندێ کاری سەرسوڕهێنەر ئەنجام بدەن.

٥٥- دڵ ناڕەحەتیی و (قەلەق)ـی نەفسیی بە نووشتە کردنە مل و هەڵواسینی بەقۆڵ و باڵیەوە چارەسەر ناکرێ، بەڵکو بە:

- قورئان خوێندن و ئەو دوعایانەی هاتوون.

- زیکر کردن و ئاکاری چاك کردن.

- خۆ دوورخستنەوە لەگوناح و تاوان.

٥٦- جگەرەکێشان حەرام و قەدەغەیە، چونکە زەرەرمەندە بۆمرۆڤ.

٥٧- چوونە لای (کەهەنە)و نوقلانە لێدەرو فالچییەکان بۆ چارەسەرو عیلاج حەرامە و ڕێی لێ گیراوە، چونکە گەلێ جار درۆو دەلەسە دەکەن و خەڵکی پێچەواشە دەکەن و بەناڕاست دەردەچێ، ئەگەرچی هەندێ کاتیش ڕاست دەرچێ.

٥٨- هەرکەسێك داوای ناوی نەخۆش و دایکی نەخۆشەکەی کرد، ئەوە (جنی) بەکار دەهێنێت.(شێخ بن باز).

٥٩- چارەسەری (بەسراو) بەرامبەر بەژنەکەی:

- حەوت (٧) گەڵای تەڕی داری (نەبەق) بهێنرێ و بەبەرد، یان بەهەرشتێك بکوترێ و بکرێتە ناو قاپێکەوە، ئینجا ئەوەند ئاوی تێبکات بەشی خۆشۆرینی بکات، پاشان خۆی پێ بشۆرێت.

- (آیة الکرسی، سوورەتی: فەلەق، ناس، ئیخلاص، کافرون) ئەو ئایەتانەی جادوویان پێهەڵدەوە شێتەوە (١٢٢-١١٧)ـی سوورەتی (ئەعراف)، (٧٩-٨٢)ـی سوورەتی یونس، (٦٥-٦٩)ـی سوورەتی (تاها) بە سەرئاوەکەدا بخوێنرێ، پاشان هەندێ لە ئاوەکە بخواتەوە بەوی دیکەش خۆی بشۆرێ - ان شاءالله - شیفای بۆ دێت، ئەگەر جارو دووجار پێویستی دەکرد بەکار بهێنرێ قەیدی نییە بەکاری بێنن تاچاك دەبێتەوە.

٦٠- فوو کردن بەئاودا: ئەگەر مەبەست (تبرك) بوونی ئاوەکە بێت بەفووی ئەوکەسە، ئەوە کارێکی حەرامەو جۆرە شیرکێکە، چونکە جگە لەفووی پێغەمبەر ﷺ (تبرك) بەفووی هیچ کەسێك ناکرێ، خۆ ئەگەر هەندێ قورئان بخوێنێ و فووی پیابکات، قەیدی نییە، چونکە هەندێ لە (سەلەف) کردوویانە، پێغەمبەریش ﷺ سوورەتی (فەلەق و، ناس)ی لەکاتی خەودا دەخوێندو فووی دەکرد بەهەردوو دەستییداو دەیهێنا بە جەستەیدا.

## کاروباری قوتابخانە

١- لێدانی ئەو قوتابیانەی (کچ و کوڕ) گوێ بەوانەکانیان نادەن و، مامۆستایش هەموو ڕێگەیەکی گرتە بەر بۆچاکبوونیان و چاك نەبوون، دروستە، بەڵام دەبێ سووکە لێدانێك بێت و مەبەست وەبیرهێنانەوەی وانەکانیان بێت.

٢- گاڵتەو مەسخەرە بە مامۆستا، لە فەرهەنگی موسڵماناندا نییە، بۆیە دەبێ هەموو قوتابییەك بەرامبەر بەمامۆستا بەئەدەب و خاوەن وێڵ و شەرم بێت، نابێ بەهیچ شێوەیەك ئازاری بدەن.

٣- پێویستە ژنان - بەتایبەت - ئەوەند کاتی خۆیان بەئیش و کاری ماڵەوە نەکوژن، بەڵکو دەبێ هەندێکی بۆخوێندنەوەوە وفێربوون بەکار بێنن.

٤- دروست نییە بۆ قوتابیی (کچ و کوڕ) بەهیچ شێوەیەك گزیی و قۆپی لەوانەکانیاندا بکەن، ئەگەرچی وانەی ئینگلیزیش بێت.

٥- هەقە مامۆستای کچان، ژن بێت، بۆئەوەی تووشی روانین و تێکەڵیی و فیتنە و کاری ناپەسەندو ناشەرعیی نەبن، هەر لەبەر ئەوەیشە تێکەڵکردنی کچان و کوڕان لەقوتابخانەکاندا، کارێکی ناڕەواو ناردروستەو، دینی ئیسلام قەبووڵی ناکات.

٦- هەقە مامۆستا بەهیچ شێوەیەك دیاری لە قوتابی وەرنەگرێت، تاتووشی ناحەقیی و ستەم نەبێت، چونکە لەوانەیە ئەو قوتابیە مەبەستێکی هەبێ لەو دیاری بردنەیەدا.

٧- هەندێ مامۆستا، یان کارمەند، هەموو پێکەوە، هەریەکە شتێك لەمانگانەکەیان دادەنێن و پاشان هەرمانگەی دەدرێ بەیەکێکیان، ئەوە کارێکی باشە، چونکە قەرزێکە و هیچ فائیزی تێدانییە.

٨- هەڵسانەوەی قوتابی لەپۆلدا، لەبەر هاتنی مامۆستا، شتێکی (مەکروهە)، واتە: چاك وایە نەبێت.

٩- خوێندن و (تخصص)ی کچان، بۆنموونه: له (کیمیا، ئەندازە) تا زۆر پێویستی وڵاتمان نەبێت، هەق نییە ژنان بەوەوە خۆیان خەریك بکەن، چونکە دەرفەتگەلێکی تر هەیە، ئەوان ڕۆڵی تێدا ببینن، سەرەڕای ئەوەیش، بۆ دوایی دەبێ بچێتە ناو پیاوان و تێکەڵی دروست دەبێت.

١٠- دواکەوتنی مامۆستا (ژن و پیاو) لە پۆل، کاریکی ناڕەواو نادروستە، چونکە ئەو چۆتە ژێرباری ئەو ئەرکەوە، هەقە جێبەجێی بکات بێ دواکەوتن، خوا دەفەرموێ: (وأوفوا بالعهد ان العهد كان مسئولا).

١١- مامۆستای کچان، دەبێ ژن بێت.. بۆیە ئەگەر پیاو بوو، دەبێ خۆیان لەڕوانینی ناپێویست بپارێزن.

## ژنان و سوێند خواردن

١- هەقە موسڵمان لە سوێند خواردن خۆی بپارێزێ، بەڵام ئەگەر رکی هەڵساو تووڕە بوو و گوتی: (واللە) قسە لەگەڵ فلانەکەسدا ناکەم، کەچی قسەی لەگەڵکرد، دەبێ کەفارەتی سوێندەکەی بدات، مەگەر تووڕە بوونەکەی وابووبێت هەستی نەمابێ ونەزانێ چی گوتووە، دەشتوانێ سوێندەکەی بشکێنێ و کەفارەتی بدات، ئەگەر بەرژەوەندی لەوەدا دەبینرا.

٢- کەفارەتی سوێندیش بەم جۆرە دەدرێ:

- دەبێ ژەمێك (١٠) کەس تێر بکات، ئەگەر خۆراکیش دانێ، دەبێ بەهەریەکەیان - یەك و یەك لەسەردوو، واتە: کیلۆونیوێك بدات.

- کراس و دەرپێیەك نوێژی پێوە بکرێ، واتە: عەورەت داپۆش بێت.

- بەندەیەکی موسڵمان ئازاد بکات.

- ئەگەر هیچ کام لەوانەی پێ نەکرا، سێ رۆژ بەرۆژوو بێت.

٣- سوێند بەدرۆوە - کەپێی دەڵێن: (اليمين الغموس) چونکە خاوەنەکەی لە گوناح نقووم دەکات - کەفارەتی نادرێ، بەڵکو دەبێ پەشیمان بێتەوەو تەوبەی لێ بکات.

٤- ئەوسوێندانەی بەبێ نییەتی دڵ و مەبەست کەپێیان دەڵێن: (اللغواليمين) لەزار دەردەچن، کەفارەتیان نییە.

٥- دایکێك سوێندی زۆر لەمنداڵەکانی دەخوات، گەلێ جاریش بەگوێی ناکەن و سوێندەکەی دەخەن.. دەبێ چی بکات ؟! لەوەدەچێ (لغو اليمين) بێت، واتە: لەدڵەوە نەبووبێت، بەڵکو مەبەست هەڕەشەو ترساندنیان بێت، کەوابوو کەفارەتی ناوێ.

٦- سوێند بەغەیری خودا.. دروست نییە، ئەگەر بە (كعبة الله)یش بێت، کەوابوو بە

(شەرەفم) بەگۆڕی شەهیدان... تاد، نابێ بەکار بهێنرێن، پێویستە موسڵمان بەتایبەتی خۆی بپارێزێ لێیان.

## نەزر لە ئیسلامدا

١- کەسێك شتێك فەرزدەکاتە سەرخۆی، کەخودا فەرزی نەکردووە، بۆ نموونە: دەڵێ: ئەگەر خودا لەم نەخۆشیە شفام بدات، (نەزر) بێت مەڕێك سەرببڕم.. ئەو جۆرە نەزرانە لە ئیسلامدا (مەکرووهە)، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((انه لايأتي بخير)) جا ئەگەر لەکاتی خۆیدا ئەنجامی نەدا، دەبێ بۆ دوایی هەر جێبەجێی بکات، لەباتی دوا خستنەکەی کەفارەتی سوێندەکەشی بدات.

٢- کەسێك نەزری کرد لەفلانە جێگادا مەڕێك سەرببڕێ، کەچی دوایی دەرکەوت، لە جێگایەکی تر باشترە و هەژاری زۆرترە و صالح و باشترن.. (شێخ بن باز) دەڵێ: دەتوانێ بۆجێگای باشتر نەزرەکەی بباو لەوێ جێبەجێی بکات.

٣- ئایا دەکرێ خۆی لە نەزرەکەی بخوات.. ؟ ئەگەر کاتی خۆی مەبەستی بەو نەزرە هەژارو خەڵکانی بێ نەوابووبێ، ئێستا نابێ خۆیی و ماڵ ومنداڵی لێی بخۆن، خۆ ئەگەر مەبەست لەماڵ و منداڵ و هاوڕێیانی خۆی بووبێت، دیارە خۆیشیی و ئەوانیش لێی دەخۆن.

٤- نەزر بۆغەیری خودا حەرامە و گەلێ جار دەبێتە شیرك.. بۆیە ئەگەر مەڕێکی بۆ گۆڕێك، یان بۆ پاشا، یان بۆ پێغەمبەرێك.. سەرببڕێ، بەمردارەوە بوو دادەنرێ وشەریکیشی بۆ خودا داناوە.

٥- ئەگەر گوتی شتێك نەزربێت لەسەرم بۆخودا.. دەبێ کەفارەتی سوێندێك بدات، ئیتر شتێکی تری لەسەرناکەوێ.

٦- ئەگەر گوتی: ئەگەر قسەم لەگەڵ کردیت، مەڕێك نەزربێت لەسەرم، یان گوتی: ئەگەر ئەو هەواڵە ڕاست نەبوو نەزربێ مەڕێك سەرببڕم.. بۆ ئەم جۆرە نەزرانە تەنها کابرا سەرپشك دەکرێ: نەزرەکەی جێبەجێ بکات، یان کەفارەتی سوێندێ بدات.

٧- نەزری کرد کە شەراب بخواتەوە.. ئەوە پێویستە وازی لێ بهێنێ، بەڵام ئایا کەفارەتی سوێندی لەسەر دەکەوێ یان نا ؟ هەندێ زانا دەڵێن: کەفارەتی سوێندی لەسەر دەکەوێ، بەڵام جەماوەری زانایان دەڵێن: کەفارەتیشی لەسەر نییە.

٨- کەسێك نەزری کرد ئەوەند ڕۆژ بەرۆژوو بێ بۆ خودا، دەبێ جێبەجێی بکات، ئەگینە کەفارەتی سوێندی لەسەرە، یان گوتی: ئەگەر خودا لەم نەخۆشیە شفای دام، نەزربێت

وشترێك سەربڕم، جا ئەگەر خودا شفای دا، دەبێ وشترەکە سەربڕێ، ئەگەر توانای کڕینی وشترێکی نەبوو، دەبێ کەفارەتی سوێندێ بدات.

٩- ئەگەر کابرایە گوتی: واللە قسە لەگەڵ کاکم ناکەم، واللە قسە لەگەڵ کاکم ناکەم، چونکە دووبارە کردنەوەیە، بەیەك سوێند دادەنرێ، واتە: ئەگەر قسەی لەگەڵ کرد، یەك کەفارەت دەدات.

١٠- ئەگەر گوتی: واللە قسە لەگەڵ مامم ناکەم، واللە نانی ناخۆم، واللە ناچمە ماڵی، پاشان هیچی جێبەجێ نەکرد، دەبێ لەباتی هەریەکەیان کەفارەتی سوێندێك بدات، چونکە لەیەك جودان و هەریەکە حسابی تایبەتی خۆی هەیە. شیاوی باسە سوێند خواردنی زۆر کارێکی (مەکرووهە) و ناپەسەندە لەئیسلامدا، جگە لەوەیش کەسێتی مرۆۋ دەڕوخێنێ و لەناو کۆمەڵگەدا سووك دەبێ.

## ژنان و چوونە لای پزیشك

١- هەرشتێك زۆر پێویست نەبێ، بۆ پزیشك ناڕەوایە ببینێ و دەستی لێ بدات.

٢- کاتێ ژنان دەچنە ژوورەوە لای پزیشك، دەبێ مەحرەمیان لەگەڵ بێت، واتە: نابێ بەتەنها بچێتە ژووری پزیشکەوە، چونکە خەڵوەت روودەدات، ئەوەیش حەرام و قەدەغەیە.

٣- دەبێ لەکاتی چارەسەردا، دکتۆر هەر ئەوجێگایە ببینێ، پێویستی بەچارەسەر هەیە.

٤- تابکرێ و پزیشکی ژنان چارەسەریان بۆبکات، نابێ بچنە لای پزیشکی پیاو.

٥- پێویستە پزیشك و ژنە کارمەندەکانی نەخۆشخانەکان، جل و بەرگێکی وا لەبەر بکەن جەستەیان داپۆشێ و تەسك و ترووسك نەبێ لەبەریاندا.. واتە: نە ئەوەندە تەسك بێ و قەدو باڵای بگوشێ، نە ئەوەندەش پان و پۆڕ بێت رێ لەئیش و کارەکانیان بگرێ.

٦- دروست نیە پزیشك و هەر ئافرەتێکی تر لە نەخۆشخانە، یان لەهەرجێگایەکی تردا بەتەنها بمێنێتەوەو خەڵوەت رووبدات.

٧- بەکارهێنانی وشەی (سستر) واتە: خوشك بەزمانی ئینگلیزی، هەقە تەنها بۆژنانی ئیماندار بەکاربهێنرێت.

٨- ژنێك بچێتە لای پزیشکی ددان بۆچارەسەر، یان بەپێچەوانەوە.. پێویستە ژنان لای پزیشکی ژنان و، پیاوان لای پزیشکی پیاوان بچن، مەگەر زۆر پێویست بێ و دەست نەکەوێت.

## ژنان و پەیوەندییان بەخەڵکانی ناموسڵمانەوە

١- ئەگەر دراوسێیەکی کافری هەبوو، پێویستە چاکەو پیاوەتی لەگەڵ بکرێت، بەڵکو ئەو چاکەیە کاریگەر بێ لەسەری.

٢- کڕین و فرۆشتن و مامەڵە لەگەڵ کافراندا لە چوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامدا ڕەواو دروستە.

٣- ئەگەر بەشێوەی رەسمیی هێنرانە ولاتەوە، دەبێ ڕێزیان لێ بگیردرێ و مامەڵەی چاکیان لەگەڵ بکرێ وستەمیان بەرامبەر نەکرێ ومافی خۆیانیان بدرێتێ.

٤- نابێ موسڵمان لەسەر حسابی دین موجامەلە لەگەڵ کافران بکات، یان کارەکانی ئەوانی لاپەسەند بێت.

٥- نابێ موسڵمان لەکاتی جەژنەکانیاندا، بچێت جەژنە پیرۆزەیان لێ بکات، چونکە ئەوە ددان نانە بەکارە ناشەرعییەکانیاندا.

٦- موسڵمان دەتوانێ دیاری کافران وەرگرێ و قەبووڵی بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ دیارییەکەی (مقوقس)ی پاشای (میسر)ی قەبووڵ کرد.

٧- هەقە موسڵمان لە ژوورێکدا لەگەڵ کەسێکی کافردا کۆنەبێتەوە، خۆئەگەر زەروورو پێویست بوو قەیناکات، ئەگەرچی پێکەوەیش نان بخۆن و هەڵس و کەوت بکەن، بەمەرجێ دینەکەی بپارێزێ.

٨- پێویستە موسڵمانان مێژووی کافران (بەگاورەکانیشەوە) بەکارنەهێنن، چونکە هاوەڵان لەو سەردەمەدا مێژووی ئەوان هەبوو، کەچی لایاندا لێی و مێژووی (هیجری)یان داهێنا بۆخۆیان.

٩- چوونە دەرەوە بۆ ولاتی کافرنشین، بەم مەرجانە نەبێ دروست نییە:

- بتوانێ دین و ئایینی دەربخاو ئەرکە خواییەکان بپارێزێ، (تەمەلوق) نەکاو خۆی بە کەم نەزانێ و خاو نەبێتەوە لەدینداریی.

- سەفەرەکەی لەبەر پێویستیی و زەروورەت بێت، وەکو چارەسەری نەخۆشیی و فێربوونی ئەوشتانە تەنها لەوێ دەست دەکەون و ولات پێویستی پێیان هەبێت.

- بەلام سەفەر بۆ پیاسە و رابواردن دروست نییە.

١٠- هاوبەشی گاوران و جوولەکەو هەرخەڵکێکی تر لەو چەشنە دروست نییە، چونکە بەشداری کردنیان خۆشوبهاندنە بەوانەوە، ئەوەی کارێکی ناردوست و حەرامە.

١١- دەتوانرێ کافرو خوانەناس بهێنرێ، جل وبەرگیان پێ بشۆردرێ و نان وچێشتیان پێ بکرێت، ئەگەرچی فەرموودە هەیە کە بەرلە چێشتەکە دەبێ قاپ و قاچاخەکەیان

بشۆردرێ، بەتايبەتى كە ئەوان شەرابى تێدا دەخۆنەوەو گۆشتى بەرازى تيادەكوڵێنن.

١٢- ڕاگرتنــى كارەكــەرى ناموســڵمان و خزمــەتكارو شــۆفيرى غــەيرە موســڵمان و كرێكارى ناموسڵمان لە (الجزيرة العرب) دروست نييە، چونكە هەر ئەوكات كە جوولەكەو گاور ئەوهەموو گزيى و خەيانەتەيان كرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمانيدا كە لەوێ دەربكرێن. چونكە هێنانى كافران بۆ وڵاتى موسڵمانان، مەترسى گەورەى لێدەوەشێتەوە بۆ دين و رەوشتى موسڵمانان.

١٣- دەعوەتكردنى خەڵكانى خراپ و خوانەناس بۆسەر زەماوەند ئەگەر مەبەست لەو دەعوەتە، دڵخۆشكردنيان بێت بۆهێنانيان بەرەو ئيسلام، ئەوە كارێكى باش و قەشەنگە، خۆئەگەر هەر مەبەست نانخواردنێك بوو و هيچى تر، ئەوا پێويست ناكات.

١٤- ســەربڕاوى دەســتى خاوەننامــەكان دەخــورێ، بەمــەرجێ نــەزانرێ بــە غــەيرە شەرعيى سەربڕاون.

١٥- ســەر بڕاوى كافرەكانى تـر، ئاگرپەرسـتبن، يـان بتپەرسـت، يـان كۆمۆنيسـت.. ناخورێ و حەرامە.

**والحمد لله أولاً وأخرـ والصلاة والسلام على إمام المتيقين والمرسلين**
**سيدنا محمد و على آله وصحبه أجمعين.**

## كۆتايى

## سەرچاوەكان


١. قورئانى پيرۆز.
٢. تفسير ابن كثير.
٣. الجامع لأحكام القران / للإمام ابن كثير للقرطبى.
٤. روح المعانى / للشيخ محمود الآلوسى.
٥. الأساس فى التفسير / للشيخ سعيد حوى.
٦. في ظلال القرآن / للأستاذ داعية الاسلام سيد قطب.
٧. تفسير المنار / للأستاذ رشيد رضا.
٨. تفسير الكريم الرحمن / للشيخ عبد الرحمن السعدى.
٩. الكشاف / للزمخشرى.
١٠. الكاشف / للأستاذ جواد.
١١. قصص الأنبياء / عبدالوهاب نجار.
١٢. فتح البارى / شرح البخارى.
١٣. شرح النووى على مسلم.
١٤. الترغيب والترهيب / للحافظ.
١٥. نيل الأوطار / للشوكانى.
١٦. جامع الأصول / إبن كثير.
١٧. المفصل فى أحكام المرأة والبيت المسلم / د.عبدالكريم زيدان.
١٨. مدى سلطان الارادة فى الطلاق.. / د.مصطفى الزلمى.
١٩. أحكام الأسرة فى الفقه الإسلامى / د.عبدالستار حامد.
٢٠. المحلى / لإبن حزم الظاهرى.
٢١. مجموعة الفتاوى / شيخ الإسلام إبن تيمية.
٢٢. المجموع / للإمام النووى.
٢٣. المغنى / لإبن قدامة المقدسى.
٢٤. المرأة في القرأن و السنة / محمد عزت دروزة.
٢٥. المرأة بين الفقه و القانون / د. مصطفى السباعى.
٢٦. المعجم المفهرس / للأستاذ محمد فؤاد عبدالباقى.
٢٧. أهل الحل و العقد، صفاتهم و ووضائفهم / للأستاذ عبدالله ابراهيم الطريق.

٢٨. الجهاد و القتال فى السياسة الشرعية / محمد خير هيكل.

٢٩. الفقه الاسلامى و أدلته / د. وهبة الزحيلى.

٣٠. أحياء علوم الدين / للإمام محمد الغزالى.

٣١. مسألة تحديد النسل / د. محمد سعيد رمضان البوطى.

٣٢. المرأة الكردية و دورها في المجتمع الكردى / د. ابراهيم طاهر معروف.

٣٣. الحريات العامة في الدول الاسلامية / الشيخ راشد الغنوشى.

٣٤. تربية الأولاد فى الاسلام / عبدالله ناصح علوان.

٣٥. احكام الزواج و الطلاق والخلع / محمد متولى الشعراوى.

٣٦. المرأة بين طغيان النظام الغربي و لطائف التشريع الرباني / د. محمد سعيد رمضان البوطى.

٣٧. موسوعة فقه المرأة المسلمة / يوسف الحاج أحمد.

٣٨. واجبات المرأة المسلمة / خالد عبدالرحمن.

٣٩. أكثر من (١٠٠٠) جواب للمرأة / خالد الحسينيان.

٤٠. يسألونك فى الدين و الحياة / د. احمد الشرباصى.

٤١. تفسير أيات الأحكام / للشيخ محمد على الصابونى.

٤٢. فقه السنة / للشيخ سيد سابق.

٤٣. إختصار من (أحكام و فتاوى المرأة المسلمة) لمجموعة من السادة العلماء الأفاضل (اللجنة الدائمة للبحوث العلمية و الإفتاء فى المملكة العربية السعودية.

# پێڕست